- ناوی کتێب: نوری مینبەر.
- نوسەر: فاتح مەلا رسول شارەستێنی.
- چاپخانە: زانا ـ شەقامی مەولەوی .
- تیراژ: ( ٥٠٠ ) دانە.
- نۆبەی چاپ: یەکەم.
- ساڵی چاپ: ٢٠١١ ز - ١٤٣١ ك.

# پێشکەشە بە :-

- دایك و باوكی بەرێزم.
- بە هەموو ئەو مامۆستایانەم كە ئەگەر بۆ ساتێكی كەمیش لە خزمەتیاندا بووم، لە زانستەكانیان بەهرەمەند بووم لە هەر كوێ هەن.

لە ناویاندا بە تایبەتی پێشكەش بێت بە رۆحی مامۆستا (مەلا سەعیدی قامیشی) كە یەكەم وانەی فەقێتیم لە خزمەت ئەو زاتە زانا بێ وێنە گومناوە خوێند.... وە رۆحی پاكی مامۆستا (مەلا محمد أمینی بن طەبەق) كە چەند كتێبێكم لە خزمەتیدا خوێند... وە روحی پاكی مامۆستا (ملا محمودی شارستێن ) وە رۆحی پاكی هەریەك لە مامۆستایان (مەلا محمد نورەدینی) و مامۆستا (سید سلێمان) و مامۆستا (عبدالباقی) گەورە زانایانی دەڤەری رانیە كە ماوەیەك لە خزمەتیاندا بووم.. وە رۆحی پاكی مامۆستای گەورە و زانای دڵسۆز و دڵ پڕ لە ئیخلاص، مامۆستای گەورەم، مامۆستا (شێخ خالیدی موفتی) كە لە خزمەتیدا ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت.

رۆحیان شاد و جێگەیان بەهەشتی بەرین بێت و خوای گەورە لە جیاتی من و هەموو فەقێ و خزمەتكارانیان پاداشتیان بداتەوە.

- بە هاوسەری دڵسۆز و پشتیوانم (دایكی ئاسودە) و هەر چوار جگەرگۆشە و نوری چاوانم (محمد و ئیبراهیم و ئاسودە و ئەڤین).

# بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار، سەلات و سەلامی خوا لەسەر رۆحی سەردار و نوری چاومان حەزرەتی محمد ﷺ ، وە هەموو هاوەڵان و شوێنکەوتوانی بە گشتی.

خوێنەری ئازیز: ئەم کتێبەی بەردەستت برتیە لە بەرگی دووەمی نوری مینبەر لە وتاری رۆژانی هەینی، بە وتارەکانی مانگی شەعبان دەست پێ دەکات و تا کۆتایی ساڵ لە خۆ دەگرێت کە بەو شێوەیەی کە لەم کتێبەدا نوسراونەتەوە، لەسەر مینبەر خوێندومنەتەوە و هەموو هەفتەیەك بە (CD) بڵاوکراونەتەوە.

بەڵام دواتر بە باشم زانی کە بیاننوسمەوە و بەم شێوەیەی ئێستا بیانخەمە بەرچاوی موسڵمانان بە گشتی و وتاربێژان و بانگخوازان بە تایبەتی، وە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە چەند شتێك بکەم:

١.ئەوەی نوسراوەتەوە هەمان دەربڕین نیە کە لەسەر مینبەر پێشکەش کراوە، واتە لە (CD)یەوە نەقڵ نەکراوەتە سەر کتێب، بەڵکو بە شێوازی نوسینی ناو کتێب نوسراوەتەوە، لەبەر ئەوەی زمانی نوسین و قسەکردن لەیەکتر جیاوازن، وە وتاربێژ دەبێت خۆی جارێکی تر بە زمانی خۆی و شێوازی سەر مینبەر بیخوێنێتەوە، نەك لەسەر کتێبەکە.

٢.وتارەکان درێژن و مانای ئەوە ناگەیەنێت کە مەرجە بەیەك جار و لە یەك وتاردا هەمووی بخوێندرێتەوە، بەڵام من مەبەستم ئەوە بوو ئەوەی کەوا لەسەر ئەو بابەتە خوێندومەتەوە، هەمووی بنوسم و ئیتر وتاربێژ بە پێی ئەو کاتەی لەبەر دەستیەتی دەتوانێت سود لە وتارەکان وەربگرێت، بۆ نمونە: لە دوو بەسەرهاتی ناو یەك وتاردا کامیانی لا گونجاوتر بوو، ئەوەیان وەربگرێت.

٣.لە کۆتایی هەر وتارێکدا ئاماژەم کردووە بۆ ئەو سەرچاوانەی کە وتارەکەم لێ وەرگرتووە و ئەگەر کەم و کوڕی وهەڵەیەك هەبێت، ئەوە لای منەوەیە و هەر خوای تاك و تەنهاش لەهەڵە بە دوورە:

هەربۆیە:

و إنْ تجِدْ عَيْباً فَسُدِّ الخَلَلا .... جَلَّ مَنْ لا عَيْبَ فِيهِ وَ عَلا

ئامانجیشم لەم بابەتە تەنها و تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەیە و گەیاندنی ئەمانەتی سەرشانمە و هاوکاریەکی بچوکی وتاربێژان و بانگخوازانی هاوپیشەمە.

وە لەبەر ئەوەش ئەوەی کە لەم کتێبەدا نوسراوەتەوە قورئانە و فەرمودەی گەوهەرباری پێغەمبەری پێشەوامانە ﷺ وە فەرمودەی صەحابەکان و خواناسان و بەسەرهاتی پیاوباشانە، کە هەمووی نورە و روناك کەرەوەیە و (نُورٌ عَلى نُور) ، بۆیە کتێبەکەم ناونا (نوری مینبەر)، بە ئومێدی ئەوەی پێش هەموو

شتێك ببێت بە نور و روناكی دڵ و دەرونی خۆم و نوری رێگام لە ژیانی دونیادا و روناكی و نوری ناو گۆڕەكەم و مەیدانی مەحشەر و سەرپردی صیڕاتم، لەگەڵ هەموو ئێوەی ئەهلی قیبلە لە ئوممەتی پێغەمبەری نور ﷺ.

داواكاریشم لە تۆی خوێنەری بەڕێز لە دوعای خێر و رەخنە و پێشنیاری بنیاتنەر بێبەشمان نەكەیت.

﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ البقرة: ٣٢.

﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾ هود: ٨٨.

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ علی سَیدنا مُحَمَّد وَعَلی آلهِ وَصَحبِهِ اجمَعينَ:

ئیمانداران و خواناسانی بە ڕێز:پشتیوان بە خوای گەورە لەم ووتارەدا باسی ڕێزو گەورەیی مزگەوت دەکە ین.

مزگەوت ئەو ناوە پیرۆزەی کە ئاشنایە بە هەموو گوێچکەیەك، کە بە بیستنی مرۆڤ مانای پاکیەتی و گەورەیی و جوانی و بەرزی و بڵندی دێتە بەرچاو، بە بیستنی ووشەی مزگەوت مرۆڤ مانای خواپەرستی و سوژدەو ڕکوعی دێتە بیرو هۆش و ئەندێشەوە، بە بیستنی ووشەی مزگەوت مرۆڤ ئەو شوێنەی دێتە بەرچاو کە خەڵکی بۆ خواپەرستی ڕووی تێ دەکەن، لەکاتی لێقەومان و بێ دەرەتانی و گرفتەکانی ژیاندا هەر پەنا بۆ ئەو خەڵکە دەبەن کە خاوێنن، کە دڵسۆزن، کە بەبەزەین، کە گوڵ پێشکەش دەکەن و دڕك لە لاشە دەردەهێنن، کە فرمێسك دەسڕن و زەردەخەنەی دەخەنە شوێن، چونکە پەروەردەکراوی مزگەوتن، بەسە بۆ گەورەیی ناوی پیرۆزی مزگەوت کە بە بیستنی ناوی گەورەترین کەس، خالقی هەموو کەس و هەموو نەفس و گیاندارو بێ گیان، لە زەڕڕە بچووکتر تا گەورەترین کەشکەشان و هەموو ئاسمانەکان و عەرش وکورسی کە(الله). یە(جل جلاله)دێتەوە یادی مرۆڤی موسوڵمان و یەکەم ووشە کە ڕۆژی پێنج جار بە ئاشکراو بە دەنگی بەرز لە منارەی مزگەوتەوە بەرز دەبێتەوە ( الله اکبر ). وە ئاخر ووشەش ( لا اله الا الله) یە .

ئای چەند شیرین و پڕ مانان ئەم دوو شیعارو دروشمە بەرز و بڵندە، ( الله اكبر ) و( لا الـه الا اللـه) . کە هەرکەسێ لە ژێر ئەم بەیداغەدا بێ و خزمەتکاری ئەم شیعاری ئیسلامە بێت ، وەکو منارەی مزگەوت گەردن و سەری بەرز دەبێت .

خۆشەویستان : ئەگەر بمانەوێ لە گەورەیی مزگەوت بگەین، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ قورئان .لە سوڕەتی (التوبە) دا لە ئایەتی ١٧ بۆ ١٨ دا خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە کێ شایەنی ئەوەیە مزگەوت دروست بکات و ئاوەدانی بکاتەوە، کێ شایەنی ئەوەیە کە ئەم مەدالیایە بکرێتە گەردنی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، کە فڵان کەس دروستکەری ئەم مزگەوتەیە، بەوەندەی لە توانایدا بووە لە ئاوەدان کردنەوەی ئەم مزگەوتەدا درێغی نەکردووە و خۆی بۆ ڕەنجاندووە و هەوڵی پێ گەیشتنی داوە.

بەڕێزان : لە ئاینی ئیسلامدا کە ئاینی ڕێزدانانە بۆ هەموو کەسێك و هەموو بیروباوەڕێك ، کە ئاینی پێکەوە ژیانە وەك دەفەرموێت: مرۆڤەکان لەسەر زەوی دا ئەگەر هاو دینیش نەبن خۆ دەتوانن هاوژینی یەکتری بن، لەم ئیسلامەی ئێمەدا دەفەرموێ: لە دەوڵەتی ئیسلامیداو لە ژێردەسەڵات و فەرمان ڕەوای موسوڵماناندا، کاتێك موشریك و بێ باوەڕ هەیە، ئەم موشریکە، بت پەرستە، بۆی هەیە خزمەتگوزاری پێشکەش بە موسوڵمانان بکات و قوتابخانە و نەخۆشخانە دروست بکات، پرد وجادەو ڕێگاوبان چاك بکات، وە هەموو پڕۆژە خزمەتگوزارییەکان بە مرۆڤ دروست بکات و ئەویش

وڵـات ئـاوەدان بکاتــەوە، وە لــە لایــەن حکومــەت و موســوڵمانانەوە دەست خۆشی لێ دەکرێ و هەوڵ و ماندوو بوونی بەرز دەنرخێنرێت . بەڵام تەنها ڕێگای یەك شتی لێ دەگیرێ و ئەو مافەی پێ نادرێ و ئەو خەڵاتە گەورەیە نابێت بەشی ئەو بێ ، ئەویش دروست کردنی مزگەوتــە کــە ئایەتەکــە دەفــەرموێت : ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴾. التوبه ١٧.

واتــە: شــیاوو شایــستە نــەبووە بــۆ موشــریك و هاوەڵگــەران کــە مزگەوتــەکانی خــوا ئـاوەدان بکەنــەوە، لــە کاتێکـدا خۆیـان شـایەتن لەسەر خۆیان کە بێ باوەڕن، ئەوانە هەموو کارو کردەوەیەکیان بێ نرخـەو پوچـەڵ بووەتـەوە، ئـەوان لـە نـاو ئـاگری دۆزەخ دا لـە ژیـانی کولەمەرگیدا بەردەوامن.

دوای ئەوە لە ئایەتی ژمارە ١٨ی سورەتی (التوبە) دا باسی ئەو کەسە پایەدارو بەڕێزو بەختەوەرە دەکات کە شایەنی ئەوەیە مزگەوت ئاوەدان بکاتەوە و بینای مزگەوت بکات، کە دەفەرموێت:﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَـٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴾.

واتـە: بەڕاسـتی تـەنها ئەو کەسە بە دڵ و بە گیان مزگەوتـەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە ( بە خواپەرستی و نوێ کردنەوەی) کە باوەڕی

پتەوی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناوەو نوێژەکانی بە چاکی ئەنجام داوەو زەکاتیشی لە ماڵ و سامانی دەرکردووە و لە کەسیش نەترساوە جگە لە خوای باڵادەست، جا ئومێدە ئەو جۆرە کەسانە لە ریزی ڕێنموونی کراواندا بن.

بەڵێ بێگومان هەرکەسێ ئەو مەرجانەی تێدا هاتەجێ کە ئایەتەکە باسی دەکات وەکو:.

١. ئیمان و بڕوایەکی بە تین و پتەو بە خوای گەورەو بەڕۆژی دوایی، کە پاداشتی چاکەکارانی تێدا ئەدرێتەوە (لەم مەرجەدا ئەوە روون دەبێتەوە کە ئەو کەسەی مزگەوت دروست دەکات دەبێت تەنهاو تەنها لەبەرخاتری ڕەزامەندی خوای گەورە بێت و بۆ پاداشتی ڕۆژی دوایی ئەنجامی دابێت و ئیخڵاصەکەی ئەوەندە پاك و بێگەرد بێ دوور بێت لە هەموو جۆرە ڕیاییەك و خۆدەرخستنێك و ئومێدێك بەوەی کە بەهۆی ئەو مزگەوت دروست کردنەوە ناوو ناوبانگێك دەربکات).

٢. ئەو کەسەی کە مزگەوت دروست دەکات دەبێت بۆ خۆی نوێژ خوێنێکی زۆر چالاك بێت و زۆر پابەند بێت بە نوێژەکانەوە، چونکە کەسێك خۆی نوێژ نەکات ئایا مەعقولە شوێنێك بۆ خەڵکی دروست بکات کە نوێژی تێدا بکەن؟ لەبەرئەوە ئەم خاڵەش دەبێت بەردەوام لەبەرچاوی ئەو کەسانەدا بێت کە مزگەوت دروست دەکەن، بۆ خۆیان زۆر پابەند بن بە نوێژەکانیانەوەو بە هیچ بیانو زروفێکەوە نوێژ نەفەوتێنن و خۆیان پێش خەڵکی هاتوچۆی مزگەوت بکەن بۆ نوێژی

جەماعـەت و جومعـە ( نـەك بەداخـەوە لـەم ڕۆژگـارەدا كەسـانێك هـەن مزگەوت دروست دەكەن و بینا دەكەن، كەچی مەگەر ڕۆژی كردنەوەی مزگەوتەكە یان ڕۆژانی هەینی بێنە مزگەوت، ئیتر مزگەوت نابینێت، یان بە هۆی دەوڵەمەندی و بازرگانیەوە زۆرجار كەمتەرخەمە بەرامبەر ئەنجامدانی نوێژەكانی).

٣. ئـەو كەسـەی مزگـەوت دروسـت دەكـات دەبێـت كەسـێكی دڵ و دەست واڵا بێ و زەكات لەماڵەكەی دەر بكـات، واتـە مـاڵ و پارەكـەی خـاوێن بێـت، چـونكە هـەر ماڵێـك زەكـاتی لـێ دەرنـەكرێت ئـەو ماڵـە پیـسەو ئـەو پارەیـە سـەرجەم حـەرام دەبێـت، كەواتـە هـەر كەسـێك ماڵەكەی زەكاتی لـێ نـەدرابێ و فەقیرو هـەژار بەشـی خۆیـان لـەو ماڵـە وەرنەگرتبێت، خوای گەورە ڕێگە نادات كە بەو پارە پیسە كە زەكاتی لێ نەدراوەو بەشی هەژاران و موستەحەقانی زەكات تێدایە، مزگەوت دروست بكرێت، وە ئەگەر دروست كرا خوای گەورە وەری ناگرێت.

٤. ئەو كەسەی كە مزگەوت دروست دەكات، ئەبێت كەسێكی زۆر مـەردو بـە غیرەت و بـە شـەهامەت بێـت، جگـە لـە خـوا لـە هـیچ كـەس نەترسێت، وە دڵی تەنها خۆشەویستی خواو ڕەزامەندی خوای تێدا بێت و چاویشی تەنها پاداشتی خوای گەورە ببینێت، كە لـە قیامەتـدا لە جیاتی ئـەو مزگەوتـەی كـە دروسـتی كـردووە بـە كۆشـكی بەهەشـت پاداشـتی بداتـەوە، بـەردەوام چـاوی لـەو كۆشـكەی خـۆی بێـت لـە بەهەشتدا و ئومێدەوار بێت كە مادام ئەم بەبێ ڕیاو بەرچاوی خـەڵكی و هیچ مـەرام و مەبەسـتێك دروسـتی كـردووە، خـواش لـە سـەر زمـانی

پێغەمبـەر ﷺ وەعـدی داوە کـە بـە کۆشـکی بەهەشـت پاداشـتی ئەداتەوەو پاداشتەکەی مسۆگەرە، جا کەسێك ئاوا دڵ و چاوی هەر خواو پاداشتی خوا ببینێت بە بێ گومان منەتی بە هیچ کەس نیەو لە کەس ناترسێ و لە لۆمەی کەس سڵ ناکاتەوە.

بە داخەوە ئەڵێم ئەمڕۆ زۆر لەوانەی کە مزگەوت دروست دەکەن، شەیتان لەم خاڵەوە زەفەریان پێ دەبات بۆ ئەوەی نەبنە شایەنی ئەو ڕێزە گەورەیە، وایان لێ دەکات کە حەز دەکەن زۆرترین کاربەدەست و دەوڵەمەنـدو سـەرۆك عەشـیرەتەکان بانگهێشت بکرێن، لـە وانـەش کاربەدەستان بە تایبەت قسە دەکەن و ئەوەی خوا پێی ناڕازییە لە ماڵی خوادا ئەوە دەڵێن، وە ئەو کەسەش کە بە حساب بە پارەی ئەو مزگەوتەکە دروست کراوە تەمەلوقیان لەبەردا دەکات و لەبەر دەمیان هەڵدەسوڕێ و هەوڵی ڕازی کردنیان دەدات ، لەکاتێکدا کە زۆرێکیان هـەر بـۆ تـەنها جـارێکیش بێـت سـوژدەیان بـۆ خـوا نـەبردووە، کـە بەڕاسـتی ئەمـەش پێـچەوانەی خـاڵی چوارەم و مـەرجی چـوارەمی ئایەتەکەیە کە بۆ ئەو کەسانەی داناوە کە مزگەوت دروست دەکەن کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ﴾ ....

جا هەر کەسێك ئەم چوار مەرجەی تێدا هاتە جێ کە ئایەتەکە باسی دەکات، ئەوە خوای گەورە لە ڕیزی هیدایەت دراوان حیسابی دەکـات و لـە دنیـادا بەرچـاو ڕوون و دڵ گەشـاوەو ئاسـوودەو لـە قیامەتیشدا لە ڕیزی پاکان و چاکاندا حەشر دەکرێت بە بێ گومان. ان شاءالله.

بەڕێزان: هەرکەسێك ئەم چوار مەرجەی تێدا هاتەجیٚ کە باسمان کرد، ئەوا با گویٚ بگریٚ بۆ ئەو موژدانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسانەی داوە کە بینای مزگەوت دەکەن و تەعمیری دەکەن و نویٚی دەکەنەوە. کە لێرەدا تەنها ئاماژە بە پێنج فەرموودەی خۆشەویستمان دەکەین ﷺ.

فەرموودەی یەکەم: پێغەمبەری خوا ﷺ موژدە دەدات بەو کەسانەی کە بینای مزگەوت دەکەن و دەفەرموێت: ( مَن بَنَى مَسجِداً يَبتَغي بِهِ وَجهَ اللهِ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً في الجَنَّة ) رَواهُ البُخاري وَ مُسلِم.

واتە: هەر کەسێك جا ژن بێت یان پیاو ( چونکە ژنیش ئەگەر ماڵ و سامانی خۆی هەبێت ، ئەتوانێت مزگەوت دروست بکات و هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ پیاودا) مزگەوتێك دروست بکات و لە دروست کردنی ئەو مزگەوتەدا غەیری ڕەزامەندی خوا هیچ مەبەست و مەرامێك لەناو دڵ و دەرونی دا نەبێت ، ئەوا خوای گەورە بەوە پاداشتی ئەداتەوە کە خانوێکی بۆ دروست ئەکات لە بەهەشتدا .

بەڵام بەڕێزان: کە باسی خانوێکی بەهەشت دەکرێت نابیٚ سەرنج و بیرو هۆشمان بۆ لای ئەم جۆرە خانوانەی دونیا بچێت کە ئێستا لەبەر چاومانە، بەڵکو خانوی بەهەشت بە هیچ نرخێك ناتوانریٚ دیاری بکرێت ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( ومَوضِعُ سَوطِ أحَدكم منَ الجَنَّة خَيرٌ منَ الدُّنيا وَ ما عليها )رواهُ البُخاري.

واتە: بەقەدەر شوێنی گۆچانێك لە بەهەشتدا زۆر گرانبەهاترو چاکترە لە هەموو دونیاو ئەوەشی کە لەسەر دونیا هەیە.

ئیمانداری بەڕێز: دڵنیام هەریەك لە ئێمە كاتێك ئەم مـوژدە خۆشەمان لە دەمی موبارەكی ئەو (صادق الامین)ەوە پێ دەگات، سەدجار بە دڵ خۆزگە ئەخوازین كە توانامان بوایە مزگەوتێكمان لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورە دروست بكردایە.

بەڵام بێگومان ئەو توانا مادییە زۆرە لە توانای هەموو كەسێكدا نییە، بەڵام مەحزوون مەبە، لەبەر ئەوەی هەموو كەسێك ئەتوانێ كۆشكێكی بەهەشت بۆخۆی مسۆگەر بكات، ئەگەر دەپرسیت چۆن؟ ئەوا فەرموو گوێ بۆ ئەم مووژدەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگرە كە دەفەرموێ:( مَنْ بَنَى للهِ مَسجِداً كَمَفحَصٍ قَطاةٍ أو أصغَرَ بَنَى اللهُ لَهُ بَيتاً في الجَنَّةِ ) رواهُ إبنُ خُزَيمَةَ في صَحيحِهِ .

واتە: هەركەسێك لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوا مزگەوتێك درووست بكات، با ئەو مزگەوتە هەر بە ئەندازەی هێلانە سوێسكەیەكیش بێت، یان لە هێلانە سوێسكەیەكیش بچووكتر بێت، ئەوا خوای گەورە لە پاداشتا. خانوێكی لە بەهەشتدا بۆ درووست دەكات.

جا بەڕێزان : خۆ گومان لەوەدا نییە كە مزگەوتی ئاوا بچووك نیەو نابێت، بەڵكو مەبەستی فەرموودەكە (خواو پێغەمبەرەكەی باشتر دەزانن) مەبەست لەو كەسانەیە كە بە بچووكترین شت بەژداری لە درووست كردنی مزگەوتێكدا دەكەن، بە چەند دینارێك، بە تەنها بلۆكێك، بە كیسەیەك چیمەنتۆ، بە فەرشو ڕاخەرێك، بە گڵۆپێك بەژداری لە درووست كردن و ئاوەدان كردنەوەی ئەو مزگەوتەدا

دەکەن. ئەوا ئەو پاداشتە گەورەیەیان بە نسیب دەبێت. هەزاران هەزار سوپاس بۆ لوتف و کەرەمی بێ شوماری خوای پەروەردگار.

ئیمانداران: مزگەوت ئەوەندە پیرۆزو گەورەیە لای خوای پەروەردگار، نەك هەر ئەوانەی کە درووستی دەکەن و ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن بۆ بینای مزگەوت، یان بەلاشە ئیشی تێدا دەکەن، پاداشتی گەورەیان بۆ هەبێت، بەڵکو فەزڵ و گەورەیی و بەرەکەتی مزگەوت هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە ئوممەتی محمد بێت ﷺ بۆیە گوێ بگرن بۆ فەرموودەی دووەم و مووژدەی دووەم کە دەفەرموێت: ( إذا رَأيتُمُ الرَّجُلَ يَعتادُ المَسجِدَ فَاشهَدُوا لَهُ بالإيمان ) رَواهُ الترمذي وَحَسَّنَهُ وإبنُ ماجَة والحاكم وَصَحَّحَهُ.

واتە: ئەگەر کەسێکتان بینی دڵی وابەستەی مزگەوت بوو، وە بەردەوام هاتووچۆی مزگەوتی ئەکرد ئەوا شاهیدی بۆ بدەن کە بڕوادارە،

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە لەسەر ئەم موژدە گەورەیەی بۆ ئەو کەسانەی کە لە مزگەوت دانابڕێن، بەڵێ تۆ بۆت نییە کە بە کەس بڵێی بە ڕاستی بڕوادارەو ئەهلی بەهەشتە، بەڵکو هەر ئەتوانی بڵێی بە ڕاستی وەکو من فڵان کەسم ناسیبێت کەسێکی باش بوو ئەهلی خێرو چاکەکاری بوو، ئیتر هەر خواش بۆخۆی بەندە ناسە، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە بەردەوام ئەهلی مزگەوتن و ئەگەر فەرزێك دیار نەبن لە نوێژی جەماعەت و جومعەدا جێگایان دیارەو خاڵییە، بۆ ئەو کەسە ڕێگەت پێ دراوە بڵێی بڕوادارەو لە ئەهلی بڕوادارانە.

فەرموودەو موژدەی سێهەم، لە ڕۆژی سەختی قیامەتدا، کام ڕۆژی قیامەت؟ ئەو قیامەتەی کە دایکی هەموو ئیمانداران خاتوو عائیشە بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت:( سَمِعتُ رَسـولَ الله ﷺ يَقُـولُ: يُحشَرُ النّاس حُفاةً عُراةً غُرلاً، قالَتْ عائشَةُ: فَقُلتُ: الرِجالُ وَالنِّساءُ جَميعاً يَنظُرُ بَعضُهُم إلى بَعضٍ؟ قال: الأمرُ أشَدُ مِن أنْ يُهِمَهُم ذلكَ) .. وَفي رِوايَةٍ: (مِن أنْ يَنظُرَ بَعْضُهُم إلى بَعضٍ) .

واتە: بەم گوێچکانەی خۆم لە پێغەمبەری خوام بیست ﷺ کە فەرمووی لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی دەهێنرێن بۆ مەیدانی مەحشەرو لێپرسینەوە کە حاڵیان وایە، پێیان پەتییەو هیچ پێڵاوونەعلێکیان لە پێدا نییە، هیچ جل و بەرگێکیان لە بەردا نییە و لاشەیان ڕووتە، هیچ ئەندامێکی لاشەیان لێ کەم نەبووەتەوە، ئەوانەی کە لە دونیادا کەم ئەندام بوون لەوێ لاشەیان تەواوەو کەمئەندامیان نەماوە، تەنانەت ئەو پێستەی کە لە کاتی خەتەنەکردندا لێیکراوەتەوە ئەوەشی بۆ دەگەڕێنرێتەوە، ئابەو حاڵەوە مرۆڤەکان دەبرێن بۆ گۆڕەپانی مەحشەر، حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: بە سەر سوڕمانەوە لە پێغەمبەری خوام پرسی : ئایا ئەو هەموو ژن و پیاوە ئاوا بە ڕووتی بە یەکەوە دەبن و تەماشای یەکتری ناکەن؟! { هەزاران هەزار ڕەحمەت لە خاتوو عائیشەی خاوەن حەیاو شەرم و ڕەوشتی بەرز، ئالێرەدا ئەوەی هاتە بیر کە چۆن دەبێت ژن وپیاو بە ڕووتی و بێ بەرگ لەبەرچاوی یەکتری بن؟ ئەمە بۆ مرۆڤی خاوەن شەرم و حەیا لە هەموو گرانی و ناڕەحەتییەك گرانترو قورسترە} .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە بە خوا کارەکەو حیساب و لێپرسینەوەکە و چاوەڕوانی ئەو خەڵکە بۆ زانینی چارەنوسی کۆتایی خۆیان کە ئایا بۆ بەهەشت دەچن یان بۆ دۆزەخ ؟ ئەوەندە ئەو خەڵکەی خەریك کردووە، کارەکەی ئەو ڕۆژە چارەنووس سازە زۆر لەوە گەورەترە خەڵکی بیری ئەوەیان بمێنێت کە هەندێکیان تەماشای هەندێکیان بکەن.

بەڵێ بەڕێزان: ئاڵەو ساتە وەختە سامناکەی گۆڕەپانی مەحشەردا پێغەمبەری مووژدە بەخش موژدە ئەدات و ئەفەرموێت: لەو کاتەدا حەوت چین و دەستە و تاقم وان لە ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگاراو هەرچی خەم و خەفەت و ترس و لەرزە نییانە ( ئای خۆزگەم بەو کەسەی کە یەکێك ئەبێت لەو حەوت تاقم و دەستەیە) فەرموودەکە هەردوو پێشەوای فەرموودەناس (بوخاری و موسلیم) گێڕاویانەتەوەو ناوی هەر حەوت تاقمەکەیان باسکردووە، کە یەکێك لەو حەوت تاقمە( وَرَجُلٌ قَلبُهُ مُعَلَّقٌ بالمَساجِد) کەسێکە دڵی بەردەوام لای مزگەوتە. لە ماڵەوە بێت، لە سەفەر بێت، ئیش وکاری هەبێت، بێ ئیش بێت، کە نوێژی نیوەڕۆی بە جەماعەت کرد لە خەمی ئەوەدایە بۆ جەماعەتی عەسریش خۆی بگەیەنێتە مزگەوت، یان بەردەوام دڵی لای مزگەوتەو بە ووردی سەرنجی کەم وکوڕییەکانی ئەدات و ئەگەر کەم وکوڕییەکانی بینی دڵی هەر لایەتی و هەتا چاکی نەکاو پڕی نەکاتەوەو لای نەبات دڵی ئیسراحەت ناکات و ئارام ناگرێ.

دەی بــا هــەر ئێـستا هەریــەك لــە ئێمــە ســەیری دڵ و دەروون و واقیعی ژیانی ڕۆژانەی خۆی بکات، بزانین یەکێك دەبین لەو کەسانەی کە ئاوا دڵی بە مزگەوتەوەیەو زەمانەتی پێغەمبەری خوا ﷺ مسۆگەر ئەکات بۆ چوونە ژێر سێبەری عەرشی خواوە؟.

مـوورژدەو فـەرموودەی چـوارەم: خۆشەویـست و نـووری چـاومان حەزرەتی محمد ﷺ دەفەرموێت: ( إنَّ للمَساجِدِ أوتــاداً، المَلائكَــةُ جُلَسائُهُم: إنْ غابُوا يَفتَقِدُونَهُم وَإنْ مَرِضوا عادُوهُم، وَإنْ كانُوا فــي حاجَةٍ أعانُوهُم ).

واتــە: بەڕاسـتی بـۆ مزگەوتـەکان و مـاڵی خـوا کەسـانێك هـەن کـە شوێنی دانیشتنیان بۆ نوێـژی جومعـە و جەماعـەت و گـوێ گـرتن لـە ئامۆژگاری مامۆستایان و بانگخوازان و فێربوونی زانستی شەرعی لـە نــاو مزگەوتــدا دیــاری کــراوە، ئەوەنــدە بــەردەوام لــەوێ دانیــشتووە خــەڵکی ناچــنە ئــەوێ دانیــشن، ئــەڵێن ئــەوە شــوێنی فڵانــە کەســە، هەرچەندە هیچ جێگایەك لە مزگەوتدا تایبەت نییە بە تەنها کەسێك بـۆ دانیـشتن بـەڵکو کـێ زووتـر بێـت ئـەو شـایەن تـرە بـەو شـوێنەی پێشەوەو ڕیـزی یەکـەم ، بـەڵام چونکە ئـەو کەسـە ئەوەنـدە ئامـادەی مزگەوت و ڕیـزی یەکـەم و نزیـك ئیمـام ئـەبێت ، خەڵکەکـە حـەز ناکەن ئەگـەر جارێـك دواکـەوت شـوێنەکەی بگـرن ، بـەڵکو بـە بۆشـی بـۆی دەهێڵنــەوە تــا دێتــە شــوێنەکەی خــۆی، جــا ئــەم جــۆرە کەســانە فریشتەکانی خوا دەبنە هاونشین و هاوەڵیان، ئەگەر دیـار نـەبوون لـە مزگــەوت بۆیــان بێتاقــەت و وەڕس دەبــن، ئەگــەر نــەخۆش کــەوتن

سەردانیان دەکەن و ئەو فریشتانە دەچنەماڵەوە بۆ لایان و لە لای دادەنیشن و دوعای خێری بۆ دەکەن، هەرچەند ئەو کەسە فریشتەکان نەبینێت، بەڵام ئەوان دەیبینن و لە لای دەبن، وە ئەگەر پێویستییەکی ژیانی ڕۆژانەی هاتە پێش ئەم فریشتانە هاوکاری دەکەن و یارمەتی دەدەن و کارەکەی بۆ ئاسان دەکەن بۆ ئەوەی لە مزگەوت دانەبڕێت بەهۆی ئەم ئیشەوە.

جا ئیمانداری بەڕێز: ئایا چی هاونشینی و هاوەڵییەك چاکترە لە هاوەڵی کردنی فریشتەکانی خوا؟ کە بەهۆی بەردەوام بوونت لە هاتوچۆی مزگەوت دەستت دەکەوێت .

فەرموودە و مـوژدەی پێنجەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلَّا رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلْ الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ وَلَا يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظَرَ الصَّلَاةَ) رَوَاهُ الْبُخَارِي .

واتە: نوێژی کەسێك بە جەماعەت لە مزگەوتدا خێرو ئەجرو پاداشتی زیاترە لە هەمان نوێژ کە لە ماڵی خۆیدا یان لە شوێنی کارکردن و بازاڕو دوکانەکەیدا ئەنجامی بدات، بە بیست و پێنج پلە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کاتێك ئەم بەندەیە لە ماڵەکەی خۆیدا

دەستنوێژێکی زۆر جوان دەگرێ و پاشان لەماڵ دەچێتە دەرەوە بۆ مزگەوت دەڕوات و هیچ مەرام و مەبەست و ئیشێکی لە مزگەوت نییە تەنها چوون بۆ نوێژی جەماعەت نەبێت، ئەوا هیچ هەنگاوێك هەڵناهێنێت ئیللا بەو هەنگاوەی پلەیەك لە چاکەکانی بەرز دەبێتەوەو هەر بەو هەنگاوەش گوناهێکی لەسەر ڕەش دەکرێتەوەو دەسڕدرێتەوە کە لە دەفتەری کردەوەکانی دا لەسەری تۆمار کراوە.

جا کاتێ گەیشتە مزگەوت و نوێژەکەی بە جەماعەت کرد، ئەوا هەتا لەو شوێنی نوێژەی بمێنێتەوە، پێش نوێژەکە چاوەڕێی هاتنی کاتی نوێژەکە و نوێژکردنەکەی بە جەماعەت، دوای نوێژەکەشی دانیشت بۆ تەسبیحات و پاڕانەوە لە خوا، ئەوا لە هەموو ئەو مانەوەیەیدا لە مزگەوت و شوێنی نوێژەکەی دا، بەردەوام فریشتەکان داوا لە خوا دەکەن کە ڕەحمەتی خۆی بڕژێت بەسەر ئەو کەسەداو دەڵێن: یاڕەبی خوایا بەرەکەت و ڕەحمەتی خۆتی بەسەردا ببارێنە، خوایا ڕەحمی پێ بکە، وە هەتا لەو شوێن نوێژەی بمێنێتەوەو چاوەڕێی نوێژ بکات کە کاتی بێت و لەگەڵ ئیمامی مزگەوت دا نوێژەکەی بە جەماعەت بکات، هەموو ئەو کاتانەی بە نوێژکردن بۆ دەنوسرێت و وەکو لە ڕکوع و سجود دا بێت وایە.

ئیمانداران: زانایان و دانایان فەرمویانە ( المَسْجِدُ مَصْنَعٌ لِلرِّجال ) مزگەوت شوێنی دروست کردنی پیاوانە، مەردانە، دلێرانە، دانایانە، زانایانە، بیرمەندانە، ڕۆشنبیرانە، مزگەوت کەسانێك دروست دەکات کە ﴿رِجَالٌ لَا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ ئەوانەی لە

مزگەوتدا شەهادەی پیاوەتی و دلێری وەردەگرن، ئەوەندە بەهێزن کە ئەو پارەو زێڕو زیوەی کە خەڵکی بونەتە بەندەی، ئەم لەکاتی نوێژ دا پشتی تێ دەکات و کڕین و فرۆشتن لە مزگەوت و نوێژو زیکری خوای دوورناخاتەوە.

ئیمانداران: لێرەدا پرسیارێکمان بۆ درووست دەبێت ئەویش ئەوەیە کە بۆچی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاوانی گەورە لە مزگەوتدا دەردەچوون و تەخەڕوجیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی بیناوە زۆر سادەو ساکار بوو، فەرش وڕایەخی تێدا نەبوو، بە چەوو گڵ داپۆشرابوو، سەری مزگەوتەکە بە لقی دارخورما گیرابوو، کە باران دەباری ناو مزگەوتەکە هەمووی تەڕ دەبوو، کەچی لەگەڵ ئەو هەموو سادەو ساکاری بینایەدا، ئەو هەموو هەزاران کەڵە پیاوەی تێدا هەڵکەوتن، خولەفای ڕاشیدین و باقی عەشەرەی موبەشەرەو گەورە هاوەڵان هەر لەو مزگەوتەدا پێگەیشتن و تێگەیشتن، ئایا ئەو هۆکارانە چی بوون کە ئەو مزگەوتەی کرد بە کارگەی درووست کردنی گەورە پیاوان، چونکە دروست کردنی کەل و پەلی بێ گیان لە کارگەدا زۆر ئاسانەو زۆر کەس و دەزگا ئەتوانێ دروستی بکات و پێشکەش بە کۆمەڵی بکات، بەڵام ئەوانەی ، ئەو شوێنانەی مرۆڤی بە مانای مرۆڤ ، بە تەعبیری قورئانی(رجال) چونکە هەموو نێرینەیەك ئەو (رجال) ە نیە کە قورئان باسی دەکات، ئەو شوێنانە و ئەو کەسانە زۆر کەمن وتەنها مزگەوتەو دەستی پێغەمبەری خوا و میراتگرانی پێغەمبەرە ﷺ.

١. ئەو کاریگەرییە گەورە دەرونی و ڕووحی و مەعنەوییەی کە موسوڵمانان بۆیان درووست ئەبوو لە کاتی قورئان خوێندنی ناو نوێژی جەماعەتدا، کە لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەری خوادا ئەهاتە دەرەوە و بەو ئاوازە پڕ سۆزەی ئەیخوێندەوە، ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەی دا لە موحەمەدی کوڕی جوبەیری کوڕی مەطعەمەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە باوکییەوە کە فەرموویەتی:( سَمِعْتُ النَبيَّ ﷺ يَقرأُ في المَغرِبِ بالطُّورِ. فَلَمّا بَلَغَ هذهِ الآيَة: أَمْ خُلِقوا مِـنْ غَيـرِ شَيءٍ أَم هُمُ الخالِقونَ. كادَ قَلبي أَنْ يَطيرَ ).

واتە: لە خزمەت پێغەمبەردا نوێژی مەغریبم بە جەماعەت کرد گوێم لێ بوو کە سورەتی (الطور)ی لە دوای فاتحە خوێند جا کاتێك گەیشتە ئەم ئایەتە﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيرِ شَـيءٍ أَمْ هُـمُ الخـالِقونَ﴾ ئەوەندە بە سۆزو بە دەنگێکی بە تەئسیر خوێندیەوە، وا کاری تێکردم کە خەریك بوو دڵم لە لاشەم ئەهاتە دەرەوەو ئەفڕی.

بەڵێ خۆشەویستان: لە سورەتی پیرۆزی (الطور) دا پانزە جار ووشەی (أم) هاتووە، هەرجارەی بە شێوەیەك بیرو هۆش و دڵی مرۆڤ بە ئاگا دێنێتەوە و دەهەژێنێ، جا ئەبێ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ چەند بە خۆشی خوێندبێتییەوەو ئەوەندە کاریگەری لەسەر دڵ و ڕوح و دەرونی صەحابە هەبووە کە گەیشتۆتە حاڵەتێك کە خەریك بێت دڵی بفڕێت.

٢. هۆکاری دووەم کە وایکرد مزگەوت ببێتە شوێنی گەورە پیاوان و مەردان و چاکان و پاکان و پێشەوایانی مرۆڤایەتی، چرا بە

دەستانی ڕێگا بۆ لای خوای گەورە، ئەوە بوو کە مزگەوت تەنها بۆ نوێژو جومعە و جەماعەت بەکار نە ئەهات و و دوای نوێژ دابخرێت و وەك و دائیرەو فەرمانگەیەکی حکومی بەکار بهێنرێت و تەماشا بکرێت. بەڵکو مزگەوت گەلێك دەوری کاریگەری دەبینی، بۆ نموونە:
مزگەوت شوێنی فێربوونی ڕێك و پێکی و نیزام بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ڕۆژێك پێنج جار ڕووی دەکردە هاوەڵانی و پێش دابەستنی نوێژ دەیفەرموو:( سَوّوا صُفوفَكُم فَإنَّ تَسوِيَةَ الصُفُوفِ مِنْ إقامَةِ الصَّلاةِ ) رواهُ البُخاري.

بەڵێ هەرکەسێك لە مزگەوتدا فێری ڕێك و پێکی نەبێت و نەتوانێت بە دڵێکی پاکەوە شان بەشانی براکانی بوەستێت، ئایا لە دەرەوەی مزگەوتدا و لە گرمەو گاڵەی بازاڕو سیاحەتدا فێر دەبێت برابێ و تەبا بێت ؟ بێگومان نەخێر.

وە هەروەها مزگەوت پەرلەمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا ڕاوێژی بە هاوەڵان دەکرد کە لە مەدینەدا بمێننەوە یان بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی کافران بچنە دەرەوەی شار؟

لە دوای وەفاتی حەزرەت ﷺ ئەبوبکری صدیق لە مزگەوتدا دەنگی پێ دراو یەکەم ووتاری خۆی خوێندەوەو وە حەزرەتی عومەرو.........هتد.

مزگەوت شوێنی ئازادی ڕادەربڕین و ڕەخنەگرتنی سەربەستانەو بێ ترسانە بوو لە خەلیفەو کاربەدەستان، لە مزگەوتدا بوو کە سەلمانی فارسی بە عومەری خەلیفەی گووت: گوێت بۆ ناگرین

چونکە تۆ دوو پارچە قوماشت بۆ خۆت هەڵگرتووە و یەك پارچەت داوە بە ئێمەی هاوڵاتی، خەلیفەش لە جیاتی ئەوەی توڕە ببێ و بفەرموێت ئادەی بیگرن و دارکاری بکەن، سوپاسی سەلمانی بوێرو دلێرو حەق بێژ دەکات و بۆ ڕەواندنەوەی گومانەکەشی بانگی عبدالله ی کوڕی ئەکات و سوێندی ئەدات بە خوا کە ڕاست بڕوات، ئایا ئەو پارچە قوماشەی بەر ئەو کەوتووە باوکی لێی نەخواستووە، چونکە حەزرەتی عومەر باڵای بەرز بووەو پارچەکەی خۆی بەشی نەکردووە، ئایا لەسەردەمی عەولەمەو جیهانگیری ئەم سەردەمەدا، لەسەردەمی بەناو دیموکراسی و ڕادەربڕیندا، جیهان ئازادی ڕادەربڕینی ئاوای بە خۆیەوە بینیوە؟.

لە ئیسلام دا دەبێت کاربەدەست لە پلەی باڵاوە بۆ لێپرسراوی ناحیەیەك، شارەزای فیقهی ئیسلامی بێ و ووتاری ڕۆژی هەینی بۆ جەماوەری موسوڵمانان بخوێنێتەوەو ڕاپۆرتی هەفتانە پێشکەش بکات و میللەت بە ئازادانە بێ پرسگەو سکرتارییەت چاوی بە لێپرسراو سەرکردەی ووڵات بکەوێت و بە ئازادانە ڕەخنەی لێ بگرێ و هەڵەی بۆ ڕاست بکاتەوە .

مزگەوت مینبەری ئازادی ڕادەربڕینە، ئافرەتێکی شارەزاو ووریاو چالاك، هەڵەی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابی ڕاست کردەوە کە فەرمووی نابێت مارەیی ئافرەت لەوەندە بڕە زیاتر بێت ، ئافرەتەکە فەرمووی ئەی ئەمیری بڕواداران ئەو بڕیارە نە لە قورئان و نە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ نەهاتووە، حەزرەتی عومەر بیری

کردەوەو زانی کە ئەو ئافرەتە ڕاست دەکات، بۆیە هەر لەسەر مینبەری پێغەمبەرو لەبەر چاوی هەموو جەماوەر دانی بە هەڵەکەیدا ناو فەرمووی ( أصَابت إمرأةٌ وأخطأَ عمرُ).

بەڵێ مزگەوت لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ تاووتوێکی بارودۆخی ژیانی ڕۆژانەی تێدا دەکراو دەرسەکانی ڕابردووی تێدا باس دەکرا، پێشەوا موسلیم، لە صەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژی بەیانی لە شوێنی نوێژەکەی خۆی لە میحرابی مزگەوتەکە ئەمایەوە تا هەتاو ئەکەوت، جا لەو ماوەیەدا ڕووی لە هاوەڵان ئەکرد ( كانُوا يَتَحَدَّثونَ، فَيَأخُذُونَ في أَمرِ الجاهلِيَّةِ فَيَضحَكونَ وَيَبْتَسمُ ) لەگەڵ صەحابەکان قسەی دەکردوو باسی زەمانی جاهیلیەتی پێش ئیسلامیان دەگێڕایەوە و هاوەڵان پێدەکەنین بەو هەموو جەهالەتەی کە ئەنجام ئەدراو خوای گەورە بەهۆی نووری ئەم ئیسلامە ڕزگاری کردن، پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەی بە ڕوودا دەکردن.

٣. هۆکاری سێهەم کە وای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەزاران صەحابی و شێرە پیاوی ئەم ئیسلامە لە مزگەوتدا پێ بگەیەنێ، ئەوە بوو مزگەوت هەروەك و جێگای بە جێهێنانی نوێژی جومعەو جەماعەت بوو، جێگای عیلم و فێربوونی زانستیش بوو، بۆیە بە مزگەوت دەوترێ (جامع) واتە دونیاو قیامەتی بەیەکەوە تێدا کۆ بووەتەوە، لە مێژووی ئیسلامدا جامیعەی ئەزهەرو قورتوبەو دیمەشق، هەموویان لە مزگەوتا بوون، ئەو زانکۆ بە ناوبانگانە کە تا

ئێستاش جامیعەی ئەزهەرو دیمەشق لە زانکۆ بەناوبانگەکانی جیهانن لەناو مزگەوتدا بوون، لە کوردستانی ئازیزی خۆشماندا، لە کوردستانی گەورەش دا، ئەمە چەند ساڵێکی کەمە کە لە نیو سەدە تێناپەڕێت قوتابخانە کراوەتەوەو خەڵکی تیایدا فێری خوێندن و نوسین بووە، بەڵام پێش ئەوە تاکە شوێنی فێر بوونی زانست و زانیاری تەنها حوجرەی مزگەوتەکان بووە، کە هیچ گوندێکی ئەم کوردستانە نەبووە کە مزگەوتی نەبێ و هیچ مزگەوتێکیش نەبووە کە حوجرەی فەقێیانی تێدا نەبووبێت و مامۆستای ئاینی لەگەڵ ئەنجامدانی کاری ئیمامەت و ووتاربێژی و فتوادان و چارەسەری کێشەکانی خەڵکی، تەواوی کاتەکانی بە وانەبێژی بە فەقێکانی بەسەر بردووەو ئەو هەموو زانا ناودارەو ئەو هەموو کتێبە نایابە دەست نوسانەی کە ئەمڕۆ بە سەدان نامەی دکتۆراو ماستەری لەسەر وەردەگیرێ، هەمووی لە حوجرەی مزگەوتا پێگەیشتووەو نوسراوەتەوە، هەرچی شاعیرو فەیلەسوف و داناو زانا هەیە، هەمووی لە مزگەوتا فێر بووە، بۆیە هەموو زانستخوازانی دنیا بە گشتی و جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی و کوردستانی خۆمان بە تایبەتی تر قەرزاری مزگەوتن، کە بە داخەوە ئەمڕۆ زوڵمێکی گەلێك گەورە لە مزگەوت دەکرێت بەوەی کە حوجرەکانی دادەخرێن و فەقێ بوونی نەماوە و هەرگیزاو هەرگیز خوێندنگاکانی ئاینی و پەیمانگاو کۆلێژەکانی ووتاربێژی و شەریعە ناتوانن و نەیان توانیوە کە شوێنی

حوجرە بگرنەوەو هەرگیز ئەو زانستە پڕ بەرەکەتە لە پەیمانگاو کۆلێژەکان دەست ناکەوێ.

٤. لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ مزگەوت بەشێکی تەرخان کرابوو بۆ هەموو ئەو پیرو پەك کەوتەو بێکەس وکارو خانەو لانەو کەم ئەندام و ئەو هەژارانەی کە توانای کاروکاسپییان نەبوو، کە پێیان دەوترا ( أهل الصفة) دانیشتوانی سەر سەکۆی مزگەوتەکە، بۆ ئەوەی بێ ناو نەبن، غەریب و دڵ بریندار نەبن، توشی سواڵ کردن و بێ حورمەتی کردن نەبن، مەسرەف و خەرجی خۆراك و جل وبەرگیان لە لایەن خەڵکی ناوشاری مەدینەوە بە تایبەت دەوڵەمەندان و دەست ڕۆیشتوانەوە دابین دەکراو لەو خواردنەی بۆ خۆیان دەیان خوارد هەر لەوەش دەیانبرد بۆ مزگەوت و بەشی ئەوانیشیان ئەدا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ڕۆژێك جگە لە نوێژە فەرزەکان وە جگە لەوەی کە ماڵەکەی لە تەنیشتیانەوە بوو، سەردانی دەکردن و لە گەڵیان دادەنیشت و ئەوانیش هەموو خەم وخەفەتەکانیان و هەموو ئازارە دەرونییەکانیان بە چاوپێکەوتنی ئەو نوورو ڕووناکی و جەمالەی ناو چاوانی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەڕەوایەوەو خۆیان زۆر بە نرخ ئەهاتە بەرچاو، هەستیان ئەکرد کە ئەمانیش کەم نین و خاوەن ڕێزن، ئەوەتا سەرداری هەموو پێغەمبەران لەگەڵیان دادەنیشێت و هەواڵیان دەپرسێ ، وە چەند فەرمووده‌مان هەیە کە باس لەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی زۆر برسییەتی دا ، کە چاوی بە یە کێکی وەکو (ئەبو هورەیرە) کەوتووە کە لەبرسان لە

مزگەوت هاتووەتە دەرەوەو یەکێکە لە ئەهلی صوففە، دەستی ئەبوهورەیرەی گرتووەو فەرموویەتی: وەرە با بچینەوە بۆ ماڵی ئێمە بزانین شتێك نییە بەیەکەوە بیخۆین، کە چونەتە ماڵی پێغەمبەر ﷺ خێزانە بەڕێزەکانی فەرموویانە هیچمان نییە تەنها ئەم قاپە شیرە نەبێت کە ماڵی فلان وەك و دیاری بۆ جەنابتیان ناردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی ئەبووهورەیرە بە پەلە بچۆ بۆ مزگەوت و هەموو ئەهلی صوففە بانگ بکە، دەفەرموێ لەو کاتەدا (٧٠) کەسی لێ بووە، هەموویان هاتنە ماڵی پێغەمبەری خواو خۆشەویستی خواو دڵسۆزی هەژاران و بێ کەسان، خۆی هێشتا لەگەڵ ئەو هەموو برسێتیەدا دەمی لێ نەداوە، فەرمووی: ئەبووهورەیرە با یەك یەك بێنە ژوورەوە، ئینجا بە دەستی موبارەکی قاپە شیرەکەی ئەدانێ و ئەو کەسە تێری لێ دەخواردەوەو ئینجا ئەیدایەوە دەستی پیرۆزو پڕ بەرەکەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ئەیدایە دەست کەسی دواترو بەم شێوەیە حەفتا کەسەکە تێریان خواردەوە لە شیرو هێشتا (سبحان الله) شیرەکە هەر وەکو خۆی بوو لە قاپەکەدا، ئینجا فەرمووی: ئەبووهورەیرە تۆش بخۆرەوە، ئەویش خواردیەوە، سێ جار پێغەمبەری خوا ﷺ هەر دەیفەرموو: دەی زیاتر بخۆرەوە، تا ئەبوو هورەیرە لە جاری سێهەمدا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خوا هیچ شوێنێکی لاشەم نەماوە کە شیری تێ نەچوو بێت و بە تەواوی تێرم خواردەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخوی لە بەر ماوەی ئەوان شیرەکەی خواردەوە.

ئەمە یەکێکە لە موعجیزەکانی ێغەمبەری خوا ﷺ کە خواردن و خواردنەوە لە بەردەستی پیرۆزیدا بەرەکەتی تێ کەوتووەو زۆر بووە، وە لەو موعجیزە تر، بوونی ئەو پێشەواو سەرکردە بێ وێنەیە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا کە نەبینراوەو نە بیستراوە، ناشبینرێت و ناشبیسرێت، کە سەرکردەی یەکەمی وڵات و گەورەی ئوممەتێك لە گەڵ هەژارترین کەسی ئومەتەکەیدا، لەگەڵ لاوازترین و بێ دەسەڵات ترین کەسی وڵاتەکەیدا دابنیشێ و هەموو ڕۆژێك لە ناویانا بێت، بانگیان بکات بۆ ناو ماڵ و عائیلەی خۆی و بە دەستی خۆی خواردنیان پێشکەش بکات، لە هەمووی گەورەتر لە بەرماوەی ئەوان خۆی تێر بکات و دەمی بخاتە شوێن دەمی ئەوانەوە.

ئەمڕۆ لەو وڵاتانەی کە بە حساب مافی مرۆڤی تیا لە لوتکەدایە، شوێن دابین کراوە بۆ بەساڵاچوان و کەم ئەندامان و بێ کەسان، بەڵام لەناو خانویەکی سادەدا ژیان بەسەر دەبەن ، نەك لەناو پەرلەمانی وڵات دا ، چونکە مزگەوت پەرلەمان و شوێنی دانیشتنی هەموو گەورە پیاوانی وڵات بوو، ئا لەو شوێنە پیرۆزەدا جێگایان بۆ دابین کرابوو، وە لە هیچ شوێنێکی دونیادا نەبووە کە سەرکردەی وڵات بانگی ئەو جۆرە کەسانە بکات و بە دەستی خۆی خواردنیان پێشکەش بکات، کەواتە: ئەوەی ئەمڕۆ پێشکەش بە هەژاران و بە بەساڵا چووان و کەمئەندامان و بێ لانەو ماڵ وحاڵان دەکرێ ، زۆر زۆر کەمترە لەوەی کە کاتی خۆی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و مزگەوت

پێشکەشیان کردووە، وە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام بناغە دانەری ئەم جۆرە خزمەتانە بوون کە پێشتر هەر بیریشی لێ نەکراوەتەوە.

دەبا شانازی بە مزگەوت وبە ئیسلام و بە پێشەوای هەموو پێغەمبەرانەوە حەزرەتی محمد ﷺ بکەین و بزانین و خەڵکیش تێ بگەیەنین کە ئەوەی خزمەتەو پێشکەش بە مرۆڤایەتی بە گشتی و هەژاران و داماوان و بەساڵاچوان بە تایبەتی دەکرێ، هەر بەرهەمی دەستی پێغەمبەری خواو مزگەوتەو داهێنانی ئەوانە.

وە تا ئەمڕۆش مزگەوت تاکە شوێنی بێ لانەکان و بێ دەرەتان و بێ کەس و غەریبەکانە، کە لە گوندەوە تا شار هەر ڕوو دەکەنە مزگەوت و تەنها دەرگای مزگەوت و ماڵی ئەهلی مزگەوت بە ڕویان دا واڵایە .

ئیمانداران: بە پشتیوانی خوای گەورە لە ووتاری داهاتوودا ئەم باسە لەسەر گەورەیی مزگەوت و دەورو ڕۆڵ و کاریگەری مزگەوت و ئەو زوڵمانەی کە ئەمڕۆ لە مزگەوت دەکرێن ، باس و ڕوون دەکەینەوە (ان شاء الله) تا ئەو کاتە هەموو لایەکتان بە خوای بەرزو باڵا دەست ئەسپێرم.

# ووتاری دووەم
# بۆ مانگی شەعبان

# ڕۆڵ و گەورەیی مزگەوت لە ئیسلامدا
## بەشی دووەم

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ على سَيّدنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ أجمَعِينَ:

ئیمانداران: لە ووتاری ڕابردوودا باسی ڕۆڵی مزگەوتمان کرد، کە مزگەوت چ دەورێکی کاریگەری هەبووە و هەیە لە ناو موسوڵماناندا و گەورەترین کاری مزگەوت دروست کردنی ( رجال) مەردان و پاڵەوانان و زانایانە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەو کەسانەمان بۆ دەکات کە مزگەوت پەروەردەی کردون و گەورەی کردوون و پێ ی گەیاندوون و تێی گەیاندوون، دەفەرموێ: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ۝ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ﴾النور ٣٧-٣٨.

بە ڕاستی ئەوەی لە مزگەوتدا پێ نەگاو بە پەیامی مزگەوت گەورە نەبێت، زوو دەخەڵەتێو زوو دونیاو پارەو پوڵ و بازرگانی و کڕین و فرۆشتن لە خوای دوور دەخاتەوەو قیامەتی بیر دەباتەوە، ئینجا کە قیامەت و چاودێری خوای بەسەر خۆیەوە لە بیرکرد، بۆ بەدەست هێنانی سەروەت و سامان، هەموو ڕێگایەکی ناشەرعی و غەش و تەزویرو دەست بڕی و قوڵ بڕی دەگرێتە بەروو سیقەو متمانە لەبازاڕو کڕین و فرۆشتندا نامێنێت، وە ئابووری ووڵات توشی تێك

شكان دەبێت، كەواتە مزگەوت گەورەترین زانكۆو كۆلێجی دەرچوونی كەسانی بواری ئابوورییە، كە دەست پاك و بە ویـژدان و كـار جـوانن، وە مزگەوت پیاوانێك پێ دەگەیەنێت لە بواری سیاسەت و حكـومڕانی وڵاتـدا كـە كاتێـك چـوونە سـەر مێـزی حـوكم و قەڵـەمێك كەوتـە دەستیانەوە، چونكە ڕۆژانە هاتووچۆی مزگەوتیان كردووە، بەردەوام خـوای گـەورەیان لـە بیرە.ئاگایـان لەوەیـە كـە ئەگـەر كەسـیش نـەبێت لێپرسینەوەیان لەگـەڵ بكـات و سـزایان بـدات لەسـەر كەمتەرخـەمی و گەندەڵی و جیاوازی لە نێوان ئەم وئەوو حەق كردنە ناحەق و ناحەق كردنە حەق، خـوای گـەورە خۆی ئاگـای لێیـەتی و قیامـەتێكی داناوە كـە:﴿تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ﴾ بۆیـە ئـەوانیش لـەو ڕۆژەوەو لـەو كاتـە سـامناكەو لـەو حیـسابە تونـدە دەترسـن.﴿يَخَافُونَ يَوْمًا﴾ دەزانن ژیان هەر ئەم چەند ڕۆژە نییە، ئەبێت ڕۆژانێكی تریش هـەبێت كە لە دوای مردنەوە دەست پێ دەكات.

وە كاربەدەست پرسیاری ووردو درشتی حاڵی گەل و میللەتی لـێ دەكرێت، لەبەر ئەوە كاربەدەستێكی دەست پاك دەبێت، بە ویـژدان ئـەبێت، ڕاسـتگۆ ئـەبێت، لەسـەر پارەو پولی میللـەت قەصـرو قـصورو كۆشك و ڤێلاو بازار نابات بە ئاسمانـدا، چونكە ئـەزانێت لـە (قصور) ەوە ئـەبێ بـچێت بـۆ ( قبـور) ڕۆژێـك لـە قەصـر ئـەبێ بچێت و بخرێتـە قەبر، بۆیە لە ترسی ئەو قەبرە بە پـارەی میللەتەكـەی لـە پرێكـا خـۆی ناكـات بـە كوڕێـك، وە كاربەدەسـت كاتێـك لـە مزگـەوت پـەروەردە بـوو،

ڕۆژی پێنج جار لە کۆشکەکەی و فەرمانگەکەیەوە هاتە ناو مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت و جومعە، وە شانبەشانی هاوڵاتیان وەستاو لە یەك ڕیزدا و لە دوای یەك ئیمامەوە نوێژی کرد، ئەوجا چاك تێ ئەگات کە ئەمیش هەر هاوڵاتییەکە وەکو ئەو خەڵکەو ئەوەتا لەگەڵ حەماڵ و کرێکارو دەست قڵشاوو منداڵ و گەنج دا هیچ جیاوازی نییەو دەبێت شان بنێ بە شانی ئەوانەوەو وەکو ئەوان سوژدەو ڕکوع ببات و بڵێ (سُبحانَ ربِّيَ العَظيم)، (سُبحانَ ربِّيَ الأعلـــى)، کەواتە کەس گەورەو بەرز نییە تەنها خوا نەبێت، ئیتر ئەم کە بووەتە کاربەدەستی ئەم میللەتە ئەوە تەنها فەزڵی خوایە بەسەریەوە، ئەگەر دادپەروەر بێت لەگەڵ ژێردەستەکانیدا، خوای گەورە کاتی سەرمێزوو ناو دائیرەو دەسەڵاتەکەشی بە عیبادەت بۆ ئەنوسێت و وەکو لەناو مزگەوت دا بێت وایە، بەڵکو زۆر لەوەش زیاتر، چونکە لە فەرموودەی پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: یەك سەعات لە دادگەری و عەدالەتی کاربەدەست لە شوێنی فەرمانڕەوایەتیدا، خێرو پاداشتی زیاترە لە عیبادەت و نوێژو شەو نوێژو ڕۆژوی سوننەت و زیکرو فیکری کەسێك کە لە شوێنێکدا گۆشەگیرەو کەس نایبینێ و هەر خەریکی عیبادەتی خوای خۆیەتی، بە شەست ساڵ زیاتر. واتە: یەك سەعات دادگەری کاربەدەست خێری زیاترە لە شەست ساڵ عیبادەتی گۆشەگیرێك، واتە هەر یەك دەقیقەی کاربەدەستی عادل و دادگەر بەرامبەر یەك ساڵی خواپەرستی ئەو عابد و گۆشەگیرەیە، جا کاربەدەست کە ئەمە لە مزگەوتا فێر بوو، ئیتر کە گەڕایەوە بۆ ناو

فەرمانگەکەی و شوێنی کارەکەی، بەبێ گومان هەوڵی دادگەری و عەدالەت ئەدات و میللەتیش تەنهاو تەنها لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی دادگەردا ئاسوودە دەبێ و هەناسەی ژیانی مرۆڤانە هەڵدەمژێ، وە تەنها لە مزگەوتدا کاربەدەست چاوی بە میللەت دەکەوێ، وە دەزانێ دەیان و سەدان خەڵك هەیە نانی نییە ئاوی نییە، نەخۆشە، بیمارە، غەمبارە، ئەگەر نەیەتە مزگەوت ئایا لە ڕێگەی پرسگەو سکرتێرەکەیەوە هەژارو بێ کەس دەگاتە لای؟

وە مێژوو شاهیدە کە میللەت تەنها ئەو کاتە سوودی لە کاربەدەست بینی و توانی دەنگی نارەزایی خۆی بگەیەنێتێ و ڕەخنەی لێ بگرێ و مافی خۆی داوا بکات کە کاربەدەست لەناو مزگەوتدا بوو، ئیتر لە دوای ئەوەوە کاربەدەستان ڕۆژ بە ڕۆژ بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان لە ناو کۆشکەکەیان دا، و داماو و هەژاری ناو میللەتیش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئەچێت بەناو زەویداو بەردەوام بۆشایی نێوانیان زیاد دەکات،

بەڵێ ڕۆڵی هەرە گەورەی مزگەوت شوێنی پێگەیاندنی پیاوانی سیاسی و کاربەدەستی دادگەرو دڵسۆزە، بە ئومێدی ئەوەی کاربەدەستانمان جارێکی تر لە جیاتی نادی و عەرەق خانەو قومار خانەو سەیرانگاو باخەکانیان ڕوو بکەنەوە مزگەوت و هەم لەگەڵ خوادا نێوانیان خۆش بکەنەوەو لەگەڵ پەروەردگاردا ئاشت ببنەوە، هەم لەگەڵ ئەو میللەتەش دا کە بە خوێن و بە فرمێسك و بە هەوڵ و

ڕەنجی ئەوان ئەم چووەتە سەر ئەو کورسییەو ئەو پۆستەی بە دەست هێناوە، بەڵام کەی؟! ﴿قُل عَسى أن يَكونَ قَريباً﴾ .

بەڕێزان: دەورو ڕۆڵێکی تری مزگەوت ئەوەیە کە شوێنی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان و دروست کردنی یەکەم خشتی کۆمەڵگایە کە ئەویش خێزانە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : ( إعْلِنُوا هذا النِّكاحَ، وَجعَلُوهُ في المَساجِدِ واضرِبوا عَلَيه بالدُّفوفِ﴾.

واتە: ژن مارەبڕین و ژن هێنان و کچ بە شوودان ئاشکرا بکەن، باهەموو ئەهلی گەڕەك و گوند و شارو شاروچکەکە، هەموو خزم و ناسیاوان بزانن کە وا لە ماڵی فڵان کەس ئاهەنگ و شایی و خۆشییە و ئەو هەموو خەڵکە بۆیە کۆبونەتەوە چونکە فڵان کەس کچە بە حورمەت و بەڕێزو دیندارەکەی خۆی کە بە جوانترین ئەدەب و ئەخلاق پەروەردەی کردووەو ئێستا وەختی شووکردنی هاتووە، وە هاوشانێکی خۆی هاتووە لە دەرگای داون و کۆمەڵێك خەڵکی بەڕێزی هێناوە بۆ خوازبێنی و ئەمانیش کچەکەیان پێشکەش کردووەو ئەوەتا وەکو شوکرانە بژێری خوا کە کچ و کوڕەکەیان گەیشتونەتە ئەم تەمەنەی کە کاتی ژیانی هاوسەرگیری هەردوو لایان هاتووە، هیچ لەکەیەکی کۆمەڵایەتییان توش نەبووەو بە داوێن پاکی ماونەتەوە، وەکو شوکرانە بژێری خوا، ئەوا کەس وکاری هەردوولا ئاهەنگ و شادی شەرعی دەگێڕن و دەف لێدەدەن و سروود ئەڵێن ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:( وَجعَلُوهُ فِي المَساجِدِ). با ئەم شەکراو خواردنەوەیەو ڕاگەیاندنی ئەم شووکردن و ژن هێنانە لە

مزگـەوت دا ئـەنجام بـدرێت. ( فـی المـساجد) هـەر لـەناو حـەرەمی مزگەوتەکەدا، هـەر لـەو شـوێنەدا کـە نوێـژی جومعـەو جەماعـەتی تیا ئەنجام ئەدرێ و خوتبەی تیا ئەخوێنرێتەوە، با هەر لەو شوێنەدا ئەم زەواجە ڕابگەیەنرێ و خەڵکی بۆ کۆ بکرێتەوە.

جـا سـەرنج بـدە ئیمانـداری بـەڕێز ئێمـە ئـەمڕۆ چـۆن دەوری مزگەوتمان کەم کردووەتەوە، ئەوەتا ئەچین لە شوێنی چۆڵدا ژن مارە ئـەبڕین و نایبەینـە مزگـەوت، بـەڵام ئـەوەی شـەرع نـەهی لـێ کـردووە بریتـی یـە لـەوەی کـە تەعزیـە لـە مزگـەوتا دابنرێـت، کەچـی تەعزیـە دەبەینـە مزگەوتـەوە، بـەڵام مەسـیحییەکان ژن و ژن خـوازی لـە کەنیسەدا ئەنجام ئەدەن، بەڵام پرسەو تەعزییەیان نابەنە کەنیسەوە.

بەڵێ ئیماندارن: یەکێکی تر لە دەورو ڕۆڵی مزگەوت لەسەردەمی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بریتـی بـوو لـەوەی کـە مزگـەوت شـوێنی پێـشوازی وەفـدەکان بـوو، هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە وەکـو وەفـد و نوێنەر ڕوویان دەکردە شاری مەدینە، وەکو وەفدی مەسیحییەکان و ئاین و بیروباوەڕەکانی تر، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتا پێشوازی لـێ دەکـردن و گفتوگـۆی لەگـەڵ دەکـردن و هەریەکـەیان دیفـاعی لـە بیروبـاوەڕی خـۆی دەکـرد، کەواتـە مزگـەوت وەکـو سـەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و هۆڵی پەرلەمانی ئەم سەردەمە دەوری بینیوە.

بەڕێزان: دەورو ڕۆڵێکی تری گرنگی مزگەوت بریتـی بـووە لـەوەی کە شوێنی باس و خواستی ئـەدەبی بووە، لـەو کاتانـەی کـە وەختـی نوێـژی جەماعـەت و جومعـە نـەبووە، شـاعیران شـیعریان

خوێندووەتەوە. تەنانەت ئەوانەی کە دژی ئیسلام شیعریان نوسیوە، لە مزگەوتا بە ئەوپەڕی ئازادییەوە شیعرەکانیان خوێندووەتەوەو شاعیرانی موسوڵمان وەکو (حەسان) بە شیعر وەڵامیان داوەتەوەو بیروباوەڕە بە تاڵەکەیان پوچەڵ کردووەتەوە، کەواتە مزگەوت دەوری ئەو بنکە ئەدەبی و ڕۆشنبیریانەی ئێستای بینیوە.

بەڵێ بەڕێزان: بەو شێوەیەی کە لە ووتاری ڕابردوو ئەمڕۆدا باسمان کرد، مزگەوت شەوو ڕۆژ کراوەتەوەو هەرکاتەو هەر ساتەی دەورێکی بینیوە، نەك وەکو ئەمڕۆ کە مزگەوت تەنها بۆ کاتی نوێژ بکرێتەوەو دواتر دابخرێ و تەنانەت کەس بۆی نەبێت قورئانیشی تیا بخوێنێت، جا مزگەوت ئەم ڕۆڵە ئەساسیانەی خۆی لێ سەندرایەوە، بۆیە هەندێ جار لە لای هەندێ بە ناو ڕۆشنبیری فکرە ژەهراوی تانەو تەشەر لە مزگەوت ئەدرێ، تەنانەت جارێکیان لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە کە یەکێك لەو بەناو نووسەرانە وتبووی: مزگەوت چییە؟ تەنها بریتییە لە کۆمەڵێك ئاودەستی بۆگەن! لە وەڵامدا دەبێت بە ئەویش و هاوبیرانیشی بڵێین: مزگەوت ئەوەیە کە باسمان کرد، بەڵام کاتێك مزگەوت لە ژین دابڕا ئاوای لێهات.

ئیمانداران: ئەمڕۆ ئیسلام و بەها ئیسلامییەکان و ڕەمزە ئیسلامییەکان زوڵمیان لێ دەکرێت، جا ئەو زوڵم و ستەمە جاری وا هەیە لەلایەن ناحەزان و دوژمنانی ئیسلامەوە دەکرێ، زۆر جاریش لە لایەن موسوڵمانان خۆیانەوە دەکرێت، یەکێك لە سیماکانی کۆمەڵگای موسوڵمان مزگەوتە کە پشکی شێری بەرکەوتووە لەو زوڵم و

ستەمەدا، جا وەرن با سەرنج بدەین و بزانین ئەو زوڵم و ستەمانەی کە لە مزگەوت دەکرێن چین؟

یەکەم: داخستنی مزگەوت: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا أُولَئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَنْ يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾.

بەڕێزان: با بە ووردی سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان بدەین، دەفەرموێ( ومن أظلم ) ئایا کێ لەو کەسە ستەمکارترو زاڵمترە؟ واتە هیچ کەس لەو کەسە ستەمکارتر نییە کە دژی مزگەوتە، جا دژایەتی مزگەوت بە دوو جۆر، یەکەم:﴿ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ﴾ ئەو ستەمکارەیە کە مزگەوت دروست دەکات و دەیڕازێنێتەوە، یان لانی کەم وەکو بیناکەی نایڕوخێنێ، بەڵام ناهێڵێت ناوی خوای تێدا ببرێت! جا ئەبێت زۆر بە ووردی سەرنجی ئەم تەعبیرە قورئانییە ناوازەیە بدەین، مەنع کردنی ناو هێنانی خوا هەر ئەوە نییە کە دەرگاکەی دابخات و بڵێت نابێت کەس تێیدا ناوی خوا ببات، نەخێر، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە نەهێڵێت لەو مزگەوتەدا شتێك بوترێ، خوتبەیەك پێشکەش بکرێ، لە ئەوەی کە خوا پێی خۆشەو فەرمانی پێ کردووە بوترێ و بە گوێی موسوڵمانان بگەیەنرێت و حەڵاڵ و حەرامێك کە شەرعی خوا دیاری کردووە بۆیان ڕوون بکرێتەوە، یان چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیارییەکان کە ڕۆژانە

ڕووبەڕووی موسوڵمانان دەبێتەوە لەلایەن پێشەواو ووتار خوێنی مزگەوتەوە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چارەسەرەکەی و چۆنیەتی ڕووبەڕوو بونەوەکەی بۆ موسوڵمانان باس بکرێت، بەڵکو داوا لە ووتاربێژ بکرێ کە تەنها هەندێ بابەتی عیبادەتی وەکو دەست نوێژو چوونە سەر ئاوو بۆ خەڵکی باس بکرێ و ئیتر نەگاتە باسی نوێژ نەکردن و سزای نوێژ نەکەران، جا بەم شێوەیە با مزگەوت هەر ڕازاوە بێت، وە بە سەدان کەس نوێژو جومعەی تێدا بکەن، با لە ڕووی ڕوکەشەوە ئاوەدان بێت، بەڵام بە تەعبیری قورئان داخراوەو مەنعی ناوی خوای تێدا کراوە،

دووەم: ﴿وَسَعَى فِي خَرَابِهَا﴾ هەوڵی ڕووخاندن و کاول کردنی دەدات، جا یان بە شۆفلْ لێی ئەدات و بە(TNT) ئەیتەقێنێتەوە وەکو ڕژێمی بەعسی عەفلەقی سۆشیالیزمی کە زیاتر لە چوار هەزار مزگەوتی کوردستانی ڕووخاند و پێش ئەوانیش کۆمۆنیستەکان ئاوایان لە مزگەوتەکانی ڕووسیا کرد، یاخوود هەوڵی کاول کردن و وێران کردنی و چۆڵ کردنی بدرێ بەوەی کە پیس و پەڵۆخ بکرێ و لەبەر بۆنی گۆرەوی نەتوانی نوێژی لێ بکەی، ئەمەش هەر ستەمکارییە و زوڵمە لە مزگەوت، جا ئەو کەسانەی کە ئاوا دژی مزگەوتن، بەردەوام ترس و لەرز لە دڵیاندایە:﴿ أُولَئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَنْ يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ﴾ ئەو زاڵم و ستەمکارانە کە لە هەموو زاڵمێك زاڵمترن چونکە دەیانەوێت ئەو هەموو نوورو بەرەکەت و ڕەحمەتەی سەر زەوی کە مزگەوتەو ماڵی خوا خۆیەتی وێران بکەن، ئەوەندە

زەبوون و ترسنۆك و لەرزۆكن، کاتێك دەچنە سەر مزگەوتێك بۆ وێران کردن و ڕووخاندنی دڵیان پڕە لە ترس و ئەو ترسە بە ڕەنگی زەردو پڕ شەرمەزاریانەوە دیارەو بە ئاشکرا شڵەژاو و پەشێو حاڵن. جا ئەو ستەمکارانە ﴿لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ سەرەنجامیان لە دونیادا سەرشۆڕی و نەدامەتی وماڵوێرانییە، بە چاوی خۆمان بینیومانە، ئەوانەی کە مزگەوتەکانیان داخست و ڕووخاند چۆن بوونە پەندی زەمانەو جرجی ناو زێراب و چۆن ماڵ و کۆشکەکانیان بە شێوەی مزگەوتە وێران کراوەکان وێران بوو، کاول بوو بەسەریان دا، وە چ ڕیسوایی و سەرشۆڕییەك لەوە گەورەترە کە ئەوانەی دوژمنی مزگەوتن و لە وڵاتی موسوڵماناندا دەژین، ڕۆژێك دێت دەمرن و ئەو مزگەوتەی کە هەرگیز بۆ عیبادەت و خواناسی ڕوویان تێ نەکرد، مەگەر بۆ داخستن و وێران کردنی، ئێستا دوای مردنی دەبێت هەر بیهێننەوە بۆ مزگەوت بەڵام بە خەجاڵەتی و چاوشۆڕییەوە، ئەمە لە دونیادا. ﴿وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ وە لە ڕۆژی دوایشدا سزای زۆر گەورەیان بۆ دیاری کراوە، سەرنج بدەن ئەوەندە سزاو عەزابەکەیان قورسە دەفەرموێ: ﴿عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ .

دووەم: زوڵم و ستەم کە لە مزگەوت دەکرێت بریتییە لە: داخستنی حوجرەو خوێندنی فەقێیەتی، وە نەهێشتنی تەدریس لە مزگەوتەکاندا.

سێهەم: پیس کردنی مزگەوت و بۆن ناخۆش کردنی، چونکە بە ڕاستی پاك وخاوێنی و بۆن خۆشی ئەگەر بۆ هەموو شوێنێکی

گشتی پێویستییەکی گەورە بێت، ئەوا بۆ مزگەوت زۆر گەورەترەو بگرە واجبە، دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە دەفەرموێ: ( أَمَرَنَا رَسولُ الله ﷺ، ببناء المَساجِد في الدُّرِر، وَأن تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ) رواه أحمد.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بەوەی کە لە هەموو ئاوەدانییەکدا مزگەوت دروست بکەین، وە بە پاکوخاوێنی ڕایبگرین و بۆنی خۆش بکەین.

بەڵێ جوانی مزگەوت تەنها بە دیکۆرات و شێوازی ئەندازەیی پێشکەوتوو منارەی بەرزو گومەزی ڕازاوە نییە، بەڵکو بە پاکوخاوێنی و بۆنی خۆشەوەیە، هەربۆیە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمان بە بڕواداران دەکات کە لەکاتی چوونیان بۆ مزگەوت، جوانترین جل وبەرگ بپۆشن و خۆیان بۆن خۆش بکەن و شێوەی ڕوخسارو قژیان بە جوانترین شێوە ڕێك بخەن، کە دەفەرموێ: ﴿ يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ بەڵام بەداخەوە زۆرجار دەبینین خەڵکی نوێژخوێن و ئەهلی جەماعەت بە جلی زۆر شڕو بۆن عەرەقاوی و گۆرەوی پیس و چڵکنەوە دێن بۆ مزگەوت و ماڵی خوا ناشیرین دەکەن و موسوڵمانان ئازار ئەدەن، زۆرن ئەو موسوڵمانانەی کە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەفتار دەکەن و سیرو پیاز دەخۆن و ئەمجا دێن بۆ مزگەوت و لە جیاتی بۆنی عەترو گوڵاو ئەو بۆنە ناخۆشەی سیروپیاز دەبەن بۆ مزگەوت ( سبحان الله)

زانایانی ئەم ئیسلامە شتی وایان فەرمووە کە زۆربەی موسوڵمانان هەتا ئێستاش لێی بێ ئاگان .

(شێخ محمدالغزالی) لە (الخطب المنریة) کەیدا دەفەرموێت: زانایان فەرموویانە:( وتسقط صَلاةُ الجَماعَة بإتِفاق الفُقَهاء عَمَّن كانَ مَرِيضاً بِفَمِهِ تَصدُرُ مِنهُ رائِحَةٌ كَرِيهَــةٌ﴾ واتە: بە تێکڕای دەنگی زانایانی شەرعزان، هەر کەسێك نەخۆشی ناو دەمی هەبێت، وەکو نەخۆشی لە ددانەکانی دا، یان پوکەکانی، یاخود لە لیکە ڕژێنەکانی دا و بە هۆیەوە بۆنی ناخۆش لە دەمی بێ و بێتە مایەی ئازاردانی خەڵکی دەوروبەری ئەوە پێویستە بە زووترین کات چارەسەری بکات و ئەمجا بچێ بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، وە ئەگەر پزیشکی پسپۆڕ پێی ووت چارەسەری ئەو بۆنە ناخۆشەی دەمت نییە ، ئەوە لەو کاتەوە دەبێت واز لە چوون بۆ مزگەوت بهێنێ و نوێژی جەماعەتی لەسەر نابێ و بە نەچوون بۆ نوێژی جەماعەت گوناهبار نابێ و ئەم بۆنی ناو دەمە یەکێکە لە و هۆیانەی کە نوێژی جەماعەت لەسەر خاوەنەکەی لادەبات.

بەڕێزان: پاکوخاوێنی ناو مزگەوت ئەوەندە گرنگی پێ دراوە، کە لە شەرعدا دەفەرموێت: نابێت لەناو سنووری مزگەوتدا، لە ناو حەوشەکەشی دا، تف و بەڵغەم فڕێ بدەی، خۆ ئەگەر ناچار بووی دەبێت دوای فڕێدانی قاچی بخەیتە سەرو قاچی لێ بخشێنی تاوەکو دەیسڕیتەوە، بۆ ئەوەی کەسێك چاوی پێ نەکەوێت و بێز بکاتەوەو

توشی ئازار ببێت، کەواتە: هەر شتێك ئازاری مرۆۋ بدات نابێت لەناو مزگەوتدا ئەنجام بدرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو سەردەمەی خۆی دا کە خەڵکی نەیان ئەزانی پاکوخاوێنی چییە، ئەم شارستانییەتی و پاکوخاوێنییەی بە موسوڵمانان ڕاگەیاندو فێری ئەوەی کردن کە تف و بەڵغەم ڕۆکردن لەناو سنووری مزگەوتدا بە گوناه و تاوان حیسابەو کەفارەتەکەشی ئەوەیە کە بیشاریتەوە بەوەی خۆڵی بەسەردا بکەی یان بە پێڵاوەکانت بیسڕیتەوە و شوێنەواری نەهێڵی، وەك و دەفەرموێ: ( البُصاقُ في المَسجدِ خَطِيئَةٌ وَ كَفارَتُها دَفنُها) رواه البُخاري وَ مسلم.

بەڕێزان: بەڕاستی دەبێت هەمووومان خزمەتکاری مزگەوت بین، وانەزانین پاککردنەوەی مزگەوت هەر ئیشی خادمی مزگەوتە، چونکە هەمووومان پێویستمان بەوە هەیە کە چاکە بە دەست بهێنین، پێغەمبەری خۆشەویست موژدەمان ئەداتێ و ئەفەرموێ: ( عُرِضَت عَلَيَّ أُجُورُ أُمَّتي حَتَّى القَذاةُ يُخرِجُها الرَّجُلُ مِنَ المَسجِدِ) رواه أبو داود.

واتە: چاکەو ئەجرو پاداشتی ئوممەتەکەم خرایە بەرچاوم، تەنانەت چاوم پێ کەوت کە یەکێك لە چاکەکان ئەوەیە کە موسوڵمانێك پیسییەکی لەناو مزگەوت بەرچاو کەوتووەو هەڵی گرتووە و فڕێی داوەتە دەرەوەی مزگەوت ، وە هەروەکو پیاوان دەبنە خزمەتگوزاری مزگەوت، بە هەمان شێوە ئافرەتانیش بۆیان هەیە بەژداری بکەن لە پاککردنەوەی مزگەوتدا، لەم بارەیەوە هاوەڵی

بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو هورەیرە فەرموودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:( أَنَّ إمرَأَةً سَوداءَ كانَت تَقُمُّ المَسجِدَ. فَفَقَدَها رَسولَ الله ﷺ فَسَأل عَنها بَعدَ أيَّامٍ فَقيلَ لَهُ: إنَّها ماتَت، فَقالَ: فَهَلا آذَنتُمُوني، فَأَتى قَبرَها فَصَلَّى عَلَيها ) رواهُ البُخاري وَ مُسلِم.

واتە: ئافرەتێکی هەژاری ڕەش پێست، ئافرەتێکی گومناوی بێ کەس، زۆر خزمەتی مزگەوتی دەکردو بەردەوام خەریکی ماڵین و پاککردنەوەی بوو، کەچی ماوەیەك پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو جاران ئەم ئافرەتەی نەئەهاتە بەرچاو ئەوە بوو کە چەند ڕۆژێك دیار نەبوو، پێغەمبەری خەمخۆری هەموو کەس بە گشتی و هەژارو بێ کەس و بێ ناوەکان بە تایبەتی لەم ئافرەتەی پرسی و بە هاوەڵانی فەرموو: ئەرێ ئەو فلان ئافرەتەی کە زۆر خەریکی خزمەتی مزگەوت بوو نایبینم، باشە ئەبێت بۆ دیار نەبێت؟ عەرزیان کرد: کۆچی دوایی کردوو مرد!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی باشە بۆچی ئاگادارتان نەکردم بۆ ئەوەی بەژداری بەخاك سپاردنی بکەم و نوێژی مردووی لەسەر بکەم؟ ئەمجا لەگەڵ صەحابەکان بەرەو گۆڕەکەی بە ڕێکەوتن و نوێژی مردووی لەسەر کرد، چونکە هەر کەسێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مردووی لەسەر بکات ئەبێتە هۆی هەڵوەرینی گوناهەکانی و ڕەحمەتی خوای بەسەردا ئەبارێت.﴿ إنَّ صَلاتَكَ سَكَنٌ لَهُم﴾.

لەم فەرموودەیەوە تێدەگەین کە ئافرەتانیش وەکو پیاوان شەرەفی خزمەتکردنی مزگەوتیان پێ براوە، وە ئەوانەی کە خزمەتی مزگەوت

دەکەن دەبێت ڕێزیان لێ بگیرێت، دەبێت سەرکردەی وڵات ئاوا هەواڵی خزمەتکاران بپرسێ و ڕێز لە هەوڵ و ماندوو بوونیان بگرێت، بەڵام ئەوە تەنهاو تەنها پێغەمبەری خوایە ﷺ کە ئافرەتێکی ڕەش پێستی گومناو بەڵام بە کردەوە دیار، بەڵام خزمەتکاری گەورەترین شوێنی سەر زەوی کە مزگەوتە، لە بیرناکاو هەرچەند ڕۆژێك دیار نەبێت هەواڵی دەپرسێت و کە ئەزانێت وەفاتی کردووە خۆزگە ئەخوازێت کە ئامادەی ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردنی بوایە، دواتر ئەچێتە سەر گۆڕەکەی و دووعای خێری زۆر بۆ ئەکات و دواتریش نوێژی جەنازەی لەسەر دەکات.

٤ چوارەم: ستەمێکی تر کە لە مزگەوت ئەکرێت ئەوەیە کە بانگەواز بۆ شتی وون بووی تیا ئەکرێت، لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إذا رَأيتم مَنْ يَبيعُ أو يَبتاعُ في المَسجِدِ فقولوا: لا أربَحَ الله تِجارَتَكَ، وَإذا رَأيتم مَن يَنشُدُ ضالَّةً فَقُولُوا: لا رَدَّها الله عَلَيك) رواه الترمذي وقال حَديث حَسَن صَحيح.

واتە: ئەگەر کەسێکتان بینی لەناو مزگەوتدا کڕین وفرۆشتنی ئەکرد ئەوا پێی بڵێن: یاخوا بازرگانی و کڕین وفرۆشتنەکەت قەت خێر نەکات، وە ئەگەر بینیتان کەسێك لە ناو مزگەوتدا بانگەواز بۆ شتی وون بوو دەکات، ئەوا بڵێن یاخوا هەرگیز نەیدۆزێتەوە.

پێشەوا موسلیم لە صەحیحەکەی دا ڕیوایەتی کردووە کە: ( أنَّ رَجلاً نَشَد في المَسجدِ فقالَ: مَن دعا لي الجَمَلَ الأحمَرَ، فَقالَ رَسولَ الله ﷺ: لا وَجَدْتَ إنَّما بُنيَتِ المَساجدُ لِما بُنيَت لَهُ).

واتە: کەسێك لەناو مزگەوتدا دەنگی لێ هەڵبڕی و بانگەوازی دەکردو ووتی: کێ ووشترە سوورەکەم بۆ دەگرێتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئای هەر نەیدۆزیتەوە، ئایا تۆ نازانی کە مزگەوت بۆ خواپەرستی و تاعەت و عیبادەت درووست کراوە، نەك بۆ ئەم بانگەواز کردنە بۆ حوشترو مەڕوماڵات ، بە داخەوە لەم ڕۆژگارەدا ڕۆژانە چەند بانگەواز بۆ شتی بزر بوو لە مزگەوتدا دەکرێت!.

پێنجەم زوڵم وستەم کە لە مزگەوت دەکرێت بریتی یە لەوەی کە: قسەی دونیایی تێدا دەکرێت لە جیاتی زیکرویادی خوای گەورە و دەورو دەرس و کۆڕی ئامۆژگاری.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ( لا تَقُومُ الساعَةُ حَتى يَتَباهَى النّاسُ بالمَساجِد، ثُمَّ لا يعمُرُونَها إلاّ قَليلاً ) رواه أحمَد.

واتە: قیامەت نایەت هەتاوەکو ئەو کاتەی کە خەڵکی شانازی دەکەن بە درووست کردنی مزگەوتەوە، بەڵام بەکەمی نەبێت بەیادی خواو عیبادەت ئاوەدانی ناکەنەوە.

بەڵێ بەڕاستی ئەی پێشەوامان ڕاستت فەرموو، ئەمڕۆ ئەم نیشانەیەی هاتنی ڕۆژی دوایی بە چاوی خۆمان دەبینین، دەیان مزگەوت لە گوندو شاروچکەکان دا هەیە، نە نوێژی جومعە نە

جەماعـەتی تیـا ناکرێـت، لەبـەر تـەپ و تـۆز نـاتوانتی سـوژدەی تیـا ببەی، خەڵکەکەی تەنها بۆ تاعزیە خانە بەکاری دەهێنن، لەوکاتەشدا زۆربەی ئەوانەی تیایدا دائەنیشن نوێژ نەکەرن!!

هەزار ڕەحمەت لە ئیمامی عەلی بێت کە فەرموویەتی:( يَأتِي عَلَـى النَّاسِ زمانٌ لا يَبقَى مِنَ الإسلامِ إلاّ إِسـمُهُ، وَلا مِـنَ القُـرآنِ إلاّ رسمهُ، يَعمُرُونَ مَساجِدَهُم وَهيَ خَرابٌ مِن ذِكرِ اللهِ تَعالى).

واتـە : سـەردەم و زەمانێـك بەسـەر خەڵكیـدا دێـت كـە ئیسلامەتی تەنها هەر ناوەكەی ماوەو هیچ حوكم و كارپێكردنێكی لە دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتیـدا نامێنێـت، قورئـانی پـیرۆز تـەنها لـە چوارچێوەی ( موصحەف) ێكدا ماوەتـەوەو ئـەو هـەموو یاسایەی نـاوی كـە تـەواوی ژیانی مرۆڤی تێدا باس كراوە لە هـەموو ڕویەكـەوە، هیـچی كـاری پـێ ناكرێ و قورئان لەبەرگەوە دەپێچرێ و لە تاقی مزگەوت و ماڵەكان دا تۆزی لەسەر دەنیشێت، لەم سەردەم و زەمانەدا خەڵكی دەست دەكەن بـە درووسـت كردنـی مزگـەوت و جـوان كـردن و ڕازاندنـەوەی بـە جوانترین دیـزاین و دیكـۆرات، بـەڵام وێرانـە لـە یـادی خـواداو یـادی خوای تێدا ناكرێت.

- شەشەم: زوڵم و ستەم كە لە مزگەوت دەكرێت: ئەوەیە كە تـاعزێ و پرسـە لـەناو مزگـەوت دا بـەڕێوە بـچێت، بـەڵام ژن مـارەبڕین لـە دەرەوەی مزگەوتـدا و لـە مـاڵێكی چۆڵدا ئەنجام ئەدرێت، لە كاتێكدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ژن مـارەبڕین لـە مزگـەوت دا ئـەنجام بـدەن، وە هـەموو زانایـانی شـەرعزان لەسـەر ئـەوە یـەك دەنگـن كـە

دانیشتن بۆ تاعزییە مەکروهە، وە لە مزگەوتدا حەرامە، کەچی ئێمە هەردووکیان بە پێچەوانەوە ئەنجام ئەدەین، بەڵام مەسیحییەکان ژن لە کەنیسەدا مارە ئەبڕن و تاعزییە لە کەنیسەدا دانانێن، بە داخەوە ئەبوایە ئێمەی موسوڵمان کە مزگەوتمان نیشانەی زیندویەتییە، لە جیاتی بکرایە بە شوێنی تەعزییەو پرسەو هۆڵی پرسەی تێدا درووست بکرایە، ئەبوایە لە جیاتی ئەوە هۆڵی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتمان بۆ لاوەکانمان لە مزگەوتدا دابنایە.

بەڵام ئیمانداران : لەگەڵ ئەو هەموو زوڵمەش کە لە مزگەوت دەکرێت ، کەچی مزگەوت هەر دەوری کاریگەری خۆی هەیە ، ئەوەتا:

١. بەهۆی ئاوەدانی مزگەوتەکان و ئەو هەموو دەستە بە دەست نوێژو دەم بە دوعاو نزاو پاڕانەوانەیە کە خوای گەورە پەیتا پەیتا ڕەحمی خۆی دەبارێنێ بەسەرمانداو غەزەبمان لێ ناگرێ، ئەگینا کە ئەم وڵاتە ئاوەدانە هی عەرەق خانەو قومار خانەو سەرخۆش و مێشك بۆش و قەڵەم فرۆشانەوە نییە.

٢. هێشتا مزگەوت ڕۆژانە کوڕ وکچی گەنجی پاك، وەکو فریشتە پاك و ئەمین و بەڕێز، پێدەگەیەنێ ، تەحەددا ئەکەم گەنجێکی پەروەردە کراوی مزگەوت زەرەری بۆ ماڵێك، کەسایەتییەك، حورمەتی ئافرەتێك، بازاڕودوکانێك، بۆ ئاسایشی وڵات و حکومەت بوبێت، هەموو ئەوانەی کە دەبنە مایەی شێواندنی ئاسایشی وڵات و ئارامی هاوڵاتییان، دزو گیرفان بڕی ماڵان و بازارەکان، ئەوانەن کە لە مزگەوت دوورن و ئەهلی باڕو عەرەق خانەو شوێنە پیس و بەدەکانن.

٣. مزگەوت تاکە ڕەمزی بەزەیی و سۆزە، تەماشاکە هەژارو نەدار، نەخۆش و بیمار، گرفتارو بێکەس وکار، هەر ڕوو لە مزگەوت و ئەهلی مزگەوت دەکەن، تەنانەت سەرنج بدەن زیناکار کە منالّی زینا فڕێ ئەدات، ناچێت لەبەردەم نادی و سینەماو قومار خانەیەکدا فڕێی بدات، بەڵکو ئەچێت لەبەردەم مزگەوت منالّەکە دادەنێت، چونکە ئەویش ئەزانێت کە ئەهلی مزگەوت خاوەن بەزەیی و سۆزن و ئەو منداڵە لای ئەوان نافەوتێت.

لە کۆتایدا ئومێدەوارم ئەوەی کە بیستمان دەربارەی مزگەوت، بەکردەوە جێ بەجێی بکەین و مافی مزگەوت بدەین و خۆمان بپارێزین لە زوڵم کردن لە مزگەوت، تا ووتاری داهاتوو هەموو لایەکتان بە خوای گەورە ئەسپێرم.

# سەرچاوەکان :-


١. قورئانی پیرۆز .

٢. الترغيب والترهيب للحافظ المنذری

٣. أحياء علوم الدين ج١ ص ٢٤٤

٤. خطب الشيخ محمد الغزالی ج١ ص٢٦ ،ص٣٤

الحَمدُ لِلـهِ رَبِّ العـالَمين. وَ الـصَّلاةُ وَ الـسَلامُ علـى سَيِّدنا مُحَمَّد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ اجمَعينَ:

ئیمانـدارانی بـەڕێز: لـە ژیانـدا هـیچ کەسـێك نییـە بتوانێـت بـەبێ هاوەڵ و برادەرو دۆست و نزیك بژیت و کاروبارەکانی ژیـانی بـەڕێوە ببات، مرۆڤ هەر خۆی لە ناخی خۆی دا، خـوای گـەورە وای درووسـت کـردووە کـە حـەزی بـە تێکـەڵی نـاو کـۆڕو کۆمەڵـەو حـەز لـە ژیـانی تەنهایی ناکات، جا ئاینی ئیسلام کە هیچ ڕێگایەکی خێروو خۆشی نەماوە کە دەستی مرۆڤی نەگرتبێ بۆی و هیچ خراپەو شەڕێکیش کە ژیان دەکات بە ژان، باسـی کـردووەو فەرموویـەتی دەبێـت مـرۆڤ خـۆی لێ بپارێزێت، یەکێك لەو شتانە کە هەم مایەی بەختەوەرییـە بـۆ مـرۆڤ هەم مایەی بەدبەختییەو ئەبێتە هۆی سـەرگەردانی و مـاڵوێرانی مـرۆڤ بریتییـە لـە بـرادەرو هـاوڕێ، جـا پێغەمبـەری خۆشەویـستمان ﷺ لـە فـــەرموودەی گەوهـــەربارو (جوامـــع الکلـــم) ی خـــۆی دا بـــە چـــەند ووشەیەکی کورت و پڕمانا وەڵامی پرسیاری نـاو نـاخی تـۆی بـڕوادار ئەداتەوە، کاتێك بیر لەوە دەکەیتەوە: باشە چەند کەس بەهۆی هاوڕێ و بـرادەرەوە توشـی سـەرگەردانی و مـاڵوێرانی بـوون، تووشـی لەکـەی کۆمەڵایـەتی بـوون، تووشـی ئابڕوچـوون و حـەیاو شـەرەف لـە دەسـت دان بوون، باشە ئەی پێغەمبـەری پێشەوام مـن هاوڕێیـەتی کـێ بکـەم ؟ ئەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕێگـە بـە کـێ بـدەم بێتـە مـاڵم و نـانم بخـوا و بـچمە مـاڵی و نـانی بخـۆم؟ پێغەمبـەری دڵسۆز، دڵسۆزتر لـە خۆمـان بۆخۆمان وەڵاممان دەداتـەوەو دەفـەرموێت:( لا تُصاحِب إلاّ مؤمِنـــاً،

وَلا يَأكُل طَعامَكَ إلاّ تَقِي) حَديث صَحيح- رواه أحمَد وَصَحَحَهُ الألباني.

ئیمانداری بەڕێز: سەرنجی فەرموودەکە بدە فەرموویەتی( لا تصاحب) نەیفەرمووە ( لا تصاحبوا ) کەواتە: لەگەڵ هەر یەك لە ئێمەیەتی و دەفەرموێ: ئەی ئیماندار ئاگادارو هۆشیار بە هاوڕێیەتی کەسێك مەکە کە ئیماندار نەبێت، وە با کەس لە ماڵ و سەر سفرەو خۆراکت نەخوات کە لە خوا ناترسێت.

بەڕێزان: (إلاّ) بۆ حەصرو قەصرە، (مؤمن ، تقي) واتە: ئەوەی بە کەڵکی هاوڕێیەتی و برادەرایەتی دێت و دەبێتە مایەی خێرو خۆشی و ڕێنمایی حەق و فریاد ڕەسی ڕۆژی تەنگانەو سەختی، ئەو کەسەی کە بەکەڵکی ئەوە دێت متمانەی پێ بکەیت و بیهێنیتە ناو ماڵ و منداڵت و لەسەر سفرەو خواردنت دانیشێوو پاشان نانت نەدڕێنێت و خیانەتت پێ نەکات ، دەبێت دوو سیفەتی تێدا بێت، یەکەم: بڕوادار بێت، دووەم: موتتەقی و لە خوا ترس بێت.

ئیمانداران: ئەوانەی کە لە دونیاداو لەبەر خاتری خواو لەسەر دینی پاکی ئیسلام یەکتریان خۆش ویستووە و دۆست و هاوڕێی دڵسۆزو ڕاستەقینەی یەکتری بوون، ڕۆژێك لە ڕۆژان خیانەتیان بە یەکتری نەکردووەو بە چاوی برایەتییەوە تەماشای یەکتریان کردووە، ئەوانە لە بەهەشتیش دا ئەو دۆستایەتی و برایەتییەیان هەر بەردەوام دەبێت، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴾. الحجر ٤٥–٤٨

واتە: بەڕاستی خواناس و پارێزکاران لە ناو باخەکانی بەهەشت و کانیاوە سازگارەکاندان، پێیان دەوترێت: فەرموون بچنە ناوی بەسەلامەتی و سەلامەتان لەسەر بێت، ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی تیادا بەرنە سەر، لە کاتێکدا هەرچی کینەو بوغزە لە دڵ و دەرونیاندا دەرمان کێشاو ئەو بەختەوەرانە برای یەکترن و لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان لە بەرامبەر یەکەوە دانیشتوون، ( لەبەیەك گەشتنەوەیەکی پڕ سۆزو خۆشەویستی دا تەماشای یەکتر دەکەن و سەلام لە یەکتری دەکەن و سوپاس و ستایشی پەروەردگار دەکەن، هیچ جۆرە بێتاقەتی و بێزاری و پەستییەك دووچاریان نابێت و هیچ کات ئەوان لەو بەهەشتە دەرناکرێن).

ئیمانداران: هەروەکو پێویستە مرۆڤی بڕوادار لەگەڵ چاکان و پاکان و خواناسان دا هاوڕێ و برادەر بێت، بەهەمان شێوە دەبێت خۆشی بپارێزێت لە هاوەڵی و هاوکۆڕی و دانیشتن لەگەڵ ئەوانەدا کە خوا نەناسن، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە کاتی دانیشتنەکانیان دا دەست دەکەن بە قسە وتن بە خواو پێغەمبەرو قورئانی پیرۆز و تانەو تەشەر لە موسوڵمانان دەدەن،لە تەفسیری پێشەوا: (الطبری) ج١ ص٤٣٧ دا دەفەرموێ: لەسەردەمی مەککەدا: موشریکەکان کاتێ

دادەنیشتن و دەیانزانی وا موسوڵمانێکیان لەناو دایە، دەستیان دەکرد بە قسە وتن بە پێغەمبەری خواو قورئانی پیرۆزو جوێن و قسەی ناشیرینیان پێ دەگوتن و گاڵتەیان بە پێغەمبەرو قورئانی پیرۆز دەکرد، جا خوای گەورە ئایەتی ژمارە ٦٨ی سورەتی (الأنعام) ی ناردە خوارەوەو ئیماندارانی ئاگادار کردەوەو کە نەکەن بچن لەگەڵ ئەو موشریکانە دانیشن و هاوکۆڕیان بن، هەتاوەکو قسەوباسی مەجلیسەکەیان دەگۆڕن بۆ بابەت و مەوزوعێکی تر کە گاڵتە کردن و سوکایەتی پێکردنی بۆ پێغەمبەری خواو قورئانی تێدا نەبێ، هەروەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾الأنعام ٦٨.

واتە: کاتێك ئەو موشریك و کافرانەت بینی کە دەم لە ئایەتەکانی ئێوە دەدەن و ( گاڵتەو سوکایەتی بە قورئانی پیرۆز دەکەن و بە درۆی دەزانن) ئەوە تۆ پشتیان تێ بکەو کۆڕو کۆبونەوەیان جێ بهێڵە هەتا ئەو کاتەی دەچنە ناو باسێکی ترەوەو واز دێنن لە گاڵتەکردن بە قورئان، کاتێکیش ئەگەر شەیتان لە بیری بردیتەوە کە دوور بکەویتەوە لێیان، جا دوای ئەوەی کە بیرت هاتەوە لەگەڵ قەومی ستەمکاران دامەنیشە.

بەڕێزان: ئەم قورئانە پیرۆزە هەر بەسەرهات و باسێکی زەمانی پێغەمبەر ﷺ لە قورئان دا تۆمار دەکات و هەتا قیامەت موسوڵمانان

دەیخوێننەوە، ئەوە دەبێ بزانین و وا لە قورئان بگەین کە ئەم باسانە حیکایەت و سەر گوزەشتە نین، بەڵکو مەبەستی قورئان ئەوەیە کە ئەم باس و بابەتانە دووبارە دەبنەوە لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا و هەتا قیامەت ئەو کۆڕو کۆمەڵانە هەر دەمێنن کە بەیەکەوە دادەنیشن و هەدەف و ئامانجیان تەنهاو تەنها گاڵتەکردن و تانەدانە لە پێغەمبەری خواو ئایەتەکانی قورئان و موسوڵمانان.

جا ئەمە بە پێی پێشکەوتنی سەردەم و گۆڕانکاری لە شێوەو شوێنی دانیشتنەکاندا، شێوازی کافرەکانیش دەگۆڕێ و ئەگەر جاران لە (دارالندوة) و بەربەڕۆچکەو پەنا دیوارێکدا دادەنیشتن، ئێستا لەناو بینای چەند قات و موئەسەس دادەنیشن و ڕێکخراوی بۆ درووست دەکرێ و گۆڤارو ڕۆژنامەی بۆ دەردەکرێ و تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و چاپەمەنی لە خزمەتدایەو دەیان و سەدان کەس نانی لەسەر دەخۆن و هەریەکەیان بە شێوەیەك و لە لایەکەوە پەلاماری نورو ڕووناکی پێغەمبەری خوا ئەدەن و قورئانەکەی خوا بە درۆ دەزانن و بە کۆنە پەرستی ناوی دەبەن و بە ئاشکرا هاوار دەکەن ( ئەم شەریعەتی ئیسلامە کۆن بووەو بە کەڵکی ئەم سەردەمە نەماوە) وە موسوڵمانان و دینداران بە کۆنە پەرست و کۆنە ویست دەزانن و ناو دەبەن)

جا خوای گەورە دەفەرموێت، نابێت تۆی ئیماندار لەگەڵیان دابنیشی و گوێیان بۆ شل بکەی، جا ئەمڕۆ وەکو ووتمان دانیشتنەکان شێوەو جێگایان گۆڕاوە، کەواتە بەشداری کردنیان و

گوێ لێ گرتنیشیان شێوەکەی گۆڕاوەو ئەمڕۆ دەبێ ئایەتەکەی خوا ﴿فأعرض عنهم﴾ جێبەجێ بکەی کە لە سەتەلایتەکەت دا ئەو کەناڵە دژ بە ئیسلام و پێغەمبەری خوایانە ڕەش بکەیتەوە، وە لە تەلەفزیون دا بیگۆڕی و گوێی بۆ نەگری، وە لە ڕادیۆدا کە گوێبیستی دەنگی ناسازیان بووی خێرا بیکوژێنیتەوە یان بیگۆڕیت بۆ بابەتێکی ترو بەرنامەیەکی تر، وە ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە هەموو بابەتەکانیان لە ئەلفەوە تا یای بریتی یە لە سوکایەتی کردن بە ئیسلام و ئەخلاق و ڕەوشتی موسوڵمانانەو چەواشەکردنی موسوڵمانان و کارکردن بۆ ئەوەی خەڵکی بەتایبەت گەنج ولاوەکان، گوناه و تاوانیان بەلاوە ببێتە شتێکی سادەو تەنانەت بێ فەرمانی خواو پێغەمبەرو ئایەتی قورئان بە پێشکەوتن و مۆدێل و مۆدێرنە ناو دەبەن ، ئەوە واجبە کە تۆی موسوڵمان ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانە نەکڕیت و نەخوێنیتەوەو بازاڕی بۆ گەرم نەکەی، مەگەر بۆ ئاگادار بوون لە نیەتی پیسیان و بە درۆ خستنەوەیان بیخوێنیتەوە و پاشان بیفەوتێنی و ڕیکلامی بۆ نەکەیت و بە کەسانی تری نەناسێنی.

وە ئەمڕۆ چەندین سەنتەرو ڕێکخراو هەن بەناوی جۆراو جۆرو لە ژێر ناوی جۆراو جۆردا کە تەنها ئامانجیان ئەوەیە کە گەنج و لاوەکان لاڕێ بکەن و ڕەشیان لێ بکەن بەسپی و بۆگەنیان لێ بکەن بە بۆنی خۆش، لەم کاتەشدا تۆی ئیماندار بەوە﴿ فأعرض عنهم﴾ جێبەجێ دەکەیت کە ئاگات لە کوڕوکچەکەت بێت و نەهێڵی ئەو گورگانەی کە لە پێستی مەڕدان بیانخەڵەتێنن و فریویان بدەن و دین و ئیمان و

ئەخلاقەکەیان لیٚ بدزن، چونکە ئەگەر ئاگاداریان ئەکەی کە ئاگایان لە خۆیان بێت و دز زەفەریان پیٚ نەبات و پارەو سەیارەکەیان لیٚ نەدزن، دەبیٚ سەد ئەوەندە ئاگاداریان بکەی کە ئاگاداری خۆیان بن و ئیمان و ئەخلاقەکەیان لیٚ نەدزرێت.

ئیمانداران: قورئانی پیرۆز کاتێک ئامۆژگاریمان دەکات کە هاودەمی و هاوکۆڕی لەگەڵ خوانەناسان نەکەین ، چونکە مرۆۆ بە فیترەت وا هەڵکەوتووە کە لەگەڵ هەر جۆرە کەسانێکدا هەڵسوکەوت بکات، سەرەنجام ناچار دەبێت بەبیٚ ئەوەی بە خۆی بزانێت هەڵسوکەوت و ڕەفتارو ڕەوشتی ئەوان دووبارە دەکاتەوەو ڕەوشتی وەکو ڕەوشتی ئەوانی لیٚ دێت.

هەر بۆیە لە قورئاندا لە سورەتی (الکهف) دا ئایەتی ٢٨ دا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تێکەڵاو بوون و هاودەم بوون، سەرەنجام گوێڕایەڵی لیٚ پەیدا دەبێت.﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ ﴾.

**خۆشەویستان هاوڕیٚ چەند جۆرێکی هەیە:**

یەکەم: برادەری وا هەیە وەکو نان وئاو وایە ناتوانی بەبیٚ ئەو بژیت.

٢ دووەم: برادەری وا هەیە وەکو دەرمانە، هەندێ جار پێویستت پێی دەبێت لەکاتی توش بوون بە ناخۆشی و ئازارو ئاستەنگەکانی ژیان.

٣ سێهەم: هاودەم وهاوکۆڕی وا هەیە وەکو دەردو میکرۆبە، نەك هەر پێویستیت پێی نییە بەڵکو دەبێت خۆشتی لێ بپارێزی و لێی دوور بکەویتەوە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢٥﴾ .الانفال ٢٥.

یاخود دەفەرموێت:﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾.هود ١١٣.

شێخی بەیضاوی ئەفەرموێت:( الرُكونَ هوَ المَيلُ اليَسير) کەواتە: کەمترین مەیل وسۆز نواندن و نزیك بونەوە لە دژبەدینان و زاڵمان و هاتوچۆ کردنیان و برادەرایەتیان توشی ئەو سزایەت ئەکات کە زاڵمەکەو بێ دینەکە توشی دەبنن، با تۆش کەسێکی پاکو چاك بیت و دیندارو خواناس بیت، هەر بە ئەوەندەی کە دەبیت بە دۆست و هاوڕێی خراپەکارو خوانەناسان، خوای گەورە هەمان حیسابیش بۆ تۆ دەکات. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ( المَرءُ مَعَ مَن أَحَبَ) مرۆۆ لەگەڵ ئەو کەسەدا دەبێت کە خۆشی دەوێت، بێگومان هاوڕێیەتیش لە ئەنجامی خۆشەویستییەوە دروست ئەبێت، بەڵام

ئەبێت ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە جاری وا هەیە کەسێکی بێ دین و خراپەکار بەهۆی کارو پیشەکەتەوە، بەهۆی دەسەڵات و پلەو پایەکەتەوە، لێك نزیك بونەوەیەك لە نێوان تۆو ئەودا ڕوو ئەدات و ناچاری بۆ ئەوەی لە شەڕو بەڵای بە دوور بیت و گێچەڵت پێ نەکات، مەرحەباییەکی بکەیت، ئەمە لەم کاتەدا مادام بەدڵ ڕقت لە خۆی و بیروباوەڕەکەیەتی بەڵام بۆ خۆپاراستن ئەو کارە دەکەی، ئەوە ( ان شاء الله) بەر ئەو هەڕەشە قورئانیە ناکەوی، ئەمەش قسەو فەرمایشتی ئیمامی (قرطبی) یە لە تەفسیرەکەی دا بەرگی٩ لاپەڕە ١٠٨ لە تەفسیری سوڕەتی هود ئایەتی ١١٣ کە دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾.

بەڵێ ئیمانداران: چۆن میکرۆبی نەخۆشی لە یەکێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ یەکێکی تر بەهۆی نزیك بونەوە لێی و تەوقە لەگەڵ کردنی و نان خواردن لەگەڵی و تەنانەت میکرۆبی واهەیە، هەر لەو هەوایەی ئەو شوێنەدا هەناسە وەردەگری کە ئەو نەخۆشە هەناسەی تێدا ئەدات، تۆش بەبێ ئەوەی هەست بە خۆت بکەی هەمان ڤایرۆسی ئەو نەخۆشییە هەڵدەگریت، برادەرو هاوڕێی خوانەناس و خراپەکارو ڕەفتار ناشیرین بەهەمان شێوەیەو ئەگەر ڕەنگیشی نەگری، ئەوا خوو ئەخلاقی وەردەگری و هەمان حیسابی ئەوت بۆ

دەکرێ. هەر لە ژیانی دونیادا چەند کەسمان بینیوە، هەرچەندە بۆخۆی هیچ ڕەفتارو خویەکی ناشیرینی نییە، بەڵام هەر بە ئەوەندەی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی و هاتوچۆی کەسانێك دەکات کە خووڕەوشتیان ناشیرینە، خەڵکی ئەویش وەکو ئەو تەماشا دەکەن و هەمان هێمای پرسیاری دەخەنە سەر، لە قیامەتیشدا هاوڕێ و برادەری خراپ لێت دەبێتە دوژمنێکی سەرسەخت و سەرەڕای هەموو نەهامەتییەکی خۆی برادەرە خراپەکەی دونیاشی یەخەی دەگرێ و لە کۆڵی نابێتەوەو دەڵێت: من بەهۆی تۆوە توشی ئەم ڕۆژە ڕەشە بووم.

خوای گەورە لە سورەتی ( الزخرف) ئایەتی (٦٧) دا دەفەرموێت:

﴿ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾.

پێشەوا (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ( كُـلُّ خلَّةٍ وَ صَدَاقَةٍ لِغَيرِ اللهِ فَإنَّها تَنقَلِبُ يَومَ القِيامَةِ عَداوَةً إلاّ ماكـانَ للهِ عَزَوَجَل فَإنَّهُ دائِمٌ بِدَوامِه).

تەفسیری ئاسانیش ئاوا ڕاڤەی ئایەتەکە دەکات: دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو ڕۆژەدا، کە ڕۆژی قیامەتە، دوژمنی یەکترن و هەموو ڕقیان لە یەکتری دەبێتەوە، جگە لەو کەسانەی کە لەسەربنچینەی تەقواو خواناسین کۆبونەتەوەو برایەتییان بەرپاکردووە . خۆشەویستان زانایان فەرمویانە: برادەرو هاوڕێ وەکو درەخت وایە.

١. ( فَمنها ما لَهُ ظلٌ ولَيسَ لَهُ ثَمَرٌ). درەختی وا هەیە سێبەری هەیە بەڵام زڕەو بەرهەم ناگریٚ، ئەمەش ئەو برادەرەیە کە بۆ ژیانی دونیا ڕەنگە مرۆڤ بۆ چەند سات و سەعاتێك لە سایەو سێبەری دا سوودمەند بیٚ و بحەوێتەوە، بەڵام بۆ قیامەت هیچ سودێکی پیٚ ناگەیەنێت، جا سوودی دونیاش زۆر زوو تەواو دەبێت، هەوەکو سێبەری درەخت کە زوو لەسەر مرۆڤ لادەچێت.

بەڵیٚ ئەم جۆرە برادەرانە زۆرجار هەر لە دونیادا زوو پشت لە برادەرە بەناو نزیك و دڵسۆزەکانیان دەکەن و هەروەکو هەگیز نەیان ناسیبن وایە، وەکو خەڵکانی سیاسی و ڕێکخراوە حیزبییەکان.

٢. ( وَمِنها ما لَهُ ثَمَرٌ وَ لَيسَ لَهُ ظِلٌ). درەخت و ڕووەکی وا هەیە کە بەرهەمی جوانی هەیە بەڵام سێبەری نییە، ئەمەش ئەو هاوڕیٚ و برادەرانەن کە تەنهاو تەنها لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆش دەوێت و هیچ سوودێکی دونیایی و ماددی لە یەکتری نابینن، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا لای خوای گەورە تکاو ڕجاو شەفاعەت بۆ یەکتری دەکەن .

٣. ( وَمِنها ما لَـيسَ لَـهُ واحِـدٌ مِنهُمـا) درەختی وا هەیە نە سێبەرەکەی بە کەڵك دێت و نە بەریشی هەیە ، ئەمەش ئەو جۆرە برادەرانەن کە نەبۆ دونیا باشەو نە بۆ قیامەتیش بە کەڵك دێت.

ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( تَجِـدونَ النّـاسَ مَعادن، خيارهُم في الجاهِلِيَةِ خيـارُهُم فـي الإسـلام إذا فقهـوا ) رواه البخاري .

بەڵێ مرۆڤەکان چونکە لە زەوی درووست بوون، هەروەکو زەویش وان، چۆن زەوی ( نەفیس و ڕەخیصی) هەیە زەوی هەیە زۆر بەبەرەکەتەو بەروبومی باش دێنێت، زەویش هەیە بێ بەرەکەتەو هیچ شین ناکات، بە هەمان شێوەش مرۆڤی وا هەیە شەریف و ڕێك و پێکەو هەموو قسەو گوفتارێکی، هەموو هەنگاوو هەڵوێستێکی پڕ خێروو بەرەکەتە بۆ خۆی و بۆ دەوروبەری و هەموو ئەو کەسانەی کە دەبنە برادەرو هاوڕێی ، کەسانیش هەن کە زۆر حەقیرو بێ خێرن و زۆر بەد فەڕن.

جا لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان ئاوا جیاوازن ، ئەوا لە کاتی هاوڕێیەتیشیان دا هەریەکەو توشی دەبێت بەو کەسەی کە وەکو خۆی وایە.

هەروەك مامۆستای مرۆڤایەتی حەزرەتی محمد ﷺ فەرموویەتی: ( ألأرواحُ جُنُودٌ مُجَنَدَّةٌ فَما تَعارَفَ منها إئتَلَفَ، ومـا تنـاكَرَ مِنهـا اختَلَفَ). رَواهُ مُسلِم وَالبُخاري في الأدَب المُفرَد(٢٩٢)

بەڕێزان: ئەگەر مرۆڤ بە ووردی سەرنج بدات دەبینێت، کە هەموو مرۆڤێك مەیلی دەجوڵێت بەلای ئەو کەسەوە کە لەگەڵ ئەو دەگونجێت لە ڕوانگەی دەروونی و ئەدەب و ڕەوشت و بیروباوەڕو پیشەو کارو کەسابەتەوە، ئەهلی خێروچاکە زوو یەکتری ئەدۆزنەوەو دڵیان بۆ لای یەکتری ئەبزوێت، بەهەمان شێوە ئەهلی خراپەکاریش هەرزوو هاوتای خۆیان ئەدۆزنەوەو لە ناو هەزاران لە خەڵکی دەگەن بەیەك، هەرلە کۆنەوە وتویانە:( الطُيُورُ عَلى أشكالِها تَقَعُ ).

لــە کــاتی کــۆچ کردنــی موســوڵمانان بــۆ مەدینــە، ئــافرەتێکی موسوڵمانی خەڵکی مەککە، زۆر دەم بە خەندەو ئەهلی گاڵتـەو گـەپ و قسەی خۆش بوو، کاتێك گەیشتە مەدینە، یەکەم کەس کە توشی بوو بردیەوە ماڵی خۆیان ئافرەتێکی مەدینەیی بوو کە ئەویش بە هەمان شێوە ئەهلی گاڵتـەو گـەپ و پێکـەنین و دەم بە سوعبەت بوو، کاتێك ئەمـەیان بۆ دایکـی ئیمانـداران خـاتوو عائیـشە باس کـرد، فـەرمووی: (صَدَقَ حِبّي. سَمِعتُ رَسولَ الله ﷺ يَقولَ: الأَرواحُ جُنُودٌ مُجَنَــدَةَ. ما تَعارَفَ مِنها أئتَلَفَ وما تَنا كَرَ مِنها اختَلَفَ). رواهُ أبو يَعلي في مُسنَدِه بسَنَدٍ جَيدٍ.

واتە: ڕاستی فەرمووە خۆشەویستەکەم کە پێغەمبەری خوایە ﷺ کە بەگوێی خۆم لێم بیست کە فەرمووی: ((الأَرواحُ جُنُودٌ مُجَنَــدَةَ) .....الخ

تەنانەت مالیکی کوڕی دینار فەرموویەتی :( لا يَتَّفِقُ نَوعانِ مِــنَ الطَّيرِ في الطَّيرانِ إلاّ وَ بَينَهُما مُناسَبَةَ).

واتە: هەروەختێك دوو باڵنـدە بەیەکـەوە فڕین ئەوە بە دڵنیاییـەوە مناسـەبەیەك لـە نێوانیانـدا هەیـە، بۆیـە جارێکیـان سـەیریان کـرد وا قەلـەڕەش و کـۆتر بەیەکـەوە دەفـڕن و بـە تەنیـشت یەکـەوە دەغـڕن، هـەموو خەڵکەکـە سـەریان سـوڕما باشـە چـی قەلـەڕەش و کـۆتری بەیەکــەوە کۆکردووەتــەوە وا بەیەکــەوە دەفــڕن؟ کــە ســەرنجیاندا تەماشایان کرد هەردوکیان شەلن و هەریەکەیان قاچێکی ناتەواوە.

ئیمانداران: پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێ:( الرَّجُلُ على دِيَنِ خَلِيلَه، فَلِيَنظُر أَحَدُكُم مَنْ يُخالِل).رَواه أبـو داود وحَسَنَهُ الألباني بِرَقم: (٤٨٣٣) .

واتـە: مـرۆڤ لەسـەر ئـایین و بیروبـاوەڕی هاوڕێکەیـەتی، جابـا هەریەکـە لـە ئێـوە سـەرنج بـدات کـێ دەکـات بـە هـاوڕێی خـۆی. لـە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا ( سفیان بن عیینه) فـەرمووی: تەماشاکەن هاوڕێی خراپ چەندە کاریگەری هەیـە: فیرعـەون هامـان وەزیـری بوو، ئەوەی فیرعەون لە خراپەکاری و کوشتن بە بیریشیا نەدەهات، هامانی وەزیرو ڕاوێژکاری دەیخستە بەرچاوی و بەردەوام ڕێگای خراپـەکاری و خوێنڕێژی و زوڵم و ستەمی دەخستە بەرچاو.

وە تەماشـاکەن ( حـەجاجی کـوڕی یوسـفی ثـەقـەفی) کـە کاربەدەستێکی خوێنڕێژ بوو، یەزیدی کوڕی ئەبی موسلیم هاوڕێ و ڕاوێژکاری بوو کە زۆر لە حەجاج خراپتر بوو، ئەوەشی کە حەجاج لە خراپەکاری و خوێن ڕێژی نەیدەکرد ئەم هاوڕێ خراپەکارەی نیشانی ئـەداو وای لـێ کردبـوو ڕقـی لـە هـەموو کـەس دەبـووەوە بـە تایبـەتی زانایان و دڵسۆزان، وە بـە درێـژایی مێـژوو هـەتا ئێـستا سـەرکردەکان کە زوڵم لە میللەت دەکەن، بەردەوام ئەوانـەی دەورو بـەری لـە وەزیـرو ڕاوێـژکارو سـەرکردایەتییەکانی هـەمووی لـە خـۆی خـراپترن و ئـەو خراپەکارە بووەتـە خاڵێك و ئەمانـەش دەورەیـان داوە. ( الطُيُورُ علـى أَشكالِها تَقَعُ ).

کـوردیش فەرموویـەتی: ( تـەیری گـول عاشـق بـە داری ژەقنـە بووتە) .

بـەڕێزان ئـەو مەرجانـەی کـە پێویـستە لـە هـاوڕێی چـاکدا هـەبن ئەمانەن:.

١.عەقڵ و ژیری: چونکە کەسی بیّ عەقڵ نەك نابێتە مایەی زیاد بوونی زانیاریت و ئاسودەیت، بەڵکو ئەگەر خۆشی بە دڵسۆزت نیشان بدات و لە ناخیشەوە دۆستت بێت، بەڵام ئەگەر خاوەنی عەقڵ و ژیری نەبێت، ئەوا ئەبێتە مایەی بەدبەختی و سەرئێشەو ئیش لیّ تێك دانت، بۆیە حەکیم و دانایان فەرموویانە: ( عَداوَةُ العاقِـلِ أَقَـلُّ ضَرَراً مِن مَوَدَّةِ الأحمَـقِ ) . واتە: دوژمنایەتی عاقڵ و ژیر کەمتر زەرەر بەخـشە لـە دۆسـتایەتی و خۆشەویـستی ئەحمـەق و نـەزان. بۆچی؟! چونکە مرۆڤی ئەحمەق و تیّ نەگەیشتوو ڕەنگە زەرەر بدات لە کاتێکدا کە دەیتوانی سوود ببەخشێت، بەڵام چونکە ژیری نیەو ناتوانێت قازانج و زەرەر جیا بکاتەوەو دواڕۆژ نابینێت زەرەر دەبەخشێت لە جیاتی سوود و سنوور دەبەزێنێت، بەڵام کەسی ژیر ئەگەر دوژمنایەتیشت بکات لە سنوور دەرناچیّ و کورد ووتەنی: ( لە شەڕدا بەشی ئاشتی تێدا ئەهێڵێتەوە ) .

هەر لە کۆنیشەوە ووتراوە:.

فَلا تَصحَب أخا الجَهلِ .... وَ إيّـاكَ وَ إيّـاهُ

فَكَم مِن جـاهِلٍ أردى ..... حَليماً حيـنَ أخـاه

يُقاسُ المَـــرءُ بالمَـــرءِ .... إذا ما المَرءُ ما شاهُ
وَ لِلشَيءٍ مِـــنَ الشيءِ ..... مَـــقاييس وَ أشبـــاهُ
وَ لِلقَـــلبِ عَلى القَـــلبِ ..... دَليــلٌ حيـــنَ يَلقـــاهُ

دەگێڕنـــەوە: ئیمـــام ئـــەبو حەنیفـــە لـــە گـــەڵ خوێنـــدکارەکانی دا دانیشتبوو وانەی ( فقه) ی پـێ دەوتنـەوە، پێشەوا ئەبوحەنیفە ئازار لە ئەژنۆکانی دا هەبوو، بۆیە بە داوای لێبووردنەوە لە فەقێکانی لەبەر ئازاری ئـەژنۆی قاچـەکانی ڕاکێشابوو، لەگەرمـەی دەرس خوێندنـدا بـوون، پیـاوێکی زۆر بـە هەیکـەل و سـیما جـوان و بـە جـل و بـەرگ پۆشتەو پەرداخ لە کەسێکی زاناو داناو ناودارو دنیادیدە ئەچووهاتە مزگـەوت، بۆیـە هـەر کەســەلامی کـرد، ئیمـام ئەبوحەنیفـە قاچـی کۆکردەوەو لەسـەر ئـەژنۆ دانیشت وەکو ڕێـزو حورمـەتێك بـۆ میـوانی هـاتوو، دوای بەخێرهاتنی ، ئیمـام داوای ڕوخسـەتی لـە میـوان کـردو دەستی کردەوە بە وانە وتنەوەو گەیشتە ئەو بابەتەی کە فـەرمووی: ( إنَّ وَقتَ المَغرِبِ يَبدَأُ مِن حينِ تغرب الشَمس إلى أن يغيب الشَّفَق الأحمَر مِنَ السَماء ).

واتە: مەغریب لەو کاتەوە دەست پـێ دەکات کە ڕۆژ ئاوا دەبێـت و هەتا ئەو کاتە دەخایەنێت کە سوورایی کەناری ئاسمان وون دەبێت و نامێنێـت، کـە سـەرەتای نوێـژی خـەوتنان دەسـت پـێ دەکـات، کابرای میوان ڕووی لە ئیمام کردو وتی: یا شێخ، ( أرأيتَ إن لَـــمْ تَغَـــرِبِ الـــشمس؟!). مامۆسـتا ئـەی ئەگـەر ڕۆژ هـەر ئـاوا نـەبوو؟! ( کـە ئـەم

پرسیارە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر کەمی عەقڵ و ژیری و نەزانی و جاهیلی). ئیمام ئەبوحەنیفە ڕووی لە هاوڕێکانی کردو فەرمووی:( ألآن آنَ لِأبي حَنيفَةَ أن يمدَ قَدَميه ).

ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئەبوحەنیفە بە ئیسراحەتی خۆی دابنیشێ و قاچی ڕاکێشێت، چونکە ئەم پیاوە وەکو لە ڕەنگ و ڕووخساریدا گەورەیە، لە عەقڵدا زۆر بچووکەو پێویست ناکات شەرمی لێ بکرێت.

کەواتە: پێویستە زۆر خۆمان بپارێزین لە هاوڕێیەتی ئەو کەسانەی کە ژیرییان کەمەو داوا لە خوای گەورە بکەین کە ژیریمان پێ ببەخشێ و هاوڕێی ژیرمان دەست بکەوێت.

٢. ڕەوشت جوانی: چونکە هاوڕێ مەرج نییە هەموو کات هەر لەسەر یەك هێڵ و یەك بۆچوون بن و لە هەموو شتێکدا هاوڕا بمێننەوە، بەڵکو دەگونجێت ڕۆژێك لە یەکتری جیا ببنەوەو بەکاری یەکتری ڕازی نەبن، لەم کاتەدا کۆمەڵێك شتی ژیانی تایبەت لای خەڵك شاراوەو لای ئەمان ئاشکرایە، چونکە لە کاتی هاوڕێیەتی دا زۆر شتی ژیانی خۆیان بۆ یەك باس کردووە، ئەگەر لەیەك جیا بوونەوەو هاوڕێیەتیەکە پچڕا، ئەگەر ئەو هاوڕێیە ڕەوشت جوان نەبێت، نهێنییەکانی ئەدرکێنێ و زۆرجار لێشی زیاد دەکات و بوختانی بۆ دەکات و ئابڕووی دەبات، سەدوهەشتا پلە دژی دەوەستێتەوەو ئەوەی ناشێت بە هاوڕێکەی دەکات، بەڵام ئەگەر هاوڕێیەکی ڕەوشت بەرز بێت، بە ئەمانەتەوەو بە حورمەتەوە دەیپارێزێت.

٣. دینداری و خواناسی: چونکە مرۆڤی بێ دین و بیروباوەڕ بە خواو ئاینی ئیسلام، دوژمنی خۆیەتی و گەورەترین دوژمنایەتی لەگەڵ خۆی دەکات، ئەی دەبێت چاوەڕێی چ خێرێکی لێ بکرێت کە بیبەخشێت بە هاوڕێکەی، کەسێك وەفای نەبێت بۆ خوای خالقی، ئەی چۆن وەفای دەبێت بۆ برادەرەکەی.!؟

٤. دڵسۆزو ڕاستگۆ بێت و دوور بێت لە دوڕوویی و ڕووپامایی و ئەگەر ڕۆژت گەش بوو، ناوت بەرز بوو، ماڵت گەرم و گوڕ بوو، سفرەت ڕازاوە بوو، دۆستت بێ و ئەگەر ڕۆژگاریش سوڕاو حاڵ و وەزعت پێچەوانە بووەوە، ئەویش پشتت تێ بکات، وە بەڵێ قوربانەکانی بۆت تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆی بووە کە پێویستی پێت هەبووە.

شاعیر بەحەق فەرموویەتی:.

ولا خيرَ في ودِّ امــرئٍ مــتلونٍ ... إذا الريحُ مالَتْ مالَ حيثُ تميلُ
جوادٍ إذا استغنيتَ عن أخذِ مالهِ ... وعند احتمالِ الفقرِ عنك بــخيلُ
فما أكثرَ الإخوانَ حينَ تــعدهمْ ... ولكــنهم في النــائبــاتِ قــليلُ

بەڵێ زۆرجار خوای گەورە کە مرۆڤی توشی تاقیکردنەوەی هەژاری و ڕۆژ ڕەشی و گیروگرفت دەکات، یەکێك لە حیکمەتەکانی ئەوەیە: ئەم کەسە لەناو ئەو هەموو کەسانەی کە بە دۆستی خۆشەویستی خۆی زانیون، بەڵام لەم مەیدانەدا دۆستی ڕاستەقینەی بۆ دەردەکەوێ و دۆستی تەنگانە لەگەڵ دۆستی سەرسینی لێك جیا دەبێتەوە.

بەڕێزان: لوقمانی حەکیم ئامۆژگاری کوڕەکەی کردوو فەرمووی: ( یا بُنيَّ مَن لا يَملِكُ لِسانَهُ يَنـدَم ) کوڕی خۆشەویستم هەرکەسێك دەست نەگرێت بەسەر زمانی خۆی داو ئاگای لە زمانی نەبێت هەمیشە پەشیمانە، ( وَمَن يكثر المِراء يشتم ) هەر کەس دەمە دەمێو چەلەحانێی زۆر بکات جوێنی پێ دەوترێت ( وَمَـن يَـدخُل مَـداخل الـسُّوء يـتهم ) هەرکەسێك بچێتە شوێنی خراپەکاری با خراپەش نەکات، تۆمەتبار دەکرێت بە خراپە کردن، ( وَمَن يُصاحِب صاحبَ الـسُّوء لا يَـسلم ) هەر کەسێك هاوڕێیەتی هاوڕێی خراپ بکات، سەلامەت نابێت لە خراپەی ئەو هاوڕێ خراپەی .

بەڵێ خۆشەویستان: تێکەڵاو بوون و درووست کردنی هاوڕێیەتی مەرج نییە هەر لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤدا بێت، بەڵکو گیانلەبەرەکانیش لەناو خۆیان دا هاوڕێیەتی درووست دەکەن، وە زۆرجار مرۆڤ لەگەڵ ئـاژەڵ و گیانلەبـەرەکان دا هاوڕێیـەتی درووسـت دەکـات و هاوڕێیەتییـەکی زۆر سـەرکەوتوو ڕاسـت و درووسـت و فیداکارانـە دەبێت، ئەمڕۆ لە ئەوروپا و ئەمریکا و ڕۆژئاوا بە گشتی و بەشێکی بەرچاوی وڵاتانی ڕۆژ هەڵاتیش، هاوڕێیەتی لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا بەتایبەتی سەگ، زۆر بە پیرۆزتر سەیر دەکرێت وەك لە هاوڕێیەتی لەگەڵ مرۆڤدا، دەبینین زۆر کەم هەیە لەوان کە سەگێکی نەبێ و ناوی بۆ سەگەکەی دانەنابێت و شەوو ڕۆژ بۆ ناو ماڵ و کارگەو سەیران و بازاڕو هەموو شوێنێك لەگەڵی نەبێت، تەنانەت زۆرجار بووە کەسێك

وەسـیەتی نوسـیوە کـە لـە دوای مردنـی پـارەو سـامانەکەی بـۆ سـەگەکەی یـان پـشیلەکەی یـان مەیمونەکـەی لەلایـەن حکومەتـەوە صەرف بکرێت ! بۆچی؟! چونکە ئەوەندە خیانەت و ناپاکی لە هاوڕێ مرۆڤەکەی بینیوە، ئەوەندە بێ وەفایی لە نێوانیاندا ڕووی داوە، بۆیە بڕیار ئەدات سەگێك کە وەفادارە، بکات بە هاوڕێی خۆی، چونکە زۆر لە مرۆڤی ناپاکو بێ وەفا باشترە.

قسەو بۆچونەکەشیان نابەجێ نییە، چونکە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ عبدالله ی کوڕی عەباس فەرموویەتی:( كَلبٌ أمين، خَيرٌ مِن صاحِبِ خائِن). سەگێکی ئەمین و بەوەفا زۆر باشترە لە هاوڕێیەکی ناپاك و بێ وەفا با مرۆڤیش بێت، تەنانەت جارێکیان جەعفەری کوڕی سولەیمان گەورە زاناو پیاوباشی زەمان مالیکی کوڕی دیناری بینی لە دەشت و بیابانێکدا بوو، سەگێکی پێ بوو، جەعفەر بە سەرسوڕمانەوە وەك ئەوەی بونی سەگ لەگەڵ زانایەکی وەکو مالیکی کوڕی دینار بە شتێکی نەشیاو بزانێت، وتی: قوربان ئەوە چییە؟ چۆن ئەم سەگە لەگەڵ خۆت ئەبەی بۆ ئەم سەفەرە؟ مالیکی کوڕی دینار فەرمووی:( هذا خَيرُ مِن جَليسِ السُّوء ) ئەم سەگە زۆر باشترە لە ڕەفیق و هاوڕێ و هاودەمی خراپ.

تەنانەت لای ئیمامی مالیك (رحمة الله عليه) سەگ لەبەر ئەوەی ئاژەڵێکی بەوەفایەو سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت پیس نییەو گڵاو نییە، هەرچەندە ئەم فتوایە تەنها هی ئیمامی مالیکەو کۆی زانایانی شەرعزان بەلایانەوە سەگ پیس و گڵاوە.

وە لاپەڕەکانی مێژوو دەیان و سەدان ڕووداویان بۆ تۆمار کردوین لەسەر ئەوەی ئاژەڵ کە بووەتە هاوڕێی مرۆڤ زۆر هاوڕێیەکی بەوەفا بووە، بۆ نموونە: قورئانی پیرۆز باسی ئەو سەگە دەگێڕێتەوە کە بووە هاوڕێ و هاودەمی هاوەڵانی ئەشکەوت ( أصحاب الكهف ) کە زۆر بەوەفا بوو لە هاوڕێیەتییەکەی و لەگەڵیان چووە ناو ئەشکەوتەکەوەو لەگەڵیان مایەوەو لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا لە حاڵەتی ئامادە باشیدا بوو وەکو پاسەوانێکی ووریا بۆ پەلاماردانی هەر نەیارێك کە بیەوێت هێرش بکاتە سەر لاوانی ئەشکەوتەکە، قورئانی پیرۆز وێنای ئەو سەگە دەکات و دەفەرموێت:

﴿وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ﴾.

تەنانەت خوای گەورە لە سوڕەتی الكهف دا چوار جار باسی ئەو سەگە بەوەفایەی کردووە، سێ جار لە ئایەتی (٢٢) داو یەك جار لە ئایەتی( ١٨) دا .

وە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان دەگێڕنەوە کە جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بینی وا خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە لە دەوری لاشەیەك، کە پێغەمبەر چووە پێشەوە تەماشای کرد وا کەسێکە کوژراوە فەرمووی: (ماشأنه) ئەمە بۆچی و لەسەرچی

کوژراوە؟ عەرزیان کرد: ( إِنَّهُ وَثَبَ عَلَى غَنَم بَني زَهرة. فَأَخَذَ مِنها شاة، فوَثَبَ عَلَيه كَلبُ الماشيَة، فقَتَلَهُ ).

عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پیاوە ئەمشەو خۆی گەیاندووەتە ڕانەمەڕەکەی (بەنی زەهرە) و مەڕێکی گرتووەو دزیویەتی، بەڵام سەگی ڕانە مەڕەکە پێ ی زانیوەو پەلاماری داوەو وازی لێ نەهێناوە تا بەم شێوەیە کوشتویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺڕووی کردە هاوەڵان و کەس وکاری کوژراوەکەو دەرس و ئامۆژگارییەکی گەورەی بە هەموو مرۆڤایەتی ڕاگەیاند کە فەرمووی: ( قَتَلَ نَفسَهُ، وَأَضاعَ دِيَتَهُ. وَعَصى رَبَّهُ وَخانَ أَخاهُ، وَكانَ الكَلبُ خَيراً مِنهُ ) فەرمووی: ئەم کەسە کە ئاوا کوژراوەو گۆشتی لاشەی پچڕپچڕ کراوە، خۆی بووەتە هۆی ئەوەی کە ئاوای لێ بێت و لەناو بچێت، بۆیە خوێنی نییەو کەس بۆی نییە داوای خوێنی بکات و خوێنی بە هەدەر چوو، وە ئەم کەسە سەرپێچی خوای خۆی کردو ناپاکی و خیانەتی لە براکەی کرد بەوەی کە چوو لە تاریکی شەودا پەلاماری مەڕەکەی داو دزی لێکرد و هەر بەلاشە مرۆڤ بوو، بەڵام وەکو گورگی هارو برسی لێ هات لە ڕەوشتدا، ئەو سەگە کە چەند پاروە نانێکی لەماڵی خاوەنەکەی خواردووە، وەفاداری خۆی نواند بۆ خاوەنەکەی وسەلماندی کە هاوڕێیەکی بەوەفایەو خیانەت لە خاوەنەکەی ناکات و ئەو ناپاکە لەناو دەبات کە هێرش بکاتە سەر مەڕەکانی، بۆیە ئەو سەگە زۆر لەو ناپاك و دزە چاك ترە.!

وە گەلێك بەسەرهات و سەرگوزەشتە هەن لە بارەی ئەوەوە كە سەگ چۆن هاوڕێیەكی دڵسۆز بووە بۆ مرۆڤ، دەگێڕنەوە، یەكێك لە پاشاكان ڕۆژێكیان لە دیوانی پاشایەتی دانیشتبوو داوای لە چێشت لێنەرەكەی كرد كە فڵان خواردنەكەی بۆ ئامادە بكات، ئەویش دەستی كرد بە درووست كردنی خواردنەكەو خواردنەكە حازر بوو، چێشت لێنەرەكە هێنایە بەردەم پاشاو لەو كاتەدا ڕووداوێك لە دەرەوەی كۆشك ڕووی داو پاشای ناچاری ئەوە كرد كە خواردنەكە بەجێ بێڵێ و هەموو پاسەوانەكانیشی لەگەڵی چوونە دەرەوەو ژوورەكە بە چۆڵی مایەوەو خواردنەكە بە سەربەتاڵی لەوێ مایەوە، پاشا سەگێكی هەبوو، لەناو پەنجەرەی ژوورەكەدا بوو، لەو كاتەدا مارێك لە بنمیچیماڵەكەدا هاتە دەرەوەوەو چوو دەمی خستە خواردنەكەوەو ژەهری تێ كردو پاشان كە چاوی بە سەگەكە كەوت دوور كەوتەوەو سەگەكە فریای نەكەوت و مارەكە چووە كونەكەی خۆیەوە، دوای كەمێك پاشا گەڕایەوە شوێنەكەی خۆی و داوای خواردنەكەی كرد، بەڵام سەگەكە زۆر بە دەنگی بەرز بەڕووی پاشادا هاواری دەكردو تەنانەت خۆی گەیاندە لای پاشاو پەلاماری دەفری خواردنەكەی دا كە دەیویست خواردنەكەی ناوی بخوات، ئەوە بوو خواردنەكەی لە دەست ڕشت، پاشا لەم كارە سەرسوڕهێنەرەی سەگەكەی كە پێشتر كاری وای لێ نەبینرا بوو، زۆر سەری سوڕما، بۆیە ناردی بە دوای حەكیم و پزیشكەكەی دا كە بێت ئەو خواردنە بپشكنێ، كاتێك پزیشكەكە خواردنەكەی پشكنی تەماشای كرد، پڕە

لە ژەهری مار، ئەمەی بە پاشا ڕاگەیاند، پاشا بڕیاری دا ئەم سەگە هەرگیز لێی دوور نەکەوێتەوە، وە بۆ هەر شوێنێك بچوایە سەگەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد، کاتێك لێیان ئەپرسی بۆچی وا دەکەیت؟ ئەیووت: ( هوَ أوفي مِـــنَ الإنـــسان ) ئەو سەگە زۆر بەوەفاترە لە مرۆڤ لە هاوڕێیەتی دا ئەو سەگە منی ڕزگار کرد.

هـەر لەسـەر وەفـاداری ئاژەڵـەکان لـە هاوڕێیـەتییان بـۆ مـرۆڤ دەگێڕنەوەکە: لـە میـصر کابرایـەك ماینێکی باشـی دەبێـت، ماینەکە جوانومـاینێکی دەبێـت، بـەڵام لـە کتـوپڕا ماینەکـە لـەناو دەچێت، خاوەنەکەی بە شیری مەمکە، جوانوماینەکە بە خێو دەکات و زۆر خزمەتی دەکات، بەڵام پاش ماوەیەك لە گەورە بوونی جوانوماینەکە، کابرا نەخۆش دەکەوێت و خواردن و خواردنەوەی بۆ ناخورێت، لەو کاتـەوە جـوان وماینەکـەش دەم لـە خـواردن و خواردنـەوە نـادات و لـە سوچـێکدا بـە غـەمباری دەکـەوێت، پاشـان کـە خاوەنەکـەی بـەو نەخۆشـییە دەمرێـت و دەیبـەن بـۆ سـەر قـەبران، جوانوماینەکـەش بـە شوێن خەڵکەکە دەکەوێت و دوای ناشتنی لە خەڵکەکە جیادەبێتەوەو دەڕوات لەسەر شاخێکی بەرزەوە خۆی فڕێ ئەداتـە خـوارەوەو خۆی دەکوژێت و بەکردەوە بە خەڵکەکە دەڵێت: نامەوێ لەدوای خاوەنەکەم بـژیم کـە ئـەو ژیـانی منـی دابین کـردو بـە خێوی کـردم، کـە ئـەو مـرد دەبێت منیش بمرم.!!

لەم چەند ساڵەی ڕابردووش دا ڕۆژنامەکان بڵاویان کردەوە کە لە مەکسیك کۆترێك ئەچێتە ناو مەخزەنێکی خۆراکەوە، بەڵام دواتـر کـە

دەرگاو پەنجەرەکان دادەخرێن، ئەم کۆترە ناتوانێت بچێتە دەرەوە، بۆیە ئەوەندە خۆی بە دەرگاو پەنجەرەو دیوارەکان دەکێشێت تا باڵێکی دەشکێت و دەکەوێت و خەریك دەبێت بمرێت، بەڵام دواتر ئافرەتێك کە دەرگاکە دەکاتەوە کۆترە باڵ شکاوەکە دەبینێت، هەڵی دەگرێتەوەو باڵەکەی دەرمان دەکات و خواردنی پێ ئەدات و خزمەتی دەکات تا ئەو کاتەی چاك دەبێتەوە، ئیتر لەو کاتەوە ئەو کۆترە بە هیچ شێوەیەك لەو ئافرەتە دوور ناکەوێتەوە و بەردەوام لەسەر شانی دەبێت ، وەکو نواندنی وەفادارییەك بۆ ئەو کەسەی کە لە مردن ڕزگاری کردو خزمەتی کرد.

لە کۆتایی ئەم ووتارەدا جارێکی تر دەچمەوە خزمەت فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمووی:( لاتُصاحِب إلاّ مؤمناً وَ لا يَأكُل طَعامَكَ إلاّ تَقيٌ ).

کە هەرکاتێك بە کردەوە ئەو فەرموودە بە ووشە کەمە بەڵام بە مانا زۆر فراوانە، جێبەجێ بکەین بێگومان لە دەست کەوتنی هاوڕێی چاك بێبەش نابین و لە هاوڕێی خراپ و بێ وەفاش بە دوور دەبین،

داواکارم لە خوای گەورە بمانکات بە یەکێك لە چاکەکاران و هاوڕێی چاکمان توش ببێت و لە خراپەکاران دوور بین و خۆشمان خراپەکار نەبین، ئامیــــــــــــــن.

# سەرچاوەکان:.

١. قورئانی پیرۆز.
٢. صفوة التفاسير        محمد على الصابونى ج٢ ص٣٦
٣. الوصايا المنبرية    محمد عبدالعاطى بحيرى ج٢ ص٤٠٦ ، ص٤٠٩ ، ص٤١٠

الحَمدُ لِلهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ اجمَعينَ:

ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: ووتاری ئەمڕۆمان بە پشتیوانی خوای گەورە لە ژێر ڕووناکی و نووری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و زانستی نوێ دا، باسی گەورەیی و فەزڵی نوێژی بەیانی ئەکەین ( ان شاءالله) ، سەرەتای ووتارەکەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خۆشەویستمان دەست پێ ئەکەین کە فەرموویەتی: ( لَتَنقَضنَ عرى الإيمانِ عروة عروة. فَكُلَّما انتقضت عروة تثبت النّاس بالَّتي تَليها فَأَوَّلُهُنَّ نَقضاً الحُكمَ وَ آخَرهنَ الصَّلاةُ ).

واتە: گرێ و قوڵفەکانی ئیمان هەڵدەوەشێتەوە، گرێ دوای گرێ، هەرکاتێ گرێیەکی شل بوەوەو کرایەوە، خەڵکی دەست دەگرن بەوەی دوای ئەوەوە ، یەکەم قوڵفێ کە هەڵدەوەشێتەوە حوکم و دەسەڵاتی ئیسلامیەو کۆتا قوڵف و گرێ نوێژە.

بەڕاستی پێغەمبەری خۆشەویست ڕاستی فەرمووە بە حەق و ڕاستی. ئەوەتا یەکەم شت کە موسوڵمانان دەستیان لێی بەربوو حوکم و دەسەڵات و فەرمان ڕەوایی بوو، ڕۆژگارێکی دوورودرێژ بە دەیان گەل و میللەت لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەژیان و قورئان و سوننەت دەستوری حوکوم بوو لە وڵاتدا. موسوڵمانان خاوەن فەرمانڕەواو ئەمیرو والی خۆیان بوون، بەرووبوومی وڵاتی موسوڵمانان بۆ ئەهلی ئیسلام خەرج دەکرا، بەڵام ئەمڕۆ هیچ

دەسەڵاتێك بەدەست موسوڵمانانەوە نەماوە، دوای ئەوە گرێیەکانی تری ئیسلام یەك لە دوای یەك وا لە لایەن موسوڵمانانەوە بەداخەوە وازیان لێ دەهێنرێ و تەنها بۆ خەڵکانێك نوێژکردن ماوەتەوە، ئەمڕۆ زۆرن ئەو پیاوو ژنانەی کە هەموو پابەندییەکەیان بە دین و ئیمان و ئیسلامیەتیەکەیان تەنها نوێژەکانیانە کە ئەنجامی ئەدەن، ئیتر لە بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەسابەت و بازاڕیان دا، لە بواری خێزان و پەیوەندی یە کۆمەڵایەتییەکانیاندا هیچ پابەندییەکیان نەماوە بە ئیسلامەوە، ئەو هەموو ئافرەتە بە سفووری دەبینیت کەچی نوێژیش دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کە لای زۆربەی موسوڵمانان تەنها نوێژەکە ماوەتەوە زۆر لە نوێژ خوێنان وازیان لە نوێژی بەیانی هێناوەو ئەوەی زۆر گرنگی پێ بدات یان لە کاتێکدا نوێژی بەیانییەکەی دەکات کە خەریکە خۆر دەکەوێت و لە نێوان مان و نەماندایە، یان هەر نایکات و لەگەڵ نیوەڕۆدا دەیگێڕێتەوە، کەبەڕاستی ئەمەش زۆری هۆی بێ ئاگاییە لە گەورەیی ئەو نوێژەو پیرۆزی و پڕ بەرەکەتی ئەو کاتەی بەرەبەیانە، بۆیە بە پێویستی دەزانم هەندێ فەرموودەی خۆشەویستمان و تاجی سەرمان حەزرەتی محمد ﷺ لە بارەی گەورەیی نوێژی بەیانییەوە باس بکەم.

فەرموودەی یەکەم: خۆشەویستمان ﷺ فەرمووی: (لَن يَلِجَ النار أَحَدٌ صلى قَبلَ طلوعِ الشَمسِ وَ قَبلَ غُرَوبِها، يَعني: الفَجر وَالعَصر). رَواهُ مُسلِم (٦٣٤).

واتە: ئاگری دۆزەخ نابینێت ئەو کەسەی کە پێش خۆرکەوتن و پێش خۆرئاوا بوون نوێژ بکات، واتە: نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر.

بەڵێ هەرکەسێك ئەم دوو نوێژەی نەفەوتێت، نوێژی بەیانی کە کاتی شیرینی خەوەو زاڵ بوون بەسەر نەفسیدا دەوێت کە لەناو جێگای نەرم و گەرم ( بە تایبەت لە کاتی سەرمادا) یان لەکاتی (هاوین و گەرمادا کە شەوگار زۆر کورتە ) بێتە دەرەوەو دەست نوێژ بگرێ و نوێژ بکات و ( الصَّلاةُ خَيرٌ مِنَ النَوم) ی بانگ بێژ بە کردەوە جێبەجێ بکات، وە نوێژی عەسر: کە کاتی سەرقاڵ بوونە بەکاروباری دونیایی و بازاڕو کەسابەت و کرێکاری و پیشەکانی ترو خەریکی خۆکۆکردنەوەیەتی و زوو تێ دەپەڕێت، ئەگەر واز لەکارو کەسابەتەکەت نەهێنی و نوێژی عەسرەکەت زوو ئەنجام نەدەیت، وەختێك ئەزانی نوێژی مەغریب دێتە پێشەوە ، جا هەر کەسێك ئەم دوو نوێژەی نەفەوتێت ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە بەڕاستی خواناسەو ئەمرو فەرمانی خواو سوژدە بردن بۆ خالقی خۆی لە هەموو شتێك بەلاوە گرنگترو گەورەترە، هەرکەسێك ئاوا بێت، ( انشاءالله) جێگای بەهەشتەو لە دۆزەخ بەدوورە.

فەرموودەی دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( مَــن صلَّى العشاءَ في جَماعَةٍ فَكَأنَما قامَ نِصفَ اللّيلِ، وَمَن صلَّى الصُبحَ في جَماعَةٍ –أيّ مَعَ العشاء كَما نَصَّ عَلى ذلكَ حَـديث أبــي داود والترمذي– فَكَأنَما صلَّى اللَّيل كُلَّه ). رواه مسلم وأبوداود والترمذي.

واتە: ئەوەی بە جەماعەت نوێژی عیشا ( خەوتنان) بکات، ئەوە وەکو ئەوە وایە کە نیوەی ئەو شەوە شەو نوێژی کردبێت، وە ئەوەی نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ کردبێت، واتە نوێژی عیشاو بەیانی هەردووکی بە جەماعەت کردبێت، وەکو لە دەقی فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە ئەبو داود و ترمزی هێناویانە، ئەوە وەك ئەوە وایە کە هەموو شەوەکە شەو نوێژی کردبێت.

بەڕاستی مژدەیەکی گەورەیە، بەڕاستی فەزڵ و کەرەمی خوایە کە بەخشیویەتی بە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ تەنها بەوەی کە نوێژی خەوتنان ( عشاء) و بەیانی لە مزگەوتدا، یان کەسێكماڵی زۆر دوورە لە مزگەوت یان بەهۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە ناتوانێ نوێژی عیشاو بەیانی بچێت بۆ مزگەوت، لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی خۆتدا بیکەی بە جەماعەت، ئەوە وەکو ئەوە خوا بۆت حیساب بکات کە تەواوی ئەو شەوە شەو نوێژت کردبێ و هەر لەسەر بەرماڵ بیت و سەرت نەکردبێتە سەر جێگای خەوتن.

فەرموودەی سێهەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( رَكعَتَا الفَجرِ خَيرٌ مِنَ الدُّنيا وَ مافيها). واتە: دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی گەورەترە و خێری زیاترە لە دونیاو هەموو ئەوەی کە لە دونیادایە.

وە دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو هەموو سوننەتەکان دا زیاتر سوور بوو لەسەر دوو ڕکاتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( لا تَدعوا رَكعَتي الفَجـــر وَإِن طـــردتكم الخيـــلُ ). واتـە: واز مـەهێنن لـە دوو ڕكاتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی ئەگەرچی ئەسپیش بە دواتانەوە بێت و ڕاوتان بنێت.هەر لەبەر ئەو هەموو خێرو گەورەییەی ئەو دوو ڕكاتە سوننەتەی پێش نوێژی بەیانی بوو، ئەگەر پێغەمبەری خوا ئەو دوو ڕكاتـەی لـە دەسـت بـچوایەو لـە كـاتی خـۆی دا بـۆی نەكرایـە، ئـەوا لـەدوای نوێـژی بـەیانی یـان لـە دوای خـۆر هـەڵاتن ئەیگێڕایـەوە، كـە ئەمەشی بۆ نوێژە سوننەتەكانی تر نەدەكرد مەگەر بۆ شەونوێژ.

جا بـەڕێزان: سـەرنج بـدەن ئەگـەر دوو ڕكـات سـوننەتەكەی پـێش نوێژی بـەیانی ئـاوا گـەورە بێـت، كـە ئـەو قـەدرو ڕێـزەی بـەهۆی نوێـژە فەرزەكەی بەیانییەوە پەیدا كردووە، ئەبێ خوودی دوو ڕكات نوێـژە فەرزەكەی بەیانی چەند گەورە بێت و خێرەكەی چەند مەزن بێت.

فـەرموودەی چـوارەم: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی ئـەكرد بـە موسـوڵمانان كـە نوێـژ بـە جەماعـەت درێـژ نەكەنـەوە بـەڵام لـە نوێـژی بەیانیـدا قورئـانی زۆر بخـوێنن، صـەحابەكان دەفـەرموون: لـە شەسـت ئایەتەوە تا سەد ئایەتی دەخوێنـد لە دوای فاتیحـەوە، وە ئەوەنـدە لـە نوێـژی بـەیانی دا دەمایـەوە كاتێـك نوێـژمان دائەبەسـت، یـەكتریمان نەئـەدی لەبـەر تـاریكی، بـەڵام كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەلامی ئەدایـەوە ئینجـا یـەكتریمان دەناسـی لەبـەر ئـەوەی بەتـەواوی دونیـا ڕووناك دەبووەوە.

فەرموودەی پێنجەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:( مَـــن صَلَّى البُردَينِ دَخَلَ الجَنَّة ). رَواه البُخاري وَ مُسلِم

واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی و عەسر لەکاتی خۆی دا بکات دەچێتە بەهەشتەوە.

بەڕێزان: بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر گەورەیی نوێژی بەیانی کە لەشەرعدا حوکمی جیای لە هەموو نوێژەکان هەیە. بۆ نموونە:.

کاتی هەموو نوێژێك لەسەرەتای کاتەکەوە دەست پێ دەکات، هەتا کاتی نوێژەکەی تر ماوەی هەیە، بەڵام بۆ نوێژی بەیانی وانییە، چونکە نوێژی بەیانی تا نیوەڕۆ نامێنێت، بەڵکو کۆتایی کاتی نوێژی بەیانی تا وەختی خۆرهەڵاتنە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( وَقتُ صلاةِ الصُّبحِ مِن طلوعِ الفَجرِ ما لَم تطلع الشمسُ ).

واتە: کاتی نوێژی بەیانی لە بەرەبەیانەوەیە تا هەڵهاتنی خۆر.

وە هەروەها لەناو هەرپێنج نوێژە فەرزەکەدا، تەنها نوێژی بەیانی نە کورت دەکرێتەوە نە کۆ ئەکرێتەوە واتە: ( قصرو جمع) ناکرێت.

ئیمانداران: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بکات لەو گرێ یە ڕزگاری دەبێت کە شەیتان لە کاتی خەوتنی هەر مرۆڤێکدا لەلای سەری دەدات. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (يعقد الشيطان على قافية رأس أحدكم إذا هو نام ثلاث عقد يضرب كل عقدة عليك ليل طويل فارقد فإن استيقظ فذكر الله انحلت عقدة فإن توضأ انحلت عقدة فإن

صلى انحلت عقده فأصبح نشيطا طيب النفس وإلا أصبح خبيث النفس كسلان).رواه البُخاري(١١٤٢)

**واتە: لە پاسەری هەر یەکێك لە ئێوە شەیتان سێ گرێ ئەدات کاتێك یەکێکتان خەوت، بە هەموو گرێیەك شەوێکی درێژ گرێ ئەدات، جا ئەگەر ئەو کەسە هەستاو یادی خوای کرد، گرێیەکیان دەکرێتەوە، کاتێك دەست نوێژ دەشوات گرێیەکی تریان دەکرێنەوە، کاتێك نوێژی کرد گرێی سێهەمیش دەکرێتەوە، ئیتر ئەو کەسە چالاك و گورج و گۆڵ دەبێت و دەروونی پاك دەبێت، خۆ ئەگەر بەو جۆرە نەبوو، ئەوا تەمبەڵ و دەروون پیس دەبێت.**

**بەڵێ بە چاوی خۆمان دەبینین ئەو کەسەی کە نوێژی بەیانی ناکات، چۆن بەردەوام دەم بە باوێشك و وەڕسەو لە خۆشی تورەیە چ جای کەسانی تر، ئەوانەشی کە هەڵدەستن بۆ نوێژی بەیانی و یادی خوا دەکەن و دەست نوێژ دەگرن و نوێژی بەیانی دەکەن، بە چوستی و چالاکی و ڕووی گەش و خۆشەوە پێشوازی لە هەڵاتنی خۆری ڕۆژی نوێ دەکەن .**

**وە یەکێکی تر لە بەرەکەتەکانی نوێژی بەیانی ئەوەیە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بکات بەرەکەتی ئەو ڕۆژەی تووش دەبێت، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوای پەروەردگار پاڕایەوەو فەرمووی:(** اللهُمَّ بارِك لِأمَّتي في بُكورِها **). پەروەردگارا بەرەکەت بخەرە ئوممەتەکەمەوە لە بەیانیانی زوودا.**

بـەڵێ بەرەكـەت لـە بەرەبـەیان دایـە، سـەعاتەكانی یەكـەمی دوای نوێـژی بـەیانی پـڕ بەرەكـەتترین سـەعاتەكانی ڕۆژە، وە هـیچ كـەس نازانێت بەرهەمیان بێنێت تـەنها ئەوانـە نـەبن كـە لـەو بەیانییە زووەدا هەڵدەسـتن و نوێـژی بـەیانی دەكـەن و لـە سـەرەتای ڕۆژەوە بەرهـەمی باشیان دەبێت، ئەم بەرەكەتەش لە هەموو شتێك دا، لـە هـەموو كارێك دا ، لە بازرگانی و كشتوكاڵ و خوێندنەوەو سـەفەرو جیهادی ڕێگـای خوادا بە ڕوون و ئاشكرایی دەردەكەوێت.

ئیمانـداران: هەنـدێك لـە خـەڵكی كاتێـك لێیـان دەپرسـیت، بۆچـی نوێـژی بـەیانی ناكـەیت؟ لـە وەڵـام دا یەكسەر دەڵێت مـن ئیمـانم بـە فـەرزی نوێـژی بـەیانی هەیـە، بـەڵام بەڕاسـتی نوێـژی بـەیانی زۆر قورسـەو زۆر زەحمەتـە مـرۆڤ بـەو بەیانییـە زووە لـە نـاو جێگـای خـەو بێتـە دەرەوەو مـرۆڤ لـەكاتی گـەرمادا تێرخـەو نابێـت و لـە كـاتی سەرماشـدا مـرۆڤ لـە ترسـی سـەرما بـەو بەیانییـە زووە لـە خـەو هەڵناستێت.

بـەڵام ئایـا ئـەم وەڵامـە حەقیقـەتی هەیـە؟ بێگومـان نـەخێر، لەبـەر ئەوەی:

یەكەم: جێگای دوو دڵی و گومان نییە كە هەر شتێك خوای گەورە لەسـەر بەنـدەی خـۆی فـەرز كردبێـت، مانـای ئەوەیـە لـە سـوودی بەندەكەیەو لـە توانـای بەنـدەدا هەیـە، هـەروەكو لـە قورئـانی پیرۆزدا دەفـەرموێت: ﴿لا يُكَلِّـفُ الله نَفـساً إلاّ وسـعَها﴾ یـان دەفـەرموێت: ﴿ أَلا يَعلَمُ مَن خَلَقَ وَهوَ اللَّطِيفُ الخَبير﴾.

کەواتـە: خـوای گـەورە دەفـەرموێت: شـتێکم لەسـەر بەنـدە فـەرز نـەکردووە کـە بـۆی ئـەنجام نـەدرێت و لەسـەری قـورس بێـت. یـەکێك لەوانە نوێژی بەیانییە.

دووەم: ئەگەر سەیری ئەو وواڵتانە بکەین کە زۆربەی دانیشتوانی موسوڵمان نین، بۆ نموونە: ئەمریکا، دەبینین لە کاتی نوێـژی بـەیانی دا هەموو شەقامە سەرەکییەکانی شارە گـەورەکان پـڕن لـە ئۆتۆمبیـل. کە بەو بەیانیە زووە بۆ کارەکانیان هەستاون، کەواتـە: لـەو کاتـەوەی کـە موسـوڵمانان هەڵدەسـتن بـۆ نوێـژی بـەیانی ئـەوانیش لـە خـەو هەڵدەستن و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ کارو پیشەی ئەو ڕۆژەیان.

یـەکێك لـە زانـا موسـوڵمانەکان کـە نـاوی ( دکتـۆر غالـب) د دەفەرموێ: ئامادەی کۆنگرەیەکی پزیشکی ئەمەریکی بووم لـە یـەکێك لە شارەکانی ئەمەریکا، سەرسام بووم کاتێك وتیان کۆنگرە کاتژمێر شەشی بەیانی دەست بەکارەکانی دەکات، دانیشتنی یەکـەم شـەشـی بەیانی بوو، ئەوە بوو لەو کاتـەدا ڕۆیـشتم، من دڵنیا بووم لـەوەی کـە لەو کاتەدا هیچ کەسێك لـە هۆڵەکەدا ئامادە نابێت، کـێ لـەو بەیانییـە زووەدا دێـت؟ کاتێـك چـوومە ژوورەوە سەرسـام بـووم. چـی ببینـم؟! هۆڵەکـە پـڕ بـوو، لـە کاتێکـدا ئـەو هۆڵـە نزیکـەی سـێ هـەزار کـەس دەگرێت، بە زەحمەت شوێنێکم لە کۆتایی هۆڵەکە دەست کەوت. هەر ئـەو دکتـۆرە دەڵێـت لـەو سـەفەرەمدا لـە ئەمـەریکا، زۆرجـار ئـەمبینی کاتێك کە من ئەچووم بۆ نوێژی بەیانی. ئافرەتان و پیاوانی ئـەمریکی ئەگەڕانەوە بۆ شووقەو ماڵـەکانیان. لـە کاتێکـدا زۆر ساردو سـەرماش

بوو، کە پرسیم باشە چی ئەمانەی هێناوەتە دەرەوە؟ لەم سەرمایەداو بەم بەیانییە زووە بۆ سەر شەقام و ناو پارکە گەورەکان، لە وەڵامدا پێیان دەوتم: تەنها بۆ ئەوەی سەگەکانیان هەوای پاکی بەرە بەیان هەڵمژن.! کەواتە: هەستان لە خەو بەکاتی بەیانی زوو تەنها موسوڵمانان ئەنجامی نادەن، تاوەکو بەکارێکی گرانی بزانن.

سێهەم: با سەیری وڵاتانی خۆشمان بکەین لە ژیانی رۆژانەماندا، ئەگەر سەفەرمان کردبێت، ئەگەر دەوامەمان بووبیٚ، ئەگەر ئیشێکی گرنگمان بووبیٚ، چەند زوو لە خەو هەستاوین و هەندیٚ جار هێشتا بانگی بەیانی نەداوە کە بە خەبەر بووین، جا ئایا نوێژی بەیانییەکە لە پێشتر نییە؟

هەریەک لە ئێمە پرسیارێك لە خۆی بکات، باشە ئەگەر یەکێك پێمان بڵیٚ، بەیانی لە کاتی نوێژی بەیانی دا وەرە بۆ لام ئەوەندە پارەت ئەدەمیٚ، ئایا چەند بە وورياييەوە دەخەويت؟ ئایا هەموو خێزانەکەت ئاگادار ناکەیت کە ئاگادار بن و لە کاتی خۆی دا خەبەرت بکەنەوە؟ ئایا کاتژمێری ئاگادار کردنەوە دانانێیت بۆ ئەوەی کە پێشتر خەبەرت بکاتەوە و لە کاتی خۆی دا لەویٚ ئامادە بیت و پارەکەت لە کیس نەچێت؟

باشە توخوا نوێژی بەیانییەکەمان گرانبەهاتر نییە؟ بەڵیٚ ئەگەر دوو رکات نوێژە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی لە هەموو دونیاو ئەوەی لە دونیاشدا هەیە خێری زیاتر بێت، ئایا نوێژە فەرزەکەی بەیانی خێری لە هەموو گەردوون زیاتر نییە؟ ئایا تام و چێژو لەزەتی

سوژدە بردن بۆ خوای گەورە لەو بەرە بەیانەدا، بەهیچ پارەو پولْ و سەروەت و سامانێك دەپێورێت؟

ئیمانداری خۆشەویست: ئێستا با بزانین نوێژی بەیانی لای صالحان و پیاو باشان چۆن تەماشا کراوە؟

* ئیمامی مالیك لە ( الموطأ) دا ڕیوایەتی کردووە کە ( عومەری کوڕی خطاب) ڕۆژێکیان لە نوێژی بەیانی دا چاوی ئەگێڕا بۆ ( سلێمانی کوڕی ئەبی حەسمە) بەڵام نەیبینی، بۆ بەیانی حەزرەتی عومەر چوو بۆ بازاڕ، ماڵی سولەیمان لە نێوان مزگەوتی پێغەمبەرو بازاڕدا بوو، لە ڕێگاوە سەردانی ماڵی سولەیمانی کردوو لە دەرگادا (شفاء) کە دایکی سولەیمان بوو پێشوازی لە حەزرەتی عومەر کرد، حەزرەتی عومەر فەرمووی: دانانیشم تەنها هاتم بزانم بۆچی سولەیمان دیار نەبوو بۆ نوێژی بەیانی؟ ( ئەو سەردەمە پێیان سەیر بووە کەسێك لە نوێژی بەیانی لە جەماعەت نەبینرابێت. نەك هەر نوێژەکەی نەکردبێت! ) دایکی سولەیمان گووتی: ئەمشەو هەتاکو بەرەبەیان خەریکی شەو نوێژ بوو، بۆیە لە پێش نوێژی بەیانیدا خەوی لێکەوت و نوێژی بەیانییەکەی بە جەماعەت فەوتا. ( تەماشاکەن ئیمانداران، لەسەر شەو نوێژ جەماعەتەکەی بەیانی فەوتاوە، نەك لەسەر سەیری تەلەفزیۆن و دانیشتن لە مەجلیسی غەیبەت و باسی ئەم و ئەودا) حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئای بەخوا ئەگەر نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکەم. خۆشەویستترە بەلامەوە لەوەی شەو هەستم و هەموو شەوەکە زیندوو بکەمەوە.

* خالیدی کوڕی وەلید هەگیز جەنگی دەست پێ نەدەکرد، هەتا نوێـژی بـەیانی بـە جەماعـەت بـە لەشـکرەکەی نەکردایـە، ئـەمجا ڕاستەوخۆ دوای نوێژی بەیانی دەستی دەکرد بە هێرش کردن.

* یوسفی کوڕی تاشفین کە گەورەی دەوڵەتی (مرابطین) بوو، وە یەکێکـە لـە سـەرکردە ئازاو ناودارەکانی ئیسلام، وەختێ چوو بۆ جەنگی بەناوبانگی ( زەلاقە) و سەرکەوتنی بەدەست هێنا، کە نوێـژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجامداو ئینجا دەستی بە جەنگ کرد.

* قطز، سەرکردەی ناوداری ئیسلام لە جەنگی (عين جالوت) ی بە ناوبانگدا لە دژی تەتارەکان جەنگی دەست پێ کردو سەرکەوتنی بە دەست هێنا، ڕاستەوخۆ دوای نوێـژی بـەیانی جەنگەکە دەستی پێ کرد.

کەواتـە: کـاتی نوێـژی بـەیانی پـڕ بەرەکـەتترین کاتـە بـۆ هـەموو کارێـك، بۆیـە خواناسـان و سـەرکردەکانی موسـوڵمانان، ئەوەنـدە بەلایانەوە گرنگ بووەو کردویانە بەسەرەتای هەموو کارەکانیان، وە زانایان و وانە بێژان (مدرسين) لە حوجرەو مەدرەسەکاندا لە دوای نوێـژی بـەیانیان وانـەیان بـە خوێنـدکارو فـەقێکان وتووەتـەوەو مامۆستاو فەقێ زۆر لێی سوودمەند بوون.

بەڕێزان: تەنانەت کافرانیش زانیویانە نوێژی بەیانی چەند گرنگە بۆ موسوڵمانان.

ئـەوەتا کاتێـك جولەکـە سـاڵی ( ١٩٦٧) چـوونە نـاو قودسـەوەو مزگـەوتی( ئەقـصا )یـان سـوتاند، ڕۆژنامەنوسـێکی جولەکـە لـە

(موشی دیان) ی وەزیری جەنگی ئیسرائیلی پرسی: چی دەڵێی دەربارەی بیروباوەڕی موسوڵمانان کە دەڵێن لە قورئاندا هاتووە کە موسوڵمانان دەچنەوە ناو مزگەوتی قودس هەروەك و چۆن یەکەم جار چوونە ناوی و دواڕۆژ بۆ موسوڵمانانە؟ ئایا ڕای تۆ چییە دەربارەی ئەو بیروبۆچوونەی موسوڵمانان؟

( موشی دیان) ووتی: ئەوە ئەو کاتە دەبێت کە ژمارەی نوێژ خوێنان لە نوێژی بەیانی دا بە ژمارەی نوێژ خوێنانی ڕۆژی هەینی و ووتاری هەینی بن.

بەڵێ: ئەوەی دوژمنانی ئیسلام لێی دەترسن ئیمانی موسوڵمانانە، قەرەباڵغی مزگەوتەکانەو عیبادەتی ئیمانداران‌ە، نەك سیاسەتیان و ژمارەی ڕێکخراوەکانیان.

بەڵێ جولەکەو بە کرێ گیراوەکانیان گەرم وگوڕی مزگەوتەکان لە نوێژی بەیانی دا کە نیشانەی بە ئاگایی و ئیمان پتەوی ئەهلی ئیسلامە، بەترس دادەنێن ، نەك دەنگ و سەدای سیاسی و بینای گەورەو ڕازاوەی مزگەوت.

ئیمانداران: ئەگەر بچینە خزمەت قورئان، دەبینین سەرنجێکی سەیرو گرنگ لە سوڕەتی (الإسراء) دا هەیە، کە لەم سوڕەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴾ الأسراء٧٨.

هەر ئەم سورەتەشە کە باس لە نزیک بونەوەی لابردنی (بەنی ئیسرائیل) دەکات و موژدە دەدات کە ئوممەتی موسوڵمانی باش لە شوێنی ئەواندا دادەنرێت، کە سەرکردایەتی زەوی دەخاتە دەست ئەو ئوممەتە موسوڵمانە، ئەو قیادەو سەرکردەیەش تەسلیم بە کەسانێك دەکات کە زۆر جوان پارێزگاری لە نوێژی بەیانی دەکەن.

بەڵێ لە سورەتی(الإسراء) دا باس لە سەرکەوتن ناکات تەنها دوای باسی نوێژی بەیانی نەبێت.

* صلاح الدین ی ئەیوبی بەردەوام هانی سەربازەکان و موسوڵمانانی ئەدا کە نوێژ لە مزگەوتدا بکەن، بە تایبەتی زۆر ئاگاداری نوێژی بەیانی بن، چونکە باش تێگەیشتبوو لەو ڕاستییەی کە سوپایەك ئەگەر نوێژی بەیانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا بکەن، سەرکەوتوو ئەبن بەسەر دوژمنەکانیان دا لەبەر ئەوەی چاو نەترس و خاوەنی ئیرادەیەکی پۆڵاین دەبن.

هەروەها خوای گەورە دەربارەی تێدا چوونی گەلی( هود) دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ﴾.

باشە بۆ خوای گەورە کاتی بەرەبەیان دیاری دەکات بۆ لەناو بردنیان، ئایا هەموو کاتێك کاتی خوای گەورە نییە لە بەیانیان و نیوەڕوان و ئێواران دا، بۆ بەیانی بەتایبەتی؟ لەبەر ئەوەی کاتی

بەیانی کاتی گۆڕان و گۆڕانکاریە، سەرەتای ڕووناکی و نەمانی تاریکییە.

هەر لەبەر گرنگی کاتی بەیانییە کە خوای گەورە سوێند دەخوات بەو ئەسپانەی کە لە ڕێی خوادا جەنگ دەکەن، بەو ئەسپانەی کە هێرش دەبەنە سەر دوژمن لە بەرەبەیاندا، ﴿وَٱلۡعَـٰدِيَـٰتِ ضَبۡحً۬ا ﴿١﴾ فَٱلۡمُورِيَـٰتِ قَدۡحً۬ا ﴿٢﴾ فَٱلۡمُغِيرَٲتِ صُبۡحً۬ا ﴿٣﴾﴾.

هەروەها هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیساو بڵاو بونەوەی دادپەروەرەی و خۆشی، لە کاتی نوێژی بەیانی دا دەبێت، یا (الله) چەند ناسکە ئەو چرکە ساتانە، ئەمە بە ڕێکەوت نییە، ئەوە چرکە ساتەکانی نوێژی بەیانییەو چرکەکانی گۆڕانە.

بەڕێزان: ئەو هۆکارانەی کە یارمەتیت ئەدەن بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، لە کاتی خۆیدا ئەمانەن:.

١. ئیخڵاص و دڵسۆزی: کە دڵ و دەروونت زۆر پاك بکەیتەوەو مەبەستت بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، چەندە پارە خۆشەویستێك لە خۆشی پارەکەی هیچ هەست بە ناڕەحەتی لە خەو هەستان ناکات، لەو تاریکی شەوو شیرینی خەوو ناو جێگای گەرمەدا، چونکە پارەکەی زۆر بەلاوە مەبەستە، ئیمانداری موخڵیس و دڵسۆز دەبێت کە بیری ڕەزامەندی خوای کردەوە، بیری کردەوە کە لەم بەرەبەیانەدا خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت تەماشای دەکات و

وەڵامی دووعاکانی ئەداتەوە، ئەوە هیچ نارەحەتییەك نابینێت لە هەڵسان بۆ نوێژی بەیانی.

٢. عەزم و ئیرادەی بەهێز: نەك هەر لە ئێوارەوە نیەتی ئەوە بێنێت کە بۆ نوێژی بەیانی خەبەری نابێتەوەو لە خەو هەڵناستێت.

٣. خۆت لە گوناه بپارێزە: چونکە گوناه و تاوان دڵ تاریك دەکات و لاشە قورس دەکات.

٤. بەدەم خوێندنی زیکرو دوعاو پاڕانەوەوە بخەوە ( نەك بەدەم غەیبەت کردنەوە).

٥. شەو زوو بخەوە، هەر لە دوای نوێژی عیشاوە بخەوە، بۆ ئەوەی بەیانی زوو لەخەو هەستیت، لە ڕۆژئاوادا خەڵکی شەو زوو دەخەون و بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستن، بۆیە کارەکانیان لەکاتی خۆیدا ئەنجام ئەدەن.

٦. ئەگەر کەسێکت لەگەڵ بوو لە ماڵەوە ، پێی بڵێ کە ئەگەر زووتر خەبەری بویەوە باتۆش خەبەر بکاتەوە بۆ نوێژی بەیانی.

٧. سەعاتی جەرەس دابنێ بۆ ئەوەی کاتی نوێژی بەیانی خەبەرت بکاتەوە.

ئیمانداران: ئێستا با بەرەکەتی کاتی بەرەبەیان لە ڕوانگەی زانستییەوە باس بکەین:

١. زانستی پزیشکی دەڵێت: بیرتیژی مۆخی مرۆڤ لە سەعاتەکانی سەرەتای ڕۆژدا بە پلەیەکی زۆر بەرزترە لە کاتەکانی تر، لەبەر ئەوە پیرۆزی لەوەدایەو بەرەکەتیش لەوەدا زیاترە کە دوای نوێژی بەیانی

مرۆڤ نەخەویتەودر بەتایبەت خویندکاران دوای نویژی بەیانی دەست بکەن بەسەعی کردن، نەك تا نیوەشەو سەعی بکەن بەلام دوای نوێژی بەیانی بخەونەوە یان هەر هەلنەستن بۆ نویژی بەیانی.

٢. زانایان دەڵێن: شنەبایەك لە سەعاتەکانی یەکەمی بەیانی دا هەڵدەکات کە هیچ سەعاتێکی تری شەووڕۆژ بەو جۆرە نییە، کەش و هەوا نەرم و فێنك دەکات، مرۆڤ بەئاسانی هەستی پێ دەکات و ئەگەر مرۆڤ لەو کاتەدا بە ئاگا بێت و نەخەوێت. تەواوی لاشەی بەو هەوا پاکە ئیسراحەت دەکات و گەشەو نەش و نما دەکات.

٣. لە بەیانیاندا هەوا زۆرترین ڕێژە لە گازی (ئۆزۆن)ی تێدایە، ئەم گازە بە هەڵاتنی خۆر نامێنێت، ئەم گازەش سوودێکی باش بە کۆئەندامی هەستیاری مرۆڤ دەگەیەنێت، بەتەواوی کاری فیکری و ماسولکەیی گەشە دەکات بۆ ئەو کەسەی لەو کاتەدا بە خەبەر بێت و نەخەوتبێت.

٤. تیشکی خۆر لە کاتی هەڵاتنی دا نزیکە لە ڕەنگی سوورەوە، ئەم ڕەنگە چالاکی زیاد دەکات، هەروەها ڕێژەی تیشکی سەروو وەنەوشەیی زۆرترین بەشی لەو کاتەدایە بۆ ئێمە، کە ئەم تیشکە هاندەرە بۆ پێست کە ڤیتامین (D) درووست دەکات.

٥. کاتێك خانەکان تێر دەبن بەگازی ئۆزۆن. ئەچێتە سووڕی خوێنەوە. هەروەها گازی (یوم) یش کە سییەکان پاك دەکاتەوە.

٦. زۆرترین ڕێژەی (کورتزوم) لە بەیانیاندایەو لە ئێوارانذ؛ کەم دەکات، دیارە (کورتزوم) ئەو مادەیەیە کە چالاکییەکانی لەش زیاد دەکات.

٧. پزیشکە پسپۆڕەکان لە ( کۆمەڵەی پزیشکانی دڵ لە ئەردەن) ڕایان گەیاند کە جێبەجێ کردنی نوێژی بەیانی لە کاتی خۆی دا، باشترین هۆکارە بۆ چارەسەرو خۆ پارێزی لە نەخۆشییەکانی دڵ و ڕەق بوونی دەمارەکانی خوێن، کە ئەم نەخۆشییە دەبێتە هۆکاری جەڵدەی دڵ و سەکتەی دەماخ، هەروەها دەرکەوت کە کاتێك مرۆڤ لە خەوی درێژخایەندایە دڵی لە دەقیقەیەکدا (٥٠) جار لێدەدات، کە ئەمە دەبێتە هۆی نیشتنی چەوری و خوێ و مادەکانی تر لە بۆرییەکانی خوێن و شاخوێنبەرەکان دا، بەتایبەتی شا خوێنبەری تاجی بەهۆی ئەوەوە دەگیرێت کە زۆر مەترسیدارە.

ئیمانداران: ئێستا با بزانین سزای ئەو کەسە چییە کە لەبەر ئەوەی خەوەکەی لێ تێك نەچێت نوێژێکی فەرز تەرك دەکات، کە بە تایبەتی نوێژی بەیانی بەهۆی حەزکردن بە خەو لەو کاتەدا زۆرجار دەفەوتێت،

ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە خەونمدا چەند دیمەنێکم نیشان درا، یەکێك لەو دیمەنانە ئەوە بوو کە پیاوێك لەسەر پشت ڕاکشابوو، یەکێکیش بە پێوە وەستا بوو بەردێکی گەورەی بە دەستەوە بوو، ئەم بەردە گەورەیەی دەکێشا بەسەری ئەو کەسەدا کە لەبەردەمیدا ڕاکشابوو،

بەردەکە لەسەر سەری دەخولایەوەو سەری کابرا پارچە پارچە دەبوو، کاتێك دەچوو بەردەکە بێنێتەوە سەریری دەکرد سەری کابرا خۆی لی هاتووەتەوە، دیسانەوە وەکو جاری یەکەم بەسەری کابرای دەکێشایەوەو بەم جۆرە بەردەوام دەبوو، بۆ ئەوەی بەردەوام لە ئازارو ئەشکەنجەدا بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: لە خەوەنەکەمدا جوبریلم لە گەڵ دا بوو، ووتم ئەی جوبریل ئەو کەسە تاوانی چییە کە ئاوا بەو شێوە پڕ ئازارە بەردەوام سزا ئەدرێت، فەرمووی: ئەی محمد ﷺ ( هذا الذي يأخذ القُرآن ويرفضه وينام عن الصّلاة المكتوبة ).

ئەوە ئەو کەسەیە کە کە قورئانی بۆ ڕوون کراوەتەوە و بە تەواوی تێی گەیشتووەو وەری گرتووە، کەچی بەرپەرچی ئەداتەوەو بە قسەی فەرمایشتەکانی قورئان ناکات، وە تاوانێکی تریشی ئەوەیە کە ئەخەوێت و گوێ بە نوێژە فەرزەکان نادات. واتە خەوەکەی پی خۆشتر و چاکترە لە نوێژەکەی. لە لای ئەو لە جیاتی ( الصّلاة خيـر من النوم ) بەپێچەوانەوەیە ( النومُ خير من الصلاة ).

جا ئەی ئەو کەسانەی کە تا ئێستا بەیانییەك نەبووە بە مەبەستی بەجی هێنانی نوێژی بەیانی لە ناو جێگای خەوتنەکەتان هاتبنە دەرەوەو خەوتان لە خۆتان تۆراندبێت، هەر ئێستا تەوبە بکەن و نوێژی بەیانی بۆ خەو مەفەوتێنن. پێش ئەوەی بگەینە ئەو سزایەی کە پێغەمبەری دڵسۆزمان هەر لە دنیادا پێی ڕاگەیاندوین کە بۆ نوێژ نەخوێنانی بەیانی بە تایبەتی دیاری کراوە

* لە فەرموودەیەکی تردا کە هەردوو پێشەوای فەرموودە (بوخاری وموسلیم) ڕیوایەتییان کردووە، پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فەرموویەتی.( إِنَّ أَثْقَلَ الصَلاةَ عَلى المُنافقينَ صَلاةَ العشاء وصَلاةَ الفجرِ) واتە: قورسترین نوێژ لەسەر مونافیق و دوو ڕووەکان ، نوێژی عیشاو بەیانی یە.

پەنا دەگرین بەخوا لە نیفاق ودووڕوویی کە لە هەموو بەڵاو نەگبەتییەك خراپترە، کە نیشانەیەکی ئەوەیە، مرۆڤی مونافیق زۆر بە تەمەڵی و بێ زەوقییەوە نوێژەکانی بە گشتی دەکات و وە قورسترین نوێژ بەلایەوە نوێژی عیشاو بەیانییە. چونکە بەپێچەوانەوە مرۆڤی ئیماندار بە ئەنجامدانی نوێژ خۆشترین تام و چێژ وەردەگرێت، چونکە لە خزمەت پەروەردگاری دا دەدوێت و داواکاری پێشکەش دەکات، وە نیشانەی ئیمانداری ڕاستەقینە بە پێچەوانەی مرۆڤی دوو ڕووەوەیە کە زۆرترین تام و لەزەت و خۆشی و ئاسوودەیی و دڵئارامی لە نوێژی عیشاو بەیانی وەردەگرێت.

بەڕێزان: بابزانین فەوتانی یەك نوێژی بەیانی چ کاریگەرییەکی لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ داناوە، یەکێك لەو صەحابە بەڕێزانە کە هەموو تەمەنی خۆی لە منالییەوە تا وەفاتی پێغەمبەر ﷺ کە ماوەی نۆ ساڵ بوو- شەوو ڕۆژ لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، ئەنەسی کوڕی مالیکە کە دەفەرموێت: لە دوای وەفاتی پێغەمبەری نازدارەوە ﷺ هیچ شەوێك نەبووە کە من لە خەومدا بە خزمەتی نەگەیشتبم، ئەمجا ئەنەس لە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خواو یاد کردنەوەی

ڕۆژە خۆشـەکانی کـە لـە خزمـەتی ئـەو سـەروەرو پێـاڵارەدا بەسـەری بردووە دەستی دەکرد بەگریان.

ئـەم صـەحابییە بـەڕێزوو پایـە بڵنـدە لـە ژیانیـدا بەشـداری دەیـان جەنگی دژ بە کـافران و خوانەناسـانی کـردووە، بـەڵام هـەرکاتێك بیری (فـەتحی توسـتەر) ی بکەوتایەتـەوە، دەگریـا، ( توسـتەر) شـارێکی فارسی بوو، قەڵاکانی زۆر بەهێز بوون، موسوڵمانەکان ساڵ ونیوێك گەمارۆیاندا، ئەمجا لە دوایدا کەوتە دەستی موسوڵمانان، سەختترین جەنگی موسوڵمانان کە ڕووبەڕووی خوانەناسان بوونەتەوە لە شاری ( توستەر) دا بوە.

باشـە ئـەم صـەحابە بـەڕێزە لـە جیـاتی ئـەوەی دڵخـۆش بێـت کـە بەژداری ئەو جیهادەو ئەو فەتحە گەورەیەی کردووە، ئەی باشە بۆچی دەگریـا؟ هۆیەکـەی ئەمەیـە: دەرگـای قـەڵای( توسـتەر) بـە چـەند سەعاتێك پێش نوێژی بەیانی کرایەوەو موسوڵمانەکان فەتحیان کرد، سـوپای ئیـسلام ڕژایـە نـاو شـارەکە، جـەنگێکی ترسـناك ڕووی دا لـە نێوان سێ هەزار موسوڵمان بەرامبەر سەدوپەنجا هەزار جەنگاوەری فارسی، جەنگێکی زۆر خوێناوی و ترسناك بوو، هەموو چرکە ساتێك مردن ئامادەیی هەبوو لە لای سەربازانی هەردوولا، موسوڵمانەکان لـە مەترسـیدا بـوون، بـەڵام لـە کۆتایـدا، بەیارمـەتی خـوای گـەورە، موسـوڵمانەکان سـەرکەوتن، ئـەویش لـە دوای هـەڵاتنی خـۆر بە چـەند سـەعاتێك، موسـوڵمانەکان کاتێکیـان زانـی کـە نوێـژی بـەیانییان لـە

دەست چوو، لەو جەنگە ترسناکەی کە لە شەوەوە هەتا خۆر هەڵاتنی خایاند.

بەڵێ لەو چەند سەعاتەی تێکرژاندنیاندا نەیانتوانی لە کاتی خۆیدا نوێژی بەیانی ئەنجام بدەن، لەبەر ئەوە بوو ئەنەسی کوڕی مالیك بۆ یەکەمین جار لە ژیانی دا نوێژی بەیانی لە دەست چوو، لە تاوی نوێژی ئەو بەیانییە دوای چەندین ساڵ هەر دەگریا، لە کاتێکدا لەبەر عوزرێکی گەورە کە جەنگ و جیهاد بووە نەیتوانیوە لە کاتی خۆی دا ئەنجامی بدات. هەرچەند ئەوانەی دەوروبەری دڵیان دەدایەوە، بەڵام ئەنەس دەیفەرموو: توستر چییە؟ لە کاتێکدا نوێژی بەیانیم لە دەست چوو، هەموو دونیا نابێتەوە بەو نوێژی بەیانییەم کە لە دەستم چوو.

ئەی گەنجانی بەڕێز: تکاتان لێدەکەم هەر لەم ڕۆژە موبارەکەداو هەر ئێستا لەناو دڵی خۆتاندا کە ئاوا باسی گەورەیی نوێژی بەیانیتان بیست، بڕیار بدەن کە (ان شاءالله) بە هیچ شێوەیەك نەهێڵن نوێژی بەیانیتان بفەوتێت، ئای چەند خۆشە کاتێك کە پیر بووی شانازی بەوەوە بکەی کە بە گەنجی نوێژی بەیانیانت هەمووی لە کاتی خۆی دا ئەنجام داوە، ئای خۆشحاڵییەکەت چەندەی تر زیاد دەکات، ئەگەر نوێژەکەی بەیانیت لە مزگەوتدا بە جەماعەت ئەنجام دابێت، ئەمە شایانی ئەوەیە کە مرۆڤ لە پیری دا شانازی پێوە بکات، نەك وەکو ڕیاو ڕوپامایی، بەڵکو شانازی بەوەی کە لە تەمەنی جوانی

گەنجییەتی دا لە جیاتی کاری لابەلاو نابەجێ، لە خزمەت پەروەردگاردا بووەو نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام داوە.

لە کۆتایی ئەم ووتارەدا ئەم دوو موژدەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیەنم بە هەموو ئەو بەڕێزانەی کە لە تاریکی شەودا بۆ نوێژی عیشاو بەیانی دەچن بۆ مزگەوت و تاریکی شەو نابێتە ڕێگر لەبەردەم هاتوچۆی مزگەوتیان:. خۆشەویستمان دەفەرموێت:( بَشِّر المَشائينَ في الظُلَمِ إلى المَساجِدِ بالنوُّرِ التامِ يَومَ القيامَةِ ). حَديث صَحيح رواهُ إبن ماجه وَ إبن خزَيمَة وَالحاكم انظر (صَحيح التَرغيب)٤٢٣.

واتە: موژدە بدە بەو کەسانەی کە لە تاریکی شەودا دەچن بۆ مزگەوتەکان بۆ ئەنجامدانی نوێژی عیشاو بەیانی، موژدەیان بدەنێ بە نورێکی تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا.

موژدەی دووەم: فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە ئەنەسی کوڕی مالیك بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ( مَن صَلّى الصُبحَ في جَماعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذكُرُ الله حَتّى تَطلُعَ الشَمسَ، ثمَّ صلّى رَكعَتَينِ كانت لَهُ كَأجرِ حَجَّةٍ وَ عُمـرَةٍ). ئەنەس دەفەرموێت: قال رسول الله ﷺ [تامَّةٍ تامَّةٍ تامَّةٍ] حَديث حسَن. رواهُ الترمذي وَ صَحَّحَهُ الألباني.

واتە : هەرکەسێك ( ژن بێت یان پیاو کوڕ بێت یان کچ) نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات، ( لەم زەمەنەدا ژن دەتوانن لەگەڵ مێردەکانیان یان لە گەڵ منداڵەکانیان لەماڵەوە نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکەن) ( کچ دەتوانێت لەگەڵ دایکی یان براو خوشکەکانی

دا لە ماڵەوە بەجەماعەت نوێژی بەیانی بکەن) جا لە دوای نوێژی بەیانییەکە کە بە جەماعەت کردویەتی، لە شوێنی نوێژەکەی خۆی نەجوڵێت و دانیشێت و زیکری خوا بکات. ( جا زیکری خوا مەرج نییە هەر ( سبحان الله و لا اله الا الله ) بێت، بەڵکو قورئان بخوێنێت، موتاڵای تەفسیری قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەرو پیاو چاکان بکات، یان خوێندکارە، بە دەرس و وانەکانی خوێندنگایدا بچێتەوەو بەو نیازەی کە خوێندکارێکی زیرەك بێ و بە زیرەکی و نمرە بەرزی خۆی، نموونەی خوێندکارێکی موسوڵمانی مولتەزیم پێشکەش بە مامۆستاو خوێندکارە هاوڕێکانی بکات و بە بینینی ئەم جوانی ئیسلامیان بێتەبەرچاو، بەم نیەتەوە سەعی کردن دوای نوێژی بەیانی هەر بەزیکری خوا حیسابە، جا کەسێك ئاوا لە شوێنی نوێژی بەیانییەکەی دابنیشێ و زیکری خوا بکات هەتا ئەو کاتەی کە خۆر هەڵدێت، ئینجا هەستێ و دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو ( صلاة الضحی ) بکات، ئەوە وەکو ئەوە وایە کە حەج و عومرەیەکی سوننەتی کردبێت، ئەنەس دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا وەکو ئەوەی گومانی ناو دڵەکان لابەرێت، کە وەکو ئێمە ئێستا پێمان عەجیبە چۆن ئەمە پاداشتی حەج و عومرەیەکی سوننەتی هەیە؟! بۆیە فەرمووی: (تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ). حەج و عومرەی سوننەتی تەواو، تەواو ، تەواو .

واتە: بێ کەم و کوڕی لە پاداشتی حەج و عومرەی سوننەت! الله اکبر لە سۆزو بەزەیی خوا بەرامبەر ئیماندارانی ئوممەتی محمد

المصطفى ﷺ کە ئاوا ڕێزیان لێدەگرێ و بەکردەوەیەکی ئاسان و کەم پاداشتێکی ئاوا گەورەیان پێ دەبەخشێت. هەزاران هەزار سوپاس بۆ خوای گەورەو بەخشندە.

بەڵێ وولات بەو پیرو گەنجانەوە جوانەو پێشکەوتووەو ئومێدی خێری لێ دەکرێت و دوژمن پێی ناوێرێت و میللەت خیانەت لە حکومەتی خۆی ناکات، کە لە نوێژی بەیانی دا لە مزگەوت و ماڵەکاندا بە ئاگابن و سوژدەو ڕکوع بۆ خوای خۆیان ببەن، بەڵام ئەو گەل و میللەتەی گەنج و لاوەکانی تا نیوەشەو خەریکی خواردنەوەی عەرەق بن و لە قومارخانەو بلیاردا شەو بکەنەوەو بەیانیش بەگەرمی ڕۆژیش لەسەریان بە خەبەر نەیەن، زۆر بەئاسانی دەکڕدرێ و دەفرۆشرێ و مەردو پاڵەوانی تێدا درووست نابێت.

ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە فەرموویەتی:

لا يُصنَعُ الأبــطالُ إلاّ ... في مَساجِدنا الفــساح
في رَوضَةِ القرآن في ... ضِلِّ الأحاديثِ الّحاح
شَعبٌ بِغــيرِ عَــقيدَةٍ ... وَرَقٌ يَذريهِ الرِّيــاح
مَن خان (حيَّ عَلى الصَّلاة) ... يَخونَ (حَيَّ عَلى كِفاح)

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: بە هەموو شێوەیەك لە هەوڵی ئەوەدا بن کە نوێژی بەیانی لە کاتی خۆی دا ئەنجام بدەن و هەتا بۆتان دەگونجێت هەوڵ بدەن لە مزگەوتدا نوێژەکەتان بە جەماعەت ئەنجام بدەن، جا ئەگەر هاتوو جارێك لە جاران بە بێ کەمتەرخەمی خۆت خەبەرت نەبوەوە، ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریمان دەکات و

دەفەرموێت: ( مَن نَسيَ صَلاةً، أو نامَ عَنها، فَكَفَّارَتها أن يُصلِّها إذا ذَكَرَها ).

**واتـە: هەرکەسـێك نوێـژێکی لـە بیرچـوو، وای زانـی نوێژەکـەی کردووە، بەڵام دوای هاتنی نوێژێکی تر ئەمجا بۆی دەرکەوت کە ئەو نوێـژەی پێـشووی نـەکردووە، یـان لـە خـەو خەبـەری نـەبووەوە، بـەڵام بەبیٚ کەمتەرخەمی خۆی، ئەوە کەفارەتی ئەو نوێـژە فەوتاوە ئەوەیە کە نوێژەکە بکات هـەرکاتێك کە بیری هاتـەوە یـان لـە خـەو خەبـەری بوەوە.**

**ئـەوا دەچـینە خزمـەت مـانگی پـیرۆزی ڕەمـەزان و باشـترین هـەل و فرسەتە بۆ ئەوەی لەسەر نوێژی بەیانی خۆمـان ڕابهێنین کە لەکاتی خـۆی دا ئـەنجامی بـدەین، وە بەجەماعـەت لـە مزگـەوت دا ئـەنجامی بدەین.**

**داواکارم لە خوای پـەروەردگار:**( اللهمَّ أعنّا علَى ذِكرِكَ وَ شُكرِكَ وَحُسنِ عِبادَتِكَ ).

## سەرچاوەکان:.

**١. المجموعة الثانية من صحيح وصايا الرسول ﷺ**

**سعد يوسف ابوبكر ج١ ص٣٦٢.**

**٢. نوێژی بەیانی ، چۆن هەستین و بەردەوام بین؟ فاتح شێخ محمد سمیع.**

**٣. الترغيب والترهيب للحافظ المنذري .**

الحَمدُ لله رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ اجمَعينَ:

هەزاران هەزارجار سوپاس بۆ خوای پەروەردگارو درووود و سڵاوات لەسەر ڕوحی هەمیشە زیندوی پێغەمبەری نازدار ﷺ کەوا ئەمساڵیش گەیشتینەوە خزمەت مانگی پیرۆزی ڕەمەزان، هەموومان لەم ماڵی خودایەداو لەم کاتە پیرۆزەدا لە ناخی دڵمانەوە، بەتەواوی هەستمانەوە، کە هەموو خانەکانی لاشەمان لەگەڵیا بجووڵێ و ئەم هەستە پڕ شادومانییە لە زمانمانەوە بێتە دەرەوە، دەڵێت:

بە خێرهاتی مانگی پڕ نوور
شەمعی دەستمان بۆ ڕێگای دوور
بەخێرهاتی سومبولی واتای خواناسی
هەوێنی بۆ خوا سوڵحان
مەرحەبا بارانی ڕەحمەت
کڵاو ڕۆژنەی ماڵی دڵمان
بە خێرهاتی یوسفی نێو دوانزە برا
لە دەیجور و یەڵدای ساڵدا، بوی بە شەمع و بووی بە چرا
بە خێرهاتی
لە ئێستاوە ژیلەمۆی ئیمانی دڵمان
چاوەڕوانی باوەشێنی شاپەڕی پڕ سۆزی تۆیە
بەخێرهاتی کەناری ئارام بەخشی دڵ
کەشتی هیوا دەریای ئیحسان

بەخێرهاتی لەگەڵ خۆتدا

جوانترین دیمەنت هێنا

تەپڵی پارشێو، سەڵای بەیان، سفرەی بەربانگ

ئاپۆڕای نوێژی تەراویح

دووعای بەکوڵ، خەتمی قورئان

بەخێرهاتی کەژاوەی قافڵەی خواناسی

بەخێرهاتی مانگی غوفران، بەخێرهاتی مانگی قورئان.

ئیمانداران: وا تازە دەچینە خزمەت سەرەتای مانگی ڕەمەزان و بە بینینی مانگی یەك شەوە بە فەرموودەی: (صُوموا لِرُؤيَتِــهِ)دەست دەکەین بەڕۆژو گرتن و داوا دەکەین لە خوای میهرەبان کە مانگی خێرو خۆشی بێت، هەروەکو پێغەمبەری چاوساغ و دڵسۆزمان، نووری چاومان حەزرەتی محمد ﷺ هەرکاتێك مانگی تازەی دەبینی دەیفەرموو:( أَهِلَّهُ عَلَينا بالأمنِ وَ الأيمان وَ السَّلامَةِ وَ الإسلام. رَبّي وَ رَبُّكَ الله، هِلالُ رُشدٍ وَ خَيرٍ) حَديث حَسَن. رَواهُ أحمد في مُسنده.

واتە: خوای گەورەو میهرەبان داوات لێدەکەم ئەم مانگە نوێیە بە هێمنــی و ئیمانــەوە بەســەرماندا هــەڵبێت، وە بەئاشــتی و ئیسلامەتییەوە بچینە ناوی، ئەی مانگی جوان خوای من و خوای تۆ هەر (الله) یە هەردووکمان بەندەو دروستکراوو ملکەچی(الله) ین، مانگی پڕخێرو بەرەکەت و خۆشی بیت.

بەڵێ خۆشەویستان: بەووردی سەرنجی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن تەماشاکەن چۆن ئەمن و ئەمان لە

هەرشوێنێك بێت ئیمانیش وا لە وێیە، ئاشتی وئارامی لە هەر جێگایەك دا باڵی كێشابێت، ئیسلامەتی و دینداری و خواناسی وا لەو شوێنەدا، جا ماڵ ئەمین وپڕ لە ئاشتی بێت، دوور لە دەمە دەمەو شەڕە قسەو ڕق وقین بێت، ژن ومێردو جگەرگۆشەكان بە ئارام بن لەگەڵ یەكترو حورمەت و ڕێز لە نێوانیاندا بڵاو بكەنەوە، ئەوە ئەو ماڵە پڕ دەبێت لە دینداری و خواناسی و ئیمان و ئیسلامەتی، ئەو ماڵە پڕ لە ئاشتییە سوود لە بەرەكەتی ڕۆژووی ڕەمەزان وەردەگرن، دەبا هەرلە ئەمڕۆوە بڕیار بدەین ئاشتی و خۆشەویستی باڵ بكێشێت بەسەر ماڵ و خێزانەكانمان دا، إن شاءَالله.

بەهەمان شێوە لە گەڕەك و گوند و شارو وڵاتدا ئارامی وئاشتی هەبێ و گرمەو گاڵەو دەنگ بەرزكردنەوەو دەنگی گوللە و بۆنی بارووت لە ئارادا نەبێت، ئەوە ئیسلامەتی و ئیمانداری بە حەق، وا لەو جێگەو وڵاتەدا جێی خۆی گرتووەو خەڵكی سوود لە عیبادەت و نوێژوڕۆژو جومعەو جەماعەت دەبینن، وە بە دڵنیاییەوە سوودمەندترین خەڵكی لە ئەمن و ئاسایشی وڵات و هێمنی گەڕەك وشار موسوڵمانانن. هەر بۆیە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ ئەمن وسەلامی پێش ئیمان وئیسلام خست.

كەواتە: ئەوە گەورەترین بوختانی ناحەزانی ئیسلامە كە دەڵێن: ئیسلام ئاینی ترس وتۆقاندن و داپڵۆسین ونا ئارامییە بۆ خاك و خەڵكی، بۆ وڵاتان و میللەتان، نەخێر ئیسلامی ئێمە لەو جێگایە گەشە دەكات كە دوورە لە شەڕو ئاژاوەو خوێن ڕشتن و ترساندن و

داپڵۆسین، هەر بۆیە داواکارم لە حکومەت کە لەم مانگی ڕەمەزانەدا ، لە هەمووکات زیاتر گرنگی بەلایەنی هێمنی وئاسایشی وڵات بدات و موسوڵمانانیش هاوکاری دەزگاکانی ئاسایش و پۆلیس بکەن بۆ لەناو بردنی هەر دەستێکی تێکدەرو ئاژاوەگێڕ، وە مزگەوتەکان شەووڕۆژ کراوە بن و چاوی دەزگاکانی وەزارەتی ناوخۆ لە جیاتی لەسەر گەنجی مزگەوت بێت، بالەسەر ئەو کەسانە بێت کە نایەن بۆ مزگەوت، چونکە ئێمەی ئەهلی ڕۆژو بەبەرەکەتی ڕۆژووی ڕەمەزان وا پەروەردە بووین، کە لە مانگی ڕەمەزاندا نەك هەر شەڕ بە خەڵکی نافرۆشین و ئاژاوە درووست ناکەین، بەڵکو ئەگەر کەسانێکی دوور لە دینیش شەڕمان پێ بفرۆشن، ئێمە لێیان ناکڕین و دەڵێین پێغەمبەری پێشەوامان فێری کردووین:( فَأَنْ سابَّهُ أَحَدٌ أَو قاتَلَهُ، فَلْيَقُـلْ: إِنِّـي صائِمٌ ) واتە: ئەگەر کەسێك قسەی ناشیرینی پێ ووتین یان شەڕی پێ فرۆشتین، پێی دەڵێین: من بەڕۆژووم ، من لە فێرگەی ڕۆژودا فێری هێمنی و سەلامەتی بووم و وەڵامت نادەمەوە.

بەڵێ ئیمانداران: هەروەکو هەموو موسوڵمانان بە گەورەو بچووکەوە، بەژن وپیاوەوە، جۆش وخرۆش و گەشی وخۆشی بەدەم وچاوو ناومال وناوبازاڕو دائیرەکانیانەوە دیارە، لە خۆشی هاتنی مانگی ڕەمەزان، ئەوە بەڕاستی لە جێگای خۆیدایەو، مانگی پیرۆزی ڕەمەزان مانگی ئەوەیە کە ببێتە مایەی دڵخۆشی ئیمانداران لەبەر ئەوەی:

(١)

یەکەم: مانگی خێروبەرەکەتە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا بە خەڵکی دەفەرموو: (يأَيُّها النّــاسُ أتــاكُم شَهرُ رَمَضان. شَهرُ بَرَكَةٍ).

ئەی خەڵکینە: ئەوە مانگی ڕەمەزانتان بەرەو ڕووهات، مانگێکی پڕ بەرەکەت وخێرە، هەزاران هەزار سڵاوات لە دیدارت ئەی پێغەمبەری خۆشەویستمان بەڕاستی جوانت فەرموو: مانگی بەرەکەت، ئایا کێ هەیە کە هەست نەکات بەو هەموو خێرو بەرەکەتەی کە لەم مانگەدا بەسەرماندا دەڕژێت؟ سەر سفرەو خوانی بەربانگمان چەند ڕازاوەیە، ئەو خواردنە چەند بەتامە؟! کە هەرگیز پێش ڕەمەزان ئاوا تام وچێژمان لێ نەبینیوە، ئەوەی پێش ڕەمەزان هەژاری و دەست کورتی نەیهێشتووە خواردنێکی باش بخوات، بەبەرەکەتی مانگی ڕەمەزان خوای گەورە دڵی دەوڵەمەندی دەوروبەری بۆ نەرم دەکات و ئەویش لە هەموو لایەکەوە ڕزق وڕۆزی ڕووی تێدەکات، ئەوەتا دەبینین چ جۆش وخرۆشێك دەکەوێتە بازاڕەکانەوە، کە ئەگەر دووکاندارە بەڕێزەکان بێ ویژدانی نەکەن، بە ئاشکرا بەرەکەت لە کارو کەسابەت و کڕین وفرۆشتنیان دا بەدیار دەکەوێت، لەم مانگەدا بەقەدەر چەند مانگ پارەیان دەست دەکەوێت، وە زۆر بە ئاشکرا بەرەکەتی زیاد بوونی دین وئیمان دێتە بەرچاو کە ناومالٚ ومزگەوتەکان دادەپۆشێت، کەواتە دەبێت دڵخۆش بین بە مانگی ڕەمەزان ، چونکە مانگی بەرەکەتە.

دووەم: خواپەرستی وتاعەت لە مانگی ڕەمەزاندا ئەجرو پاداشتی زیاترە لە غەیری مانگی ڕەمەزان، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: (مَن تَقَربَ فيه بِنافلَة كَمَن أَدّى فَريضةً فيما سواهُ. وَمَن أَدّى فيهِ فَريضَةً كانَ كَمَن أَدّى سَبعينَ فَريضَةً فيما سِواهُ).

واتە: هەرکەسێك لە خوای گەورە نزیك بێتەوە بە ئەنجامدانی سوننەتێك، ئەوە وەکو ئەوە وایە فەرزێکی ئەنجام دابێت، کە دیارە خێرو پاداشتی فەرز زۆر زیاترە لە سوننەت، وە هەرکەسێك فەرزێك ئەنجام بدات لە مانگی ڕەمەزاندا، ئەوە خێرو پاداشتی ئەوەندە بۆ ئەنوسرێت وەك ئەوەی لە پێش مانگی ڕەمەزاندا حەفتا فەرزی ئەنجام دابێت.

کەواتە ڕەمەزان خەرمانی عیبادەتە، فرسەتێکی زێڕینە، چۆن خەڵکی جوتیار کاتێکی دیاری کراوی هەیە لە هاوین و پایزدا بۆ کارو کەسابەتەکەی، بۆ ئەوەی زادو زەخیرەی تێدا بخات بۆ زستان، بە هەمان شێوەش مانگی ڕەمەزان دەبێت بکرێت بە مانگی کۆکردنەوەی خەرمانی چاکە.

سێهەم: بە مانگی ڕەمەزان دڵخۆشین چونکە مانگێکە کە هەر لەسەرەتاوە تێیدا ڕەحمەتی خوامان بەسەردا دەڕژێت، پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێت: ( شَهرٌ أَوَّلُهُ رَحمَة، وَ أَوسَطُهُ مَغفِرَة، وَآخِرُهُ عِتقٌ مِنَ النّار)... مانگی ڕەمەزان سەرەتاکەی ڕەحمەتە، ناوەڕاستەکەی لێخۆش بوونە، کۆتاییەکەی ئازاد بوونە لە ئاگر. ئەم فەرموودەیە پێشەوا (ابن خزیمە) لە صەحیحەکەی دا بە ژمارە

( ١٨٨٧) هێناویەتی. ئایا دەبێت چەند دڵخۆش بین کە ڕەحمەتی خوامان بەسەردا دەبارێت.

٤- چوارەم: ڕەمەزان مانگی بەهەشتە، بەڕاستی لە دیدی ئینسانی بڕوادارەوە سەرزەوی وەکو بەهەشتی لێدێت، پێغەمبەری پێشەوامان فەرموویەتی:(إذا جاءَ رَمَضانُ فُتِحَت أبوابُ الجَنَّة، وَ غُلِّقَتْ أبوابُ النّار، وَصُفِّدَتِ الشَياطينُ) متفَق عَلَيهِ . بخاري (١٨٩٨) ومسلم(١٠٧٩).

واتە: هەرکاتێك مانگی پیرۆزی ڕەمەزان هات، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، وە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن، وە شەیتانەکان کۆت وزنجیر دەکرێن.

بەڵێ ئیمانداران: ئەوەتا بە ئاشکرا دەبینین کە چۆن دەرگاکانی بەهەشت کراونەتەوەو بانگی خەڵکی دەکەن بۆ چوونە ناو بەهەشت، ئەمەش بەرجەستەیە لە کردنەوەی دەرگای مزگەوتەکان بەبەردەوامی و بەگەرم وگوڕی، بەخوا مزگەوتەکان، بەو هەموو نوێژخوێنە لە نوێژی جەماعەتدا، ئاپۆڕای نوێژی تەراویح و مەوعیزەو کۆڕی ئامۆژگاری عەسران و دوای نوێژی تەراویح و سیمای کاتی پارشێو وبەربانگ، بەهەشتی سەرزەوییەو بە ئاشکرا هەستی پێ دەکەین و بۆنی بەهەشتی لێ دەکەین.

بەڵێ پێغەمبەری خوا (صَدَقَ رَسولُ الله) ڕاستی فەرموو: (وغُلِّقَت أبوابُ النّار) ئەوەتا عەرەقخانە، قومارخانە، شوێنە خراپەکان دادەخرێن ربازاڕیان نامێنێت، ئەوەتا ڕووتی ئافرەتان کە بێ

شــەرعییەکی گەورەیــەو دەرگــای جەهەننــەمیان بــە هۆیــەوە بــۆ دەکرێتــەوە، ئـەو دەرگایـە دادەخـرێ و خوشـکان سـەرپۆش دەدەن بـە سەریاندا و لاشەیان دادەپۆشن و شـەیتانەکان کـۆت وزنجیر دەکـرێن، بۆیە بێ دینەکانیش ئەو کەسانەی کە ماوەی یانزە مـانگی ڕابـردوو شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووە و نەیهێشتووە سوژدە بۆ خوا ببەن، وا لەم مانگی ڕەمەزانەدا خۆیان ئامادە کردووە بۆ خوا پەرستی و نوێژ وڕۆژو وعیبادەتی خوا.

بەڵێ ئەم خەڵکە ئیمانداره ئیمان وا لە ناخیدایە، بەڵام شـەیاتینی جنۆکـە و ئینـسان وایـان لێکـردووە ئـەم ئیمـان و نـوورو ڕوناکییـەی بـشاردرێتەوەو پرشـنگ نەداتــەوەو بــەردەمی خاوەنەکـەی ڕوونــاك نەکاتـەوە. هـەروەکو شـەهید ( سـید قطـب) فەرموویـەتی: ئیمـان وەکــو پارچــەیەك ئــاڵتوون وایــە لــە نــاخی مرۆڤــدا، هــی وا هەیــە ئیمانەکــەی ســاف وبێگــەردەو بــەردەوام وەکــو ئــاڵتون دیــارە کــە دەدرەوشـێتەوە، هـی واش هەیـە ئاڵتونەکـەی بـە هەنـدێك تـەپ وتـۆز داپۆشـراوە، هـەر فوویـەکی لێبکـەی پـاك دەبێتـەوە، واتـە هـەر بـەوەی دوو قسەی خێـری بـۆ کـراو ئامۆژگارییـەکی خێـری بیـست، یەکـسەر ئیمانەکەی زیندوو دەبێتەوە، کەسانێکیش هەن ئیمانەکەیان بەهۆی کاریگــەری گونــاه وتــاوانی زۆرەوە و بــەگوێ کردنــی نــەفس وشەیتانەوە، چەند چینێکی ئەستوور لە خۆڵ و خاشاکی لەسەرەو کاتی زۆری دەوێت تا لەسـەری لادەبرێـت، ئەوەتا بەبەرەکـەتی مـانگی ڕەمـەزان کـە شـەیتانەکان کـۆت وپەیوەنـد کـراون، پـۆل پـۆل خـەڵکی

ڕوودەکەنەوە خواناسی ومزگەوت، جا دڵنیابن ئەوەی لەم مانگەدا بەبێ عوزری شەرعی بەڕۆژو نەبێت، وە لەم مانگەدا بە ئاشکرا خواردن وخواردنەوە بخوات و بێ ڕێزی بەرامبەر مانگی پیرۆزی ڕەمەزان بکات، یەقینتان بێت کە خۆی شەیتانە، چونکە شەیتان مەجالی نەماوە کە بیخەڵەتێنێت، ئەوە هەر خۆی شەیتانە.!

پێنجەم: ئێمەی موسوڵمان دڵخۆشین بە مانگی ڕەمەزان، چونکە مانگی تەوبەو لێخۆش بوونی خوایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (نادى مُنادٍ مِن السَّماء الدُنيا كلَّ لَيلَةٍ إلى إنفجارِ الصُبحِ – يا باغِيَ الخَيرِ تَمِّم وَ أَبشِرْ، وَ يا باغِيَ الشَرِّ أَقصِرِ وَ أبصِرْ).

واتە: لە هەموو شەوێکی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا، بانگدەرێك لە ئاسمانی دونیاوە تابانگی بەیانی بانگی بەندەکان دەکات و دەفەرموێت: ئەی ئەو کەسەی کە چاکەکاری و وەڵامی بانگی خوات داوەتەوە، لێی زیاد بکەو موژدەت لێبێت بە ڕەزامەندی خوا، وە ئەی ئەو کەسەی کە تائێستا لە زۆنگاوی گوناهو تاوانداى و ڕووت لە خوا نەکردووە، وەرە ئەم هەلە زێڕینە لە دەست خۆت مەدەو بەرەو لێخۆش بوونی خوا وەرە، بەرەو گەرماوی پاککەرەوەی مانگی ڕەمەزان وەرەو خۆت پاك بکەرەوە لە گوناه وتاوانەکانت، وەرە خوا لێت خۆش دەبێت و گوناهەکانی ڕابردووشت بۆ دەکات بە چاکە.

شەشەم: بەهۆی ڕۆژووەوە بۆنی دەممان لای خوای گەورە خۆش دەبێت، ئەو بۆنی دەمەی کە بەهۆی نەخواردن ونەخواردنەوەوەو کەم

قسە کردنـەوە بـۆنی نـاخۆش دەبێـت، کەچـی ڕۆژوەوان لای خـوای گـەورە ئەوەنـدە ڕێـز لـێگیراوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: (وَالذِي نَفسُ مُحَمّدٍ بِيَدِهِ لَخَلُوفُ فَمِّ الصّائِمِ أَطيَبُ عِندَ اللهِ مِن رِيـــحِ المِسكِ) متفقٌ عَلَيه.

واتە:سوێند بەو کەسەی کە نەفسی موحەممەدی بە دەستە، بۆنی دەمـــی بەنـــدەی ڕۆژووەوان لای خـــوای گـــەورە لـــە بـــۆنی میـــسك خۆشترە.جائایا ئەمە جێگەی دڵخۆشی نیە کە بەندەیەك ئەوەنـدە لە خوا نزیك بێتەوە وئەوەندە ڕێزی لێبگیرێت؟!

حەوتـەم: بەڕاستـی مـانگی ڕەمـەزان مـانگی خۆشـی و فەرەحییـە، نەك مانگی وەڕەسی و بێتاقەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویـەتی: (لِلصائِمِ فَرحَتانِ يفرَحُهُما: إذا أفطَرَ فَرِحَ بِفطرِهِ، وَ إذا لَقيَ رَبَّـــهُ فَرِحَ بِصَومِهِ) متفق عليه.

واتە: بۆ ڕۆژووەوان بە تایبـەتی دوو خۆشـی هەیـە، دوو گەشـی و دڵـشادی ڕووی تێدەکات، یەکـەمیان: کاتێـك بـەربانگ دەکاتـەوە، لـەو کاتەدا چەند هەست بە خۆشی دەکات، دووەمیان: کاتێك دەگاتەوە بە لیقـای خـوا – سُـــبحانَهُ وَ تَعـــالی – لـە قیامەتـدا، وە پاداشـتی ڕۆژووەکـەی وەردەگرێـت، کـە هـەر خـوا خـۆی دەزانێـت پاداشـتەکەی چەندە، ئەوە لەو کاتەدا بە بینینـی ئـەو هـەموو خێـرو چاکە زۆرە زۆر خۆشحاڵ دەبێت و هەموو ناڕەحەتییەکی بیر دەچێتەوە.

عبدالله ی کوڕی عومەر (ڕەزای خوا لە خۆی و باوکی بێت) دەفەرموێت: کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەربانگی دەکردەوە دەیفەرموو: (ذَهَبَ الظَمَأُ وَابتَلَت العُروقُ، وَثَبَتَ الأَجَرُ إِنْ شاءالله) صَحيح سُنَن أَبـــي داود (٢٣٥٧). واتە: تینوێتی نەماو ڕۆیشت و بەخواردنەوەی ئاو هەموو دەمارو ڕەگەکانی لاشەمان تێر بوون و پاداشتەکەشی لای خوای گەورە تۆمارکراوە. إن شاءالله.

بەڵێ ئیماندارن: بەڕاستی ئەو خۆشی و لەزەتە ڕووحی و دەروونییەی کە مرۆڤی ڕۆژووەوان لە کاتی بەربانگ دا هەستی پێ دەکات، هەرگیزاو هەرگیز بێ دینەکان و ئەوانەی بەڕۆژو نابن لە هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی ناکەن، بگرە ئەوانەی کە بەڕۆژو نابن لە ناخی خۆیان دا هەست بە شەرمەزاری وتاوانکارییەک دەکەن، ئەگەر تۆزێک ویژدانیان زیندوویەتی تیا مابێت.

هەشتەم: خاڵێکی تر لەوانەی کە وامان لێدەکات کە ئێمە دڵخۆش بین بە بەڕۆژووەکەمان، ئەوەیە کە لە کاتی بەربانگ کردنەوەدا، لەوکاتەدا کە خەریکیت ڕۆژووەکەت بشکێنیت هەر دووعایەک بکەی گیرا دەبێت، جا ئەگەر دووعاو پاڕانەوەیەکت لای خوای گەورە گیرا بێ و قبوڵ ببێت، ئەوە لە هەموو دونیا گەورە ترە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّ لِلصائِمِ عِندَ فِطرِهِ لَدَعوَةَ ما تُرَدُّ ). رَواهُ إبن ماجَه بإسنادٍ صَحيح.

واتـە: بەڕاسـتی و دڵنیاییـەوە بۆ ڕۆژووەوان لـە کـاتی بـەربانگ دا ئـەوە هەیـە کـە هـەر دووعایـەك بکـات، بەسـەری دا نادرێتـەوەو خـوای گەورە قبوڵی دەکات.

**فەلسـەفەی ڕۆژوو:** بەبێ هیچ گومان و دوودڵییەك ئەوەی کە خـوای گـەورە لەسـەر بەنـدەکانی خـۆی فـەرز کـردووە، هـەمووی لـە بەرژەوەندی مرۆڤـ دایـەو خـوای گـەورە –سُبحانَهُ وَ تَعـالی– هـیچ موحتـاجی تاعـەت و عیبـادەتی بەنـدەکانی خـۆی نییـە، بـەڵام بـۆ دڵنیـایی ﴿وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِـي﴾ هەنـدێك لـە فەلسـەفەی واجب بـوونی ڕۆژوو لەسەر ئیمانداران باس دەکەین:

یەکـەم: ڕۆژوو ڕوکنـی چـوارەمی ئیـسلامە، دوای شـایاتوومان ونوێژو زەکات هاتووە.

دووەم: ڕۆژوو مرۆڤـ پەروەردە دەکات، چونکە نەفس بە تێر بوون بوغرا دەبێ و لە خۆی بایی دەبێت، بۆیە دەبێت بە برسییەتی جڵەوی ئەسـپی سەرکەشـی نـەفس بگیرێـت، وە ڕۆژوو فێرمـان دەکـات کـە موسـوڵمان نـەك هـەر حـەرام نـاخوات، بـەڵکو لەبـەر فـەرمانی خـوا بـۆ ماوەیـەکی دیـاری کـراو واز لـە خـواردن و خواردنـەوەی حـەڵاڵیش دەهێنێت.

ئای ئەم دینی ئیسلامە چەند گەورەیە، کە ئاوا مرۆڤ بەبێ ئـەوەی هیچ چاودێری لەسـەر بێت، بەبێ ئەوەی کـەس پێـی بزانێت، هـەموو

ناخ و گیانی هاوار دەکات بۆ قومێ ئاوی سارد، پەرداخە ئاوە ساردەکەش بە دەستییەوەیەتی، گەدەی داوای خواردن دەکات و لەبەر برسییەتی، بە بۆنی خواردن لیکە ڕژێنەکانی ناو دەمی لیك دەڕێژن، هیچ کەس ئاگای لێی نییە، ئەگەر تێریش بخوا و بخواتەوەو بشڵێ بەڕۆژووم هەر بڕوای پێ دەکرێت، کەچی تەنها لەبەر فەرمانی خوای گەورە کە فەرموویەتی: نابێت لە بانگی بەیانییەوە تا بانگی ئێوارە لە حەڵاڵی ماڵی خۆشت بخۆی، نایخوات! جا ئایا کەسێ کە ئاوا لە ڕۆژوو گرتن تێبگات، دەچێت دەست بۆ ماڵی حەرامی خەڵکی ببات؟ وە گیرفان و ماڵی خەڵکی ببڕێت؟ بەبێ گومان نەخێر، چونکە یەقینی هەیە بەوەی کە وا خوای پەروەردگار چاودێرە بەسەریەوە، وە هەر ئەمەشە مرۆڤ ئیصلاح دەکات.

هەروەها ڕۆژوو خوێندنگەی پێگەیاندنی جەماوەرە، بۆ فێر بوونی ڕەوشتە جوانەکان و ئاگادار بوون لە حاڵی کۆمەڵگا، حەزرەتی یوسف سەلامی خوای لەسەر بێت، لەسەر موڵك وخەزێنەی هەموو وڵاتی میصر بوو، هەرچی دڵی ئارەزووی بکردایە بۆی ئامادە دەکرا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆرکات بەڕۆژوو دەبوو، کاتێك عەرزیان دەکرد بۆچی ئەوەندە بەڕۆژوو دەبیت؟ دەیفەرموو: بۆ ئەوەی هەژارانم لە بیرنەچێت، کە سکیان لەبرساندا دەنگی لێوە دێت، حەز دەکەم ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت وەکو هەژاران بژیم.

بەڵێ لە دنیای ئەمڕۆدا بۆیە سەرکردەکان هیچ جۆرە بەزەییەکیان بە میللەتی هەژارو برسیدا نایەتەوە، چونکە خۆیان تێرن

بەبەردەوامی، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ساڵێكدا مانگێك برسی نەبوون بەهۆی ڕۆژوو گرتنەوە تاكو بزانن حاڵی هەژاران چۆنە.

(٣) سێیەم: ڕۆژوو سیاسەتی شەرعی ڕاستەقینەیە، چونكە لە ڕۆژوودا سەركردەی یەكەمی وڵات لەگەڵ هەژارترین كەسدا یەكسانەو هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە، ئەوەی لە هەموو كەس زیاتر پلەوپایەی بەرزە و دەوڵەمەندترین كەسە، كە چووە خولی مانگی ڕەمەزانەوە، ئەبێت یەكسان بێت لەگەڵ لاوازترین و بێكەس ترین و هەژارترین خەڵكی وڵات دا، بەیەكەوە لە بانگی بەیانییەوە واز لە خواردن و خواردنەوە دەهێنن و لەیەك كات دا بەربانگ دەكەنەوە، بێ ئەوەی كە سەركردە مۆڵەتی ئەوەی پێ بدرێت كە یەك دەقیقە پێشتر بەربانگ بكاتەوە یان درەنگتر واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێت.

هەروەها ڕۆژوو دەورەیەكە كە هەموو چین وتوێژەكانی كۆمەڵگا بەهەموو ئاستەكانی تەمەنەوە تێیدا بەشدارن، تەماشاكە لە ڕۆژوودا، دەوڵەمەندو هەژار، دەسەڵاتدارو بێدەسەڵات، لە پیرەمێردو پیرەژنەوە تا منداڵێكی نابالغ كە توانای ڕۆژووگرتنی هەیە، تا گەنج ولاوو ژن وپیاو، كوڕوكچ، شاریی ولادێیی، خوێندەوارو نەخوێندەوار، قوتابی ومامۆستا، ئەفسەروسەرباز، كڕیارو فرۆشیار، بازرگان وجوتیار، وەستاوشاگرد، خاوەنكاروكرێكار، هەمووی بەیەكەوە چوون بەدەم بانگەوازی پەروەردگارەوە كە فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾.

ئەمجا سەرنج بدەن، ئەم دەورەیە تایبەت نییە بە وەرزێکی دیاری کراوەوە، بەڵکو هەموو وەرزەکان دەگرێتەوەو ساڵانە لە دەوران دایە.

جا بەڕێزان: سەرنج بدەن، ئایا غەیری ئیسلامەکەی ئێمە، هیچ بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیایەکی تر توانای کردنەوەی خولێکی ئاوای هەیە؟! بێگومان نەخێر، چونکە خولەکانی مرۆڤ کرد، ئەگەر بۆ گەنج بێت بەکەڵکی پیر نایەت، ئەگەر بۆ خوێندەوار بێت بەکەڵکی نەخوێندەوار نایەت، ئەگەر بۆ ئەفسەر بێت قەدەغەیە سەرباز نزیکی بکەوێتەوە، کەواتە: باشانازی بە ئیسلامەکەمانەوە بکەین و دڵشادو سەربڵند بین بە بەڕۆژووەکەمان کە ئەوەندە عەزیم وگەورەیە.

(ج) چوارەم: ڕۆژوو گیانی هاوکاری و یارمەتیدان درووست دەکات، (سبحان الله) لەبەرەکەتی ڕەمەزان، ئەوانەی دەوڵەمەندن خۆیان بەدوای هەژاران دا دەگەڕێن تا یارمەتییان بدەن، کە ئەو سەخاوەت و بەخشینە لە غەیری ڕەمەزاندا هەستی پێ ناکرێت، هەروەکو لە فەرموودەدا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەس زیاتر سەخی بووە، بەو هەموو هەژارییەی خۆیەوە کەچی بەردەوام بەخشندە بووەو دەستی بەخشینی والاّ بووە، بەتایبەتی لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا، لە هەموو کاتێك زیاتری دەبەخشی و وەکو شنەی شەماڵ کە هەموو جێگەیەك دەگرێتەوە، ئاوا هەموو کەس و لایەکی دەگرتەوەو بە هەموو لایەك دا دەیبەخشی.

بەراستی هەژاران لە هەموو کەس زیاتر دڵخۆشن بە مانگی ڕەمەزان، وە بەتایبەتی چاوەڕێی هاتنی دەکەن، چونکە دەزانن لەو مانگەدا زۆرترین هاوکارییان پێشکەش دەکرێت.

پێنجەم: ڕەمەزان مانگی درووستکردنی مرۆڤی هیممەت بەرزە، بەراستی هەیممەتی بەرزی دەوێت کەسێك بەبێ هیچ چاودێرییەك بتوانێت زاڵ بێت بەسەر داواکارییەکانی نەفسی خۆیدا، کە ئەمەش تەنها لە ئیسلامدا هەیە.

بانگخوازی بەناوبانگ( عمروخالد) دەفەرموێت: لە وڵاتی بەریتانیا لەگەڵ کەسێکی ئیسپانی چاوپێکەوتنم کردو باسی هەندێك بابەتی ئاینیمان کرد، ئەو کەسە نەیدەزانی ئێمەی موسوڵمان چۆن بە ڕۆژو دەبین، منیش بۆم باس کرد کە ئێمەی موسوڵمان هەموو ساڵێك لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژو دەبین. لێی پرسیم: ماوەی چەند بەڕۆژو دەبن؟ منیش بۆم باس کرد کە لە بانگی بەیانییەوە تا خۆرئاوا بوون (بانگی مەغریب) بەڕۆژو دەبین، بەسەر سوڕمانەوە ووتی: هەرکەسێك موسوڵمان بێت ئاوا بەڕۆژو دەبێت؟! ووتم: بەڵێ منداڵ، گەنج، بەتەمەن، ژن وپیاو، هەموو بەڕۆژو دەبن، زۆر بەسەرسوڕمانەوە ووتی: چۆن دەتوانن بەرگەی ئەو هەموو گەرماو تینوێتی و برسییەتییە بگرن؟! لە کاتێکدا وڵاتی ئێوە گەرمە، پێم ووت: بەڵێ تەحەمووڵی دەکەین، کابرای ئیسپانی ناموسوڵمان ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان ووتی: ئەی باشە بۆچی ئێوە لە وڵاتە دواکەوتووەکانن؟ بەڕاستی ئەبوایە ئێوە پێشەوایەتی و ڕابەرایەتی هەموو جیهانتان

بکردایە، خۆ ئەگەر ئێمە لە وڵاتی ئیسپانیا خاوەنی وورەیەکی ئاوا بەرز و خۆڕاگرییەکی پاڵەوانانە بووینایە، ئەوا ئێستا ئیسپانیا لە وڵاتە هەرە بەهێزەکانی جیهان دەبوو، مامۆستا ( عمروخالد) دەفەرموێت: کە ئەو قسەیەی کرد بەڕاستی هەستم بە ئیحراج بوون کرد، ڕاست دەکات ئێمەی موسوڵمان خاوەنی مانگی ڕەمەزان و بەڕۆژ وبوونی کاتە هەرە گەرمەکانین، لە وڵاتە گەرمەکان دا، ئایا بۆچی دواکەوتوین؟!هەوڵی پێشکەوتن نادەین، بەردەوام چاو لەدەستی خەڵکین!

ئیمانداران: مرۆڤی موسوڵمان نابێ لە مانگی ڕەمەزان دا تەنها هەر بە ئامادە کردنی بەربانگی چەور وباشەوە خەریك بێ و خەمی خۆ تێرکردنی بێت، بەڵکو دەبێت خەمی موسوڵمانانی تریشی بێت، کە ئەمەش پاداشتی گەورەی بۆ دانراوە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَن فَطَرَ فيه صائماً كانَ) هەرکەسێك بەربانگ بۆ ڕۆژوەوانێك ئامادە بکات، وە خواردنی بۆ ئامادە بکات و پێشکەشی بکات، ئەوا:.

١. (مَغفِرَةً لِذَنبِه) دەبێت بەمایەی لێخۆش بوونی تاوانەکانی و خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە کە ئەو ڕۆژووەوانەی تێرکردووە خوا لێی خۆش دەبێت، بەهۆی ئەو دووعا خێرانەی کە ئەو کەسە تینوو برسییە بۆ خاوەن خوانەکەی دەکات.

٢. (وَعِتقاً لِرَقَبَتِهِ مِنَ النّار) **خوای گەورە گەردنی لە ئاگر ڕزگار دەکات.**

٣.(وكانَ لَهُ مَثلُ أجرِهِ مِن غَيرِ أن يَنقُصَ مِن أجرِ الصّائِمِ شَئٌ ) **وە بە ئەندازەی پاداشتی ئەو ڕۆژووەوانە پاداشت بۆ خاوەن خواردنەکە دەنوسرێت، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ڕۆژووەوانەکە کەم بێتەوە.**

**جا کاتێك صەحابەکان ئەم موژدە بەرزو خۆشەیان لە پێغەمبەری خوا بیست ﷺ بە تامەزرۆییەوە عەرزیان کرد:** ( يارسول الله لَيسَ كُلّنا يَجِدُ ما يُفطِرُ الصّائِم عَلَيهِ) **ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە داخەوە هەموومان بایی ئەوەندەمان نییە کە خواردن ئامادە بکەین بۆ کەسێکی ڕۆژووەوان، ئای بەداخەوە چۆن لەو هەموو ئەجروپاداشتە بێبەش دەبینن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی ئەوانیش وهەموو هەژارانی دڵ دەوڵەمەندی خێرخوازی خۆش کردو فەرمووی:** ( يُعطي الله هذا الثوابَ مَن: فَطَّرَ صائماً عَلى تَمرَةٍ أو عَلى شَربَةِ ماءٍ أو مَذقَةِ لَبَنٍ) رَواهُ إبن خُزَيمَةَ في صَحيحِهِ (١٨٨٧).

**واتە: خوای گەورە ئەو پاداشتە دەداتە هەرکەسێك کە بەربانگ بکاتەوە بۆ ڕۆژووەوانێك بە دەنکە خورمایەك یان بە قومە ئاوێك یان بە چۆرە شیرێك.**

**بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەمانەی بۆ باس کردین تاوەکو کەس نەڵێت من هیچم نییەو ناتوانم ببەخشم، وە بزانن**

خورماو ئاوەکە لانی کەمەکەیەتی، تۆ کە زیاترت هەیە زیاتر ببەخشە، دەوڵەمەندی وا هەیە دەتوانێت لە مانگی ڕەمەزاندا حەیوان سەربیڕێت و چەند ماڵ تێربکات لە خواردنی باش بۆ بەربانگ، هی وا هەیە دەتوانیێ شیرینی ببەخشێت، چەند جوانە دەوڵەمەندێك بڕیار بدات چەند ماڵە هەژارو خاوەن منالی بێ باوك دەست نیشان بكات، تاوەکو ڕەمەزان تەواو دەبێت بەربانگی ئەوان لەسەر حیسابی ئەم بێت، چونکە بە دڵنیاییەوە ئەوەی تۆ حەزت لێیەتی خەڵکیش حەزی لێیەتی و ئینسانی ئیمانداریش کاتێك چێژ لە خواردنی بەردەمی دەکات، کە کەسێکی تریش کە نەدارو هەژارە لە هەمان خواردندا بەژدار کردبێت.

بەڵێ بەڕێزان: خاڵێکی تر کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین، ئەوەیە کە مانگی ڕەمەزان فرسەتێکی زێڕینە بۆ ئەوەی کە کاتەکانی هەمووی لە چاکەدا بەسەر بەرین، چونکە گرنگ ئەوە نییە لە ژیان دا چەند دەژیت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بزانی چۆن دەژیت، هەر بۆیە پێویستە ئێمەی ڕۆژووەوان خشتەیەکمان هەبێت بۆ کاتەکانی شەوو ڕۆژمان :

١. بڕیار بدە هیچ نوێژێکت بە تەنها نەکەی بەڵکو هەمووی لە مزگەوت دا بە جەماعەت بکەی .

٢. نوێژی تەراویح لە شەوەکانیدا ئەنجام بدەی.

٣. ئامادەی گوێگرتن بیت لە ووتاری مامۆستایانی بەڕێزی ئاینی ئیسلام، چونکە بە گوێگرتن لە ووتاری بەهێز وبەپێز، دڵ زیندوو دەبێتەوەو لە دینەکەت شارەزا دەبیت.

٤. چەند سەعاتێك دیاری بكەی بۆ قورئان خوێندن، یان گوێگرتن لە قورئان .

٥. زۆر یادی خوا كردن، زیكری خوا، وەكو زیكری (لا إلهَ إلاّ الله وأستَغفِرُ الله).

هەروەكو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (طُوبَى لِمَن وجدَ في صَحيفَتِهِ إستِغفاراً كَثيراً) خۆش بە حاڵی ئەو كەسەی كە لە نامەی كردەوەكانی دا (أستَغفِرُالله) ی زۆری تێدایە، زۆر ووتویەتی خوایا گیان داوای لێخۆش بوونت لێ دەكەم.

وە بە بیر خۆم و ئێوەی بەڕێزو هەموو ئیماندارانی دەهێنمەوە، كە ئاگاداربین بە هیچ جۆرێك ڕۆژو نەخۆین، پێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ دەفەرموێت: (مَن أفطَرَ يَوماً مِن رَمَضانَ مِن غَيرِ رُخْصَةٍ وَ لا مَرَضٍ، لَم يَقضِهِ صَومُ الدَّهرِ وَإنْ صامَهُ) رَواهُ الترمذي (٧٢٣).

واتە: هەركەسێك لە پیاووژن بەبێ هیچ عوزرێكی شەرعی یان نەخۆشییەك، كە وا لە مرۆڤ دەكات توانای ڕۆژو گرتنی نەمێنێت، ڕۆژێك بەڕۆژو نەبێت، ئەوە هەرگیز پاداشتی ئەو ڕۆژەی مانگی ڕەمەزانی دەست ناكەوێتەوە، ئەگەرچی تەواوی ساڵەكە بەڕۆژو بێت لە قەزای ئەو ڕۆژەی كە بە عەمدی و بەبێ بەهانەی ڕەوای شەرعی خواردویەتی.

داواكارم ئەوپەڕی ڕێزو حورمەت لەم مانگە پیرۆزە بگرین، تەنانەت ئەوانەی كە بەڕۆژوش نابن با تاوانەكە هەر لە نێوان خۆیان

و خـوای پـەروەردگاردا بێـت و لەسـەر شـەقامەکان و بەبەرچـاوی خەڵکەوە خواردن وخواردنەوە نەخۆن.چونکە دڵنیابن هەرکەسێك بێ حورمەتی بەرامبەر مانگی نازڵ بوونی قورئان بکات، هەرکەسێك بێ حورمـەتی بە ڕوکنـی چوارەمی ئـەم دینـە بکات، کە ڕۆژووی مـانگی ڕەمەزانە، ئەوا با دڵنیابێت کە خوا جل حورمەتی دەکات.

وە پێویـستە لەسـەر حکومـەت مـەجالی ئـەو کەسـانە نـەدات، کـە بەئاشـکرا لەسـەر شـەقامەکان خـواردن دەخـۆن یـان ئـەو هـەموو چێشتخانەیە بە ئاشکرا خواردن دەفرۆشـن و هـەر دەڵێـی ڕەمـەزانیش نییە!.

وە داواکاریشم لە خاوەن کارەکان کە ئاگایان لە کرێکار بێ و لـەم مانگـەدا کـەمتر کاریـان پـێ بکـەن، بـا توانـای ڕۆژو گرتنیـان هـەبێ و کـاریش بکـەن، ئێـوەش کرێـی زیاتریـان بـدەنێ، تـا خـوای گـەورە زیاترتان بداتێ.

لە کۆتایدا دەڵێم :

دووبارە هاتنی ئەم مانگەتان پیرۆز بێت، ئەی عاشقانی ڕەمـەزان، دووبارە بەخێربێیتەوە ئەی مانگی ئیمان و فەتح، ئەی مانگی قەدرو بەدرو صەبر، ئەی میوانی ساڵانە ڕێزت لەسەر چاوانە، چونکە مانگی قورئانە.

یاڕەبی خوای گەورەو میهرەبان بە لوتفی خۆت یارمـەتیمان بدەی بۆ جـوان پێشوازی کـردن لـەم مانگـە پیرۆزەو هیدایـەتمان بـدەی بـۆ ئـەوەی بـە جـوانترین شێواز عیبـادەتی تـۆی تێـدا بکـەین، وە ئـەوەی

ئەنجامی ئەدەین لە نوێژو ڕۆژو تەراویح وزیکر کردن لێمان قبولْ بکەی، وە لەم مانگە پڕ بەرەکەتەدا، بەرەکەت بخەیتە ڕزق وڕۆزیمانەوەو ئەوانەی لە پێناوی تۆدا دەبەخشن،خوایە زیاتریان پێ ببەخشیت، ئەوانەی هەژارو نەدارن دەرگای ڕزق وڕۆزییان لەسەر بکەیتەوە، خوای گەورەو شیفادەر ئەوانەی نەخۆشن و دڵیان دەکوڵێت لە تاوی ڕۆژووی ئەم مانگە پیرۆزە، بە شیفای خۆت شیفایان بۆ بنێری و لەشی ساغیان پێ خەڵات بکەیتەوە، تا بتوانن ڕۆژووەکانیان بگرن، خوایە گیان هەرکەس لەم مانگەدا دڵتەنگ و غەمبارە دڵخۆشی بکەیت، ڕومان خۆش بکەی، سەرمان بەرز بکەی، دونیایەکی خۆش گوزەران و قیامەتێکی ئاوەدانمان بەنسیب بکەی، ( آمین ).

## سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز.

٢. الترغيب والترهيب. للحافظ المنذريّ.

٣. شیعری سەرەتای ووتار عوسمان سەنگاوی.

٤. مِنهاج الصالحين في الآداب الإسلامية

محمد عبدالعاطي بحيرى ص١٩٦ –٢٠١.

٥. قِصَص القُران عمروخالد ص ١٨٤.

الحَمدُ لِلهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ اجمَعينَ:

ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز، ڕۆژووەوانانی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان، ئێمە لە مانگێکداین کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەصفی دا دەفەرموێت: ( رَمَضان أوَّلُهُ رَحمَة ) ڕەمەزان سەرەتاکەی ڕەحمەتە، جا فەرموون لە مانگی ڕەحمەتدا با بچینە خزمەت باسکردنی چەند ڕەحمەتێکی خوای پەروەردگار، بۆ ئەوەی لە بارو زروف و سەردەمێکی وەك ئەمڕۆدا، کە خەڵکی بە توندی باوەشیان کردووە بە دونیادا و تەنهاو تەنها بە شتە دونیاییەکان دڵخۆشن، ئێمەی ئەهلی ئیمان، ئێمەی سەر سفرەی پڕ بەرەکەتی مانگی ڕەمەزان، دڵمان بە ڕەحمەتی بێ سنووری خوای پەروەردگار خۆش بێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴾ يونس:٥٨

واتە: ئەی محمد ﷺ بە ئیمانداران بڵێ: با دڵشادو شادومان بن بە فەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی کە ( قورئان و بەرنامەی خوایە ). کەوابوو با هەربەوە دڵخۆش بن، هەر ئەوەش چاکترە بۆیان لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی خەریکن کۆی دەکەنەوە و کەڵەکەی دەکەن.

ئیمانداران: خوای پەروەردگار ڕەحمەتی بێسنوورە، هەر ئەو کاتەی کە گەردوونی درووست کرد، لە سەروو عەرشەوە نوسی:

( إِنَّ رَحمَتِي سَبَقَت غَضَبِي ) سۆزو ڕەحمم پێش توڕە بوونم کەوتووە هەروەکو لە سـوڕەتی ( الانعام:١٢) دا دەفەرموێت: ﴿قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ﴾ خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ڕەحم و میهرەبانی لەسەر خۆی فەڕز کردووە.

هەروەها لە سوڕەتی (طه) ئایەتی ١٢٩ دا دەفەرموێت﴿وَلَوۡلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى﴾: خۆ ئەگەر ئەو بڕیارە کە فەرموویەتی( إِنَّ رَحمَتِي سَبَقَت غَضَبِي) لە لایەن پەروەردگارتەوە پێش نەکەوتایەو مۆڵەتی دیاری کراویش نەبوایە، ئەوە لەناو بردنی خوانەناسان شتێکی ئەنجامدراو دەبوو.

هەروەها کاتێک کە خوای پەروەردگار ڕووحی کردە لاشەی ئادەمەوە، ئادەم پشمی، مەلائیکەت فەرموویان بڵێ:( الحَمدُ لله ) ئادەم ووتی: ( الحَمدُ لله ) خوای گەورە بە ئادەمی فەرموو: ( يَرحَمُكَ رَبُّكَ) پەروەردگارت ڕەحمت پێ بکات، ئەمە یەکەم ووشە بوو کە خوای پەروەردگار بە ئادەمی فەرموو.

بەڵێ خوای گەورە بوونەوەری بە ڕەحمەت درووست کرد، یەکەم قسە کە لەگەڵ ئادەمی کرد ڕەحم وبەزەیی بوو، خوای گەورە قورئانەکەی ڕەحمەتە.

وەکو دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ یونس ٥٧.

واتـە: ئـەی خەڵکینـە: بەڕاسـتی ئێـوە ئامۆژگارییـەکی گـەورەو گرنگتـان لـە لایـەن پەروەردگارتانـەوە بـۆ هـاتووە کـە قورئانـە، شـیفاو چارەسەریـــشە بـــۆ نەخۆشـــی دڵ ودەرونـــەکان و ڕێ نیـــشاندەرو ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران.

سەرەتای ئەو قورئانەش کە( ڕەحمەتە) بە ﴿ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ دەست پێ دەکات.

بـــەڕێزان: وەرگرتنـــی تەوبـــەی گوناهکـــاران لـــە لایـــەن خـــوای پـەروەردگارەوەو لێخـۆش بـوون لـە تـاوانی ئـەو تاوانبارانـە بـە هـۆی تەوبەی ڕاستەقینەوە، یەکێکی ترە لە ڕەحمەتـەکانی خـوای گـەورە بـۆ بەنـدە بڕوادارەکـانی، وەکـو لـە سـوڕەتی ( التـوبـة) ئایـەتی ١٠٤ دا دەفەرموێت: ﴿وَ أَنَّ اللهَ هُوَّ التَّوابُ الرَّحيم﴾ واتە بەڕاستی خوا خۆی تەوبە وەرگرو میهرەبانە.

هـەروەها خـوای گـەورە نـاوی بەهەشـتی نـاوە بـە ( الـرحمة) وەکـو دەفـــەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾.

واتە: بەڵام ئەوانەی ڕوخساریان سپی و گەش وجوانە، بە هۆی کردەوە جوانەکانی دونیایانەوە، لە ناو ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورەدا کە ( بەهەشتە) ژیان دەبەنەسەر، بۆ هەمیشەو بۆ هەتا هەتایی.

ئیمانداران: لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە، ناوی بەهەشتی بە ڕەحمەتی خوا بردووە، کە زانایان دەفەرموون:﴿فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِ﴾ مَجازٌ مُرسَل أطلق الحال وَ أريد المحَل: أي فَفي الجَنَّةِ لِأنَها مَكانَ تَنزل الرَّحمَة.

وە لە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە کە خوای گەورە فەرموویەتی بەبەهەشت، ( أنتِ – الجَنَةِ– رَحمَتي أرحَمُ بِكِ مَن أشاءُ مِن عِبادي).

بەڵێ بەهەشت ڕەحمەتی خوایە کە بە ئەهلی ئیمان دەبەخشرێت، نەك بە موقابیلی( بەرامبەر) کردەوەی چاکەو تاعەت و خواپەرستی مرۆڤی ئیماندار خۆی بێت، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَيسَ مِنكُم مِن أحَدٍ يَدخُلُ الجَنَّةِ بِعَمَلِهِ، قالُوا: وَ لا أنتَ يا رَسولَ الله؟ قال: وَ لا أنا إلاّ أن يَتَغَمَّدني اللهُ بِرَحمَتِه ) .

واتە: هیچ کەسێك بە کاروکردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە، هاوەڵان عەرزیان کرد: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوای ﷺ؟ فەرمووی: تەنانەت منیش بەبەرامبەری کردەوەو عیبادەتم بۆ خوا

ناچمە بەهەشتەوە، مەگەر خوای گەورە لە دەریای بێسنووری ڕەحمی خۆیدا نوقمم بکات.

بەڵێ بەهەشت ڕەحمەتی خوایە دەبەخشرێت بە ئیمانداران، هەر بۆیە کاتێک ئیمانداران دەچنە بەهەشتەوە ، یەکەم قسە کەپێیان دەوترێت ئەوەیە :﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ﴾ یس : ٥٨

بۆ ئەوەی ئەهلی بەهەشت تێبگەن کە گەیشتنیان بەم هەموو لەزەت و خۆشییە، تەنها بەهۆی ڕەحمی خواوەیە نەک کردەوەکانی خۆیان.

لە ئەثەردا هاتووە: لە ڕۆژی قیامەتدا کەسێک پێویستی بە یەک چاکەیە بۆ ئەوەی چاکەو خراپەی وەکو یەکیان لێبێت، چونکە ئەوکاتە ئومێدی زۆر دەبێت کە خوای گەورە لێی خۆش ببێ و بیخاتە بەهەشتەوە، بۆیە ئەم کەسە داوا لە خوای گەورە دەکات کە مۆڵەتی بدات بەڵکو بڕوات چاکەیەک پەیدا بکات و یەکێک لە خۆشەویستانی چاکەیەکی پێ ببەخشێت، بۆیە دەچێت بۆ لای دایکی، باوکی، برای، خوشکی، هاوڕێکانی دونیای، یەک بەیەک لێیان دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی تەنها یەک چاکەی خۆیانی پێ ببەخشن، بەڵام کەسیان ئامادە نابن و هەموویان هەر دەڵێن: ( نَفسي نَفسي ) ئای هاوار بۆخۆم، ئەی ئەگەر خۆم پێویستم بە چاکەیەک هەبوو لە کاتی میزان وحیساب دا ئەی من پەنا بۆ کێ ببەم؟ تا ئەم کەسە بە نائومێدی و دڵشکاوییەوە دەگات بە کەسێک کە تەنها یەک چاکەی هەیە، ئەم کەسە کە تەنها یەک چاکەی هەیە دەڵێت: من بە تەنها بەم چاکەیە هیچم پێناکرێت و دادم نادات،

بەڵام بەڵکو فریای تۆ بکەوێت و تۆی پێ ڕزگار ببی لە دۆزەخ، وەرە من لە حزووری خوای پەروەردگارا ئەم چاکەیەی خۆم دەبەخشم بە تۆ!، کاتێك دەچنە حزووری خوای پەروەردگار، کابرای خاوەن تەنها یەك چاکە، ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت کە ئەو تەنها چاکەیەی کە لە دونیادا ئەنجامی داوە یان تەنها هەر ئەوەی بۆ ماوەتەوە، چونکە زۆرکەس چاکەی زۆری هەبووە بەڵام ئەوەندەی خراپە بەرامبەر بە خەڵکی کردووە، جوێنی بەم داوە، غەیبەتی ئەوی کردووە،ماڵی ئەوی بە ناحەق خواردووە، لەوی داوە، ستەمی لەو کردووە، ئیتر وەکو لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە هیچی بۆ نەماوەتەوە لە چاکەکانی چونکە هەمووی ئەدرێت بەو کەسانە، بۆیە ئەم کەسە کە تەنها خاوەنی یەك چاکەیە، بەڵام یەکتا پەرست بووە لە دنیاداو شەریکی بۆ خوا بڕیار نەداوە، ئامادە دەبێت ئەو تەنها چاکەیەی خۆی بداتە ئەو ئیماندارەی تر، خوای گەورە دەفەرمووێت: (لَستَ أرحَمُ بِهِ منّي، وَ أنا أرحَمُ الرّاحمينَ، أُدخُلا كِلاكُما إلى الجَنّة).

تۆ بەبەزەیی تر نیت بەو ئیماندارە لە من، چونکە من لە هەموو بەبەزەییەك بەبەزەیی ترم، بڕۆن هەردووکتانم بەخشی و بەیەکەوە بچنە بەهەشتەوە!!!.

بەڕێزان: یەکێکی تر لە ڕەحمەتەکانی خوا، دابەشکردنی کاتە بەسەر شەوو ڕۆژدا، هەروەکو دەفەرموێت:

﴿وَمِن رَّحۡمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ القصص: ٧٣

**واتە: جا لە ڕەحمەت و میهرەبانی ئەو زاتە ئەوەیە کە شەووڕۆژی کردووە بەهۆی ئارامی و حەوانەوە وکاروکاسپی کردن و بەهرە بردن لە بەخششەکانی، بۆ ئەوەی تا دەتوانن شوکرانە بژێرو سوپاس گوزاری بکەن.**

**بەڕاستی ڕەحمی خوایە لەگەڵ ئێمەی مرۆڤ و هەموو زیندەوەران، کە کاتی دابەشکردووە بەسەر شەووڕۆژدا، چونکە ئەگەر کات هەر شەو بوایە ئەی کەی کاروکەسابەتمان بکردایەو بژێوی ژیانمان دابین بکردایە؟ ئەی ئەگەر کات هەر ڕۆژ بوایە، ئەی مرۆڤ و زیندەوەران کەی پشوویان بدایە؟ یان سەرنج بدەن دابەشکردنی وەرزەکانی ساڵ چەند ڕەحمی خوای تیادا دەردەکەوێت، بۆ نموونە: ڕۆژگاری بەهار درێژەو ئاووهەوای بەرەو گەرمی دەڕوات، بۆچی؟ چونکە کاتی بوژانەوە وگەشە و نەش ونما کردنەو پێویستی بە بەرکەوتنی خۆری زیاتر هەیە، وە مرۆڤ پێویستی بە کاتی زیاتر هەیە بۆ کارکردن و هەوڵدان، هەروەها بۆ گەشت وگەڕان و دەرکردنی ماندوو بوونی دەروونی کە لە زستانی سەرماو سۆڵەدا لە ژوورەوە بەسەری بردووە، جا ئەگەر کاتی بەهار وەکو پایز بوایە، ئایا هیچکام لەمانە درووست دەبوون؟ یان خوای گەورە بەڕەحمی خۆی کاتی وەرزی پایزو زستانی وا لێکردووە کە شەوگاری درێژو ڕۆژگاری**

کورتە، بۆچی؟ چونکە خوا خۆی زانا ترە، ئەگەر کاتی زستان وپایز ڕۆژگاری درێژ بوایە، ئەوا مرۆڤ تەحەمولی ئەو سەرماو سۆڵەیەی نەدەکردوو زوو نەخۆش دەکەوت،

ئیمانداری بەڕێز وەرە بیر بکەرەوە، ئەگەر کتوپڕ ڕۆژ ببوایەوە، یان کتوپڕ ڕۆژ ئاوا ببوایە، ئایا چەند نارەحەت دەبووین؟ چەند بە ناخۆشی ژیان دەگوزەرا؟ بەڵام ڕەحمی خوایە کە ئاوا بە جوانی هێواش هێواش دونیا ڕووناك دەبێتەوە، وە ئێوارەش بەهێواشی و پلە بەپلە دونیا تاریك دەبیٚ و دەبێت بەشەو، هەروەکو خوای گەورە سەرنجمان بۆ لای ئەم ڕەحمەتەشی ڕادەکێشیٚ و دەفەرموویٚت:

﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ التكوير : ١٧ - ١٨

خۆشەویستان: ئەگەر سەیری وڵاتانی شیمالی ئەورووپا یان جنووبی ئوسترالیا، وە قوطبی مونجەمیدی خواروو بکەیت، ئەبینیت شوێنی وا هەیە تەنها دوو کاتژمێر ڕۆژە باقیەکەی تری هەمووی شەوە، یان شەش مانگ ڕۆژو شەش مانگ شەوە، هەروەکو لە شیمالی نەرویج هەیە.

بەڵام لای خۆمان کە شەوو ڕۆژ تا ڕادەیەکی زۆر لە زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ دا یەکسانن، بەهۆی ئەوەوە تیشکی خۆرمان وەکو پێویست دەست دەکەوێت، فەزڵی ئەو تیشکی خۆرە لە چیدا دەردەکەوێت؟ لەوەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە دەبینیت منالی کوردەواری شەووڕۆژ لە ناو خۆڵ و گڵدایە، بەتایبەت لە گوندەکان ناو مەزراو باخەکان دا، لەم کاتەدا هەر لە دڕکێکەوە تاکو شوشە

وبزمار بەپێی ئەم منداڵەدا دەچێت و بریندار دەبێت و خوێنی لێدێت، کەچی بە دەگمەن دەبینیت پێی تووشی نەخۆشی ببێت، ئەمە ئەگەر منالێکی ئەورووپی یەك لەسەر سەدی ئەوەی تووش ببێت، دەست بەجێ تووشی جۆرەها نەخۆشی دەبێت، بۆچی؟ چونکە تیشکی خۆر لەوێ کەم دەردەکەوێت، بەڵام لێرە لای خۆمان لەبەر ئەوەی تیشکی خۆر بەباشی و بەردەوامی دەردەکەوێت، تەعقیمی ئەو برینە دەکات و توشی نەخۆشی مەترسیدار نابێت، ئایا ئەمە ڕەحمەتی خوا نییە لەگەڵمان و سوپاسی خوای گەورەی ناوێ؟

بەڵێ بەڵام چونکە ئەم ڕەحمەتی خوایە بەردەوام لەگەڵماندایە، بۆیە کەمتر هەستی پێ دەکەین و سوپاسی خوای لەسەر دەکەین.

موفەسیری قورئان (سَید قُطب) لە تەفسیری ئایەتی﴿ إعمَلُوا آلَ داوُدَ شُكراً﴾ دا دەفەرموێت: لە سجندا لە میصر لە کونێکی بچکۆلەوە تیشکی خۆرمان لێدەدرا، لە خۆشی ئەو تۆزە تیشکەی خۆردا خۆمان ڕووت دەکردەوەو خۆمان دەدایە بەر تیشکی خۆرەکە، کە لە گرتووخانە بەربووین ووتمان: ئۆخەی ئەوە تیشکە خۆرەکەی خۆمانە، ئەمجا دەمانزانی تیشکی خۆر چ ڕەحمەتێکی خوای گەورەیە.

لە زۆرێك لە ئەورووپا، خەڵکی شتێکی وەکو قەرەوێڵەیان داناوەو گلۆپی لەسەرە، ئەچنە ناویەوە، تا تەعویزی تیشکی خۆریان بۆ بکاتەوەو پێستیان بۆرکا، پارەیەکی خەیاڵی دەدەن.

ئیمانداران: یەکێکی تر لە ڕەحمەتەکانی خوای گەورە بۆ مرۆڤایەتی بارانە. هەروەکو خوای گەورە لە قورئان دا دەفەرموێت:﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ الشورى:١٨.

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێت و دەیگەیەنێتە فریایان دوای ئەوەی کە نائومێد بوون، هەروەها ڕەحمەت و بەخششی خۆی پەخش دەکاتەوە، لەبەر ئەوە هەرخۆی پشتیوان و فریاد ڕەسەو شایستەی سوپاسە.

خۆشەویستان: ئاو ڕەحمەتی خوایە،بەتایبەتی ئەم ئاوە پاکو زوڵاڵەی لای خۆمان،لە کوردستانی خۆشەویستدا، ئاو لای ئێمە کەس ناپرسێت تەرکیبەکەی چییە؟ چونکە هەموو کانزایەکی ڕێك وپێکی تێدایە، بەڵام لە وڵاتێکی وەکو نەرویج ساڵانە بایی ( ٣٠ ) ملیۆن دۆلار قسلْ وگەچ دەکەنە ناو ئاوەوە بۆ ئەوەی ماسییەکانی ناوی نەمرن، لە سووید و نەرویج منالْ کە پوکی ڕەق بوو، تاتەمەنی پێنج ساڵی ئەبێت هەموو شەوێك حەبێك بخوات تاوەکو ددانی هەڵنەوەرێت، چونکە ئاوەکەیان یۆدی کەمە، ئەگەر بێتوو وەکو ئێمە ددان نەشۆن و ئاوا لە خزمەتی ددانەکانیان دا کەم تەرخەم بن، ئەوا هیچیان لە (١٣) ساڵی دا ددانیان نامێنێت!. ئایا ئەم ئاوە جوانە ڕەحمەتی خوا نییەو سوپاسی خوای بەڕەحمی ناوێت؟

یەکێکی تر لە ڕەحمەتەکانی خوای گەورە لە گەڵمان لێرە لەم وڵاتەی خۆمان دا پەستانی هەوایە، لە شیمالی کەنەداو ئالاسکاو شیمالی ئەورووپاو قوطبی مونجەمیدی خواروو، ئەگەر تۆ لێرە سی کیلۆ هەڵگریت بەقەدەر پێنج کیلۆی ئەوێ ماندوو نابی و هەست بە قورسییەکەی ناکەی، بەهۆی زۆری پەستانی هەوا لەوێ و ئاسایی بوونی لەسەر ئێمە لێرە، ئایا ئەمە ڕەحمی خوا نییە لە گەڵمان؟!.

ئیمانداران: یەکێکی تر لەو جێگایانەی کە ڕەحمەتی خوای گەورەی تێدا دەدرەوشێتەوە، پەیوەندییە لە نێوان باوان ونەوەکانیان دا، هەروەك شوێنی درووست بوون و گەورە بوونی منالْ لە ناو سکی دایکیدا پێی دەوترێت (ڕەحم)، ئای چەند جوانە ئەو سۆزو خۆشەویستییەی نێوان باوك ودایك بۆ ڕۆڵەکانیان، وە خۆشەویستی ڕۆڵە بۆ دایك وباوك، ئەم ڕەحمەتە خەڵکانی ئەورووپی و ئەمریکی و هەموو ئەو وڵات وگەل وکەسانە هەستی پێ دەکەن کە نازانن دایك وباوکیان کێیە، یان ئەگەر بشزانێت کێیە، لە باوەشی سۆزو میهرەبانی دا گەورە نەبووەو سەری نەناوە بە سینەی پڕ سۆزو خۆشەویستی دایکییەوەو دەستی نازو خۆشەویستی باوکی بەسەریدا نەهێنراوە، ئەوەتا کاتێك لە ڕۆژنامەکاندا باسی ژیانی خۆیان دەکەن، چۆن باسی ئەو بۆشاییە دەکەن کە نەبوونی سۆزو ئامێزی دایك وباوکییەتی.

بەڕێزان: یەکێکی تر لە ڕەحمەتە بێسنوورو هەرگیز نەژمێردراوەکانی خوای گەورە بۆ بەندەکانی، قیامەتی نەبڕاوەیە،

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( الدُنيا سِــجنُ المُــؤمِنِ وَ جَنَّــةُ الكافِر ).

واتە: دونیا بەندیخانەی ئیمانداره‌و بەهەشتی بێ بڕوایە، لەسەر ئەم فەرموودەیە دەگێڕنەوە کە زانای پایە بەرز ( ئیمامی ڕازی) بەڕێگادا دەڕوات بەرەو مزگەوت، لەوکاتەدا جل وبەرگێکی زۆر جوان و پاکوخاوێنی لەبەردا دەبێت و بۆنی خۆشترین عەتری لێدێت، کابرایەکی بێ باوەڕو کافر دەچێتە سەر ڕێگای و عەرزی ئیمامی ڕازی دەکات قوربان: باشە کوا دونیا بەهەشتی کافرەو بەندیخانەی ئیماندارە؟ ئەوەتا منی کافر شڕۆڵەو بێ ئەنواو سەروسیماو جل وبەرگم جێگای بەزەیی پێدا هاتنەوەیە، بەڵام تۆی موسوڵمان جوانترین جل وبەرگت لەبەردایەو لە ڕوخسارت دا خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی دەخوێنرێتەوە، کە شایەنی ئیرەیی پێبردنە، ئیتر مانای فەرموودەکەی پێغەمبەرەکەتان چییە؟! ئیمامی ڕازی وەڵامێکی زۆر قەناعەت پێکەری دایەوەو فەرمووی:( يا هذا إنَّ ما أنا فيهِ إذا ما قيسَ بِما أعَدَهُ أللهُ في الجَنَّةِ مِن نَعيمٍ فَأَنا في سِجنٍ، وَ إن ما أنــتَ فيهِ مِن بَلاءٍ إذا ما قيسَ بِما أعَدَهُ اللهُ لِلكافِرِ مِن عَذابٍ فَأَنــتَ فــي الجَنَّةِ ).

واتە: ئەی فڵان ئەوەی کە من تیای دەژیم لە خۆشی وخۆشخۆری و جوان پۆشی و بۆن خۆشی، ئەگەر بەراوورد بکرێت بەوەی کە خوای گەورە لە بەهەشتا بۆ بەندەی خواناسی دیاری کردووە، ئەوا

مـن لـەم دونیایـەدا لـە گرتووخانـەدام، وە ئـەو ئـازارو ناڕەحـەتی و هەژاری وکزۆڵییەی کە تۆشی تێدای، ئەگەر بەراورد بکرێت بەوەی کە خـوای گـەورە لـە جەهەننـەم دا بـۆ کەسـی کـافری دیـاری کـردووە لـە سزاو ئەشکەنجەو ئازار، ئەوە تۆ لە دونیادا لە بەهەشتدای.

ئیمانداران: ڕەحمەتی خوا بەردەوام لەگەڵماندایە، ئەگەر بۆ کەمتر زۆر کەمتر لە چاو تروکانێك ڕەحمـەت ومیهرەبـانی خوامـان لەگەڵـدا نـەبێت بـەهیلاکا دەچـین، بۆیـە پێغەمبـەری سەرمەشـق وڕابـەرو دڵـسۆزمان کـە لـە هـەموو کـەس چـاکتر لـەم حەقیقەتـە گەیـشتووە، بـەردەوام لـە خـوای گـەورە دەپاڕایـەوەو ئوممەتەکـەی فێردەکـرد کـە بلێن: ( أللهُمَّ لا تَكلني إلى نَفسي طَرفَةَ عَينٍ وَلا أَقلَ من ذلكَ ).

واتە: خوایە گیان نەمسپێری بەخۆم بۆ ماوەی چاوتروکانێك وە کەمتر لە چاوتروکانێك، چونکە یەقینم هەیە کە خۆم بەکەڵکی خۆم نایەم، ئەگەر سۆزو ڕەحم و میهرەبانی تۆم لەگەڵ نەبێت، ( صَدَقتَ یا سَیِّدَنا وَ حَبیبَنا یا رَسولَ الله وَ بالحَقِّ نَطَقتَ ) کە جەنابت فەرمووت کەمتر لە چاوتروکانێك سەردەم و زەمانێك بوو، کە عیلم وتەکنەلۆژیا هەرنەبوو، تا بزانی لە لاشەی مرۆڤدا ڕووداوی وا ڕوودەدات، کە کەمتر لە چاوتروکانێك نەك یەك جار بەڵکو دەیانجار تیایدا دووبارە دەبێتەوە، خۆشەویستەکەم، پێغەمبەرە دڵسۆزەکەم، ڕێگام بدە لەگەڵ ئەم کۆمەڵە ئیماندارە خواناسەی ئوممەتت دا، بۆ گۆڕینی (عِلمَ الیَقین وحَقَ الیَقین) بەو فەرموودە گەوهەرینە پڕ لە نهێنییە زانستییەت بۆ

(عَينَ اليَقين) بچینە خزمەت زانستی پزیشکی، کە سوپاس بۆ خوا هەتا زانست پێش بکەویٚ، زیاتر نرخی فەرموودە زێڕینەکانت باشتر بە چاووی سەر دەبینریٚ و دەزانریٚ چونکە پێغەمبەری خوای، ئەگەرنا تەنها زاناو پرۆفیسۆرو و فەیلەسوفێك بویتایە، ئەوا دوای هەزارو چوارسەد ساڵ زیاتر ئەبوایە ئەم پێشکەوتنە زانستییەی ئەمرۆ دژایەتی هەبوایە لەگەڵ تاکە یەك فەرموودەتدا، بەڵام ئەوەی تۆ فەرمووتە، خوا شاهیدی ڕاستی بۆ داوە﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴾بۆیە هەتا زانست پێش بکەوێت، فەرموودە زێڕینەکانت زیاتر پرشنگ دەدەنەوەو دڵ ودونیای ئیمانداران و مرۆڤایەتی بە گشتی ڕووناك دەکەنەوە، ئەمرۆ لەسەر فەرموودەی ( وَ لا تَكلني إلى نَفسي طَرفَةَ عَينِ وَ لا أَقَل مِن ذلك ) ئاماژە دەکەین بۆ چەند زانیارییەك دەربارەی ناو لاشەی مرۆڤـ، کە ڕوونی دەکەنەوە لە ماوەی کەمتر لە چاوتروکانێکدا بەدەیان بگرە بەسەدان ڕووداو لە لاشەی مرۆڤـ دا ڕوودەدەن، جا ئەگەر خوا بەڕەحمەتی خۆی چاودێری مرۆڤـ نەکات، ئایا مرۆڤـ تەمەنی لە چاوتروکانێك کەمتریش دەبێت؟ زۆر بەدڵنیاییەوە نەخێر.

دەی فەرموون سەرنجی ئەم چەند زانیارییە بدەن، کە ئاماژە دەکات بە هەندێك لە چالاکییەکانی ناو لەشی مرۆڤ لە (٢٤) کاتژمێردا:.

* دوو گورچیلەکانی مرۆڤ لە (٢٤) کاتژمێردا (١٨٠٠) لیتر خوێن دەپاڵێون و پاکی دەکەنەوە لەئاوی زیادە، واتە: لە (٦) خولەکدا هەموو خوێنی لەش جارێك دەچێتە ناو گورچیلەکان و دەگەڕێتەوە.!

* دڵ لە (٢٤) کاتژمێردا (١٠٣٦٨٠) جار لێدەدات و (٢٣٠٤٠) لیتر خوێن وەردەگرێ و پاڵی پێوە دەنێتەوە بۆ ناولەش.

* مرۆڤ لە (٢٤) کاتژمێردا (٢٣٠٤٠) جار هەناسە ئەدات و (١٨٠) مەتر سێجا هەوا هەڵدەمژێ و (٧٢٠٠) لیتر خوێن لەگازی کاربۆن پاك دەکاتەوەو پاراوی دەکات بە (٦) مەتر سێجا گازی ئۆکسجین.

* لەشی مرۆڤ لە (٢٤) کاتژمێردا (١٤٤٠٠٠٠٠) چواردە ملیۆن وچوارسەد هەزار خڕۆکەی سوور درووست دەکات لەناو ئێسقانە درێژەکان داو (٤,٥) چوار بلیۆن ونیو گەردیلەی هیمۆگلۆبین بەرهەم دەهێنێت، جا وەرە بزانە لە کەمتر لە چاوترووکانێکدا چەندی بەردەکەوێت،

* مرۆڤ لە (٢٤) کاتژمێردا (١١٨٠٠) جار چاو دەتروکێنێ، ئەمە لە کاتێکدا لەو (٢٤) کاتژمێرە لانی کەم دەبێت (٦ تا ٨) سەعات بخەوێت، کە لەو کاتانەدا چاوناتروکێنێت.

* لەشی مرۆڤ ڕۆژانە پێویستی بە (٣٠٠٠ تا ٣٥٠٠) کالۆری گەرمی هەیە.

* دڵـی مرۆڤ لـه (٢٤) كاتـژمێردا دەتوانێـت (٢٢٠٠) گـالۆن پڕبكات، گەروەك ترومپایەك بەكار بهێنرێت. واته بڕی (١١٩) بەرمیل.

* مێشكی مرۆڤ لە (٢٤) كاتژمێردا (٩) بلیار نیشانەو ئاگاداری پێدەگات و فەرمان دەردەكات.

* لەشی مرۆڤ لە (٢٤) كاتـژمێردا (١٠٥١٢٠٠٠٠) سەدو پێنج ملیۆن وسەدو بیست هەزار خانە لە دەست ئەدات و هی تر جێگەیان دەگرێتەوە.

* دڵی مرۆڤ لە (٢٤) كاتژمێردا ئەوەندە ووزە صەرف دەكات گەر هەمووی بخەیتە سەر یەك (٧٠) كیلۆ قورسایی (٣٠٠) مەتر پێ بەرز دەكرێتەوە.

* لەشی مرۆڤ لە یەك چركەدا (١٢٠) ملیۆن خانە لە دەست دەدات، واتە: (٣١٥٣٦٠٠٠) خانە لە ساڵێكدا، وە خانەی نوێ جێگەیان دەگرێتەوە، واتە بەئەندازەی ئەو ژمارەیە خانەی تر لەدایك دەبن.

بەڵێ بەڕێزان: زانا جەستەناسەكان سەبارەت بەگرنگی و ئاڵۆزی تەنها مێشكی مرۆڤ دەڵێن: ئەگەر هەرچی ئامێری ئەمڕۆی جیهان هەیە لە دەزگای كۆمپیوتەرو تۆڕەكانی ئینتەرنێت ومانگی دەستكردو تەلەفۆن وتەلەفزیۆن و هەموو دەزگاكانی ڕاگەیاندن و گەیاندن و هێڵەكانی كارەباو ئامێرە جۆراو جۆرەكان، هەرهەمووی بچووك بكەینەوە بە ئەندازەی مێشكی مرۆڤێك هێشتا ناگاتە ١٪ ی مێشك!! ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴾.

ئایا دەتوانین بۆ ماوەی کەمتر لە چاوترووکانێك بەبێ ڕەحمی خوا بژین؟ بێگومان نەخێر.

بەڵێ خۆشەویستان: ئەگەر بمانەوێ ڕەحمەتی خوا لەسەر خۆمان بژمێرین، ئەوە بە بێ هیچ گومانێك نەك ناتوانین بیانژمێرین، بەڵکو ناتوانین هەر بە بیریشماندا بێت، بەڵام لە ماوەی ئەم ووتارەدا ئاماژەمدا بە چەند ڕەحمەتێکی خوای پەروەردگار کە زۆرجار بیرمان لێ نەکردووەتەوە، یەکێك لەو ڕەحمەتانەی خوا لە گەڵمان، ( مردن) ە، ئایا مردن، ئەو دونیا بەجێهێشتنە بەرەو ناو گۆڕێکی تاریك ڕەحمەتی خوایە بۆمان؟! بەڵێ ، ئەی ئەوە نییە لە فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویستمان دا ﷺ هاتووە کە دەفەرمووێت: فریشتەی گیان کێشان دەچێتە لای کەسێکەوە کە لە کاتی سەرەمەرگ دایە و پێی دەڵێت: ئەی ڕووحی فلانی کوڕی فلان، ( اخرِجي إلى رِضاً مِنَ اللهِ وَ رِضوان، وَرَبٍ راضٍ غَير غَضبان، أخرِجي إلى رَحمَةِ اللهِ ).

سەرنج بدەن پێی دەفەرمووێت: وەرە دەرەوە بۆ لای ڕەحمەتی (الله) ، کەواتە مردنیش بۆ ئەهلی ئیمان ڕەحمەتەو گەیشتنە بە ڕەحمەتی خوا.

خۆشەویستان: ڕەحمەتێکی تایبەتی کە خوای گەورە بە ئوممەتی پێغەمبەری ﷺ بەخشیوە، بریتی یە لە ڕۆژووی ئەم مانگی ڕەمەزانە، مانگی ڕەمەزان، تاکە مانگی ساڵە کە لەبەر قەدرو حورمەت و

گەورەییەکەی خوای گەورە بە ئاشکرا ناوی لە قورئاندا هێناوە ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ﴾.

ڕەمەزان مانگی ڕەحمەتە ئەوەتا بە ئەنجام گەیاندنی فەرزێك تیایدا وەکو بە ئەنجام گەیاندنی (٧٠) حەفتا فەرزی تر خێری هەیە کە لە غەیری ڕەمەزاندا ئەنجام درابێت، وە ئەنجامدانی سوننەتێك لە مانگی ڕەمەزاندا وەکو ئەنجامدانی فەرزێك ئەجرو پاداشتی هەیە، کە لە غەیری ڕەمەزاندا ئەنجام درابێت.

دەی تۆی ئیماندار کە لەناو ئەو هەموو ڕەحمەی خوادای، دەخۆشت ڕەحم بە خۆت بکە، وەرە بەزەیت بە خۆتدا بێتەوە، بەوەی لە کۆت وزنجیری گوناه وتاوان ڕزگاری بکە، چونکە یەکێك لە ڕەحمی خوای گەورەو ڕەحمەتی لەگەڵ بەندەکانی ئەوەیە، کەبەردەوام دەرگای تەوبەی بۆ خستووەتە سەر پشت، هەروەکو دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ الانعام :٥٤

واتە: کاتێك ئەو کەسانە هاتن بۆ لات کە ئیمان بە فەرمان وئایەتەکانی ئێمە دەهێنن، تۆ ئەی محمد ﷺ ،پێیان بڵێ: سڵاوتان لێبێت، ئەم موژدەیەشیان بدەرێ، کە پەروەردگارتان، فەرزی کردووە لەسەر خۆی کە لە ئاقاری ئێوەدا بەڕەحم و میهرەبان ودلۆڤان بێت،

ئەگەر کەسێکتان بە نەفامی، بەنەزانی گوناهێکی کردو لەوەو دوا تەوبەی کردو پەشیمان بویەوە پاش ئەنجامدانی خراپەکەو چاکسازی کرد، ئەوە با دڵنیا بێت کە پەروەردگار زۆر لێخۆش بوو میهرەبانە.

بە ڕاستی فرسەتێکە حەیفە مرۆڤی ئیماندار لە دەستی بدات، هەموو شەوو ڕۆژێکی ئەم مانگە پەروەردگار بە بەندەکانی دەفەرمووێت: (يا باغيَ الخيرِ أقبِل، وَ يا باغيَ الشَرِ أقْصِر) ئەی ئەو کەسەی حەزت لە خێرە، حەزت لە پاکییە، حەزت لە چاکییە، وەرە پێشەوەو لەم مانگەدا ئەم هەموو چاکەیە لەبەر دەمتدایە، لە ڕۆژووە، لە تەراویح، لە بەرەکەتی پارشێوو بەرەبەیان، لە نوێژی شەوان، لە فرمێسکی چاوان، لە مەوعیزەو ووتاری عەسران، لە بەخشین و صەدەقە، لە دڵ صافی وئارامی، لە گەردن ئازادی یەکتری، لە تەبایی وبرایەتی ویەکسانی، بە هۆی ڕۆژوو مزگەوتەوە، لەو هەموو بەرەکەتەی بەئاشکرا هەموو دڵ ڕووناکێك ئەیبینێ و هەستی پێ دەکات، دەی چاکەخواز، حەزبەخێر، ڕەمەزان خەرمانی عیبادەتە، توێشووی چاکی تێدا بخە، فرسەتێکەو ئێستا لەبەر دەستتدایە، هەر خوا دەزانێت ساڵێکی تر پێی دەگەیتەوە یان نا، چەند لە خزم وهاوڕێ وخۆشەویستانمان، پار ڕەمەزان ئاوا لە مزگەوتدا لەگەڵمانا بوون، بەڵام ئێستا وا لە ژێر خاکدان و ئێستا خۆزگە بە ئێمە دەخوازن کە لەگەڵمان بوونایەو چاکەو خێرو خێراتیان زیاتر بکردایە.

(وَ يا باغيَ الشَرِ أَقصِر) ئەی خراپەکار، ئەی ئەو کەسەی تا ئەم ساتە لەناو دەریای خراپەو بێ شەرعیدا خەریکە لەناو دەچیت،وەرە واز بێنــە،وەرە دەرەوە لــەناو چــڵك وچــەپەڵی گونــاه وتــاوان و لــە گەرماوی پاکژکەرەوەی مانگی ڕەمەزاندا، بە ئاوی تەوبە خۆت بشۆ، دڵنیابە لاپەڕە ڕەشەکانت دەبن بە سپی، خراپەکانت دەبن بە چاکەو ژیانت دەگۆڕێت، ناخت پاك دەبێتەوە، ویژدانت زیندوو دەبێتەوە، ئەوجا هەست دەکەی بوی بە مرۆڤێکی تر، ﴿خَلْقاً آخر﴾.

خوای گەورە هیدایەتی هەموو لایەکمان بدات و ڕۆژوو تاعەتمان لێ قبوڵ بکات . اللهُمَ آمين .

# سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز

٢. تەفسیری ئاسان ( بورهان محمد ئەمین) .

٣. بِاسمِكَ نَحْيا ( عمروخالد).

٤. صَفوة التَفاسير (د. محمد على الصابوني) ج١ ص ٢٢٣.

٥. نامیلکەی جەستەی مرۆڤ ( جلال محمد سرۆچلی ) .

الحَمدُ لِلـهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَلامُ علـى سَيِّدنا مُحَمَّد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ اجمَعينَ:

ئیمانـدارانی بـەڕێز: ڕەمـەزان مـانگی بەخـشینە، لەبـەر ئـەوەی کـە هاوەڵـان دەفـەرموون: ( کانَ رَسولُ الله (ﷺ) أجوَدَ الناسِ. فَأجوَدَ ما يَكونُ في رَمَضان ).

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە هـەموو کـەس بەخـشندەتر بـوو، وە بەتایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا لـە هـەموو سات وکاتـەکانی تـری سـاڵ زیاتری دەبەخشی.

وە لەناو زۆربەی موسوڵماناندا ڕەمەزان بووەتـە مـانگی دەرکردنـی زەکاتی سەروەت وسامانیان، کە ئەمەش بەڕاستی کارێکی پەسەندوو زۆر جوانـە، چـونکە بـەجێهێنانی هـەر فـەرزێك لـە مـانگی ڕەمـەزان دا خێـری (٧٠) حـەفتا فـەرزی تـری پـێش ڕەمـەزانی هەیـە، واتـە هـەر دینارێك کە لـە مـانگی ڕەمـەزان دا دەبەخشرێت، خێری بە ئەنـدازەی حـەفتا دینـاری پـێش ڕەمـەزان دەنوسـرێت بـۆ ئـەو کەسـەی کـە بەخشیویەتی.

ئیمانـداران: زەکـات ڕوکنـی ئیـسلامە، لـە (٨٢) جێگـای قورئـان دا نوێژو زەکات بەیەکەوە فەرمان بە بەجێهێنانیان کراوە.

* زەکـات لـە ڕەوشـتی بڕوادارانـە، خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ هەتا دەگاتە ڕەوشتی ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ

خَـٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَـٰعِلُونَ﴾ المؤمنون ١-٤

واتە: بەڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوت وسەرفراز بوون، ئەوانەی کە زەکاتیماڵیان دەردەکەن.

* هەروەها دەرکردنی زەکات دەبێتە هۆی ڕەحمی خوا بۆ زەکات بەخشەکە، خوای گەورە دەفەرموویت:﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾.

واتـە: نوێـژەکانتان بـەڕێك وپێکـی ئـەنجام بـدەن و زەکـاتی مـاڵ وسـامانتان دەربکـەن و گوێڕایـەڵی پێغەمبـەری خـوا بکـەن، ئـەو کاتـە ڕەحم پێ کراو دەبن لە لایەن پەروەردگارتانەوە.

بەڕێزان: لەیاسای مرۆڤ کرددا، لـە هـەموو وڵاتـانی سـەرزەوی دا باج هەیە کە دەخرێتە سەر سەروەت وسامانی دەوڵەمەندان و دەست ڕۆیشتوان، دەوڵەت لە لایەن وەزارەتی پەیوەندیدارەوە لە هاوڵاتییانی وەردەگرێت، بەڵام زەکات باج نییە، بەڵکو زەکات زۆر مانای فراوانترو مەبەستی گەورەتری لە باج هەیە.

بە کورتی حیکمەتەکانی زەکات ئەمانەن:.

١. زەکات مافی هەژارانە لە ناو ماڵی دەوڵەمەنداندا، چونکە لە ئیسلامدا ماڵ وسامان موڵکی دەوڵەمەندەکە نییە، بەڵکو وەکو تاقیکردنەوە خوای گەورە ئەو سەروەت وسامانەی خستووەتە ژێر

دەستی ئەو دەوڵەمەندەوە وەکو لە قورئان دا دەفەرموویێت: ﴿وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾.

کەواتە: لە دیدی ئیسلامەوە، دەوڵەمەند وەکو بەڕێوەبەری بانك وایە. بەبێ ئیمزای ئەو هیچ لەو بانکە ناچێتە دەرەوە، بەڵام تەنها مووچەی خۆی هی ئەوە لە پارەی ناو ئەو بانکە، جا خوای گەورە بڕێکی لەو ماڵەی ژێر دەست ودەسەڵاتی ئەو دەوڵەمەندە دیاری کردووە کە دەبێت وەکو زەکات ببەخشرێت، بۆ ئەوەی دەوڵەمەند فێری ئەوە ببێت کە بەکردەوە بڵێت: خوایا گیان ئەم ماڵە هی من نییەو فەزڵی تۆیە، وا بەفەرمانی تۆ دەیبەخشم.

٢. زەکات جیاوازی چینایەتی لادەبات، ئەو شۆڕشی چینایەتییەی کە ساڵانێکی زۆر لە نێوان چینی کرێکارو سەرمایەدارانذا بەردەوام بوو، وە هەزاران کرێکارو زەحمەت کێش بوونە قوربانی و وڵاتی بەرەو کاول بوون وئیفلاس بوون برد، وەکو یەکییەتی سۆڤێتی جاران. بەڵام ئیسلام لە ڕێگەی بەخشینی زەکاتەوە ئەو جیاوازی چینایەتییە لادەبات و خۆشەویستی لە نێوان سەرمایەدارو هەژاردا دروست دەکات، چونکە هەژار کاتێك دەبینێت کە دەوڵەمەند بە ڕەزامەندی خۆی و وەکو بەجێهێنانی فەرمانی خوا زەکاتی ماڵەکەی بە مەمنونییەوە دەبەخشێت بەهەژارو داوای دووعای خێری لێدەکات، هەژار ڕق وقین لە ناو دڵیا بەرامبەر بە دەوڵەمەندەکە نامێنێت، بۆیە قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت: یەکێك لە

حیکمەتەکانی زەکات ئەوەیە ﴿ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ﴾.

٣. زەکات تەکەبورو خۆبەزل زانین و فیزلێدان لە دڵی دەوڵەمەنددا لادەبات، چونکە کە زەکاتی ماڵەکەی بەخشی، کە بەڕوکنێکی دینەکەی دەزانێ و فەرمانی پەروەردگاری بەجێ دێنێت، ئەو یەقینەی لە دڵدا درووست دەبێت، کە ئەو ماڵە هی خۆی نییە بەتەنهاو، بەشی کەسانی تریشی تێدایە، خوای گەورە لەبەر حیکمەتێك بەخشیویەتی بەم ودەوڵەمەندی کردووە، وە لەبەر حیکمەتێکیش نەیبەخشیوە بەو کەسەی کە ئەم زەکاتی ئەداتێ، نە دەوڵەمەندی ئەم لەبەر ڕێزو حورمەتی تایبەتییەتی لە لای خوا، نە هەژاری ئەویش نیشانەی بێ ڕێزییەتی لە لای خوا، بەڵکو ئەمە هەمووی تاقیکردنەوەیەو ئەوەتا ئەمڕۆ ئەم زەکات دەبەخشێت، هیچ دوور نییە بەیانی زەکاتی پێ ببەخشرێ و فەقیر بکەوێت، جا ئەم زەکات بەخشینە بەم تێگەیشتنەوە، خۆبەزل زانین و طوغیان لە ناخی مرۆڤ دا هەڵدەکەنێت، چونکە خوای گەورە خالقی مرۆڤ زۆر باش دەروونی بەندەی خۆی ناسیوە کە فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ۝ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ﴾ العلق:٦-٧

بەڵێ زەکات بەخشین بیری قارونییەت لادەبات، قارون دەیگووت: ئەم ماڵە بە تێکۆشانی خۆم، بە عەقڵی خۆم، بەزیرەکی خۆم پەیدام

کردووەو من زیرەکم لە بواری ئابووریداو لەپارە پارە دروست دەکەم، پەنا بەخوا، بەهیچ جۆرێك حیسابی بۆ خوا نەدەکرد، ئەمە درووشمی بوو﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِيٓ﴾.

کە بەداخەوە لەم سەردەمەداو لە ناو کۆمەڵگای ئێمەدا، ئەم بیری قارونییەتە زۆر جار تازە بووەتەوەو بە دەیان سەرمایەدارمان هەیە کە خۆی نازانێت حیساب و ئەژمارەی سامانەکەی خۆی بکات، کەچی ئەوەی بیری لێناکاتەوە دەرکردنی زەکاتی ماڵەکەیەتی، چونکە ئەمیش وەکو قارون وادەزانێت ئەوسەروەت و سامانەی بە ڕەنجی شانی خۆیی و زیرەکی خۆی پەیدا کردووە.

٤. یەکێکی تر لە حیکمەتەکانی بەخشینی زەکات ئەوەیە: مرۆۋ بەبەخشینی زەکاتی سامانەکەی دەمی شەیتان دادەخات و دەم کوتی دەکات و فریوی ناخوات، چونکە مرۆۋ لە نێوان دوو وەعدو بەڵێندایە، شەیتان بەردەوام مرۆۋ دەترسێنێت بە هەژاری و لەو کاتەدا کە خەریکە دەبەخشێت پێی دەڵێت: نەکەی ببەخشیت، ئەی کە خۆت موحتاج بووی کێ یارمەتیت دەدات؟ ئەی کە تۆ هەژار بووی بۆ کەس نەدەهات هاوکاریت بکات، ئەوەی دەیبەخشیت بۆ منداڵەکانی خۆتی سەرف بکەی باشترە، خوای گەورە لەم پیلانەو وەعدە درۆیەی شەیتان ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێت:

﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ البقرة : ٢٦٨

بەڵام خوای گەورە دەفەرموێت: نەکەن بە قسەی شەیتان بکەن چونکە: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ فاطر: ٦

واتە: بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە، ئێوەش بە دووژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان شەیتان بانگی تاقم و داروودەستەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ، ئەمە وەعدو بەڵێن و ئامۆژگاری شەیتانە.

لەولاشەوە خوای گەورە وەعدو بەڵێن بە بەندەکانی خۆی دەدات و دەفەرموێت: ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ البقرة : ٢٦٨

واتە: کاتێك ئێوە لە ماڵ و دارایتان دەبەخشن و شەیتان بەڵێنی هەژاری و نەداریتان پێدەدات، ( دەتانترسێنێت بە هەژاری) و فەرمانتان پێ دەدات بە گوناه و تاوان و خراپەو نەبەخشین، خوای گەورەش بەڵێنی لێخۆشبوونێکی تایبەتی خۆیتان پێدەدات لەگەڵ زۆری ڕۆزی و بەهرەی فراوانداو خوا فراوانگیرو زانایە.

جا کاتێك مرۆڤ زەکاتی ماڵەکەی دەرکردو بە دڵێکی گوشادەوە بەخشی، ئەوە مانای وایە بڕوای بە بەڵێنی خوای گەورە کردووە، ئەو خوایەی کە ﴿إِنَّ الله لا يُخلِفُ المِيعاد﴾.

٥. زەکات بەرەکەت دەخاتە ماڵەوە، نەك کەمی بکاتەوە، لەبەر ئەوەی ووشەی (زَكاة) لە زمانەوانیدا بە مانای گەشەکردن، (النمو)، پاککردنەوە، زۆربوون هاتووە.

هەرماڵ و سامانێك زەکاتی لێ بدرێت، بەرەکەتی تێدەکەوێت و خوای گەورە زیادی دەکات.

(مامۆستا ناصری سوبحانی) ڕەحمەتی خوای لێبێت، نموونەیەکی زۆر جوان باس دەکات لە بارەی زەکات و بەخشین لە پێناوی خوادا، دەفەرمووێت: ماڵ وسامان وپارە وەکو داری مێو وایە، ئەگەر ساڵانە نەبڕدرێ و سەرو پەلی نەکرێت، ئەوا تولی تازە دەرناکات و ترێ ی تازە ناگرێت و دوای چەند ساڵێك پیرەك دەبێت و کرمۆڵ دەبێت و دەفەوتێت، بەڵێ هەروەختێك پارەو ماڵ وسامان ئەو بڕەی کە شەرع دیاری کردووە( کە وەکو سەروپەلی درەختەکە وایە) لە ماڵەکە دەرکرا، ئەوا ئەو ماڵە گەشە دەکات و بەرەکەتی تێدەکەوێت و بە پێچەوانەشەوە ئەگەر زەکات دەرنەکرا ئەوا ماڵ وسامانەکە بەرەو فەوتان و لەناو چوون دەچێت.

پێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ فەرموویەتی: (حَصِّنوا أموالَكُم بالزَّكاة) ماڵ وسامانەکانتان بپارێزن بە هۆی دەرکردنی زەکاتەوە، (وَداوو مَرضاكُم بالصَّدَقَة )وەچارەسەری نەخۆشییەکانتان بکەن بە صەدەقەو خێروخێرات.

لەسەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری صادقی ئەمین ﷺ کە فەرمووی چارەسەری نەخۆشییەکانتان بکەن بە خێرو خێرات و

بەخشین، ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیەتان بۆ باس دەکەم کە لەیەکێك لە شارەکانی کوردستانی ئازیزی خۆمان دا ڕووی داوە.

<؛ پیاوێك باسی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ماوەیەکی زۆر سکم ئازاری تێدا دروست دەبوو، دوای سەردانی چەندین دکتۆرو بەکارهێنانی داوو دەرمانێکی زۆر، بەڵام هیچ ئازارەکەم کەم نەدەبوویەوە، بۆیە بەناچاری بەرەو شاری بەغداد بەڕێ کەوتم و سەردانی دکتۆری شارەزاو پسپۆڕی بواری هەناویم کردو باسی چۆنییەتی ئازارەکەو ماوەی نەخۆشییەکەم بۆ کردن، دوای پشکنینی خوێن وئەشیعەو فەحصی زۆر دکتۆر ڕاشکاوانە پێی ووتم: ئەم نەخۆشییەی تۆ درێژەی کێشاوەو بە داخەوە ژێرپەنجەی کۆڵۆنتە! بە بیستنی ئەم ووشەی ژێرپەنجەیە لاشەم سارد بویەوەو بەڕاستی حەپەسام، بە تەواوی لە ژیان نائوومێد بووم، بەڕاستی ئازارەکەم زیاتر دەبوو، هەرچیم دەخوارد دەبوو بە ئاگرو دەچووە ناو سکمەوە، ئەوەی ئازاری ناو سك و ڕیخۆڵەی نەچەشتبێت نازانێت چۆنە، ئیتر هاتمەوەماڵەوەو بۆم باس کردن و هەموو زۆر بۆم بە پەرۆش بوون، ماڵ وخێزانیشم لە پەرۆشییان بۆ من، هەرچیم دەخوارد دەیانگووت نەوەکو بۆت خراپ بێت مەیخۆ، خواردنم بوو بە حەپ وشلەمەنی، ماڵ ومناڵ و کەس وکارو دۆستانم بە دەورمەوە بوون و دڵخۆشییان دەدامەوە، بەڵام هیچی ئازاری لەسەر سووك نەدەکردم، ڕۆژێکیان بەیانییەکی دەمەو کاتی چێشتەنگاو پارەم هەڵگرت و بەرەو مەیدانی ئاژەڵان کەوتمەڕێ، دوو بەرانی زۆر قەڵەو بژاردەم کڕی، هێنامنە

<

ماڵەوەو قەصابێکم بانگ کردو ووتم، ئەمەیان سەربڕەو گۆشتەکەی دابەش بکەن بەسەر دەرودراوسێکاندا بە بێ جیاوازی، ئەوی تریشیان سەربڕەو گۆشتەکەی بکەرە چەند عەلاگەیەکەوەو بە ئوتومبێلەکەی خۆم دەیبەم بۆ چەند ماڵێکی زۆر هەژارو نەدارو هەتیوبار، بەڵێ ئەوەی لە دڵما بوو جێبەجێ کراو لە زۆر ماڵی هەژاردا کە لە دەرگام ئەداو گۆشتەکەم پێ ئەدان، چەند دایکی بەڕێز کە لەسەر منالی چاوگەشی بێ باوك دانیشتبوون، ڕوویان دەکردە ئاسمان و دووعای بە کوڵ ودڵیان بۆ دەکردم، گەڕامەوە ماڵەوەو چوومە ژووری نووستنەکەی خۆمەوەو بیرم دەکردەوە، ئای چۆن چەند ڕۆژێکی تر ئەم ماڵە بەجێ دێڵم، دەهاتە بەرچاوم کە چۆن لەماڵ دەمبەنەدەر، بەرەو مزگەوت و مردوو شۆر دەبرێم و ماڵ ومناڵ وکەس وکار فرمێسکم بۆ دەڕێژن و پاشان لە قەبردا بە تەنهایی و بێ کەس جێم دەهێڵن و کەس لە لام نامێنێتەوە، ئای چەند سەختە، پرسەم بۆ دادەنرێ و دوای پرسەو تا ماوەی ساڵێکیش بیری قسەکانم دەکەنەوە، دوای دوو ساڵی تر لەبیری کەسا نامێنم، لەوکاتەدا شیعرەکەی (ئەحمەد هەردی) شاعیرم بیرکەوتەوە کە دەڵێت:

بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم  شریتی عومری ڕابردووم وەکو خەو دێتە بەرچاووم

بەڵێ، بەدەم خەیاڵ لێدانەوەو تەماشا کردنی شریتی عومری ڕابردووم و ڕشتنی چەند دڵۆپە فرمێسکێك، بەدەم شایەتوومان و

ناوی خواوە خەوم لێکەوت، زۆر دەمێك بوو تێرخەو نەبووبوم، لە خەومدا لە چۆڵەوانییەکدا بووم، دانیشتبووم یەکێك لە دوامەوە دەڕۆیشت، ئاوڕم دایەوە پیاوێکی هەڵکەوتووی تا بڵێی سیما نوورانی جل وبەرگ سپی بە هەیبەت بوو، بانگی کردم و دەستێکی خستە سەر شانم و بە دەستەکەی تری دوو دەنك خورمای دامێ فەرمووی: ئەم دوو دەنك خورمایە بخۆ، بە گریانەوە ووتم: بەڵام من شێرپەنجەمە ئەمە خراپ نییە بۆ نەخۆشییەکەم؟! پاشان تۆی موبارەك و ڕووگەش کێیت و چ کەسێکیت؟ فەرمووی: من خۆشەویستەکەی تۆم، من ( رَسُولَ الله )م، خوا دڵت خۆش بکات وەکو دڵی هەژارانی ئوممەتەکەمت خۆش کرد، ئەم دوو دەنکە خورمایە بگرەو ناوی خوا بێنەو بیخۆ، بڕۆ خوات لەگەڵ، ( بِسم الله ) م کردوو هەردوو دەنکە خورماکەم خواردوو، هەستم دەکرد هەر لە دەممەوە کە دەچێتە خوارەوە تا دەگاتە ناو کۆڵۆنم ئازار لادەبات و ئاسوودە دەبم، لە خۆشییاندا هەستام، سەیر دەکەم خەونە، بەڵام زۆر دڵخۆش بووم، هەستم دەکرد لەشم بە تەواوی سووك بووەو ئازاری ناو سکم نەماوە.!!

پاشان دەستنوێژێکی پوخت وتێرو تەواوم گرت و چوومە سەر بەرماڵ و دوو ڕکات نوێژم کردو سوژدەی شووکرم بۆ خوای پەروەردگار بردوو، هەستم دەکرد کە برسیمە، داوام لە خێزانم کرد کە خورماو ڕۆنێکم بۆ بکات، هەرچەند ووتی خراپەو چۆن تۆ خورماوڕۆن دەخۆی؟ ووتم چیت پێ دەڵێم ئەوە بکەو من تەواو چاك

بوومەتەوە، خێزانم ئاگای لە هیچ نییە بۆیە بە نابەدڵییەوە خورماو ڕۆنەکەی بۆ کردم و تێرم لێ خوارد، ووتم دڵنیام شیفام بۆ هاتووە، چۆن خۆشیمان خستە ناو دڵی هەژارانەوە، بێ باوکانەوە، ئاواش بە چەندان قات زیاتر خوای گەورە خۆشی خستە ناو ماڵی ئێمەوە!، هەزارجار سوپاس بۆ خوای گەورە.

بەڵێ ڕۆیشتم بۆ لای دکتۆر و پشکنینی خوێن و ناو ڕیخۆڵەم بۆ کراو ئەنجامەکەی ئەوە بوو، کە ژێرپەنجەکەم نەماوە،!! بەڵێ فەرموودەی صادقی ئەمین، حەزرەتی محمد ﷺ هیچ گومانێکی تێدا نییە کە فەرموویەتی: ( وَ داوو مَرضاکُم بالصَّدَقَة ). ضعیف جداً

ئیماندارانی بەڕێز: لەم بەسەرهاتەدا باسی ئەوەمان کرد کە خۆشەویست ﷺ فەرمووی: بەکابرای نەخۆش ئەو دوو دەنکە خورمایە بخۆ، باشە بۆچی خورما؟ حەز دەکەم سەرنجتان ڕابکێشم بۆ لای کۆمەڵێك سوودی خورما بۆ لاشەی مرۆۆ لە ڕوانگەی زانستی پزیشکییەوە، بەتایبەت کە ئێمە ئێستا لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزانداین و لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە کەوا باشە ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی بە ئاو بشکێنێت یان بە چەند دەنکە خورمایەك.

سوودەکانی خورما لە ڕووی زانستییەوە:.

١. پارێزەرو چارەسەرە بۆ کەم خوێنی، بە هۆی بوونی ماددەی ئاسنەوە تیایدا.

٢. بەهۆی بوونی ماددەی ( مەگنیسیۆم) لە خورمادا، خواردنی دەبێتە هۆی کەمی ڕادەی ژێرپەنجە لەو شوێنانەی کە خەڵکەکەی بەکاری دەهێنن.

٣. بەهێزکردنی ئێسقان وددانەکان، بە هۆی بوونی مادەی (کالیسیۆم) و( فسفۆڕ) هەروەها چوار هێندەی میوەکانی تر مادەی ( فلۆر) ی تێدایە، کە لە مەعجوونی ددان شتن دا بەکار دەهێنرێت، بۆ پاراستنی پوك وددان لە داخوران وڕزین.

٤. بوونی بڕێکی گونجاو لە ڤیتامین ( A) ئەی کە پارێزەرە لە شەو کوێری.

٥. هێور کردنەوەی دەمارەکان بە هۆی ڤیتامین ( A ) ئەی و ( B1 ) بی وەن، وەکەم کردنەوەی چالاکی ( غودەی دەرەقی) کە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی توڕەیی.

٦. بۆ نەخۆشی پێست وەکو: وشکی پێست و قڵیشانی لێو، شکانی نینۆك.

٧. بوونی مادەی( سلیلۆز ) لە خورمادا کە بۆ قەبزی باشە.

٨. بۆ ڕملْ وبەردی گورچیلە زۆر بە سوودە کە لایدەبات، بە تایبەتی خورمای سەوز، کە پێی دەوترێت: ( بەحل).

٩. بۆ چارەسەری گەدەو ڕیخۆڵە زۆر بە سوودە، چونکە ماددەی ( کالیسیۆم) و ( پۆتاسیۆمی) تێدایە، کە هاوسەنگی ترشی گەدە ڕادەگرن.

١٠. خورما نەخۆشی ناگوێزێتەوە، بە تایبەتی سکچوون، کۆلێرا، بە پێی توێژینەوەی پەیمانگای (بەکتریۆلۆجی) عراقی کە ( د. ئۆسکار فیلیزینفید) پسپۆڕی کۆلێرا دەڵێت: هەندێك خورما هێنرا بۆ ژێر تاقیکردنەوەو بەو پیسییەی کە لە پیسایی تاکی توشبودا هەیە، بە (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار هێندە پیس کرا دوای سێ ڕۆژ بەکتریاکان هەموو مردبوون.!

ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ هەرگیز لە خۆیەوە قسەناکات و هەموو فەرموودەکانی پڕن لە حەقیقەتی زانستی، چونکە خوای پەروەردگار خۆی دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ﴾.

بەڕێزان: دێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان کە باسی زەکاتمان کرد، هەروەکو چۆن نوێژو ڕۆژو حەج ڕوکنی ئیسلامن و مەرجی تایبەتی خۆیان هەیە و دەبێت بەو شێوەیە ئەنجام بدرێن کە خواو پێغەمبەر ﷺ فەرموویانەو زانایانی شەرعزان لە کتێبە فیقهییەکاندا ڕوونیان کردووەتەوە، زەکاتیش خوای گەورە بۆخۆی دیاری کردووە، بەکێ ئەشێت و دەبێت موسوڵمانان زەکاتی ماڵ وسامانیان بدەن بە کێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ

وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ التوبَة: ٦٠

بەڵێ لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە زەکات بە هەشت کەس دەشێت، کە پشت بە خوا، یەك بەیەك ڕوونیان دەکەینەوە، وە هیچ کەس مافی ئەوەی نییە کە کەسێکی ترو تاقمێکی تر بۆ زەکات وەرگرەکان زیاد بکات، کە لە ئایەتەکەدا باس نەکراوە، وە حەرامە کەسێك زەکات وەر بگرێت کە خۆی بزانێت یەکێك نییە لەو هەشت تاقمەی کەخوای گەورە دیاری کردوون، هەروەکو لەو فەرموودەیەی ( أبو داود) دا لەباسی زەکات دا گێڕاویەتییەوە کە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد: (اعطني من الصدَقَة)لە ماڵی زەکات پێم ببەخشەو شتێکم بدەیە، فَقالَ لَهُ رَسُولُ الله ﷺ:( إنَّ الله لَم يَرضَ بِحُكمِ نَبيٍّ وَ لا غَيرِهِ في الصَّدَقاتِ حَتّى حَكَمَ فيها هُوَ. فَجَزَأَها ثَمانيَةَ أجزاء. فَأن كُنتَ من تِلكَ الأجزاء أعطَيتُكَ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەڵامی کابرای داواکاری زەکات دا فەرمووی: خوای گەورە بۆخۆی ڕازی نەبووە بە حوکمی پێغەمبەرێك یان غەیری پێغەمبەرێك، لە دابەش کردنی زەکات دا، بەڵکو بۆخۆی دابەشی کردووە بەسەر هەشت دەستەدا، جا ئەگەر تۆ یەکێکیت لەو هەشت دەستەو تاقمە، ئەوا منیش پێت دەبەخشم.

وە دەبێت ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە مەرج نییە زەکاتەکەت بدەیت بە هەر هەشت دەستەکە، بەڵکو دروستە زەکاتەکەت بدەی بە یەکێك یان دوان لەو کۆمەڵانە، ئەمەش بەپێی زۆرو کەمی ئەو بڕە پارەیە دەگۆڕێت کە لە زەکات دا دەرکراوە، ئەگەر پارەکە کەم بوو ئەوا باشترە بدرێت بە تەنها یەکێك لەو تاقمانە بەڵکو لێی سودمەند بێت، وە ئەگەر پارەی زەکاتەکە زۆر بوو، ئەوا باشە بدرێت بە چەند کەسێك، وە جاری واش هەیە پارەکە زۆرە بەڵامماڵێك ڕووداوی ماڵ وێرانکەر ڕووی تێکردوون، بۆ نموونە: ماڵەکەیان سووتاوەو غەیری ئەوەی کە لەو ماڵەدا هەیانبووە، هیچی تر شك نابەن، ئەوە درووستە هەموو پارەی زەکاتەکەت با زۆریش بێت بیدەیتە ئەو تەنها ماڵە بۆ ئەوەی کەلێنێکی باشیان بۆ پڕ بکاتەوە.

ئیمانداران: فەرموون گوێ بگرن بۆ ئەو هەشت تاقمەی کە لە قورئان دا خوای گەورە باسی کردوون:.

یەکەم. الفُقَراء : ئەو کەسەیە کە نەماڵ وسامانی هەیە، نەکارو کەسابەت کە بژێوی ژیانی خۆی یان خۆی و منداڵەکانی دابین بکات.

دووەم.المَساکِین : ئەو کەسەیە کە شتێکی هەیە لە ماڵ وسامان وە کارو کەسابەت و مووچەیەکی هەیە، بەڵام ئەوەی کە دەستی دەکەوێت زۆر کەمترە لەوەی کە ژیانی پێ دابین دەبێت، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە کە ناتوانێت زیاتر هەوڵ بدات یان ماڵ ومناڵێکی زۆری هەیە، یاخوود نەخۆشێکی درێژخایەنی هەیەو بەردەوام پێویستی بە دکتۆرو دەرمانە.

سێهەم. العامِلِينَ عَلَيها: کارمەندەکانی وەزارەتی زەکات کە هەڵدەستن بە کۆکردنەوەی زەکات لە ماڵ وسامانی موسوڵمانان و دابەش کردنەوەی بە سەر موستەحەقان و شیاواندا، ئەمانە چونکە هەر خەریکی ئەم کارەن و کارو کەسابەتی تریان بۆ ناکرێت، بەشێك لە زەکات بۆ موچەی ئەمانە دیاری دەکرێت.

وە لەمەوە تێدەگەین کە زەکات دەبێت حکومەت کۆی بکاتەوەو هەر بۆخۆشی دابەشی بکاتەوە، واتە: لە دەوڵەتی ئیسلامیدا وەزارەتێکی تایبەتی هەیە بەناوی وەزارەتی زەکات، کە هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەو وەرگرتنی زەکاتەکە لەو شتانەی کە زەکاتیان تێدا واجبە، وەکو ئاژەڵ وکشتوکاڵ ومالّی بازرگانی، کارمەندانی حکومەت خۆیان دەچنە لای خاوەن ماڵ و زەکاتەکەی بۆ جیا دەکەنەوەو هەمووی دەبەنە گەنجینەی تایبەتی زەکات و پاشان سەرژمێری دانیشتوان دەکرێ و هەرکەسێك کە موستەحەقی شەرعی زەکات وەرگرتن بێت، ناوی تۆمار دەکرێ و پاشان لە ڕێگەی مووچەی مانگانەوە بەشەکەی خۆی پێدەدرێت، بەبێ ئەوەی منەت باری کەس بێت، وە بەبێ ئەوەی بزانرێ ئەوەی کە وەری گرتووە ماڵی کێیە، ئای چەند دەستورێکی نایاب و جوانە، بەڵام بەداخەوە کە ئەمڕۆ ئاوا زەکات کۆناکرێتەوەو دابەش ناکرێت، بۆیە زەکات ئەو ڕۆڵە کاریگەرەی نەماوە یان زۆر کەم بووە.

چوارەم. المُؤَلَفَةِ قُلُوبُهُمْ : نوێ موسوڵمان، کە تازە موسوڵمان بووە، پارەی زەکاتی ئەدرێتێ بۆ ئەوەی زیاتر دڵی بە ئیسلام و ڕەحمەتەکەی خۆش بێت.

پێنجەم. وَفِي الرِقابْ: بەندەو کۆیلەیەك کە دەیەوێت خۆی ڕزگار بکات لە کۆیلایەتی.

شەشەم. والغارِمِین: قەرزار، جا بۆ هەر شتێکی پێویست توشی قەرزاری بوبێت، وە لە شەرعدا دەفەرموێت: ئەگەر قەرزار بە خاوەن قەرز بڵێ زەکاتم بدەیە بۆ ئەوەی لە جیاتی قەرزەکە بتدەمەوە، ئەویش زەکاتی دایەو پاشان قەرزارەکە لە جیاتی قەرزەکەی بۆی هێنایەوە، ئەوە درووستە. وە ئەگەر کەسێکی دەوڵەمەند کە زەکاتی هەیە، پارەی قەرزی لای کەسێك بوو، دەیزانی قەرزارەکە نییەتی قەرزەکەی بداتەوە، پێی ووت: ئەو بڕە پارەیەی کە لە لاتە مەمدەرەوە، بەڵکو لە جیاتی زەکات بۆ خۆتی هەڵبگرە، چونکە من نیازم هەبوو زەکاتت بدەمێ، ئەمە لای زۆربەی شەرعزانان نادروستە، چونکە زەکات دەبێت لە دەستتدا بێت کاتێ کە دەیبەخشیت، لەم کاتەدا گومانی ئەوە دروست دەبێت کە ڕەنگە لە ترسی فەوتانی قەرزەکە ئەم کارەی کردبێت و خستبێتییە بری زەکات، بەڵام هەندێکی تریش لە زانایانی شەرعزان پێیان وایە دروستە.

حەوتــەم. فِيْ سَـبِيلِ الله: لـە پێنـاوی ڕێـی خـوادا، واتـە بـۆ ئـەو موجاهیدانەی کە هەمیشە ئامادەن بۆ پاراستنی سنورەکانی ئیسلام و دەچنە جیهاد.

بــەڵام پێویــستە ئــەوەش ڕوون بکەینــەوە لــە ڕۆژگــارێکی وەکــو ئەمڕۆدا کە جیهادی مەیدانی بەرامبەر لەشکری کوفر نییە، زانایانی ئیسلام لـە ڕیـزی( فِيْ سَبِيلِ الله) دا ئەمانـەیان ئامـاژە پێکـردووە کـە وەکو بەشی (فِيْ سَبِيل الله) زەکاتیان پێ بدرێت دروستە.

١. دروسـت کردنـی مزگـەوت لـەو شـوێنەدا کـە زۆر پێویـستی بـە مزگەوتـەو خەڵکەکەی کـە دانیـشتوانی ئـەو شـوێنەن دەست کـورت و هەژارن و توانای ئەوەیان نییە کە مزگەوت بۆ خۆیـان دروسـت بکـەن، وە بەهۆی بێ مزگەوتیشەوە ئەو خەڵکە دابڕاون لە جومعەو جەماعەت و هیچ بابەتێکی ئاینی ئیسلامیان بۆ ڕوون ناکرێتـەوە، لـە حاڵـەتێکی ئاوادا دروستە بەشێك لـە پـارەی زەکـات بخرێتـە دروسـت کردنـی ئـەو مزگەوتەوە، کە بەڕاستی وەکو جیهادی ڕێ ی خوا وەهایە.

٢. بە خشینی زەکات بەو فەقێیانەی کە لە حوجرەکاندا خـەریکی خوێنـدنی زانـستی شـەرعین و خۆیـان تـەرخان کـردووە بـۆ خوێنـدنی مەلایــەتی و هــیچ مووچــەو پارەیەکیــشیان نییــە. یــاخود ئــەو خوێندکارانەی کە لە ئامادەیی یان زانکۆو پەیمانگاکانـدان و کەسـی بەڕێزو ئەهلی مزگەوتن، بەڵام لەبەر هەژاری بنەماڵەکەیان خەریکە واز لە خوێندن ئەهێنن یان بێنازی و بێبەرگییان پێوە دیارە، ئەمانەش با

زانستی دونیایی بخوێنن، هەر لە خزمەتی موسوڵماناندایەو زەکاتیان پێ دەشێت.

٣. چاپ کردن و بڵاو کردنەوەی کتێبی ئاینی ئیسلام و بواری زانستی کە نوسەرەکانیان توانای داراییان نییە، بۆ چاپ کردنیان و دەزگایەکی دڵسۆز نییە لەسەر ئەرکی خۆی چاپی بکات و، بە بڵاوکردنەوەیان سوودێکی زۆر بە موسوڵمانان و زانست خوازان دەگات و دەبێتە هۆی هیدایەتی دەیان کەس و، ئامۆژگاری و بیرهێنانەوە بۆ دەیان کەسی تر، کە بەڕاستی لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا جیهادێکی گەورەیە لە پێناوی خوادا.

٤. دروست کردنی بنکەی تەندروستی و نەخۆشخانە لەو گوندو جێگایانەی کە حکومەت نەخۆشخانەی بۆ دروست نەکردون و دوورن لە شارەکانەوەو گیانی نەخۆش دەکەوێتە مەترسییەوە لەبەر بێ نەخۆشخانەیی، لەم کاتەدا دروستە بڕێك لە پارەی زەکات وەکو (فِي سَبِيلِ الله) بخرێتە دروست کردن و ئاوەدانکردنەوەی نەخۆشخانەو کەل وپەلە پێویستەکانی.

٨) هەشتەم.وَابنِ السَبِيلْ : وە بۆ ئەو ڕێبوارانەش کە لە ڕێگادا توێشوویان لێدەبڕێ و ناگەنەوە جێگای خۆیان، بەڵێ کەسی ڕێبوار با لە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیدا زۆر دەوڵەمەندیش بێت، بەڵام لەم شارەی تۆدا کە پارەی لێبڕاوە، یان لێی دزراوە، یان پارەکەی لێ بزر بووە، ئەوە دروستە پارەی زەکاتی پێ بدرێت، تا دەگاتەوە شارو گوندەکەی خۆی، بۆ ئەوەی توشی سواڵ کردن نەبێت و کەرامەت و

ڕێزو حورمەتی بە سواڵ کردن نەشکێت، بێگومان ئەمەش کاتێك دەکرێت کە وەکو ووتمان حکومەت زەکات کۆ بکاتەوەو بنکەیەك هەبێت لە هەر شارو شاروچکەیەکدا کە زەکاتەکەی تێدا هەڵگیرابێت، لەم کاتەدا کەسی ڕێبوار پیاو بێت یان ژن، کوڕ بێت یان کچ، دەچێتە ئەو بنکەیەو، دوای لێکۆڵینەوە لە ڕاستی داواکەی، زەکاتی پێ ئەدرێت بەبێ ئەوەی منەت بار و چاو لە دەستی کەس بێ ، وەکو حەقی خۆی کە خوا بۆی دیاری کردووە وەری دەگرێت و بەسەر بەرزییەوە دەچێتەوە بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی، ئای لەم ئیسلامە چەند پارێزەری ماف وکەرامەت و حورمەت و ڕێزی مرۆڤە.

جا خوای گەورە دوای ئەوەی هەر هەشت دەستەکە دیاری دەکات، لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرمووێت: ﴿ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ﴾ بڕیاری خوایەو ئەو خۆی بڕیویەتییەوە، کەس دەستی تێوەرنەدات، ﴿ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾. خوا خۆی زانایە، چاك دەزانێت کێ پێی شیاوە، کاربەجێ وکارزانە، هەموو بڕیارێکی لە جێی خۆیدایە.

جا هەروەکو پێشتریش ئاماژەم پێکرد: ئایا پێویستە ئەم زەکاتە بدرێت بە هەر هەشت تاقمەکە؟ یان ئەگەر بدرێت بە تەنها کەسێکیش هەر دروستە؟ ئیمامی شافیعی و کۆمەڵێك لە زانایان، ڕای یەکەمیان پەسەند کردووە، ئیمامی مالیك و دەستەیەك، لەم بەڕێزانە وەکو ( ئیمامی عومەر، حوزەیفە، ئیبن عەباس، سەعیدی کوڕی جوبەیر) ڕاو بۆچوونی دووەمیان هەڵبژاردووە، تەنانەت ئەگەر بەیەك کەسیش بدرێت هەر درووستە.

ئیمانداران: زەکات دەرکردن چەند ئادابێکی هەیە وەك:

١. زەکاتی ماڵەکەت بدە بە کەسێك کە ڕووی سواڵکردنی نییە، کەسێکی خاوەن هیممەتە هەرگیز ناڵاڵێتەوە و باسی هەژاری و دەست کورتی خۆی ناکات و خەڵکی بە دەوڵەمەندی دەزانن، قورئانی پیرۆز وەصفیان دەکات بەوەی کە ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَـٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾ البقرة : ٢٧٣

واتە: ئەو کەسەی کە شارەزای ژیانیان نەبێت و نەیانناسێت، لەبەر عزەت و نەفس بەرزییان، وا دەزانێت دەوڵەمەندو بێ نیازن، چونکە خۆیان لە خواردن و خواردنەوە زۆر بێنیاز نیشان دەدەن، بەسەرو سیمایاندا ئەیانناسیت کە چەند نەفس بەرزو بێ باکن لە ژیان، ئەگەرچی بێدەسەڵات و هەژاریشن، بە زۆریش داوای هیچ شتێك لە خەڵك ناکەن. بەڕاستی ئەم جۆرە کەسانە شیاوترین کەسن کە زەکاتیان پێ بدرێت، چونکە خۆیان ناتوانن داوا بکەن و خاوەنی عزەتی نەفس و کەسایەتی بەرزن.

٢. زەکاتت دا بەهەر کەسێك، ئاگاداربە منەتی بەسەردا نەکەی، لای ئەم وئەو باسی نەکەی، ڕۆژێك لە ڕۆژان بە چاویدا نەدەیتەوە کە من فڵان ساڵ زەکاتم پێ داویت، داوای کارێکی لێمەکە کە ئەگەر

بەهۆی چاو بەرە ژێری ئەو زەکاتەوە نەبێت، حەز نەکات ئەو کارەت بۆ بکات، چونکە ئەو کاتە هەموو ئەجرو پاداشتەکەت دەڕوات.

هەروەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرمووێت: ﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى﴾ البقرة : ٢٦٣

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پاداشتی صەدەقەو بەخششەکانتان بەهۆی منەت نان و ئازار گەیاندنەوە بە فیڕۆ مەدەن و بە تاڵی مەکەنەوە.

بەداخەوە کەسی وا هەیە پێش دەساڵ لەمەو بەر زەکات و سەرفیترەی داوە بە کەسێکی هەژار، ئێستا ئەو هەژارە خوا دەوڵەمەندی کردووە، ئەم پێی ناخۆشەو هەر کە باسی کرا یەکسەر دەڵێت: ئەوە فڵانە کەسە من پێش دە ساڵ زەکات و سەر فیترەم دایە، ئەوەندە هەژار بوو، یان لە ڕووی خۆی باسی دەکاتەوە، کە فڵان کات ئەو صەدەقەو خێرو زەکاتەم پێ بەخشیت. ئەم جۆرە کەسانە هەرچی ئەجروپاداشتە بۆیان نامێنێتەوە.

٣. زەکاتەکەت وا پەرت نەکەی کە هیچ جێگە نەگرێت بۆ ئەو کەسەی کە پێت بەخشیوە، بۆ نموونە: هی وا هەیە، هەزار دینار زەکاتی هەیە، ئەیدات بە پەنجا کەس، باشە بیست دینار چ پێویستییەکی ئەو هەژارە پڕ دەکاتەوە،

بۆیە ئەو هەژارانەی کە موستەحەقی زەکاتن، زۆرجار بە درێژایی تەمەنیان زەکات وەردەگرن، کەچی بەهۆی زەکات وەرگرتنەوە بێ ئیحتیاج نەبوون و هەر بە هەژاری ماونەتەوە. ڕەحمەت و ڕەزای خوا لە حەزرەتی عومەر بێت کە دەیفەرموو: ( إذا أَعطَيـتُم فَـأَغنوا ) هەروەختێك زەکاتتان دا بە هەرکەسێك، ئەوەندەی بدەنێ کە بەتەواوی لە هەژاری ڕزگاری ببێت و دەوڵەمەند ببێت.

بەڵێ خۆشەویستان: زۆر دەوڵەمەند چونکە پرس بە شەرع ناکات، بە زەکات بەخشینەکەی خەڵکی فێری سواڵ دەکات، زۆرمان بیستووە فڵان دەوڵەمەندی ناوداری فڵان شار ساڵانە لە مانگی ڕەمەزان دا زەکات دابەش دەکات و هەرکەسێك بچێت بۆ لای شتێکی ئەداتێ، ئیتر بە دەیان کەس ڕیز دەبەستن بۆ زەکات وەرگرتن و ئەویش زەکاتە زۆرەکەی کەرت و پەرت دەکات و سەرەنجام ئەو کەسانە فێری سواڵکردن دەبن.

بەڵام ئەگەر پرسی بە شەرع بکردایە، ئەوا شەرع دەفەرمووێت: وەرە بەو پارەی زەکاتە ئەو هەژارە بخەرە سەر کاسپییەك، بۆ نموونە: ئافرەتی وا هەیە بێوەژنەو چەند منداڵی نازداری جوانی بێ باوکی هەیە، وە زۆر هەژارن و هیچ سەرچاوەیەکی بژێوی وایان نییە کە ژیانیان دابین بکات، لەم کاتەدا لە جیاتی ئەوەی بڕێك پارەی کەمی بدەیتێ، کە نەتوانێت ژەمە خواردنێکی باش بۆ منداڵەکانی دابین بکات، ئەوا هەموو زەکاتەکەت بدە بە باشترین مەکینەی بەرگ دروون و یارمەتی بدە تا بچێتە خولێکی فێربوونی بەرگ دروونەوەو

سەرەنجام بەرگ درووێکی باشی لێ دەردەچێت و ئیتر بۆخۆی بێ چاو لە دەستی ئەم وئەو بێ منەتانەو سەربەرزانە، ژیانی خۆی و ماڵ ومناڵی دابین دەکات.

یاخود هی وا هەیە مۆڵەتی شۆفێری گشتی هەیە، بەڵام بە هۆی بارودۆخێکی نائاساییەوە ئوتومبێلەکەی لە دەست داوەو ئێستا بێ ئیش وکارەو خاوەن ماڵ ومناڵێکی زۆرو ووردە، چەند کارێکی جوان و شەرعییە بە سێ چوار دەوڵەمەند زەکاتەکانیان بخەنە سەر یەك و تەکسییەکی بۆ بکڕن و وای لێبکەن بکەوێتە سەر ئیش و ئیتر ساڵێکی تر ئەم زەکات بدات بە خەڵك.

پەندێکی چینی هەیە کە زۆر جوان وپڕ مانایەو دەڵێت: ئەگەر ویستت هەژارێك تێر بکەی بە ژەمێك خواردنی ماسی، ئەوا لە بری ئەوەی بە ژەمێك ماسی خواردن تێری بکەیت و پاش ماوەیەکی تر برسی بێتەوەو هیچ نەبێت بیخوات، قولاپێکی ماسی گرتنی بدەرێ و فێری ماسی گرتنی بکە باخۆی بۆ هەمیشە خۆی تێربکات.

ئیمانداران: کۆمەڵە کەسێك هەن کە زەکاتیان پێ ناشێت، لەبەر ئەوە ئاگاداربە نابێت زەکاتەکەت بدەی بەم جۆرە کەسانە:.

١. کافرو بێ بڕوا بەخوا: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی زەکاتەوە فەرموویەتی: (تُؤخَذُ مِن أغنياءِهِم فتُرَدُّ علـــى فُقَـــرائِهِم) متفق عَليه.

واتە: زەکات لە دەوڵەمەندانی موسوڵمانان وەردەگیرێ و پاشان دابەش دەکرێتەوە بەسەر هەژارانی موسوڵمان دا.

کەواتە: زەکات بە فاسق دەشێت بەمەرجێك ئەو پارەی زەکاتە بۆ بێ شەرعی بەکار نەهێنێت، وە ئەگەر کەسێك نوێژ نەکەر بوو بەڵام ژنێکی زۆر موسوڵمان و نوێژ خوێن و ڕۆژووگری هەبوو، وە منالی بچووکی بێ تاوانی هەبوو، ئەوە درووست نییە زەکات بدەی بەو پیاوە نوێژ نەکەرە، (چونکە لای زۆرێك لە زانایان نوێژ نەکەر کافرە) بەڵام دروستەو زۆریش خێرە کە زەکاتەکەت بدەی بەو ژنە موسوڵمانە نوێژ خوێنە بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی خۆیی و منالەکانی پێ دابین بکات.

بەڕێزان: پێویستە ئاماژە بەوە بدەم کە : ئەو مولحیدو بێ باوەڕو گاورو جولەکانەی لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین، زەکاتیان پێ نادرێت، بەڵکو موچەی مانگانەیان پێ دەدرێت، کە ژیانێکی ڕێك وپێکی پێ ببەنە سەر ئەم موچەیەش یان لە جیاتی ئیش و وەزیفەکەیان، یان لە کاتی پەك کەوتەیی و پیری و بێ کاریدا، وەکو خانە نشینی پێیان دەدرێت، بەڵام لە پارەی زەکات نایاندرێتێ، بەڵکو لە داهاتی تری دەوڵەت دەیاندرێتێ، چونکە ئەم مولحیدو کافرو گاورو جولەکانە زەکات نادەن بە دەوڵەتی ئیسلامی.

هەروەکو حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب موچەی دابین کرد بۆ ئەو جولەکە پیرە بە ساڵا چووەی کە لەبەر هەژاری سواڵی دەکرد، لە خەزێنەی حکومەتی ئیسلامی و لە سواڵ کردن ڕزگاری کرد.

کەواتە: هەموو غەیرە موسوڵمانێك مافی هاوڵاتی بوونی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا پارێزراوە.

٢. دەوڵەمەنـد زەکـاتی پـێ ناشـێت، جـا بـە مـاڵ وسـامانەکەی دەوڵەمەند بێت یان بە کارو کەسابەتەکەی و لەش ساغی و توانای ئیش کردنەکەی دەوڵەمەند بێت. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:

( لا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنيٍّ، وَ لا لِذي مِـرَّةٍ سَـوِيٍّ ) رواهُ الترمـذي (٦٤٧) وَ أبو داود (١٦١٨) وَفي صَحيح الجامع (٧٢٥١)

واتە: دروست نییە زەکات بدرێت بە کەسێك کە دەوڵەمەندە، یان کەسێکی لەش ساغ و بە توانایە بۆ کارکردن، بەڵام تەمەڵی دەکات و کار ناکات.

کەواتە: ئەگەر وەکو ئێستا حکومەتی ئیسلامی نەبوو کە زەکات کۆبکاتەوەو خۆی دابەشی بکات، ئەوا دەبێت خاوەن ماڵ بزانێت ئەو کەسەی کە زەکاتی پێ دەبەخشێت دەوڵەمەند نییە، وە ئەو کەسەش کە وەری دەگرێت، دەبێت ئەگەر دەوڵەمەندە وەری نەگرێت و بڵێت: ماڵـت ئـاوا بـێ و خـوا هـەزاران ئەوەنـدەت بـداتێ، بـەڵام مـن ئێستا سوپاس بۆ خوا وەزعی ژیانم باشەو زەکاتم پێ ناشێت و بیدە بە کەسێکی شیاوو موستەحەق، وە ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی هەبوو، ئـەوا لـە ڕیـزی ئـەو موچـە خۆرانـەدا کـە مانگانـە یارمـەتی زەکـات وەردەگرن، نابێـت نـاوی دەوڵەمەنـدی تێـدا بێـت. بـەڵام بـە داخـەوە ئـەمڕۆ لـە سایەی نـەبوونی دادگـەری ئیسلامدا، دەوڵەمەند لە پێش هەژارەوەیە لە وەرگرتنی هەموو خەڵات و بەراتێکی دەوڵەتدا.

ئـەوەتا بـە چـاوی خۆمـان دەبیـنین وەزیرێکـی کۆچـکردووی خانەنـشین، موچـەکەی پێـنج ملیـۆن دینـارە، کارمەنـدێکی

ئاگرکوژاندنەوەش کە لە کاتی کوژاندنەوەی ئاگردا سوتاوەو مردووە، موچەی خانە نشینییەکەی کە ماڵ ومناڵەکەی وەری دەگرن سێ سەد هەزار دینارە!! ( لآ حَوْلَ وَلا قُوَةَ الا باالله ).

وە ئیمانداران: ئاگاداری ئەوەش بن، ئەوانەی کە بە دەرگای ماڵ و مزگەوتەکانەوە دەگەڕێن و داوای زەکات دەکەن، نابێت زەکاتیان پێ بدرێت چونکە نازانیت موستەحەقن یان نا، چونکە هەیانە زۆریش دەوڵەمەندەو هەر فێری سواڵ کردن بووە.

٣. کۆیلە: زەکاتی نادرێتێ، چونکە خاوەنەکەی لێی دەستێنێت، بەڵکو دەبێت کۆیلە هەوڵی خۆ ئازاد کردن بدات جا ئەگەر بۆ ئازاد بوونی لە کۆیلایەتی پێویستی بە پارە هەبوو، دروستە زەکاتی بدرێتێ تا بیدات بە گەورەکەیی و خۆی لە کۆیلایەتی ڕزگار بکات.

٤. هاشمی و مُطلبی : واتە: بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: ( إِنَّ هذهِ الصَّدَقات إِنَّما هيَ أُوساغ النَّاس، وَ إِنَّها لا تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَ لا لِآلِ مُحَمَّدٍ) رواهُ مسلِم (١٠٧٢) وَ النَسائي (٢٦٠٩).

واتە: ئەم زەکاتە بریتییە لەو بەشەی کە بە دەرکردنی، ماڵەکە پاك دەبێتەوە، یانی وەکو چڵکو پیسی دەستی خەڵکی وایە، وە زەکات دروست نییەو حەڵاڵ نییە کە محمد و ئالوبەیتی محمد بیخۆن و وەری بگرن.

ئەگەر یەکێك بپرسێت: باشە بۆچی ئال وبەیتی پێغەمبەرو خودی پێغەمبەری خوا ﷺ دروست نییە بۆیان کە زەکات وەربگرن؟ لەبەر

ئەوەیە کە موچەی ڕێزلێنانیان هەیە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، کەواتە: نابێت هیچ کەسێك دوو موچەی هەبێت لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، با ئەو کەسە نزیکترین کەسی پێغەمبەری خواش بێت یان خودی پێغەمبەری خوا خۆشی بێت ﷺ کە سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامییە، نابێت ئەویش دوو موچە لە حکومەت وەربگرێت، تەنانەت نابێت منداڵەکانیشیان لە ماڵی زەکات بخۆن، چونکە باوکیان موچە وەردەگرێ و بەشی ئەوانیش لەو موچەیەی باوکیان دا دیاری کراوە.

ڕۆژێکیان حەزرەتی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی کە منالْ بوو، تازە پێی گرتبوو، لە لای پێغەمبەری خوا بوو هەندێك خورما لەو شوێنەدا دانرابوو کە هی زەکات بوو، حەزرەتی حەسەن وەکو عادەتی منالْ کە دەست بۆ شت دەبات، دەستی برد دەنکێك خورمای خستە دەمییەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئاوڕی دایەوە بینی وا حەسەن دەنکێك خورمای زەکاتی خستووەتە دەمییەوە، بۆیە لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستییەی دا بۆ حەسەن، بەڵام پەنجەی خستە ناو دەمی و فەرمووی: (كِخ ،كِخ -لِيطرحها- أما شعرتَ أنّا لا نَأكُلُ الصَّدَقَة) رواه البخاري (١٤٩١) و مسلم (١٠٦٩).

فەرمووی: ئەی حەسەن کخ، کخ، بۆ ئەوەی دەنکە خورماکە بتفێتەوەو قوتی نەدات، ئایا نازانیت کە ئێمە نابێت زەکات بخۆین.؟

بەڵێ ئاوا بڕینی دوو مەعاشی و سێ چوار موچە وەرگری یەك کەس لە یەك کاتداو لە یەك حکومەت، کە ئێستا بەرپرسانی حکومەت بە قسە بانگەشەی بۆ دەکەن، سەردەگرێ، ئەو کاتە جێبەجێ دەکرێت

کە بەرپرسی یەکەمی وڵات، خۆی یەکەم کەس بوو کە پابەند بوو پێوەی، هەروەکو جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ماڵەوە زۆری برسی بوو، تەماشای کرد دەنکێك خورمای تەڕو تازەی زۆر جوان لەسەر زەوییەکە کەوتووە، پێغەمبەری خوا هەڵی گرتەوەو تەماشای کردو فەرمووی: ئەگەر لە ترسی ئەوە نەبوایە کە ماڵی زەکات بێت، ئەوا دەمخواردو زۆرم حەز لێی بوو، ئەمجا دایناوەو نەیخوارد.

هەروەها بزانن: کەسی نزیك کە نەفەقەی لەسەرت نەبێت وەکو برا، خوشك، مام، خاڵ، پور، ئامۆزا، پورزا، خزمانی تر، ئەگەر موستەحەقی وەرگرتنی زەکات بوون، ئەوا زەکاتەکەت پێش خەڵکی بێگانە بدە بەوان، چونکە ئەوان زیاتر چاویان لە دەستتەو چاوەڕێی هاوکاریت لێ دەکەن.

هاوەڵی گەورەو بەڕێز (ئەبی طەڵحە) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و زەکاتی ماڵەکەی هێنابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (وَ إِنّي أَرى أَن تَجعَلَها في الأَقرَبينَ) رواه البخاري (١٤٦١) ومسلم(٩٩٨)

واتە: بە ڕاستی من حەز دەکەم زەکاتەکەت بدەیت بە خزمە نزیکەکانت.

وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: (صَدَقَتُكَ عَلى ذي الرَّحِم: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ) رواه الترمذي (٦٥٨) والنّسائي (٢٥).

ئیمانداران: لە بارەی نیەت هێنان لە کاتی دەرکردنی زەکاتدا ئەوە بزانن کە، هەر کاتێك پارەی زەکاتەکە یان ئاژەڵەکە یان دانەوێڵەکە،

کە هی زەکاتە لە ماڵەکەت جیا کردەوە، وە لەو کاتەدا بەناو دڵتدا هات کە ئەمە زەکاتە، ئیتر ئەوەندە بەسەو لە دوایدا کە دەیدەیتە دەستی هەژارو قەرزارو موستەحەقەکە نەشڵێی ئەمە زەکاتە هەر دروستە.

وە بزانن: عولەمای شەرع دەفەرموون: جا فەقێی مزگەوت بێت یاخود خوێندکاری ئامادەیی و زانکۆو پەیمانگا ئەگەر مولتەزیم بوو بە ئیسلامەوە، جا کوڕ بێت یان کچ، وە باوکی دەست کورت و نەدار بێت، دروستە زەکاتی پێ بدرێت، چونکە خوێندنەکەی سوودی هەموو کۆمەڵگای تێدایە لە دواڕۆژدا، بەڵام ئەگەر کەسێك خۆی بۆ خوا پەرستی تەرخان کردبێت، چوبێت لە ژوورێکدا یان لە ئەشکەوتێکدا خۆی گۆشەگیر کردبێ و هەر خەریکی عیبادەت بێت، وە لەشی ساغ بێ و توانای کارو کەسابەتی هەبێت، ئەوە دروست نییە زەکاتی پێ بدرێت، بەڵکو دەبێت ئامۆژگاری بکرێت کە کاسپی حەڵاڵ و عەرەق ڕشتن و ماندوو بوون بەشێکە لە عیبادەت و لە جیاتی ئەوەی زەکاتی بدرێتێ، دەبێت فێری کاسپییەك بکرێت، چونکە عیبادەتی ئەم کەسە سوودەکەی تەنها بۆ خۆیەتی.

وە لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە ئاماژە بۆ خاڵێك بکەم کە ئەویش ئەوەیە: لە کوردەواری خۆماندا قسەیەك زۆر دووبارە دەکرێتەوە کە دەڵێن: بێوەژن و هەتیوو ئەگەر کۆڵەکەی ماڵەکەشی ئاڵتوون بێت هەر زەکاتی پێ دەشێت، بەڵام لە ڕووی شەرعەوە وا نییە، بەڵکو منداڵی بێ باوك و ئافرەتی بێ هاوسەر، جا بە تەنها بێت یان لەسەر منداڵ

دانیشتبێت، دەبێت سیفەتی هەژاری و نەداری وبێ دەرامەتییان تێدا بێت، ئینجا زەکاتیان پێ دەشێت، واتە: لەبەر ئەوەی منالەکە هەتیوە یان ژنەکە بێ هاوسەرە، زەکاتیان پێ نادرێت، بەڵکو ئەگەر منالی بێ باوك لە باوکییەوە سەروەت و سامانێکی زۆری بۆ بەجێ مابێت، کە بگاتە ڕادەی زەکات، دەبێت خۆی زەکات بدات، وە ئافرەتی بێوەژنیش بە هەمان شێوە.

وە لەبارەی گواستنەوەی زەکاتەوە لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆتەوە بۆ شوێنێکی تر، یان بۆ گوندو شارێکی تر زانایان فەرموویانە: زەکاتی هەر شوێنێك دەبێت بۆ هەژارانی ئەو شوێنە سەرف بکرێت، وە نەگوازرێتەوە بۆ شارێکی ترو شوێنێکی تر، بەڵام ئەگەر هاتوو خەڵکی ئەو شارو گوندەی کە زەکاتەکەی تێدایە، دەوڵەمەند بوون و کەسی وا دەست نەکەوت کە زەکات وەربگرێت، یان لە شارێکی تر خەڵکی زۆر زۆر موستەحەق ترو هەژار تری لێ بوون، یاخود لە شارەکەی تر خزمی نزیکی کەسی زەکات بەخشی لێ بوون کە موستەحەقی زەکات وەرگرتن بوون، ئەوا لەو کاتەدا گواستنەوەی زەکات لە شوێنی نیشتەجێ بوونی زەکات بەخشەوە بۆ جێگاو شارێکی تر بۆ هەژاران و قەرزاران و خزمانی هەژاری خۆی لەوێ، ئەوە دروستە.

ئیمانداران: ئەوەش بزانن کە مەرج نییە بەخشینی ماڵ وسامان تەنها هەر زەکات بێت، بەڵکو با ئەوەی زەکاتیشی نییە، چونکە ماڵەکەی و پارەو سامانەکەی ناگاتە ڕادەی زەکات، با هەر ببەخشێت

ئەگەر بە بڕێکی زۆر زۆر کەمیش بێت، بۆ ئەوەی فێر ببێت دەستی بەخشندەیی هەبێت، لەبەر ئەوەی هەرچییەك دەبەخشین، بۆ خۆمانە، چونکە بەخشین بەڵاو موصیبەت لەسەر مرۆڤ لادەبات، بەخشین بۆ بەرەکەتی ڕزق وڕۆزی خۆمانە، لەبەر ئەوەی هەر ماڵ وسامانێك لێی ببەخشرێت، خوای گەورە بە چەندین قات بەرەکەتی تێدەخات، قازانجی بەخشین بۆ ڕووناك کردنەوەی ناو گۆڕەکەمانە کە تەنها خۆمان و ئەوەی لە چاکەو بەخشین کردوومانە لەگەڵمان دەمێننەوە، بەخشین بۆ فریاکەوتنمانە لە کاتی کێشانی کردەوەکانمان لە میزان وتەرازوو، کە ( مِثْقَالَ ذَرَةٍ) لە چاکەو خراپە دەخوێنرێتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ البقرة: ٢٧٢

واتە: هەر خێرێك ئەنجام بدەن، ئەوە قازانجەکەی بۆ خۆتانە، ئێوە ئەی بڕواداران هیچ شتێك نابەخشن مەگەر بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە نەبێت و هەر خێرو چاکەیەکیش ئەنجام بدەن، پاداشتەکەیتان دەست دەکەوێتەوە، ئەوسائێوە بەهیچ شێوەیەك ستەمتان لێناکرێت.لەفەرموودەیەکی قودسی دا هاتووە کە خوای گەور دەفەرمووێت: ( أنفق يا أبن آدم يُنفق عليك) متفق عليه.

واتە: ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە دڵنیابە کە خوای گەورە پێت دەبەخشێت.

داواکارم لە خوای پەروەرگار دڵێکی بە قەناعەت، دەرونێکی دەوڵەمەند، سامانێکی پاك و بە ڕەحمەت، دەستێکی بەخشندەمان پێ ببەخشێت و ئەوەی دەیبەخشین خوای گەورە لێمان قبولْ بکات. اللهُم آمـــينْ .

# سەرچاوەکان:.


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان ( بورهان محمد ئەمین).

٣.ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم ( ئاوات أبوبکر ئەحمەد) .

٤. ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ( کۆمپانیای ووشە).

٥. فَتاوی وَاحْکام بَرید الأسلام ( د. احمد علي طريان ).

٦. جَواهِر الخُطَب المُختارة اعداد ( عَدَدٌ مِنَ الخُطَباء ).

٧. سيرة عُمَر بُنُ الخَطابْ ( د. علي محمد الصَلابي) .

٨. صَحِيح فِقه السُنَة ( أبو مالك كمال بن سيد سالم ).

٩. الفقه المنهجي على مذهب الامام الشافعي ( د. مصطفى الخُن ... د. مصطفى البغا ).

١٠. تەفسیری ڕامان ( م. ئەحمەد کاکە محموود ).

الحَمدُ لِلهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَلامُ على سَيّدنا مُحَمَّد وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ اجمَعينَ:

ئیماندارانی بەڕێز: مرۆڤ بە درێژایی تەمەنی لە خۆ ماندوکردن و ڕەنجداندایە، شەووڕۆژ ئەخاتە سەر یەك و فەرهاد ئاسا هەوڵی هەڵکۆڵینی شاخە سەختەکانی بەردەمیەتی بە ئومێدی هێنانە دی ئاواتەکانی، لێرەدا پرسیارێك درووست دەبێت، باشە بۆچی مرۆڤ بەردەوام هەر لە هەوڵداندایەو حەسانەوەی نییە؟، بێگومان وەڵامەکەی تەنها ئەوەیە: گەڕانە بە دوای خۆشبەختی و کامەرانی و دوورکەوتنەوە لە چارە ڕەشی و بەدبەختی، وە بەختەوەری چەندین پێناسەی بۆ کراوە، بەڵام گشتگیرترین پێناسە بۆ بەختەوەری ئەوەیە کە: دوور بوونە لە ترس و غەم و پەژارە، ( خَوفْ ) لەگەڵ ( حَزنْ ) .

بەڵێ: ئەمڕۆ و ڕابردوو خەڵکی دەیانەوێ و ویستوویانە بەم ڕێگایانە بگەنە بەختەوەری:

یەکەم: بەدەست هێنانی ماڵ وسامانی زۆرو دەوڵەمەند بوون، کە ئەمە حەزێکی ناو ناخی مرۆڤە، ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا﴾ الفجر ٢٠.

وە مرۆڤ ئەوەندە ئالودەی ماڵ وسامان و پارەو پول دەبێت، بە شێوەیەك هەر خەریکی پەیداکردنی و کۆکردنەوەیەتی و دەیژمێرێ و لەسەر یەکی دادەنێت و دڵی خۆش دەبێت کە سەیر دەکات پارەکانی زۆر بوون، وە ڕژدی وبەغیلی دەکات و لێی نابەخشێت تا کەم نەبێتەوە، وا دەزانێت کە ماڵ وسامانەکەی دەبێتە هۆی تەمەن درێژی

ونەمری بۆی، وا دەزانێت کە دەوڵەمەند بوو ئیتر مردن زەفەری پێ نابات،! هەروەکو قورئانی پیرۆز لە وەصفی ئەو کەسە بە هەڵەچوانەدا کە نەحەسانەوەی دونیاو، وەیل و هاوارو ناڵەی قیامەت بەشیانە دەفەرموێت: ﴿الذي جَمَعَ مالاً وَ عَدَّدَهُ ، يَحسَبُ أَنَّ مالَهُ أخلَدَهُ﴾

بەڵام بەرێزان: ئایا کەستان بینیوە بە دەوڵەمەندی وماڵ وسامانی دونیا، گەیشتبێتە بەختەوەری و خۆشبەختی؟ ئایا کەس گەیشتووەتە ئەو رادەیەی کە بە ماڵی دونیا هەموو هیواو ئاواتەکانی هاتبنە دی و بڵێ ئیتر بەسمە؟ نەخێر، هەروەکو پێشەوای مرۆڤایەتی حەزرەتی محمد ﷺ فەرموویەتی: ( لَو كانَ لِابنِ آدَمَ واديانِ لَابتَغى الثالث. وَلا يملأُ جَوفَ ابنُ آدَمَ إلاّ التُراب، وَ يَتوبُ اللهُ على مَن تابَ ) رواه البخاري .

واتە: ئەگەر نەوەی ئادەم دوو شیوی هەبێت، ئاوات دەخوازێت سێهەمیشی هەبوایە، وە هیچ شتێك بۆشایی و تەماحی نەوەی ئادەم پڕ ناکاتەوە تەنها گڵی ناو گۆڕ نەبێت، وە خوای گەورە لەو کەسە خۆش دەبێت کە داوای لێخۆش بوون لە خوای گەورە بکات و تەوبە بکات.

لە ( البِدايَة وَالنِهايَة) ی شێخی ( ابن كثير) دا هاتووە کە: حەزرەتی عیسا پێغەمبەر ( سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ( طالبُ الدُنيا مثلُ شارب ماءِ البَحرِ، كلَّما ازداد شرباً ازداد عَطشاً، حَتّى يقتله ).

واتە: ئەو کەسەی بەردەوام عەودالّی ئەم دونیا فانییەیەو قیامەتی بیر چووەتەوە، وەکو ئەو کەسە وایە کە زۆر تینویەتی و لە تینوان دەمی خستووەتە ناو ئاوی سوێری دەریاوە، کە هەتا زیاتر بخواتەوە بە ئومێدی ئەوەی کە تینوێتییەکەی بشکێت، کەچی جار بۆجار بەو ئاوە سوێرە تینوێتییەکەی زیاد دەکات، هەتا ئەوەندە ئاوی سوێر دەخواتەوە تا دەیکوژێت و لە ناوی دەبات.

بەڵێ بەڕێزان: لەسەرەتادا ووتمان: بەختەوەری بریتییە لە دوور بوون لە ترس و دوور بوون لە خەم وپەژارە، بەڵام ئایا ماڵ وسەروەت وسامان خەم وترس لەسەر خاوەنەکەی لادەبات یان بۆی درووست دەکات؟ بێگومان ئەوەی لەزەتی ماڵ وسامان لادەبات دوو شتە:

١. ترس: بەردەوام خاوەن سامان لەوە دەترسێت کە ماڵ وسامانەکەی لە دەست بچێت، ئایا کێ هەیە ضەمانی لە دەست نەچوونی ماڵ وسامان بکات؟ چەند جار بینیومانە کەسێکی زۆر دەوڵەمەند خاوەنی چەندین دووکان بووە لە بازاڕێکی قەرەباڵغ و ناوەندی شارێکدا، ئێوارە بایی سەدان هەزار دۆلاری تێدا بووە، بۆ بەیانی هیچی نەماوەو بەهۆی شۆڕتی کارەباوە هەموو بازاڕەکە سووتاوەو سەرمایەی ئەم دەوڵەمەندە هەندێك خۆڵەمێشی ماوەتەوە!.

کەواتە: تا ماڵ وسامان زیاتر بێت ترس لە دڵی خاوەنەکەی دا زیاتر دەبێت.

٢. تا سەروەت وسامان زیاتر بێت خاوەنەکەی خەفەتی زیاتر دەبێت: بۆ نموونە: کاتێك دووکاندارێك بە یانی دووکانەکەی

دەکاتەوە ئەگەر وای دانا کە (٥٠) دۆلار قازانج دەکات، کەچی ئێوارە بۆی دەردەکەوێت ئەو ڕۆژە بازاڕی زۆر گەرم بووەو (١٠٠) دۆلاری قازانج کردووە، دەبینی زۆر خۆشحاڵە، بەڵام لە هەمان ڕۆژدا بازرگانێکی ناوداری گەورەی نێودەوڵەتی وای دانا لەو معامەلەیەدا دوو ملیۆن دۆلار قازانج دەکات، ئەگەر لە ئەنجام دا یەك ملیۆنی قازانج کرد، ئەوە زۆر خەفەتبار دەبێت و دونیای لیَ تاریك دەبێت و وا دەزانێت ملیۆنێکی زەرەر کردووە!

کەواتە: تا ماڵ وسامان و سەرمایە زۆرتر بێت، ترس وخەفەت بۆ خاوەنەکەی زیاتر دەبێت.

بەم شێوەیە دەرکەوت کە ئەوانەی وادەزانن بە دەوڵەمەندی وسەروەت وسامان پێکەوەنان بەختەوەر دەبن، بەهەڵەدا چوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر کەس هەبووە تا هەژار بووە زۆر ئاسوودەو بەختەوەر ژیاوە و زۆر حورمەت وڕێزی هەبووە، کەچی کە دەوڵەمەند بووەو بووەتە سەرمایەدارێکی ناودار ئیتر ژیانی ئاسوودەیی ڕۆیشتووەو بە کەسێکی چروك ورەزیل ناسراوەو بیَ ڕێز بووە لە ناو خەڵکی دا.

دووەم: هۆکاری بەختەوەری لای خەڵکی بەدەست هێنانی پلەوپایەیە: بەدەست هێنانی ناوو ناوبانگ وشۆرەتە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەمیش مرۆۋ بەختەوەر ناکات، لەبەر ئەوەی مرۆۋ تا پلەو پایەو مەنصەب بە دەست دێنیَ و هەڵبژاردن تەواو دەبیَ ، هەموو ژیانی خەم ودڵەڕاوکێیە، پاشانیش کە بەدەستی هێنا بەردەوام لە

ترسی ئەوەدایە تۆ بڵێی پلەوپایەو کورسییەکەی لە دەست نەچێت، وە بەردەوام لە ماستاوچییەتی و ملکەچیدایە بۆ بەرپرسانی سەروخۆی، بۆ ئەوەی پلەیەکی بەرزتر ببڕێ و موچەیەکی زیاتر بەدەست بهێنێت، وە ویژدانی خۆی دەفرۆشێ و بەردەوام ئۆباڵی ناحەق دەکێشێ و بەسپی دەڵێت ڕەشە، بۆ ئەوەی سەرکردەکانی لێی ڕازی بن، لە قیامەتیشدا هاوار دەکات: ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ۝٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾ الحاقة: ٢٨

ئەگەر تەماشای مێژووی ژیانی ئەو کەسانە بکەین کە لە غەیری خواناسیدا بە شوێن بەختەوەریدا دەگەڕاون، وە ناوو ناوبانگیان بە هەموو جیهان دا بڵاو بووەتەوە، بەڵام بەختەوەر نەبوون، بەڵکو ئاخر شەڕیش بوون، وە لە ژیان نائوومێد بوون، بۆ نموونە:

١. (دیل کارنگی): خاوەنی دەیان کتێبی بەهێز لەسەر بەهێزکردنی متمانە بەخۆ بوون و لابردنی دوودڵی ودڵەڕاوکێ لەسەر مرۆڤ. وەکو کتێبی ( دَع القَلَقْ وابدء الحَياة) و دەیان کتێبی تر کە بۆ زمانە گرنگەکانی جیهان وەرگێڕدراون، کەچی ئەم نووسەرە بە توانایە، خۆی لە دڵەڕاوکێدا ژیاو سەرەنجام لە ژیان بێزار بوو، وە بەدەستی خۆی ژیانی خۆی کۆتایی پێ هێنا.

٢. ( ارنست همنجوای) ڕۆمان نووسی بە ناوبانگی جیهانی، خاوەنی ڕۆمانی بەهێزی ( الشَيخُ والبَحر) کە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت

لە ئەدەبدا، وە ناوبانگی جیهانی پڕکرد، بەڵام بەختەوەری بەدەست نەهێناو ئەمیش خۆی لەناو برد.

٣. وێنەکێشی بەناوبانگی جیهانی و هۆڵەندی ( فان جوخ ) کە تابلۆکانی لە لەندەن وپاریس بە ملیۆن دۆلار دەفرۆشران، تەنانەت تابلۆی ( گوڵە بەڕۆژەکان) ی بە شەش ملیۆن دۆلار فرۆشرا، بەڵام ئەم کەسە ناودارەش بەختەوەری دەستگیر نەبوو لە ژیانی داو سەرەنجام لە ساڵی ١٩٨٠ دا خۆی کوشت.

٤. نوسەری میصری ( د. ئیسماعیل ئەدهەم ) کە لە زانکۆی مۆسکۆ دکتۆرای لە بیرکاری دا وەرگرت، ئەم پیاوە بانگەشەی بۆ بێباوەڕی دەکردو کتێبی ( بۆچی من مولحیدم ) ی نوسی، چەندین زمانی جیهانی دەزانی و دەیان نوسین ولێکۆڵینەوەی ئەدەبی وزانستی هەیە، بەڵام ئەمیش بەهەڵەدا چوو کە وای زانی بەختەوەری مرۆڤ لە بێ بڕوایی و پابەند نەبوونە بە ئاینەوە، هەر بۆیە ئاخر شەڕ بوو، وە خۆی فڕێ دایە دەریاوەو خنکاو لە دوای مردنی لە دەفتەری یاداشتەکانی دا دۆزرایەوە کە نوسیبووی لە ژیان بێزارم بۆیە بڕیاری خۆ کوشتنمدا.

٥. ( کریستیان ئۆناسیس) کچی ملیۆنێری یۆنانی ئۆناسیس: کە لە باوکییەوە ملیۆنان دۆلاری بۆ بەجێ ماو خاوەنی چەندان شەریکات و کۆمپانیا بوو، بەڵام دوای ئەوەی چەند جارێك لە ژیانی هاوسەریدا شکستی هێنا، وای زانی کە بەدبەختییەکەی هی زۆری سەروەت وسامانەکەیەتی!! بۆیە دواجار شووی کرد بە کەسێکی

کۆمۆنیست کە لە گەڕەکێکی هەژارنشینی مۆسکۆدا دەژیا، بەڵام لای ئەمیش دڵی ئاسوودە نەبوو، تا سەرەنجام دونیای لەبەرچاو تاریك بوو، وە ئومێدوو هیوای بە ژیان نەماو خۆی دەرمان خوارد کردو خۆی لەناو برد.

٦. دکتۆرە ( دوریە شەفیق ) ئەو ئافرەتە میصریەی کە لە پاریسی وڵاتی فەڕەنسا دکتۆرای وەرگرت، کە گەڕایەوە بۆ میصر، یەکەم حیزبی ژنانی دروست کردو داوای ئەوەی دەکرد کە ژنان واز لە دین بهێنن وخۆیان لەبەرگی داپۆشراو دابڕنن، بۆ ئەوەی بەختەوەر بن و سەربەست بن، بەڵام نەك هەر کەسی پێ بەختەوەر نەکرا، بەڵکو خۆشی بەدبەخت بوو تا وا لە ژیان بێزار بوو، کە لە نهۆمی شەشەمی شوقەکەیەوە خۆی فڕێدایە خوارەوەو مرد.!!

٧. گۆرانی بێژ ( دالیدا ) لە قاهیرە لە دایك بوو، چووە فەڕەنساو لە ماوەی بیست ساڵی گۆرانی وتنی دا (٦٠٠) گۆرانی بە(٨) زمان گوت، بەژداری دەیان ئاهەنگی کرد لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی داو خەڵکی کەئاگایان لە ناخی نەبوو، هەر دیوی دەرەوەیان دەبینی خۆزگەیانی پێ دەخواست، بەڵام ئەمیش چونکە لە خواناسی دوور بوو، لەساڵی ١٩٨٧دا خۆی دەرمانخوارد کردو خۆی کوشت ، کاتێك چوونە سەری نامەیەکی لەبەر دەمدا بوو لەسەری نوسیبوو: ( الحَياةُ لا تُحْتَمَل سامحني ) .

بەڵێ ئیمانداران: ئەمانە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا گەڕان بە دوای ماڵ وسامان وپلەو پایەو ناوو ناوبانگ دا، وە بە دەستیشیان هێنا، بەڵام

سەرەنجام نەگەیشتنە بەختەوەری و خۆشی وئاسوودەیی ژیان، چونکە خوای گەورە بە حیکمەت و دادپەروەری خۆی ئاسوودەیی و بەختیاری نەخستووەتە ناو پارەو سامان و ناوبانگەوە، چونکە دیارە خەڵکانێکی کەم لە چاو هەموو خەڵکی دا هەیانە.

☜ خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا بە ئاگامان دێنێتەوەو دەفەرموێت: ﴿فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ التوبه: ٥٥ .

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ وەئەی تەواوی ئیمانداران: نەکەن ماڵ وسامان و نەوەو ئەولادی زۆریان سەرسامتان بکات، وا بزانن هی باشییانە کە خوای گەورە ئەوەندە دەوڵەمەندی کردوون و ئەوەندەی ئەولاد پێ بەخشیون، بەڵکو خوای گەورە دەیەوێت بەو ماڵ وسامان و نەوەو ئەولادە زۆرەوە هەر لەم ژیانی دونیایەدا ئەو کافرو بێ دینانە پێش قیامەت توشی بەڵاو سزاو ئەشکەنجەو ئازاری دەروونی بکات.

زانایان فەرموویانە ووشەی ﴿لِيُعَذِّبَهُم﴾ لە ئایەتەکەدا مەبەست پێی ( المشَقَّةُ وَ النَصَبُ وَ الألَمُ وَ الهَمُ وَ السَّقَمُ ) .واتە: خوای گەورە ئەو ماڵ وسامان و دەسەڵات و ئەولادە زۆرەیان بۆ دەکات بە مایەی ماندوێتی و ناڕەحەتی و نەحەسانەوەو ئەشکەنجەو ئازارو خەم وخەفەت و نەخۆشی ودەردی لاشەیان، وتوشی دەیان نەخۆشی دەبن و تامی لێناکەن.

بەڕێزان: ئەی کەواتە خۆشبەختی و بەختەوەری مرۆڤ لە چیدایە؟
لە وەڵام دا دەڵێین:

(١) یەکەم: لە ئیمان وخواناسی دایە، خوای گەورە دەفەرمووێت:
﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ النحل ٩٧

واتە: هەرکەسێك کاروکردەوەی چاکەی کردبێت، پیاوبێت یان ژن، لە کاتێکدا کە بڕواداربێت، سوێند بەخوا بە ژیانێکی کامەران وئاسوودە لە دونیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بە جوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

(٢) دووەم: بەختەوەری و ئاسوودەیی دڵ ودەروون بەیادو زیکری خوای گەورەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ الرعد ٢٨

واتە: ئاگاداربن دڵەکان هەر بەقورئان وهەر بەیادی خواو ( پابەند بوون بە ئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە.

(٣) سێهەم: مرۆڤی ئیماندار بەوە بەختەوەرە کە هەرچەندە لە ژیانیدا توشی نارەحەتی و خەم و ئازار ببێت، بەڵام کە توشی نارەحەتی و ئازارەکانی ژیان بوو، یەکسەر بیری پاداشتی خوای دەکەوێتەوەو ئیتر کە ئەو هەموو پاداشتەی خوای گەورەی هاتە بەرچاو، ووردە ووردە ئەو خەم و ئازارەی لەبەر چاو کەم دەبێتەوەو لە لای ئاسان

دەبێت و چۆکی لەبەردەمدا نادات، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ النساء ١٠٤

واتــە: ئەگــەر ئێــوەی ئیمانــدار ئــێش و ئــازارو مانــدوێتی و برینداریتان بۆ پێش بێت، ئەوا خۆ هەمان ئێش وئازار توشی کافران وخوانەناسان دەبێت ( لە ژیانی دونیاو کاتی شەڕدا) بەڵام ئەوەی ئێوەی موسوڵمان، دامەزراوو ڕاگیراو بەهێز دەکات، ئەوەیە کە ئەوەی ئێوە بە ئومێدو بە تەمان لە لایەن خواوە دەستتان بکەوێت ( لەبەهەشت ) دا ئەوان بەتەمای نین.

بەڵێ ئیمانداران: بەڕاستی ئەوەی مرۆڤ بەختەوەر دەکات، تەنها ئیمان وباوەڕێکی پتەوە بەخوا، ئەوەتا ( شیخ الاسلام ابن تیمیة) لە گەڵ ئەو هەموو هەژاری و ناڕەحەتییەی کە لە ژیانیدا بەسەریدا هات کەچی بەردەوام دەیفەرموو: ( جَنَّتــي فــي قَلبــي).واتە: بەردەوام ئەوەندە دڵم خۆشە کە هەروەکو لە بەهەشت دا ژیان بەسەر بەرم وایە.

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمیش دەیفەرموو: ( إنَنا نَعيشُ في ســعادةٍ لَو عَلِمَ بِها المُلوك لَجادلَونا علَيها بالسَّيُوف)

واتــە: ئێمــەی ئــەهلی دینــداری وخواناســی لــە خۆشــبەختی و ئاســوودەیی و بەختەوەرییەکـداین، ئەگـەر پاشـاو دەسـەڵاتدارەکان پێیان بزانیایە، ئەوا دەهاتن بە شمشێر لێیان دەسەندین.

واتە: نەك خۆزگە ناخوازێت بە ژیانی پاشایان بەڵكو لەوە دەترسێت ئەوان حەسوودی بە خۆشبەختی و بەختەوەری ئەم ببەن، یەكێكی تر لە پیاوچاكان دەفەرموێت: ( إِنَّهُ لَتَمرُ عَلَيَّ ساعات أَقولُ فيها، لَو كانَ أَهلُ الجَنَّةِ في مثلِ ما أَنا فيهِ الآن، لَكانوا إِذاً في عيشٍ طَيب).

واتە: من چەند ساتێكم بەسەردا دێت، ئەوەندە تێیدا دڵخۆش و كامەران وئاسوودەم، لەو كاتەدا دەڵێم، ئەگەر خەڵكی بەهەشت لەو خۆشییەدا بن كە من ئێستا تیایدام، ئەوا بەڕاستی لە ژیانێكی زۆر خۆشدان.!!

بەڵێ ئیمانداران: ئەوەی ژیانی خەڵكی تاڵ دەكات ترسی مردنە، بەڵام ئیمانداری ڕاستەقینە بە مردن وگەیشتنەوە بە لیقای خوای گەورە، دەگاتە بەختەوەری.

صەحابەیەكی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتێكدا تیرێكی دوژمنانی بەركەوت و خوێن لە لاشەی دەهاتە دەرەوەو بەرەو مردن دەچوو فەرمووی: ( فُزتُ وَ رَبَّ الكَعبَة ).سوێند بەخوای كەعبە بردمەوەو بە ئاواتی خۆم گەیشتم، بەڵێ لە كاتێكدا كە ژیانی كۆتایی پێهات فەرمووی : بردمەوە، چی بردەوە؟ بەهەشتی خوای بردەوە، بەڵێ مردن لە پێناوی خوای گەورەدا بردنەوەیە، سەرفرازی و ڕزگار بوونە.

مامۆستای گەورەو موفەسیری قورئان ( سید قطب ) لەو كاتەدا كە لە سجندا بوو، لە لایەن ڕژێمی میصرەوە ئەوەی خرایە بەرچاو، كە ئەگەر لە قسەو بۆچونەكانی پەشیمان بێتەوە، دەیكەن بە وەزیرو چی

بـویْ دەیـدەنیْ، بـەڵام ڕەتـی کـردەوەو فـەرمووی: ئـەو پەنجەیـەی شایەتوومانی پـیْ دەهێنم هـەرگیز ووشـەیەکی بۆ دوژمنـانی ئیسلام پـیْ نانوسـم، پێیـان ووت: ئـەی چـاوەڕوانی چـیت؟ فـەرمووی: چاوەڕوانم لـە سێدارەم بدەن و بمرم و بـە نوێنەرایـەتی موسوڵمانان بگەڕێمەوەو بچمە خزمەتی خوای پەروەردگار.

بەڵیْ ئیماندار بەختەوەرە چونکە دەزانێت هەرچی توشی ببێت لە لایەن خوای گەورەوە بۆی نوسراوە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ التغابن ١١.

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ الحديد ٢٢.

کەواتە: مادام لە لایەن خواوە بۆم بڕیار درابێت، خوای گـەورەش ( الحكيم)ە کەواتـە هەرچـەندە ئـەو ڕووداوانـەی ڕۆژگـار بـە ڕووکـەش ناڕەحەت کەرن، بەڵام سـەرەنجامیان بە خێر کۆتـایی دێـت، وە مـادام ئیماندار خوای خۆش دەوێت، ئەوا هەرچی لـە لایـەن خۆشەویستەوە بێـت هـەر خۆشـە، پێغەمبـەری خۆشەویـستمان ﷺ فەرموویـەتی: ( احرص عَلى ما يَنفَعُكَ ، واستَعن بالله وَلا تَعجـز، وَ إذا أصـابَكَ

شَيءٌ فَلا تَقُل، لَو أَنّي فَعَلتُ كَذا، كانَ كَذا وَ كَذا، وَ لكِن قُل: قَـدَرَ الله وَما شاءَ فَعَلَ، فَأِنَّ (لَو) تَفتَحُ عَمَلَ الشَيطان) رواه مسلم.

**واتە: سووربەو بگەڕێ بە شوێن ئەوەدا کە سوودت پێدەگەیەنێ و دودڵ و ڕاڕا مەبە، پشت بەخوا ببەستەو دەستەوسان مەبە، وە ئەگەر شتێکت تووش بوو بەدڵت نەبوو، ئەوا مەڵێ: ئەگەر بێت و وام بکردایە ئاواو ئاوا دەبوو، بەڵکو بڵێ خوای گەورە چی بڕیار دابێت هەر ئەوە دەبێت، وە هەرچی مەیلی لێبێت دەیکات، چونکە ووشەی (ئەگەر) دەرگای شەیتان دەکاتەوەو توشی وەسوەسەو خەیاڵ و قسەی نابەجێت دەکات.**

**ئیمانداران: یەکێك لەو شتانەی کە بیرو هەستی خەڵکی داگیرکردووەو زۆرجار ترسی بۆ دروست کردووەو بەختەوەری لێسەندووە، مەسەلەی ڕزق وڕۆزییە، لەوە دەترسێت کە ڕزقی کەم بێت یان کەسێك لێی داگیر بکات، یان نانی ببڕێت، بەڵام ئیماندار ئەم گرفتەی بۆ دروست نابێت، چونکە لە قورئانەوە تێگەیشتووە کە ڕزق وڕۆزی مسۆگەرە، وە خوای گەورە دەفەرموێت:**﴿خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ﴾

**خوای پەروەردگار دروستی کردوون پاشان ڕزقیشتان دەدات، ئەم ئایەتە پیرۆزە تێمان دەگەیەنێت کە ڕزق وڕۆزی بە دەست خالقە نەك بەندە، ئەو خوایەی کە لە نەبووەوە مرۆڤی دروست کردووەو هەر ئەویش ئەتوانێت ڕزقی بدات، پاشان خوای گەورە وەعد و بەڵێن**

ئـــەدات بـــەدابین کردنـــی ڕزق وڕۆزی بەنـــدەکانی و دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ﴾الذاريات ٥٨.

بەڕاستی هەر خوا خۆی ڕۆزی بەخشەو خاوەنی هێزو دەسەڵاتی پتەوە.

پاشان خوای پەروەردگار نەك هەر بەڵێن دەدات، بەڵكو ضەمانەتی ڕزقی بەندەکانیشی دەکات و دەفەرموونێت﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ۝٦ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ هود ٦-٧.

واتە: هیچ زیندەوەرێك نییە لەم سەر زەوییەدا ڕزق وڕۆزییەکەی لەسەر خوای گەورە نەبێت، ئاگادارە بە شوێنی حەوانەوەو شوێنی دەرچونیان، هەموو شتێك تۆمارە لە دۆسییەی ئاشکرادا لە ( لَوحُ المَحفوظ) دا.

دوای ئەوەی خوای پەروەردگار بۆ زیاتر دڵنیایی بەخشین بە بەنـدەکانی، بەزەمانـەت کردنـی ڕزقیـان بـەس ناکـات و سـوێندیش

٢ـ سوێند

دەخـــوات و دەفـــەرموێت: ﴿وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴾.الزاريـات ٢٢-٢٣.

**واتە: سەرچاوەی ڕزق وڕۆزیتـان لـە ئاسمانەوەیـە، ( لـە خـودا داوا بکـەن ) هـەروەها ئەوانـەش کـە بـەڵێنتان پێـدراوە، سـوێند بـە پەروەردگاری ئاسمان وزەوی، ئەو بەڵێنانە حەقیقەت و ڕاستەقینەن، هەروەك چۆن ئێوە قسەی ڕاست ودروست دەکەن.**

**بـەڵێ خۆشەویـستان ئەمـە هـەمووی فـەرموودەو وەعـدو بـەڵێن و دڵنیـایی کـردن و سـوێند خـواردنی خـوای خـالق و ڕازقمانـە بـۆ دڵنیـا کردنمـان لـەوەی کـە ڕزق و بـژێوی ژیانمـان دابـین کـراوەو هـیچ مـەخلوقێك، هـیچ لایـەن وکـەس و دەسـەڵاتدارێك، بـەبێ ئیزنـی خـوا ناتوانێت ڕزقمان ببڕێت، یان زیادی بکات، وە هەتا لە ژیان دا بین بێ ڕۆزی نابین، کەواتە: ئێمەی ئیماندار دڵنیـایی تـەواو وەردەگرین و لـە خەم وپاڕایی بە دوورین لـەبارەی ڕزق وڕۆزییـەوە کە خـەڵکانێکی زۆر بەهۆیەوە، بە بیرکردنەوەی زۆر لێی، بەختەوەریان لەدەست داوە.**

**پێغەمبـەری خۆشەویـستمان ﷺ فەرموویـەتی:** (لَو أَنَّ إبـــنَ آدَمَ هرب منِ رِزقِهِ كَما يَهرُب مِنَ المَوتِ لَأدرَكَهُ رزقه كَمـــا يُدركـــه المَوتُ ﴾ رواهُ أبو نعيم في حليـــة الأوليـــاء ج٧ ص٩٠ وَحَـــسَّنَهُ الألباني في صَحيح الجامِع.

واتە: ئەگەر نەوەی ئادەم لەبەر ڕزق وڕۆزییەکەی کە بۆی دیاری کراوە ڕابکات، هەروەکو چۆن لە مردن ڕائەکات، ئەوا ئەو ڕزق وڕۆزییەی هەر پێی دەگات، هەروەکو چۆن مردن هەر پێی دەگات.

بەڕێزان: لە قورئانی پیرۆزدا کە باسی ئیمان کراوە یەکسەر عەمەلی صاڵحیشی لەگەڵ دا باس کراوە، ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ﴾ . کەواتە: کاروکردەوەی جوان وڕەوشتی بەرزو پەسەند کە بەرهەمی ئیمانە مرۆڤ خۆشبەخت دەکات.

بەڵێ بەڕێزان: لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا بوو، کاتێك بۆ یەکەم جار وەحی لە ئاسمانەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات. بەترس ولەرز لێهاتنەوە لە ئەشکەوتی (حراء )دا، وە هاتەوە بۆ ماڵەوەو بە خاتوو خەدیجەی فەرموو: ( زَمِّلُونِي ، زَمِّلُونِي ) دام پۆشن، دام پۆشن، خاتوو خەدیجەش بە پارچە قوماشێك دایپۆشی و پێغەمبەری خۆشەویستمان ماوەیەك پشووی داو خەوت، پاشان کە هەڵسا لەخەو هاتەوە سەر خۆی و فەرمووی: ئەی هاوسەری بەڕێزو بەوەفاو پشتیوانم، ( لَقَد خَشِيتُ عَلَى نَفسي) لە خۆم ئەترسم کە توشی بەڵاو ناڕەحەتییەك ببم، خاتوو خەدیجە فەرمووی:( كَلاَّ وَاللهِ لايخزِيكَ اللهُ أَبَداً).

نەخێر، ئەی محمد، ئەی هاوسەری چاك وپاکم، دڵنیابە، سوێند بەخوا، هەرگیز خوای گەورە تۆ توشی بەڵاو ناخۆشی ناکات، ئایا بەڵگەی خاتوو خەدیجە بۆ ئەم سوێند خواردنەی چییە؟ لەبەر ئەوەی

( إنَّكَ لَتَصلُ الرَّحمَ وَ تَحملُ الكَـلَّ وَ تكـسبُ المَعـدومَ، وَ تَقـري الضَّيفَ، وَ تعينَ عَلى نوائبِ الحَقِّ).

واتـە: ئـەی محمـدی خۆشەویـستم تـۆ هـەرگیزاو هـەرگیز خـوای گەورە توشی بەڵاو نارەحەتی لەناو بەرت ناکات، چونکە تۆ خاوەنی ئەم هەموو کردەوە جوانانەی، تۆ چاکە کاریت لەگەڵ خزم وکەس وکارتداو هاوکاری خزمەکانت دەکەی، ئەوەندەی لە دەستتدا بێت دەستگیرۆیی خەڵکی هەژارو لاوازو هەتیوو ئەو خێزانانە دەکەی کە ژمارەیان زۆرەو بەرهەمیان کەمە، وە هەرکەسێك ڕووت لێبنێ و داوای شتێکت لێ بکات، کە ئەو شتە لای تۆ نەبێ لای کەسی تر دەست نەکەوێت، تـۆ دەسـت بەڕوویـەوە نـانێی و بەشـی ئـەدەیی و پێویستییەکەی بۆ جێبەجێ دەکەی، وە لەکاتی بەڵاو موصیبەت و کارەساتەکان دا هاوبەشی خەم ونارەحەتی خەڵکی دەکەیت.

هـەزاران هـەزار ڕەحمـەت لـە گـۆڕت ئـەی خـاتوو خەدیجەی ژیرو تێگەیشتوو، کە جوان لەو ڕاستییە تێگەیشتبووی کە هەرکەسێك بیەوێت بەختـەوەر بێت، با ئـەم سیفەتە بەرزو ڕەوشتە باڵاو پڕ بەهایانەی تێدا بێت.

بەڵێ ئیمانداران: ڕەوشتی جوان وعەمەلی صالح، مرۆۆ بەختەوەر دەکـات، نـەك تـەنها نوێـژو ڕۆژوی بـێ کـردەوەو چـاکەکاری لەگـەڵ مرۆڤـەکان، باسـەرنجی ئـەم چـەند لایەنـەی ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلام بدەین:

لەگـەڵ ڕۆژووی ڕەمەزانـدا سـەرفیترە دانـراوە: بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ ئـەوەدا کـە بـەڕۆژووی دڵـی هـەژارو نـەدارێکیش خـۆش بکـەی و بـە گەشـانەوەی دەم وچـاوی ئـەو هـەژارە، ئـەو قـەرزارە، ئـەو سـەرخوانە بەتاڵـە، کـە بـەو پارەیـەی تـۆ خۆشـی وگەشـی دەگەڕێتـەوە نـاو دڵـی و خێـزان ومـاڵ ومنـاڵی، ئـەویش بـەربانگێکی تێـرو تەسـەل دەکاتـەوە، خوای گەورە خۆشی و بەختەوەریش دەخاتە دڵی تۆوە.

خاڵێکی تر لـە شـەرع دا دەفـەرموێت: ئـەو کەسـەی کە ڕۆژووی بۆ نـاگیرێ وبـێ هیوایـە لـەوەی کـە ڕۆژووەکـەی بـۆ بگیرێتـەوە بـەهۆی نەخۆشـی درێژخایـەن یـان بـەهۆی پـیری و بەسـاڵا چـوویی، ئـەوە لـە جیاتی ئەو ڕۆژووە با خواردنی هەژارێك بدات لە بری هەر ڕۆژوویـەك، جا یەکێك لە حیکمەتی ئەو( فیدیە ) بەخشینە ئەوەیە، ئـەو نەخۆشـە، ئەو بەساڵا چووە ئیمانداره، کـە دڵـی تەنگە بەوەی کە وا ڕۆژووی بۆ ناگیرێـت، بـە بەخـشینی ئـەو فیدیەیـە دڵـی خـۆش دەبـێ و بێتاقەتییەکەی لەسەر لادەچێت کاتێك دەبینێت بەو پارەی فیدیەیـەی کە داویەتی دڵی هەژار وموحتاجێك خۆش بووە.

ب) نموونەیـەکی تـر: کەسێك سووێند دەخـوات کە ئـەو کـارە نـەکات، ئـەو خواردنـە نـەخوات، هاتوچـۆی فڵـان کـەس نـەکات، بـەڵام دواتـر پەشیمان بوو، یان وای پێویست دەکرد کە ئەو کارە بکات، ئەوا لـەم کاتەدا لە دوو دڵـی و دڵتـەنگی وقەلەقیـدا دەژی، جا خـوای گـەورە بۆ لابردنـی ئـەو دوو دڵـی وخەفەتـەی کـە ڕوو لـە دڵـی دەکـات بـەهۆی شکاندنی سوێندەکەی، فەرموویەتی با خواردنی دە هەژار بدات، یان

١٠

پۆشاك وجل وبەرگیان بۆ بكات، چونكە لەو كاتەدا كە پارەكە دەدات بەو دە هەژارە یان خۆراك وپۆشاكیان بۆ دەكات و ئەوانیش بەدەم زەردەخەنەو بەدڵ شادبونەوە دوعای خێری بۆ دەكەن، لەو كاتەدا دڵخۆشییەكی گەورە ڕوو لەو كەسە سوێند خۆرە دەكات و خەمەكانی نامێنێت و بەختەوەری و ئاسوودەیی دەگەڕێتەوە بۆ ناو دڵی.

٤) نموونەیەكی تر: پارە پەیدا كردن و كڕین وفرۆشتن و معامەلە كردن، ماندوو بون وئازاری زۆری تێدایە، هەم لە لایەنی مێشك ودڵ ودەرونەوە، هەم لە لایەنی جەستەو لاشەوە، جا خوای كارزان وكاربەجێ زەكاتی داناوە لەسەر ئەو ماڵە، كە بڕێكی ساڵانە لێ جیا دەكرێتەوەو بە بەخشینی لە لایەن دەوڵەمەندەكەوەو وەرگرتنی لە لایەن هەژارەكەوە، دوعای خێری بۆ دەكرێ و بەم دووعای خێری هەژارو قەرزارەو بەوەی كە دەڵێت: دەی خوای گەورە هەزاران ئەوەندەی ئێستات پێ ببەخشێت، یاخوا هەر دەستی بەخشینت هەبێت، یەكسەر ئەو دەوڵەمەندە هەرچی ماندوو بوون و ناڕەحەتی كاتی پارە پەیدا كردنە، هەمووی بیردەچێتەوەو ئاسوودەیی و بەختەوەری بۆ دڵ ودەروون ولاشەی دەگەڕێتەوە.

- لە جەژنی قوربانندا ئەوەی كە لە حەجە، دڵناڕەحەتییەكی هەیە بەوەی كە لە ماڵ ومناڵ و ئازیزان ووڵات ونیشتمانی دوورە، ئەوەشی لە ماڵەوەیە دڵی ناڕەحەتە بۆ حەجەكەی كە لە ناویان دا نییە لەم جەژنە خۆشەدا، بۆیە خوای گەورە قوربانی داناوە، كە لە كاتی سەربڕینی قوربانییەكەو دابەش كردنی بەسەر دراوسێ و

دەورووبەرو هەژاران دا، خۆشی وفەرەحییەك دەچێتە دڵی ئەو خاوەن قوربانییەوەو خەم وخەفەتی لە دڵدا نامێنێت

هەروەها ئەگەر تەماشا بكەین دەبینین پێشینانی ئێمە كاتێك بەڵاو موصیبەتێك ڕووی تێكردوون، زانیویانە صەدەقەو خێرو خێرات كردن، لابەری بەڵاو موصیبەتەو یەكسەر بە دڵ وبەكوڵ بڕیاری خێرێكیان داوە، چونكە باش لەو ڕاستییە بێگومانییە گەیشتوون، كە هەركەسێك كەسێك لەبەر خاتری خوای گەورە دڵخۆش بكات ، یەكسەر خوای گەورە دڵخۆشی دەكات.

بەڵێ خۆشەویستان. بەكورتی ئەم ئیسلامەی ئێمە هەرچی فەرمووەو فەرزی كردووە، تەنها بۆ ئەوەیە دڵخۆشانەو كامەرانانە ژیان بەسەر بەرین، یەكێك لەو شتە هەرە دڵخۆشكارانە ڕۆژووە، هەروەكو پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی:( للصائم فرحتان ) بۆ ڕۆژووەوان دووخۆشی وبەختەوری هەیە:

یەكەم: كاتێك بەربانگ دەكاتەوە لەو پەڕی كامەرانی ودڵخۆشیدایەو ئاسوودەییەك دێت بە دڵ ودەروونیدا، كەمەگەر هەر خۆی بزانێت چەند شیرینە.

دووەم: ئەو كاتەی كە دەگاتەوە بە لیقای پەروەردگاری و پاداشتی ڕۆژووەكەی وەردەگرێتەوە، كە ئەوەندە ئەو پاداشتە گەورەیە غەیری خوا هیچ كەس لە پێغەمبەران و فریشتەكانیش نازانن چەندە، چونكە خوای گەورە خۆی فەرموویەتی: ( الصَّومُ لـي وَ أنا أجزي بِهِ) .

وە شتێکی بەڵگە نەویستە، کە یەکێك لەو شتە بنچینەییانەی کە مرۆڤی پێ بەختەوەر دەبێت، بریتییە لە بوونی بیرو بڕوا، بوونی دین وعەقیدەو مەبدەئی ژیان، کە ئەو ئاینەو ئەو بیرو باوەڕەش لە غەیری ئیسلام دا دەست ناکەوێت: بۆیە شاعیر بە حەق فەرموویەتی:

ئەو ڕۆژانەی کاتێك ویستم
تەمەنی کورتی ژیانم هەروا نەڕوا.
دڵی تینووم مەزرایەك بێ
پڕبێ لە درەختی بڕوا
ویستم:
کەشتی وێڵی ژینم کەناری دەریای لێ دیار بێ
سەری ماندووم
لە خەمی گومانی هەڵەو شەونخونی بیرکردنەوە
هەتا هەتایە ڕزگار بێ
ویستم:
خاوەن پەیامێك بم
زۆر بەهێز بێ
شوێن کەوتەی بەرنامەیەك بم
ووتەو کرداری پیرۆز بێ
ویستم:
بێ ئامانج ومەبەست نەبێ
کارو هەوڵدانم

خەوو خۆراك وپۆشاكم
یاساو سنوری بزانم
ویستم:
ڕێگای هەنگاونانم ڕاستەڕێ بێ
چاو حەق دیدەو، زمان ووشەی ڕاستی پێ بێ
کەوتمە گەڕان
هەرچی بیرو بۆچوون هەبوون سەرم لێدان
لای هەریەکە
بۆ ماوەیەك لەگەڵ فەرهەنگ وباسی دا
کەوتمە دوان
تا سەرەنجام
ئەوەی دڵم پێی تینوو بوو
ئەوەی گیانم لە پێناوی ڕێگەی دووری بۆ بڕیبوو
دوای ماندوو بوون
حەوایەوە لە پاڵ ئیسلام...

بەڵێ ئیماندا‌ران: دەبێت هەموومان دڵنیا بین کە لە غەیری ئەم ئیسلامە، بەختەوەری نادۆزینەوە، وەعدی خوای گەورەیە:﴿ وَمَــن أَعرَضَ عَن ذِكري فَإِنَّ لَهُ مَعِشَةً ضَنكا﴾.

لە زانکۆی (ئایوا) لە ئەمەریکا دیراسەی حاڵی ( ٥٥٠ ) کەسیان کرد، کە تەمەنیان لەسەرو ( ٦٥ ) ساڵەوە بوو، بۆیان دەرکەوت، کە ئەوانەی بڕوادارن وسەردانی پەرستگا دەکەن، زیاتر دڵ ئارام

وئاسوودەن و بەرگری لەشیان زیاترە بۆ نەخۆشی بە بەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە هیچ دین وعەقیدەیەکیان نییە.

کۆتایی ووتارەکەم بەم باسە دەهێنم کە: ( شێخ محمد عبدالعاطي بحيري ) لە کتێبەکەی دا ( رَوضَةُ المُتَقِينْ في مَجالس الـــصالحين) بۆمـان دەگێڕێتـەوەو دەفـەرموێت: لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکا پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندو سەرمایەدارێکی گەورەو ناودار هەبوو، خاوەنی چەندین کۆمپانیاو کارگە دەبێت، لە یەکێك لەو کۆمپانیایانـەدا کـە مـوڵکی ئـەو سـەرمایەدارە گەورەیـە دەبێـت، کرێکارێکی موسوڵمان تیایدا کرێکاری دەکات، بەڵام ئەوەی سەرنجی ئەو خاوەن کۆمپانیایە ڕادەکێشێت، ئەوەیە کە لەگەڵ ئەو هەموو مانـدوو بـون و شـەونخونی وکارکردنـە زۆرەی ئـەو کرێکـارەدا بـەو گەرمایە، کەچی بەردەوام ڕووی گەشەو توشی هەرکەسێك دەبێت بە زەردەخەنەوە مەرحەبایی دەکات و وەکو ئەوەی هیچ خەمێکی نەبێت، ئەم کەسە سەرمایەدارە بیری لە خۆی کردەوە کە لەگەڵ ئەو هەموو دەوڵەمەنـدی و خۆشـخۆری وجـوان پۆشـییەی هەیـەتی و لەگەڵ ئەو هەموو ئیسراحەتەی کە سەرماو گەرما لێی نادات، کەچی بەردەوام لە قەلـەقی ودڵەڕاوکێـدا دەژی و دڵـی ناکرێتـەوەو هـەر غـەمبارە، بۆیـە بـانگی ئـەو کـوڕە گەنجـە کرێکـارە موسـوڵمانەی کـردو پرسـیاری لـیٚ کـرد: هـۆی چـییە کـە ئـاوا دڵـی خۆشـەو ڕووی گەشـەو دەمـی بـە خەندەیە؟ گەنجە کرێکارەکە فەرمووی: بەخوا خۆت ئاگات لە حاڵمە کـە لـە ڕووی جەسـتەوە چـەند مانـدووم، بـەڵام ئـەوەی کـە دڵخـۆش

وبەختــەوەری کــردووم، ئیمانەکەمــەو بیروبــاوەڕی ئیــسلامەتییەکەمە، کــابرای خــاوەن کۆمپانیــا بــە پەرۆشــەوە وەکــو کەســێکی تینــووی گیرخواردو لە بیابانێکی ووشکی بێ ئاودا، کە چاوەڕێی پەرداخێك ئـاوی سـارد بێـت، ووتـی: باشـە ئەگـەر منـیش موسـوڵمان ببم و لـە ئیـسلام شـارەزا ببم ئـاوا دڵـم خـۆش دەبێـت؟. گەنجـە موسـوڵمانەکە فەرمووی: بەڵێ: بە مەرجێك دینداریکی ڕاستەقینە بی و پەیوەنـدیت لەگـەڵ پـەروەردگارت دا بـەهێز بکـەی و کاروکردەوەکانـت بـە پێـی ئیسلام بن.

کابرا ووتـی: بە قوربانـە فێـرم بکـە چۆن موسـوڵمان ببم؟ ئەویش دەستی گرت وبردی بۆ یەکێك لـە مزگەوتـەکان و مامۆستای مزگـەوت باسی ئیمان وئیسلامی بۆ کردو ئامانج ومەبەستی ئیسلامی بۆ ڕوون کــردەوە، کــابرای دەوڵەمەنــدیش زۆر بــە خۆشــی وخرۆشــییەوە شایەتومانی بە حەق هێناو فەرمووی: ( أشــهَدُ أن لا إلـــهَ إلاّ الله وَ أَشهَدُ أنّ مُحَمَّــداً رَسُــولُ الله). ئەمجا دەسـتی کـرد بەگریان، بەڵام گریـانێکی زۆر بە کـوڵ، ئەوانـەی لـە دەوری بـوون لـە موسـوڵمانانی مزگەوتەکـە عـەرزیان کـرد: بۆچـی ئـاوا دەگـری؟ فـەرمووی: چـونکە یەکـەم جـارە لـە ژیـانم دا هەسـت بـە ئـارامی و بەختـەوەری نـاو دڵ ودەرونم دەکەم. ( سُبْحانَ الله ) هەر لەگەڵ موسوڵمان بوونی دا خـوای گـەورە نـورو ڕووونـاکی خـستە نـاو دڵ ودەرونیـەوە: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ

صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَـٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ **الزمر ٢٢**

**لە خوای گەورەو میهرەبان دەپاڕێمەوەو دەڵێم:** ( أللّهُم يا مُقلِبَ القلوب، وَ يا كاشِفَ الكرُوب، وَ يا عَلاّمَ الغيُوب، وَ غفّارَ الذنوب، وَ ستّارَ العيُوب، رَطِّب ألسِنَتنا بذِكرِك، وَ نعِّم قلُوبَنا بشُكرِك، ولَيِن أبدانَنا بِطاعَتِكَ، وَجعَل سَعادَتَنا في دِينِنا وَ قُلوبِنا ﴾ أللّهُمَ آمين

## سەرچاوەکان:.


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان — بورهان محمد ئەمین

٣.نامیلکەی بەختەوەری سوبحانی — شەهید م. ناصری

٤. لا تَحْزَنْ — محمد عبدالعاطي بَحيري

٥. لاتَحْزَن — محمود المِصْري . أبو عَمارْ

٦. زایەڵەی شادی — فەرمان نەجار

٧. السيرة النَبَوية — د. على محمد الصَلابي

٨.بەهاری دڵان ( شیعر : دایکی خەڵات ) — ئەندازیار عوسمان

٩. بەرەو ئیسلام . ئاسوودەیی — ئەندازیار عوسمان

١٠. رَوضَةُ المُتَقين — محمد عبدالعاطي بَحيري

**الحَمدُ لِلـهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ أجمَعينَ:**

**ئیماندارانی بەڕێز: وا لە کۆتایی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندایـن، بەشی کۆتایی ڕەمەزان، ئەو بەشەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( وَ آخِرُهُ عِتقٌ مِنَ النّار).بە ئومێدی خوا ئێمەش یەکێك ئەبین لەو کەسانەی کە گەردنمان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری دەبێت، وە بەرەکەتێکی گەورەی تری کۆتایی مانگی ڕەمەزان، بوونی شەوی پیرۆزە تێیدا کە لە کوردەواری خۆماندا هەر بە ناوە عەرەبییەکەی (لَيْلَةُ القَدْر) ناسراوە، شەوی پیرۆز چییە؟خوای گەورە ئاوا باسی ئەو شەومان بۆ دەکات ودەفەرموویێت:** ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ۝٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ۝٣ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ۝٤ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ۝٥﴾القدر

**واتە: بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندووەتە خوارەوە لە شەوێکی بە فەڕو ڕێزداردا، جا تۆ چوزانی شەوی بەفەڕ کامەیەو چ خێرو بەرەکەتێکە، شەوی قەدری بەڕێز لە هەزار مانگ ڕێزدارو خێردار ترە، ( واتە: پاداشتی عیبادەت وخواپەرستی ئەو شەوە بێ سنورە) لەو شەوەدا فریشتەکان کە جوبرەئیلیشیان لەگەڵدایە دادەبەزن، لەسەر رووخسەت ومۆڵەتی پەروەردگاریان، بە جۆرەها**

فەرمان وكار: ( بە تایبەت بۆ سەردانی خواپەرستان، بۆ سەردانی مزگەوتەكان، بۆ گوێگرتن لە قورئان و....هتد ) ئەو شەوە ئاسوودەیی و ئاشتی و هێمنی ورەحمەت ومیهرەبانییە، هەتا كاتی بەرەبەیان.

ئیمانداران: ئەگەر سەرنج بدەین سورەتی ( القَدر ) پێنج ئایەتە، لەو پێنج ئایەتەدا سێ جار ووشەی ( القَدر ) هاتووە، كە ووشەی ( القدر ) دوو مانای هەیە.

١. القَدْر : لَيلَةُ المَكانَةِ العَظيمَة والشَرَفِ العَظيم. واتە: شەوی پیرۆز شەوێكە كە پێگەیەكی پیرۆزی هەیەو شەرەفێكی گەورەیە بۆ هەر كەسێك كە خوا پەرستی تێدا بكات.

٢. القَدْر : لأنَّ تَقدِير ألأرزاق وَالآجال، وَالسَّعادَةَ وَالخَير وَالرِفعَةَ وَالمَكانَةِ وَالحَسَنات في تِلكَ اللَّيلَة.

واتە: بۆیە پێی دەوترێت شەوە پیرۆزەكە چونكە دیاری كردنی ڕزق وڕۆزی و ئەجەل وخۆشبەختی و خێرو خۆشی و پلەبەرزی وچاكەكان، هەمووی لەم شەوەدا لە لایەن خواوە دیاری دەكرێن.

هەروەها زانایان دەفەرموون: ووشەی ( وَما ادراكَ ) بۆ پرسیارە بە سەر سوڕمانەوە، بە مانای ( تۆ چوزانی ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خێرو پاداشت و گەورەیی خوا پەرستی لەو شەوەدا و، گەورەیی و حورمەتی ئەو شەوە لەچاو شەوەكانی تری ساڵدا زۆر لەوە گەورەترە كە مرۆڤ خەیاڵی بۆی بچێت و بێتە بەر دیدو بۆچوونی، واتە:

هەرچەند تۆ خەیاڵ لە گەورەیی ئەو شەوە بکەی هێشتا لای خوا گەرەترە.!!

بەڕێزان: لە ژێر تیشکی سوڕەتی ( القَدرْ ) دا بەچەند خاڵێك هەندێك لە گەورەیی ئەو شەوە باس دەکەین:

١) ئەو شەوە شەوی هاتنە خوارەوەی قورئانە، جا ئایا هیچ خێروخۆشییەك هەیە، هیچ فەڕو ڕەحمەتێك هەیە، کە گەورەتر بێت لە قورئانی پیرۆز بۆ سەر مرۆڤایەتی؟! بێگومان نەخێر، کەواتە: بەڕاستی شایەنی ئەوەیە بە پیرۆز ناو بنرێت، چونکە پیرۆزترین کتێبی تێدا هاتووەتە خوارەوە.

٢) شەوی پیرۆز ﴿خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾ نەك هەر بەرامبەر بە هەزار مانگە بەڵکو دەفەرموێت: ( خَيرٌ) چاکترو گەورەترە لە هەزار مانگ.

٣. دەفەرموێت: ﴿تَنَزَّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ﴾. نافەرموێت: (تَنْـزِلُ) بەڵکو دەفەرموێت:(تَنَزَّلُ)کە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بە ملیارەها فریشتە بە سەرکردایەتی (جوبریل)ی ئەمین کە قورئانی لە لایەن خواوە هێناوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دێنە سەر زەوی و ئاهەنگی یادی هاتنە خوارەوەی قورئان دەگێڕن.

٤.دەفەرموێت: ﴿سَلَـٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ﴾ أي: سَلامٌ مِنَ اللهِ؛ بِرَحمَتِهِ وَسَلامٌ منَ المَلائكَةِ فَهيَ تَدعوا وَ تَستَغفرُ لَكَ.واتە: سەلام لە لایەن خواوە بەوەی ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی خۆی

دەبارێنێ بەسەر بەندەکانی دا، وە سەلام لە لایەن فریشتەکانەوە بەوەیە کە داوای لێخۆش بوون بۆ ئیماندارانی ئوممەتی حەزرەتی محمد ﷺ دەکەن و دوعای خێریان بۆ دەکەن، کە بێگومان دوعای فریشتەکانیش لای خوای گەورە قبوڵە، جا خۆش بەحاڵی ئەو کەسەی کە لەو شەوەدا بە ئاگایەو خواپەرستی دەکات و بەر دوعای فریشتەکان دەکەوێ و خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.

(٥) ئەم شەوە پیرۆزە شەوی قبوڵ بونی دوعایە، صەحابە ئازیزو بە قەدرەکانی پێغەمبەر ﷺ دەیانفەرموو: (كُنَّا نَستَعِدُّ لِهـذِهِ اللَّيلَـةِ بِدَعَوات، فالمَلائِكَةُ تُؤَمِنُ عَلى دُعائِنا).

واتە: ئێمە چەندین دوعامان بە تایبەت ئامادە دەکرد بۆ ئەم شەوە پیرۆزە، کە تێیدا بەم دوعایانە لە خوای گەورە بپارێینەوە، چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لەسەر دوعاکانمان و دڵنیاین کە خوای گەورە لێمان قبوڵ دەکات.

شێخ سوفیانی سەوری دەیفەرموو: (الدُّعاءُ في هذهِ اللَّيلَةِ أحـبُّ لي مِنَ الصَّلاةِ، قالُوا: لِماذا؟! قالَ: هذهِ لَيلَةُ إجابَةٍ).

واتە: دوعاو پاڕانەوەی بەکوڵ وبەدڵ لەم شەوەدا بەلای منەوە خۆشترە لە نوێژ کردن تیایدا، وتیان بۆچی؟ فەرمووی : چونکە ئەم شەوە شەوی گیرا بوونی پاڕانەوەو دوعایە.

خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران و خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی ( لَيلةُ القَـدْر ) دا بەچ دووعایەك لە خوای گەورە بپاڕێمەوە؟

فەرمووی: ئەی عائیشە بڵێ: ( أَللّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌ تُحِبُّ العَفْوَ فَاعفُ عَنّي).

ئەی خوای پەروەردگارم تۆ لێخۆش بووی وا لە بەندەکانت خۆش دەبی کە گوناهەکانیان لەسەر دەسڕیتەوەو شوێنەواریشیان نامێنێت، دەی خوایە تۆ زۆرت پێ خۆشە بەندە گوناهبارەکانت عەفوو بکەی، خوایا گیان لە منیش ببورەو لە هەموو گوناه و تاوانەکانم عەفوم بکەو هەموو گوناهەکانم بسڕەوە بە عەفووی خۆت.

٦. لە شەوی پیرۆزدا خوای گەورە لە بەندەکانی خۆش دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (مَن قامَ لَيلَةَ القَدرِ إِيماناً وَإِحتِساباً، غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ) رَواهُ البُخاري وَمُسلِم.

واتە: ئەو کەسەی شەوی قەدر بە خوا پەرستی ویادی خوا بباتە سەر بە ئیمان وباوەڕی دامەزراوو بەتەما بوونی پاداشت وڕەحمەت، خوای گەورە لە هەموو گوناهی ڕابردووی خۆش دەبێت.

بەڵێ ئیمانداران: صەحابەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردەکراوانی خوێندنگای سەرەتای ئیسلام، خۆشترین بۆنی خۆش وجوانترین جل وبەرگیان بۆ شەوی قەدر ئامادە دەکرد، تا پێوەی عیبادەتی ئەو شەوە بکەن، ( تەمیمی داری ) پۆشاکێکی زۆر گرانبەهای کڕی بوو تەنها لەشەوەکانی دەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان دا لەبەری دەکرد، بە ئومێدی ئەوەی کەوا شەوی قەدری بە نسیب ببێت، کاتێك لێیان پرسی بۆچی وا دەکەیت؟ فەرمووی: چونکە لەو شەوەدا فریشتەکان بەسەرکردایەتی جوبریلی ئەمین دێنە ناو ماڵ

ومزگەوتەکانەوە، هەر بۆیە حەز دەکەم بە جوانترین جل وبەرگ و خۆشترین بۆنەوە پێشوازییان لێ بکەم.

بەڕێزان: ئایا چۆن شەوانی قەدر بەرزو پیرۆز ڕاگرین و چی تێدا ئەنجام بدەین؟

لە وەڵامدا دەڵێین بەم شێوەیە شەوی پیرۆزی قەدر بەسەر دەبەین:

یەکەم: بەشێك لەو شەوە بە بەندایەتی بیرکردنەوە، ( عِبادة التَفَكرْ ) زیندوو دەکەینەوە، ئەو عیبادەتەی کەپێغەمبەری خوا ﷺ پێش هاتنە خوارەوەی وەحی دەچووە ئەشکەوتی (حِراء) و بیری لە گەورەیی خوا دەکردەوە، بیری لە عەزەمەت و دەسەڵاتی بێسنووری پەروەردگار دەکردەوە، کە چۆن ئەو هەموو مەخلوقاتەی بەو هەموو ڕێك وپێکییە دروست کردووە، بەڵێ لە فەرموودەدا هاتووە کە: (تَفَكَّرُ في خَلقِ الله ) بیر لە دروستکراوەکانی خوای گەورە بکەنەوە. چونکە هەرکەسێك بیەوێت باشتر خوای گەورە بناسێت، ئەوا با بیر لە دەسەڵاتی خوای گەورە بکاتەوە کە لە دروست کراوەکانی دا دەدرەوشێتەوە.

لە تەفسیری (ابنُ كَثيرْ)دا هاتووە کە صەحابەکان فەرموویانە: ( إنَّ نُورَ الأيمانِ التَفَكُرُ ) بەڕاستی نورو ڕوناکی ئیمان بریتییە لە بیرکردنەوە لە درووست کراوەکانی خوا.

پێشەوا حەسەن فەرموویەتی:( تَفَكُّرُ ساعَةٍ خَيرٌ مِن قيامِ لَيلَةٍ) بیرکردنەوەی یەك سەعات لە عەزەمەت وگەورەیی خوا لە ڕوانگەی دروست کراوەکانیەوە، چاکترە لە بەخەبەر بوون و خواپەرستی وشەو

نوێژی شەوێك. هەروەها (عومەری كوڕی عبدالعزیز ) فەرموویەتی: ( التَّأمُّلُ في نِعَمِ اللهِ مِن أَفضَلِ العِبادَةِ ) وورد بوونەوەو سەرنج دان لەو هەموو شتانەی كە خوای پەروەردگار بەخشەڵات بە مرۆڤی بەخشیوە، لە چاكترین بەندایەتی وخوا پەرستییە.

بەڵێ ئیمانداران: خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بە ئاگامان دێنێتەوەو دەفەرموێت: ﴿وَفي أَنفُسِكُم أَفَلا تُبصِرُونَ﴾ ئەی بەندەكانم، ئەی مرۆڤەكان، لەناو لاشەی خۆتان دا بە هەزاران بەڵگەو نیشانە هەن لەسەر ئەوەی كە تۆ خوا دروستی كردوی و نەخشەی (اللّٰه)ی (سُبْحانَهُ وتَعالى). ئیتر بۆچی سەرنج نادەیی ونابینی وبیر ناكەیتەوە؟!.

بەڵێ ئەگەر مرۆڤ تەنها سەیری لاشەی خۆی بكات، بەسە بۆ ئەوەی سەرزی بەندایەتی ئەوی بكات و بچێتە كڕنوشەوە بۆ خوای پەروەردگار، ئەگەر سەیری دیوی دەرەوەی لاشەی خۆی بكات، كە ئەمە هیچ زانستی ناوێ وخوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانن پەی پێ ببەن، بەڕاستی هەزاران جار سوپاسی خوا دەكات لەسەر ئەوەی كە ئاوا ﴿في أَحسَنِ تَقويم﴾ دروستی كردووە.

بۆ نموونە: سەرنج بدە ئەگەر چاوەكانت لەو جێگایەی ئێستایان دا نەبونایەو لە پشتی سەر بوونایە، مرۆڤ چەند ناشیرین دەبوو، یان ئەگەر چاو لە چاڵیدا نەبووایە چەند زوو لەناو دەچوو، ئەگەر گوێ بەم شێوەیەی ئێستای نەبوایە چەند زوو شتی تێدەچوو، وە ژیان لە مرۆڤ تاڵ دەبوو، ئەگەر پەنجەكانی دەستمان ئەو جومگانەی تێدا

نەبوایە، وە پەنجەکان ئاوا درێژو کورتیان تێدا نەبوایەو هەمووی یەك شێوە بونایە، چۆن دەمانتوانی سوود لە دەستەکانمان ببینین و شتی پێ بگرین و بنووسین؟.

ئیتر تەواوی ئەندامەکانی لاشە هەر بە هەمان شێوە، هەمووی لەو پەڕی جوانی وگونجاوی دا خوای گەورە نەخشەی کێشاون و دروستی کردوون بۆ خزمەتی مرۆڤ، ئەمجا وەرە سەیری دیوی ناوەوەی لاشەی مرۆڤ بکە، کە ئەمەیان تەنها زانایانی پزیشکی و پسپۆڕ لە ئەندامانی لاشەی مرۆڤ دا، پەی پێ دەبەن و پێمان ڕادەگەیەنن و دەفەرموون: هیچ مرۆڤێك لەم سەرزەوییەدا لە ئادەمەوە هەتا کۆتایی مرۆڤایەتی، لە مرۆڤێکی تر ناچێت، ( سُبْحانَ الله ) هەموو مرۆڤێك بە تایبەت خوای گەورە بەدەستی قودرەت وعەزەمەتی خۆی دروستی کردووە.

ئەو شتانەش کە هەموو مرۆڤێك تێیدا سەربەخۆیە ئەمانەن:

١. دەنگ: دەنگی هیچ مرۆڤێك لە مرۆڤێکی تر ناچێت لە سەدا سەد، بەڵکو هەمووی دەنگ و ئاوازی تایبەتی خۆی لە دەنگە ژێکانیدا هەیەو تەنها هەندێك دەنگ نزیکە لە دەنگی کەسێکی ترەوە، بەڵام لە سەدا سەد هەگیز دوو مرۆڤ دەنگیان لە یەك ناچێت.

٢. بۆنی لاشە: بۆنی لاشەی هیچ مرۆڤێك لە بۆنی لاشەی مرۆڤێکی تر ناچێت، هەر بۆیە لە وڵاتانی پێشکەوتوودا هاتوون لە ڕێگەی سەگی پۆلیسییەوە تاوانبار دەدۆزنەوە، ئەویش بەوەی کاتێك تاوانێك لە ماڵێك یان لە شوێنێك ئەنجام ئەدرێت وتاوانبارەکە دیار

نییە، ئەوا پێش ئەوەی هیچ کەس بچێتە ئەو شوێنە، یەکێك لەو سەگانە دەنێرنە ئەو شوێنەو بۆن بەو شوێنەوە دەکات و پاشان هەرکەسێك گومانی ئەو تاوانەی لیّ بکرێت دەگیریّ و ئامادە دەکرێن وسەگەکە یەك بە یەك بۆنیان پێوە دەکات و ئەگەر کەسی تاوانبار لە ناویان دا بێت، ئاماژەی بۆ دەکات و دەیهێنێتە دەرەوە. چونکە دەزانێت بۆنی لاشەی ئەم کەسە هەمان ئەو بۆنی لاشەی مرۆڤەیە کە لەو شوێنەدا بووەو تاوانەکەی ئەنجام داوە، چونکە دوای چەند سەعاتێکیش بۆنی لاشەی ئەو مرۆڤە هەر لەو شوێنەدا دەمێنێت!! جا ئایا ئەمە بەس نییە لەسەر دەسەڵاتی بێسنووری خوای خالق کە ( الله ) یە، کە ئاوا بۆنی لاشەی هیچ کەسێك لە کەسێکی تر ناچێت.

٣. DND کە لە ناو خوێنی مرۆڤ دایە هی کەس لە کەسێکی تر ناچێت.

٤. سەری پەنجە: کە پەنجە مۆری پیّ دەکرێت، چەند ملیار مرۆڤ لەم سەر زەوییە هەیە، کەچی مۆری سەری پەنجەی کەسێك لە پەنجەی کەسێکی تر ناچێت، بۆیە قورئانی پیرۆز ئاماژە بەو ڕاستییە زانستییە دەکات و دەفەرموێت:﴿ بَلَى قادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنانَهُ ﴾ خوای گەورە دەفەرموێت: بەڵیّ ئیمە ئەوەندە بە توانایین لەسەر درووست کردنەوەی مرۆڤ جارێکی تر دوای مردن، نەك هەر لاشەی بەڵکو ئەو هێڵانەی سەرە پەنجەشی درووست دەکەینەوە.

کە ئەمەش ئاماژەیەکی زانستییەو لەم دواییانەدا مرۆڤ گەیشتووەتە ئەو ڕاستییەی کە سەری پەنجەی هیچ مرۆڤێك لە سەری

پەنجەی مرۆڤێکی تر ناچێت، هەر بۆیە بۆ کاروباری فەرمانگەکان وسەنەدو بەڵگەنامەو تاپۆکان مۆری سەری پەنجە بەکار دەهێنرێت.

بەڕێزان: لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا پزیشکێکی ڕووسی ووتی: ئەگەر مرۆڤێك تەمەنی (٧٠) ساڵ بێت، ئەوا ئەمانەی لە ژیان دا لێ ڕوو دەدەن:

(١٣) ساڵ قسە دەکات، (٦) ساڵ خواردن دەخوات، (٢٣) ساڵ دەخەوێت، (١٢٥٠) تا (١٣٣٥) ئەوەندەی لاشەی خۆی لە ماوەی ئەو (٧٠) ساڵەدا خۆراك دەخوات، لە ماوەی هەر (٢٤) کاتژمێردا (١٣) هەزار لیتر هەوا هەڵدەمژێت، وە هەر مرۆڤێك لە ماوەی ساڵێکدا نزیکەی (١٠) ملیۆن جار هەناسە دەدات، دڵی دوو ملیۆن و پێنج سەد هەزار جار لێ دەدات، ڕۆژانە بیست هەزار هەنگاو هەڵدەگرێت، واتە (٧) ملیۆن هەنگاو لە ساڵێکدا بە واتایەکی تر لەو (٧٠) ساڵەدا (٥٠٠) هەزار کیلۆمەتر ڕێگە دەبڕێت، کە دەکاتە (٩) جار گەڕان بە دەوری زەوی داو (٣٩٠) هەزار جار ماوەی نێوان زەوی ومانگ.!

دەی ئیماندار لە شەوی قەدردا ئاوا بیر لە خۆت بکەرەوەو ئەنجا هەر بڵێ (سُبْحانَ اللّه) پاکو بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگار، (الحَمْدُ لله) هەرچی سوپاس وستایشە هەر شایستەی تۆیە یا (اللّه)، (لاَاله الا الله) شایەتی ئەدەم کە هیچ شتێك شایەنی پەرستن نییە تەنها (اللّه) نەبێت، کە منت ئاوا بە ڕێك وپێکی دروست کردووەو ئەو هەموو دەزگا هەستیارەت تیا دروست کردوم و بەردەوام لە کارو

خزمەتدان بەبێ ئەوەی من هەر هەستی پێ بکەم، بەڵێ ئاوا لەگەڵ زمانت دا کە زیکری خوا دەکەی، با دڵیشت بە ئاگا بێ و مێشك و بیریشت ئەمانەی تێدا بێت، ئەوجا بزانە چ تام وچێژێك لە زیکری خوا دەکەی و چۆن دڵت ئارام دەبێت.

بەڵێ ئیمانداران: یەکێکی تر لەو خەڵاتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوین و پێویستە بیری لێ بکەینەوە پێستی لاشەمانە، کە لە هەر کاتژمێرێك دا (٣٠) ملیۆن میکرۆب لە خۆی دەگرێت و (٢٩) ملیۆن لەو میکرۆبانە کە لە ماوەیەکی زۆر کورت دا بە هۆی ئەو مادە پاکژ کەرەوەی کە خوای گەورە لە پێست دا دروستی کردووە لەناو دەچن، ! لەو ملیۆنەی تریش دوای دوو سەعات تەنها (٧) هەزاریان دەمێنێت، خۆ ئەگەر مرۆڤ لەو ماوەیەدا دەست نوێژی شت، یان خۆی شت، ئەوا هیچ میکرۆبێك لەسەر لاشەی نامێنێت،! دەی بیرکەرەوە ئایا ئەگەر خوای گەورە پێستی ئاوا دروست نەکردایە، هەر زوو لەناو نەدەچوین و بەرگەی ئەو سی ملیۆن میکرۆبەمان دەگرت کە لە ماوەی سەعاتێك دا هێرش دەکەنە سەر لاشەمان؟ وە ئایا کە ئیسلام فەرمانی پێداوین بە دەست نوێژ گرتن بۆ نوێژەکان و خۆشتنی لەسەر پێویست کردووین، هەمووی لەبەر خاتری پاراستنی لاشەی خۆمان نییە؟!

هەروەها زانایان دەفەرموون: لەسەر پێستی لاشەمان (٢ تا ٤) ملیۆن شوێن هەیە کە پێی دەوترێت (خاڵی ئازار) بۆ ئەوەی بە

بچووکترین بەرکەوتنی ئازار خێرا فریای خۆمان بکەوین وچارەسەری خۆمان بکەین.

وە خوای گەورە توانایەکی زۆری بە جەستەی مرۆڤ بەخشیوە بۆ ڕووبەڕو بونەوەی بارو دۆخەکانی ژیان، ئەوەتا لاشەی مرۆڤ بەرگەی ( ٤٤ تا ٤٥ ) پلەی گەرما دەگرێت، وە ( ٢٧ ) پلەی سەرما لە ژێر سفری سەدی دا بەرگری دەکات.!

وە خوای گەورە لە ناو چاوی مرۆڤ دا توانای جیاکردنەوەی ڕەنگەکانی درووست کردووەو لەیەك کات داو بەیەك تەماشا کردن دەتوانیٚ ( ١٠) هەزار ڕەنگ لەیەکتری جیا بکاتەوە، وە (سُبْحانَ اللە) خوای گەورە چاوی منالّی وا درووست کردووە کە تا تەمەنی ( ٨) مانگی هەموو شتەکان بە ڕەش وسپی دەبینێت! خۆ ئەگەر خوای بەبەزەیی چاوی منالّیشی وەکو مرۆڤی گەورە درووست بکردایە کە هەموو شتەکان بە ڕەنگاو ڕەنگی ببینێت، ئەوا منالْ بەیەك تەماشا کردن و چاوکردنەوە نابینا دەبوو، چونکە چاوی بەرگەی نەدەگرت، بۆیە تا تەمەنی ( ٨) مانگی هەموو شتەکانی دەوروبەری بە ڕەش وسپی دەبینێت بۆ ئەوەی چاوی ئازاری پیٚ نەگات ، ئیتر بەرە بەرە چاوی بەهێز دەبیٚ و پاشان ڕەنگەکان هەمووی دەبینێت.!!

ئیمانداران: یەکێك لەو شتانەی کە مرۆڤ کەم بیری لێدەکاتەوە، بەڵام بەبیٚ ئەوەی ژیانی مرۆڤ لە بچووکترین کارەسات دا کۆتایی پیٚ بێت، بریتییە لە کرداری خوێن مەین لە ناو لەش دا، گەلیٚ جار مرۆڤ شوێنێکی لەشی دەبڕێت، پاش ماوەیەك خوێنەکە دەوەستێت یا بە

بەستێنەرێك ( لەفاف) شوێنی برینەکە دەبەستی و خوێنەکە دەوەستێتەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو مادە گەورەو گرنگەی ناو خوێنەوە ڕوودەدات، کە ( پڕۆتینی ڤۆن ویلیبران )ە کە ئەم مادەیە وەکو پۆلیسی چاودێر بەردەوام لە ئامادە باشیدایەو بە ئاگایە بۆ ئەوەی هەر جێگایەکی لەش خوێنی لیٚ بێتە دەرەوە، ئامارژە بەو شوێن وجێگایە دەکات و دەگاتە شوێنی ڕووداوەکەو لەویٚ دەوەستیٚ و ڕێگا لە ڕۆیشتنی پەڕەکانی خوێن دەگریٚ و لەو شوێنە بریندارە دەیانهێڵێتەوە، بەم شێوەیە یەکەم پەڕەی خوێن ئەوانی تر بانگ دەکات و ( ٢٠ ) ئەنزیم کۆدەبنەوەو پڕۆتینی ( ثرۆمبین ) دروست دەبێت، پڕۆتینی (ثرۆمبین) ڕیشاڵەکانی ( فایبرینۆجین ) دروست دەکەن و ثرۆمبینەکان لەسەر ئەم ڕیشاڵانە کەڵەکە دەبن و خوێنەکە دەوەستێنن.!!

جێگای خۆیەتی ئامارژە بەوەش بکەین کە: بەردەوام ثرۆمبین لە خوێندا هەیەو دێت ودەچێت، کەچی هەرگیز خوێن نامەیەنێت، تەنها لەکاتی بریندار بوون دا نەبێت بە دەوری خۆی هەڵناستێت، ئەگینا ئەگەر خوای گەورە ئاوای دروست نەکردایە، هیچ زیندەوەرێك نەیدەتوانی بژی وخوێن لە ناو بۆرییەکانی خوێندا لە جوڵە دەکەوت وژیان کۆتایی پیٚ دەهات.! کەواتە: پاك وبێگەردی و سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاوا میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی دا.

خۆشەویستان: یەکێك لەو خەڵاتە گران قەدرانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوین، بەڵام زۆر زۆر کەم نرخی دەزانین، مەگەر لەم مانگی

ڕەمەزانەدا نەبێت کە تینوێتی لە کاتی بەڕۆژو بووندا زۆرمان بۆ دێنێ و هەمووومان دەڵێین: هیچ شتێك نییە بگاتە پەرداخێك ئاوی پاك وخاوێن وسارد، وە لە کاتی بەربانگ دا بەلەزەتترین شت ئەو پەرداخە ئاوەیە کە ڕۆژووەکەی پێ دەشکێنین، کە لە غەیری مانگی ڕەمەزان دا کە ئاوا تینوێتی زۆری بۆ نەدەهێناین، ئاوا نرخی ئاومان نەدەزانی، جا فەرموون با لەشەوی پیرۆزی قەدردا، بەشێك لە کاتی دانیشتنمان بیر لە دەسەڵات وعەزەمەتی خوای گەورە بکەینەوە، کە چۆن ئاوی بۆ دروست کردوین و پێی خەڵات کردوین.

بەڵێ ئاو ئەو مادەیەی کە جوانترین پێناسە بۆی بریتییە لە کەلامی خوای خالقی ئاوو هەموو ماددەکان و هەموو شتە دیارو نادیارەکان کە لە وەصفی ئاودا فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾.

بەڵێ ئاو ٣/٤ ی زەوی داپۆشیوە، وە ٢/٣ی لەشی مرۆڤ ئاوە. ٣/٤ی لەشی باڵندە ئاوە، ٤/٥ی میوە ئاوە. چونکە ( وَاللهُ أعْلَمْ) مرۆڤ باڵندە دەخوات و باڵندەش میوە دەخوات.

ئاوی زەریاکان یەکسانە بە ٩٧٪ی ئاوی سەر زەوی، کە ئاوێکی سوێرەو ناخورێتەوەو بۆ کشتوکاڵیش نابێت، بەڵام ئەو ئاوەی کە بۆ خواردنەوە دەبێت، ٣٪ تێناپەڕێنێت، ڕەنگە کەسێك بپرسێت، باشە بۆچی ٩٧٪ی ئاوی سەر زەوی سوێرەو بە کەڵکی خواردنەوە نایەت؟ ئەی بۆچی ئاوێکی شیرین وبەتام نەبوو؟ کە هەم مرۆڤ و زیندەوەران لێیان بخواردایەتەوەو هەم کشتوکاڵیشی پێ ئاو بدرایە؟ لە وەڵام دا

دەڵێین: خوا خۆی زاناترە بەڵام ئەگەر بێت و ئەو ئاوی زەریایانە شیرین بوایەو سوێر نەبوایە، ئەوا بەماوەیەکی کەم بەهۆی ئەو وەستانەیەوە بۆگەنی دەکردو تەواوی سەر زەوی بۆگەن دەبوو، بەڵام بەهۆی سوێرییەکەیەوە هیچی لێنایەت و خوای گەورە قەرەبووی بۆ کردوینەتەوە بەوەی کە بەهەڵم بوون دەبێتە هۆی بەرز بونەوەی هەڵمی ئاوی زەریاو دەریاکان و دەبێتە هەورو پاشان لە شێوەی باران وبەفرو تەرزەدا بەپێی پێویستی زەوی دێتە خوارەوە لە ئاسمانەوە، بەڵام ئەوەی کە جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە بە حیکمەت وکاربەجێیی خوای گەورە، لەگەڵ بەهەڵم بوونەکەدا سوێری ئاوەکە لەگەڵ هەڵمەکەدا بەرز نابێتەوە، بەڵکو تەنها ئاوە شیرینەکە بەرز دەبێتەوە.!!

بەڕێزان: هەرکاتێك چاوت بە ئاو کەوت، بیری لێبکەرەوە کە ئەم ئاوە لە هایدرۆجین لەگەڵ ئۆکسجین پێك هاتووە، کە گازی هایدرۆجین گازێکی گڕگرتووە، بەڵام ئۆکسجین یارمەتی سووتان دەدات، بەڵام بەیەك گرتنی دوو گەردیلەی هایدرۆجین و یەك ئۆکسجین گەردێکی ئاو پێك دێت.

وە ئاوی خاوێن تەنها لە هایدرۆجین وئۆکسجین پێك نەهاتووە، بەڵکو مادەی دیکەی تواوەی تێدایە، بەڵام زۆر بەکەمی، وە ئاوی خاوێن شلەیەکی بێ ڕەنگ و بێ بۆن وبێ تامە، خوای گەورە ئاوی وا درووست کردووە کە بەرهەڵستی شیبوونەوە دەکات و هایدرۆجین وئۆکسجینەکە لەیەك ناترازێ وببێتەوە بە ئاگر، ئەمەش بەهۆی

بەندی هاوبەشی گەردی ئاو، ڕێکخستنی گەردەکانی لە نێوان خۆیان دا بە شێوەیەکی ئەندازەیی لار، کە وای کردووە زۆر زۆر بە زەحمەت گەردەکانی ئاو لە هەلومەرجی سروشتی دا بۆ توخمە بەراییەکانی شیببێتەوە، بەڵام لە هەلومەرجی تایبەتی دا لە (٢٧٠٠) پلەی سەدی دا ئاو بەڕێژەی ١١٪ بۆ هەردوو توخمی هایدرۆجین و ئۆکسجین شی دەبێتەوە.!!

(سُبْحانَ اللهِ) لە دوو مادەی کیمیایی کە یەکێکیان دەسووتیّ ویەکێکیان یارمەتی سووتان ئەدات، ئاو درووست دەبێت و ژیانی هەموو زیندەوەرو ڕووەکەکانی پێوە بەندە. پاشان ئەم ئاوە دەبێتەوە بە ئاگرو کارەبای لیّ درووست دەبێت و ژیان ڕووناك دەکاتەوەو هەزاران خزمەت بە ژیان وژینگەی مرۆۋ دەکات.

ئیمانداران: مرۆۋ هەرچەندە لە زانست نزیك بێت ئەوەندە زیاتر خوای خۆی ئەناسێت، هەر بۆیە پێویستە هەندێك جار ئەم بابەتە زانستییانە لە ووتاری هەینی دا باس بکەین، بۆ ئەوەی باشتر قەدروقیمەتی ئەو خەڵاتانەی خوای گەورە بزانین، هەر باسی ئاو دەکەین، دوو تایبەتمەندی تری ئاو باس دەکەین کە ئەوانیش:

١. ڕوکشان: کە بریتییە لە یەکانگیر بوونی ڕووی سەربەستی شلەیەك، تا کەمترین ڕووبەری هەبێت.

٢. لینجی: بریتییە لەوەی شلە بەرگری جوڵە بکات.

جا بەندی هایدرۆجینی نێوان گەردەکانی ئاو بوونەتە هۆی ئەوەی هێزی ڕووکشان و لینجی ئاو بۆ درێژەدانی ژیان گونجاو بن.

ئەم دوو تایبەتمەندییەی ئاوە کە وا دەکات بە زوویی ئاو لە گەڵای ڕووەکەوە وون نەبێت، کە ئەگەر ئاو ئەم تایبەتمەندییەی نەبوایە، ئەوا بە ماوەی دەقیقەیەك ئەو ئاوەی لەناو گەڵای درەختێکدایە دەبوو بە هەڵم وگەڵاکە ووشك دەبوو، پاشان ڕووەکەکە زۆر بە خێرایی لەناو دەچوو، بەڵام بەهۆی ڕوکشان و لینجی ئاوەوەیە کە لە بەرزترین پلەی گەرمادا گەڵای درەخت وگوڵەکان بەسەوزی و تەڕی وپاراوی دەمێنێتەوەو پارێزگاری لەو ئاوەی ناویان دەکەن، وە هەروەها ئەم دوو تایبەتمەندییەی ئاوە کە وا دەکەن پاپۆرو کەشتی وبەلەم سەر ئاو بکەون و لە ئاودا نوقوم نەبن لەگەڵ ئەو هەموو قورسییەی خۆیان وئەو هەموو بارەی کە لەسەریانە، چونکە لە غەیری ئاو لە هیچ شلەیەکی تردا کەشتی وبەلەم توانای سەرئاو کەوتنیان نییە.

وە تایبەتمەندییەکی تری ئاو ئەوەیە، کە خوای گەورە ئاوی بەبێ ڕەنگ وبۆن وتام دروست کردووە، خۆ ئەگەر ئاو ڕەنگی ببوایە، ئەوا ئەو جوانییەی ئێستای نەدەبوو، وە نەدەتوانرا بەکار بهێنرێت بۆ گرتنەوەی ڕەنگەکان کە بە ئاو دەگیرێنەوە، چونکە ئەو کاتە ڕەنگی ئاوەکە ڕەنگەکەی دەگۆڕی، بەڵام ئێستا بەهۆی بێ ڕەنگی ئاوەوە لەگەڵ هەر ڕەنگێك تێکەڵ بکرێت هەمان ڕەنگمان دەست دەکەوێتەوە، وە ووتمان ئاو بێتامە، خۆ ئەگەر ئاو شیرین بوایە ئاوا هیچ خواردن وچێشتێك نەدەخوراو ئەوەی شەکرەی بوایە لە ئاو خواردنەوە مەحروم وبێبەش دەبوو،ئەبوایە وەکو چا حەبی شەکرەی بکردایە

ئاوەوە! کەواتە: تامی ئاوو لەزەتی ئاو لەوەدایە کە هیچ تامێکی نییە!!

خۆ ئەگەر ئاو بۆنی هەبوایە، ئەوا بەدەیان کەس هەیە کە بە هەموو بۆنێك ناڕەحەتە، ئەو کاتە ئەو کەسانەش لێی بێبەش دەبوون وژیانیان لەناو دەچوو.

جا ئیمانداری بەڕێز: وەرە لە شەوی پیرۆزی قەدردا و لە هەموو سات وکاتەکانی تردا ئاوا بیر لە دەسەڵاتی خوای گەورە بکەرەوە کە ئاوی ئاوا بەو شێوەیە دروست کردووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ وهەموو زیندەوەران و ئاژەڵان و ڕووەکەکان لێی سوودمەند بن.

بەڕێزان: ئاو ئەوەندە گرنگە ئەوەندە بابەتی زانستی لە پێکهاتەو دروست بونیدا هەیە کە چەند لێی بدوێین هێشتا تەواو نابێت، بەڵام لە کۆتایدا ئەوەندە دەڵێم کە: ئاو لە (١٤) پلەدا دەبێت بەهەڵم خۆ ئەگەر لە (١٠٠) پلەدا ببوایە بە هەڵم، ئەوا ئەگەر بهاتبایەو تۆزێ ئاو لەماڵەکەت دا بڕژایە لە زستان دا ئەوا تا چلەی هاوین ووشك نەدەبوویەوە، بەڵام ئێستا کە ئاو لە (١٤) پلەدا دەبێت بە هەڵم لە زستانیشدا بە ئاسانی ووشك دەبێتەوە.

هەروەها لە تایبەتمەندییەکانی تری ئاو کە خوای گەورە لەبەر خاتری مرۆڤ پێی بەخشیوە، ئەوەیە کە ئاو لە (١٠٠) پلەدا دەکوڵێت، خۆ ئەگەر بێت و ئاویش وەکو زەیت لە (٥٠٠) پلەدا بکوڵایە، ئەوا هەر خۆراکێك کە بۆ ئامادەکردن وکوڵاندنی پێویستی بە ئاوە، هەتا بە تەواوی نەسوتایەو ڕەش نەبوایەو بێکەڵك نەبوایە، نەدەکوڵاو ئەو

کاتە نەمان دەتوانی بە هیچ شێوەیەك چێشتێك ئامادە بکەین، وە هەروەها بەهۆی زۆر کوڵانەوە هیچ سوودێك لە خۆراکی کوڵاودا نەدەما.

جا ئیمانداری بەڕێز: ئایا جێگای خۆی نییە کە هەرکاتێك ئاوت خواردەوە، پێش خواردنەوەی یادی ئەو خوایە بکەی کە ئەو ئاوەی بە خەڵات پێ بەخشیوی؟ و بەدڵ وبەگیان بڵێی: ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ وە کاتێکیش لە ئاو خواردنەوە تەواو بووی، ئەو هەموو تایبەتمەندییانەی ئاو بێنیتەوە بەرچاوی خۆت کە خوای گەورە لە ئاودا دروستی کردون و بەدڵ وبەگیان بڵێی: ﴿الحَمْدُ لِلّهِ﴾ هەزاران هەزار سوپاس بۆ تۆ خوای گەورە کە ئەم ئاوەت پێ خەڵات کردووین، ئەو کاتەش لەگەڵ تێراو بونتدا و ڕزگار بوونت لە تینوێتی بە هۆی ﴿بِسْمِ الله﴾ و﴿الحَمْدُ لله﴾ هکەوە چەندین چاکەت بۆ دەنوسرێت لە نامەی کردەوەکانت دا.

ئیمانداران وخواناسانی بەقەدرو بەڕێز: یەکێك لەو شتانەی کە پێویستە شەوی پیرۆزی قەدری پێ زیندوو ڕاگرین بریتییە لە نوێژی تەسبیحات (صَلاةُ التَسبيح) کە ئومێدەوارم بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە شێوەی نوێژەکە بچنە خزمەت مامۆستایانی ئاینی و داوایان لێ بکەن کە بۆتان ڕوون بکەنەوە.

ئەم نوێژە زۆر گەورەیە، لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە عبدالله ی کوڕی عەباسی ئامۆزای فەرموو: ئایا نوێژێکی سوننەتت فێر بکەم کە خوای گەورە بە هۆیەوە لە گوناهی گەورەو

بچوکت و لە گوناهی ئاشکراو نهێنیت خۆش ببێت؟ ئیتر ئەم نوێژی تەسبیحاتەی فێر کرد.

وە ئەم نوێژەش بۆیە ئەوەندە گەورەیە، چونکە گەورەترین زیکری تێدایە، هەروەکو پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە هاوەڵی بەڕێزی ( ئەبو زەڕی غەفاری ) فەرموو: ( ألا أُخبِرُكَ بِأَحَبِّ الكَلامِ إِلى اللهِ تَعالى) ئایا ئاگادارت بکەم بەوەی کە چ ووتەیەك خۆشەویستترین ووتەیە لای خوای گەورە؟ ( قالَ بَلى يا رَسُولَ الله ) ئەبو زەڕ زۆر بە موشتاقییەوە فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( إِنَّ أَحَبَّ الكَلامِ إِلى اللهِ تَعالى: سُبحانَ اللهِ وَالحَمْدُلِلّهِ وَلا إِلهَ إِلاّاللهُ وَاللهُ أَكبَر ).

بەڕاستی خۆشەویستترین قسەو گوفتار لای خوای گەورە ئەوەیە کە بەندە بڵێت: ( سُبحانَ اللهِ وَالحَمْدُلِلّهِ وَلا إِلهَ إِلاّاللهُ وَاللهُ أَكبَر ) وە هۆکارێکی تری گەورەیی ئەم نوێژی تەسبیحاتە ئەوەیە کە سوژدەی زۆردرێژی تێدایە، چونکە لەهەر سوژدەیەکدا لە دوای ( سُبحانَ رَبّيَ الأعلى)ەوە (١٠) جار زیکری ( سُبحانَ اللهِ وَ الحَمْدُلِلّهِ وَلا إِلهَ إِلاّاللهُ وَاللهُ أَكبَر) دەوترێت. وە مرۆڤی ئیماندار لەو کاتەدا کە سەری لە سوژدەدایە لە هەموو کاتێك زیاتر لە خوای گەورەوە نزیکە، هەروەکو پێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ پێی ڕاگەیاندوین وفەرموویەتی: ( أَقرَبُ ما يَكونُ العَبدُ مِنْ رَبِّهِ وَهوَ ساجِدٌ، فَأَكثِرُوا الدُّعاءَ).

واتە: نزیکترین کات کە بەندە زۆر لە خوای خۆیەوە نزیکە، ئەو کاتەیە کە مرۆڤ لە سوژدەدایە، لەبەر ئەوە لەو کاتەدا زۆر لە خوای گەورە بپاڕێنەوەو داوا لە خوا بکەن.

بەڵێ بە سوژدە بردن بۆ خوا لە خوای خۆت نزیك دەبیتەوە، وە سوژدە بردن بۆ خوا خەم وخەفەت لە دڵ ودەروندا لادەبات، خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆشەویستی فەرموو: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾﴾ الحجر٩٧، ٩٨

واتە: سوێند بەخوا ئێمە چاك دەزانین کە بەڕاستی دڵی تۆ تەنگ دەبێت بەو گوفتارە نابەجێیەی کە خوانەناسان دەیڵێن، جا لە هەموو کاتێك دا ( بەتایبەت لە کاتی دڵتەنگی دا ) تەسبیحات وسوپاس وستایشی پەروەردگارت بکەو لە ڕیزی سوژدەبەران دا بە.

بەڵێ ئەمڕۆ ئێمەی موسوڵمانیش هەروەکو کاتی خۆی بە هۆی ئەوهەموو قسە نابەجێیەی کە بەرامبەر خواو پێغەمبەری خواو شەرعی خوا لە لایەن خوانەناسان و دژ بەدینانەوە دەگوترا، دڵی پێغەمبەری خوای ئازار ئەدا، ئەمڕۆش هەمان دەنگی ناسازو بێویژدان ئازاری دڵی ئێمەی ئیماندار ئەدات، جا لەبەر ئەوە زۆر پێویستمان بە تەسبیحات وزیکری خوای پەروەردگار هەیە، وە زۆر پێویستمان بە سوژدە بردن هەیە بۆ خوای گەورە بۆ ئەوەی دڵمان دامەزراو بێت، کە هەردووکیان،( زیکرو تەسبیحات) لەگەڵ سوژدەی

درێژ لە ناو ( صَلاةُ التَسبِيح ) دا هەیە. بەڵێ سوژدەبردن مایەی ئارامی دڵ ودەروونە، مامۆستا (عبدالحكيم خفاجە) دەفەرموێت: پیاوێکی ئەڵمانی موسوڵمانێك دەبینێت وا خەریکە نوێژ دەکات و کاتێك دەچێتە سوژدە، ئەم ئەڵمانییە زۆری بەلاوە سەیر دەبێت، بۆیە دوای نوێژەکە لە موسوڵمانەکە دەپرسێت: باشە بەهۆی چییەوە وا سەرت خستە سەر زەوی؟ موسوڵمانەکەش دەڵێت: ئەوە نوێژەو سوژدە بەشێکە لە نوێژ، ئەڵمانییەکە دەڵێت: وامزانی تۆش بۆ ئارامی دڵ ودەرونت سەر دەخەیتە سەر زەوی، چونکە من ماوەی چەند ساڵێکە کە دەرونم نائارام دەبێ و هەست بە دڵەڕاوکێ وقەلەقی دەکەم، ناوچەوانم دەخەمە سەر زەوی یەکسەر دڵم ئارام دەبێت، پاشان ئەم ئەڵمانییە موسوڵمان بوو.

وە هەروەها سوژدەبردن دەبێتە هۆی بەتاڵ کردنەوەی شەپۆلەکانی( کەهرۆ موگناتیسی) لەش دا. دکتۆر (عمر عبدالكافي) دەفەرموێت: لە سویسرا لە کۆنگرەیەکدا ئامادە بووم، باسی ئەوە کرا کە چۆن مرۆڤ خۆی لەو کارەبایەی ناو لەشی خاڵی بکاتەوە، کە بایی ئەوە کارەبا لە لەشی هەر مرۆڤێکدا هەیە کە دەتوانێ گلۆپێك داگیرسێنێت، ووتووێژی زۆر لەناو ئامادەبوانی کۆنگرەکەدا کرا کە هەموویان هەڵگری بڕوانامەی ماستەرو دکتۆرا بوون وپسپۆڕی ئەو بوارە بوون، سەرەنجام ووتیان: ئەگەر مرۆڤێك بیەوێت لە شەپۆلە کارەباییەکانی ناو لەشی ڕزگاری بێت، دەبێت ڕۆژانە چەند وەرزشێك بکات، کە زۆر نزیکە لە سوژدەبردنی ناو

نوێـژی موسـوڵمانانەوە!! زاناکـان وتیـان: ئـەو سـوژدەیە ئـەبێت ئـەم خاڵانەی تێدا بێتە دی:

١. سوژدەکە لەسەر زەوی بێت.

٢. دەبێت حەوت ئەندامی لاشەی مرۆڤەکە بکەونە سەر زەوی کە: ناو چەوان و هەردوو دەست وهەردوو کڵاوەی ئەژنۆو هـەردوو سـەرە پەنجەی پێکان!، ( کە پێغەمبەری پێشەوامان هەزاران ساڵ لەمەو بەر فەرموویـەتی: فـەرمانم پێکـراوە کـە لەسـەر حـەوت ئەنـدامی لاشـەم سوژدە بەرم بۆ پەروەردگارم ).

٣. خاڵی سێهەم کە بەڕاستی جێگای سەرنجە ئەوەیە: دەبێت ئەو سوژدەبردنە ڕوو لە قیبلە بێت، چونکە دەرکەوتووە کە قیبلە چەقی زەوی موگناتیـسییە، جـا ئەگـەر بـەرەو ناڕاسـتەی غـەیری قیبلـە سوژدەکە برا، ئەوا شەپۆلە کارەبابییەکان بەتاڵ نابن.

( سُبْحانَ الله ) ئەم ئیسلامە چ بەختەوەرییەکە، ئەوەی خەڵکی بە شوێنیدا وێڵن ودەیان کۆڕو کۆبونەوەی لەسەر دەگرن و دەیـان زانـای پسپۆڕی پێوە خـەریك دەکرێن، لای ئێمـەی موسـوڵمان خـوای گـەورە بـۆی کـردوین بـە عیبـادەت و خـوای گـەورە لێمـان ڕازی دەبـێ و تـای تەرازووی چاکەو خێرمان پڕ دەبێ و بێ ئەوەی مەبەستیشمان بێ دڵ ودەرونمـان ئاسـوودە دەبێـت و لـەو شـەپۆلە کارەبابییـەی نـاو لـەشمان ڕزگارمان دەبێت.

جا کەواتە: ئەم ( صَـلاةُ التَـسْبِيحَ ) ە نوێـژێکی ماندوکەر نییـە، بـەڵکو ئەگـەر بـە تێگەیـشتن وئیخلـاص و ئاگاییـەوە بکرێـت، دەبێتـە

مایەی حەسانەوەو پشوودانی ڕوح ومێشك و لاشەمان، خوای گەورە یارمەتیدەرمان بێت بۆ ئەوەی بە جوانی بەندایەتی بکەین.

پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فێری کردین کە لە دوای هەموو نوێژێك بڵێین: ( أَللهُمَّ أَعِنّا عَلى ذِكرِكَ وَ شُكرِكَ وَ حُسنِ عِبادَتِكَ).

ئیمانداران: ئەی ئەو کەسانەی کە بەنیازن ( اِن شــاءَالله ) هەموو شەوانی قەدر بە عیبادەت وخواناسی زیندوو بکەنەوە، وا مەزانن کە دانیشتن وبەخەبەر بوون تا بەیانی، ئەرك وزەحمەت وماندوو بونە، نەخێر، بەڵکو دانیشتنی شەوان بۆ خواپەرستی وعیبادەت وگوێ گرتن لە مەوعیزەو ئامۆژگاری ئاینی ئیسلام، بە تایبەت نیوەی شەو بە دواوە کاتی بەری بەیانی، تام وچێژو لەزەتی تایبەتی خۆی هەیە لای خواناسان وئیماندارانی بەحەق.

( دکتۆر محمد اقبال ) دەیفەرموو: ئەی خوای گەورەو میهرەبان لێت دەپاڕێمەوە ( خُذ مِني ما شِئتَ یا رَب، ولَكِن لا تَحرمني لَـذَّةَ مناجَاتِ السَّحَرِ) خوای گەورە هەرچیم لێ وەردەگریتەوە قەیناکات، بەڵام بێ بەش و مەحرومم مەکە لە لەزەت و تامی موناجات و ناڵینی بەرەبەیان وسەحەر.!

ئای چ لەزەتێکی ڕووحی تێدایە لە مرۆڤ لە نیوەی شەو بە دواوە، بە کوڵ وبەدڵ لە خوای خۆی بپاڕێتەوەو موناجات لە خزمەت پەروەردگاری دا بکات و داوای لێخۆش بوونی لێ بکات و داواکارییەکانی پێشکەش بە بارەگای خوای گەورە بکات و دڵنیایی تەواو وەربگرێت کە خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە، چونکە خۆی

فەرموویەتی: لە نیوەی شەو بە دواوە بانگی عەبدەکانم دەکەم، کێ داوای لێخۆش بوونم لێ دەکات تا لێی خۆش بم، کێ پێویستی وداواکاری هەیە تا پێی ببەخشم و بە دەمیەوە بچم.

کەواتە بەڕێزان: بە تایبەت ئاگاتان لە بەری بەیان و کاتی پارشێو بێت، زیاتر دوعای تێدا بکەن، نەك لەو کاتەدا بێتاقەت بن یان بە خواردنەوە خۆتان خەریك بکەن.

خۆشەویستان: لە شەوانی قەدر دا زۆر قورئانی پیرۆز بخوێنن. وە با کەس نەڵێت ئاخر من نازانم قورئان بخوێنم، نەخێر، کەس لە قورئان خوێندن مەحروم نابێت، خۆ سوپاس بۆ خوا هەموو موسوڵمانێك سورەتی ( الفاتحة) دەزانێت کە لە هەموو ڕکاتی هەموو نوێژێکدا دەیخوێنێت، دەی مـوژدەت لێبێت هەرکەسێك سورەتی ( الفاتحة ) بخوێنێت، خوای گەورە ( ١٤٠٠ ) حەسەنەو چاکەی بۆ دەنوسێت، ئەوەی حەوت جار سورەتی ( الفاتحة) بخوێنێت، خوای گەورە ( ٩٨٠٠ ) چاکەی بۆ دەنوسێت.

وە هەروەها سورەتێکی هەرە گەورەی قورئان، بەڵام بە ووشە کەم ولەسەر زوبان ئاسان، کە ئەمیشیان سوپاس بۆ خوا زۆربەی موسوڵمانان بە ژن وپیاوەوە لەبەریانەو لە دوای سورەتی ( الفاتحة ) ەوە لە نوێژەکان دا دەیخوێنن، ئەویش سورەتی ( الإخلاص) ە واتە سورەتی ﴿ قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ ﴾ ە جا وەسییەتتان بێت ئەم سورەتە زۆر زۆر بخوێنن. چونکە پێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ ڕۆژێکیان ڕووی کردە صەحابە بەڕێزەکان و فەرمووی: ( أيُعْجِزُ أحدُكم أنْ يَقرَأ ثُلُثَ

القُرآنِ في لَيلَةٍ؟ فَشَقَّ ذالكَ عَلَيهِم وقَالُوا: أيُنا يطيقُ ذلكَ يا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَال: اللهُ الواحدُ الصمَد، ثُلُثُ القُرآنِ).. رَواهُ البُخاري وَ مُسلِم.

واتە: ئایا کەس هەیە لە ئێوە نەتوانێت لە هەر شەوێکدا سێیەکی قورئان بخوێنێت؟ صەحابەکان ئەمەیان بەلاوە قورس بوو، ئاخر چۆن مرۆڤ دەتوانێت هەموو شەوێك سێیەکی قورئان بخوێنێت، چونکە شەوی وا هەیە ئینسان ماندوو هیلاکە، هەر دوای نوێژی عیشا دەخەوێت، دەی خۆ خوێندنی سێیەکی قورئان چەند سەعاتێکی دەوێت، بۆیە صەحابەکان عەرزی پێغەمبەری خوایان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خوا لەوە ناچێت کەس لە ئێمە بتوانێت بەبەردەوامی هەموو شەوێك سێیەکی قورئان بخوێنێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەبزانن: سورەتی (الاخلاص) سێیەکی قورئانە، واتە هەرکەسێك سورەتی (الاخلاص) بخوێنێت، وەکو وایە سێیەکی قورئانی خوێندبێت.

چونکە ( وَاللهُ اَعْلَمْ) سێیەکی قورئان باسی تەوحیدو یەکتاپەرستی خوایە، سورەتی (الاخلاص) یش بە تەواوی باسی تەوحیدو یەکتاپەرستی خوای گەورەیە.

بەڵێ ئیمانداران: ئەمە هەمووی فەزڵی خوایە، هەمووی ڕەحمەت وهەدیەو خەڵاتی خوایە بۆ ئێمەی بەندەی لاوازی، دە با ئێمەش وەری بگرین و ڕووی تێبکەین و پشتی تێنەکەین و عەبدێکی ڕاستەقینەی خوا بین.

لە کۆتایی ووتارەکەشم دا ئەوەتان یاد دەخەمەوە، کە وا بەرەو کۆتایی مانگی ڕەمەزان دەچین و بەرەو جەژن دەڕۆین، جەژنیش ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی، یانی لەگەڵ دڵخۆش بوون بە ڕۆژ وتەراویح وزیکرو قورئان خوێندنی مانگی ڕەمەزان، لە جەژندا موسوڵمان بە خۆشخۆری و جوان پۆشی خۆی وخێزان ومناڵەکانی و جوانی و ڕازاوەیی ماڵی زیاتر دڵخۆش دەبێت، بەڵام ئەمڕۆ لەناو ئێمەدا، لە هەر کۆڵان وگەڕەکێکدا و لە هەر لادێ وشارو شاروچکەیەك دا، چەندین فەقیرو هەژار هەن، کە بەڕاستی ناتوانن وەکو پێویست مەراسیمی جەژنی ڕەمەزانی پیرۆز بەڕێوە بەرن، لەبەر ئەوە بە شوێنیان دا بگەڕێن وسەرفیترەیان بدەنێ و زیاد لەوەش هاوکاری تریان بکەن و کارێکی وا بکەن کە ئەوانیش لەگەڵ دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووەکان دا بتوانن بە خۆشی و ڕووگەشییەوە جەژن بکەن و هەست بە هەژاری ودەست تەنگی خۆیان نەکەن ، وەبشزانن هەموو خێرو خێرات و بەخشینێك قازانجەکەی بۆ خۆمانە، پێش ئەوەی قازانج و سوود بێت بۆ ئەو کەسەی کە خێرەکەی پێ دەبەخشین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (صَنائِعُ المَعرُوفِ تَقي مَصارِعَ السُّوءِ) حَديث صَحيح – صَحَّحَهُ العَلاّمَةَ الألباني في صَحيح الجامعِ(٣٧٩٥).

عبدالله ی کوڕی عەباس فەرموویەتی: (صاحِبُ المَعروفِ لا يَقَع، فَإن وَقَعَ وَجَدَ مُتَّكَأً).

واتــە: چـاکەکار، خێرخـواز لـە ژیـان دا ناکـەوێت، ناخلیـسکێت، نـاڕوات بـەرەو چـاڵە تاریکـەکان، وە ئەگـەر خلیـسکاو خـەریك بـوو بکـەوێت، ئـەوا شـتێك دێتـە ڕێـی کـە خـۆی پێـوە بگرێتـەوە، واتـە: چاکەکان، خێروخێراتەکـەی کـە کردویـەتی، فرمێسك وخەمـەکان کـە لەسـەر لێـوو چـاوی هـەژاران کردویـەتی بـە زەردەخەنـەو دەم وچـاو گەشـی، ئـەم چاکەکارییە دەبنـە قـەڵغانێك ودەیپـارێزن لـە هـەر بـەڵاو موصیبەتێك کە ڕوو لـەو کەسـەو لـە ماڵی وخێزانـی وخۆشەویستانی دەکات.

ﻫ- پێـشەوا: ابـنُ الجَـوزی . لـە( صِـفَةُ الـصَفْوة ) دا بەسـەرهاتێك دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پیاوێکی دەسەڵاتدار کە نـاوی( ابن الفرات )ی وەزیر بوو، زۆر ڕقـی لـە کابرایـەك بـوو، لـە خـەیاڵی خـۆی دا چـەند پلانی نهێنی بۆ دانا کـە بیکوژێت، بـەڵام پلانـەکانی سـەری نـەدەگرت ونەدەکەوتە داوەکەوە، شەوێکیان بەم خەیاڵەوە خـەوت، لـە خـەونیـدا، ئـەم پیـاوەی کـە ڕقـی لێـی بـوو گرتبـوی وبـەداردا هـەڵی واسیبوو، فەرمانی ئەدا بە سەربازەکانی بەتیر تیربارانی بکـەن وبە شمشێر لێـی بدەن، بەڵام ئەم کابرایە کولێرەیـەکی بە دەستەوە بوو، ئەم کولێرەیـە ئـەو هـەموو تـیرو شـیرەی دەگرتـەوەو نـەی دەهێـشت بـەر جەسـتەی بکەون، لە خەونەکەی خەبەری بویەوەو ئەمەی زۆر بەلاوە سەیر بوو. بۆیە ناردی بە شوێن ئەو کەسەدا کە زۆر ڕقی لێی بوو، وە بە ناچاری هەموو باسەکە وخەونەکەی بۆ گێڕایەوەو پێی ووت: حەز دەکەم بزانم تـۆ چ خێرێکـت کـردووە لـە ژیانـت دا کـە ئـاوا بووەتـە قـەڵغان و بـە

هۆیەوە خوا تۆی پاراستووە؟ کابرا ووتی: من هەر لە منداڵییەوە دلیکم هەموو ڕۆژێك کولێرەیەکی کردووەتە خێر بۆم، بەو ئومێدەی کە خوای گەورە لە بەڵاو موصیبەت بمپارێزێت، ئەو زەمانە کولێرە زۆر بەنرخ بووە چونکە گرانی بووەو نان بە نارەحەت دەست کەوتووە، وە دوای وەفاتی دایکیشم بۆخۆم هەموو ڕۆژێك بۆ دەفعی بەڵاو موصیبەت لەسەرم کولێرەیەك دەکەم بەخێر، وە خەونەکەت ئەی جەنابی وەزیر زۆر ڕاست بووە، ( ان شاءالله ) خوای گەورە ئەو کولێرەیەی خۆم ودایکمی قبوڵ کردووەو کردویەتی بە قەڵغانێك کە لە هەموو شیرو تیرو پلانێك پاراستوومی و دەمپارێزێت.

جا ئیمانداری بەڕێز: تۆش ئەوەندەی لە تواناتدایە، لەم کۆتایی مانگی ڕەمەزانەدا، خێروصەدەقە بکە، وە ئەگەر خۆشت لە تواناتدا نەبوو چاکە بکەی، ئەوا ئەگەر کەسێکی دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوو دەناسی ئاگاداری بکە کە لە فڵان گەڕەك دا ماڵێکی زۆر هەژار هەیەو توانای خەرجی جەژنی نییە، بەڵکو دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەوە دەفەرموێت: ( لأَنْ أَمشي مَعَ أَخٍ في حاجَةٍ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعتكفَ في هذا المَسجِدِ – مَسجِدِ المَدينَةِ – شَهراً) حَديث حَسَن –ذكَرَهُ الألباني في الصَحيحَةِ بِرقَم: (٩٠٦) وَ حَسَّنَهُ في صَحيح الجامِعِ بِرقَم(١٠٩٦).

واتە: ئەگەر بڕۆم لەگەڵ برایەك دا بۆ ئەوەی بەهۆی منەوە ئیش وکارو پێویستی جێبەجێ ببێت، ئەوا بە لامەوە خۆشترە لەوەی کە ماوەی یەك مانگ لەم مزگەوتەدا، مزگەوتی مەدینە ، کەیەك نوێژ

تیایـدا خێـری هـەزار نوێـژی مزگـەوتی تـری هەیـە، نەچـمە دەرەوەو اعتكاف بكەم بۆ خوا پەرستی.

كەواتـە: ئیمانـداری بـەڕێز: هـەروەكو شـەوانی كۆتـایی مـانگی ڕەمـەزان بە تاعـەت وخواپەرسـتی وبەندایـەتی و بیركردنـەوە ئـاوەدان دەكەیتەوە، (أن شاءالله) لە ڕۆژەكانیش دا لە هەوڵی جێبەجێ كردنـی پێداویستی موسوڵمانانی خاوەن پێویستی دابە.

خوای گەورەو میهرەبان بە لـوتفی خـۆی ئەجروپاداشـتی شـەوانی قەدرمان بە نسیب بكات و بمانكات بە كلیلـی دەرگـای خێـرو قـوفڵی دەرگای شەڕ، عاقیبەتی هەموو لایەك خێربكات. اللهم امیـــن .

# سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان بورهان محمد ئەمین .

٣. بِأسْمِكَ نَحْيا عمروخالد .

٤. عِباداتُ التَفَكُرْ عمروخالد .

٥. گۆڤاری دوانگە

٦. ڕۆژنامەی هاوڵاتی

٧. ژیان وئیعجاز سەروەر حەسەن

٨. ڕۆژنامەی ڕۆژنامە

٩. موسوعة أسماءُ الله الحُسنی د. محمد راتب النابلُسي

١٠. لە خزمەت قورئان دا ئەندازیار عوسمان

١١.َصفَقات غالِية محمد عبدالعاطی بَحیری

١٢. نامیلکەی: تاببیتە بەختەوەرترین کەس

د. عمر عبدالكافی و.عبدالجلیل علی

١٣. المَوسوعة الذَهَبِية منَ القِصَصُ الواقِعِية

محمد أحمد الهِلالی

الحَمدُ لِلّهِ رَبِّ العالَمين، وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وعَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ أجمَعين:

**ئیماندارانی بەرێز: جەژنی ڕەمەزانی پیرۆز لە هەموو لایەك پیرۆز بێت، خوای گەورە بە کەرەم ولوتفی خۆی ڕۆژوو تاعەت وعیبادەتی مانگی ڕەمەزانی لێ قبوڵ کردبین، وە لە کەم وکوڕییەکانمان ببورێ و جەژن لە هەموو لایەکمان پیرۆز بێ و دڵی ئێمەو هەموو ئەهلی قیبلە شاد بێ و ڕومان سپی وسەرمان بڵند بێت لە دونیاو قیامەت دا . ئامین**

**بەڕێزان: هەموو دەورەیەك دوای تەواو بوونی، ئاهەنگی دەرچووانی خولەکەی هەیە، مانگی پیرۆزو پڕ بەرەکەتی ڕەمەزانیش دەورەیەك بوو، هەرکەسێك ئامادەیی تێدا بووبێت لە موسوڵمانان بەژداری ئەو دەورەیەی کرد، ئەو خولەی مانگی ڕەمەزان هەموو تەمەن وهەموو پیشەو هەموو ڕەنگ و هەموو دەنگێکی تێدا بوو، لە گەورەو بچووك، لە پیرولاو، لە منداڵ وهەرزەکار، لە ژن وکچ، لە دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات، لە بەڕێوەبەرو فەرمانبەر، لە کرێکارو خاوەن کار، هەمووی لە خولی مانگی ڕەمەزاندا بەژدار بوون، لە هۆڵی خولەکەدا ئەم ئایەتە هۆکاری خولەکەو ئامانجی خولەکە بوو، کە کارتی بانگ کردنی هەموو لایەك بوو:**﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾

ئومێدەوارم هەموو لایەکمان: هەموو ڕۆژووەوانان گەیشتبینە پلەی ( موتەقین) .

بەڵێ خۆشەویستان: تەنها ئیسلام دەتوانێت دەورەی ئاوا بکاتەوە، دەورەیەکی وا گەورە کە هەموو عاداتی یانزە مانگی ڕابردووی گۆڕیبوین، لە خواردن وکاتی نان خواردن، لە نەخواردنەوە، لە خەوتن، لە قسەکردن، لە هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر خراپان وشەڕ فرۆشان، لە هاتوچۆی مزگەوت، لە دڵنەرمی، لە بەخشندەیی، لەبەزەیی، لە تەوبەو ئیستیغفار.

بەڵێ غەیری ئیسلام هیچ ئایدیۆلۆژیایەك ناتوانێت، دەورەیەکی ئاوا گەورە بکاتەوە کە نزیکەی یەك ملیارو دووسەد ملیۆن کەس لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، لە سپی پێستەوە بۆ ڕەش پێست، لە هەموو جۆرە دەنگ ورەنگ و هۆزو نەتەوەیەك، بە جیاوازی زمان و نەتەوەو سنووری جوگرافی وعادات وتەقالیدەوە تێیدا بەژدار بن، بۆ تەنها یەك مەبەست، دوور لە هەموو ئاوات و مەرام ومەبەستێکی دونیایی، کە ئەویش بریتییە لە ڕەزامەندی خوای گەورەو چونە ڕیزی موتەقی وخواناسانەوە.

بەڵێ وەك وتمان لە کۆتایی دەورەو خولەکەدا، ئاهەنگی دەرچوون هەیە، ئاهەنگی دەرچوونی ئەم خولەش، جەژنی پیرۆزی ڕەمەزانە: کە لە ئاسمان دا پێی دەوترێت ( يَومُ الجائِزة ) خوای گەورە لە فریشتەکان دەپرسێت: ئایا پاداشتی کرێکاری دڵسۆز چییە؟ کە کەمتەرخەمی نەکردبێت لە کارەکەی داو بەدڵسۆزی

تێکۆشابێت؟ فریشتەکان دەڵێن: خوای پەروەردگار خۆت لە هەموو کەس زاناتری، بەڵام ئێمە ئەوە دەزانین کە پاداشتی کرێکاری بەرێزو دڵسۆز، ئەوەیە کە لەکاتی تەواو بوونی کارەکەی دا، هەموو کرێکەی بە تەواوی بدەیتێ، خوای

گەورە دەفەرموێت: دەی بۆ کرێکارانی مانگی ڕەمەزان، کە لە هەوڵی کۆکردنەوەی چاکەو خێردا بوون و بەشەوو ڕۆژ تێدەکۆشان کە توێشوی زیاتر بۆ سەفەری درێژی قیامەتیان کۆبکەنەوە ﴿وَ تَزَوَّدُوا فَأَنَّ خَيرَ الزّادِ التَّقوى﴾ دروشمی کارکردنیان بوو، بۆ ئەو ڕۆژووەوانانە وا بڕیارم داو ئێوەش گادار بن کە:

( أُشهِدُكُم أَنِّي قَد جَعَلتُ ثَـوابَهُم رِضـائي وَ مَغفِرَتـي ) ئێوە بەشاهید بن کە بەڕاستی من کرێ وپاداشتی هەوڵ وماندوو بون و تینـوێتی وبرسـییەتی ڕۆژوو، بـەئاگایی و بێـداری شـەوانی ڕۆژووەوانانی ئوممەتی محمد ﷺ کرد بەوەی کە لێیان ڕازی بم و لە هەموو گوناهەکانیان خۆش بم.!!

الله اکبر . چ موژدەیەکی گەورەیە: ئەو مەدالیایەی کە خوای گەورە بە حزووری فریشتە پاك وخاوێنەکانی دەیکاتە ملی بەندەکانی لە جەژنی ڕەمەزاندا کە بریتییە لە مەدالیای ڕازی بوون ولێخۆش بوون، ﴿وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّه أَكْبَرُ﴾ .

ئیمانـداران: ئـەم مەراسیمەی جـەژنی ڕەمەزانـە لـە ئـاینی پیرۆزی ئیـسلامدا وا دانـراوە کـە دەبـێ لـە دەشـتدا، لـە دەرەوەی شـوێنی نیشتەجێ بـوون کـە لـە شـەرعدا پێـی دەوترێـت ( مُـصَلّى ) ئـەنجام

بدرێت، کە لە ئیسلامدا دەبێت هەموو گوندو شارۆچکەو شارێکی موسوڵمانان شوێنێکی تایبەتیان هەبێت بۆ بۆنەکان، بەتایبەتی بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەژنەکان، ( ڕەمەزان وقوربان ) وە نوێژە بارانە، کە ئەمڕۆ پاریگا هەیە، دەبێت شوێنێکی ئاواش کە (مُصَلَى) یە هەبێت، جا لەبەیانی ڕۆژی جەژندا هەموو هاوڵاتییانی ئەو شوێنە لە ماڵەکانیانەوە ڕووەو ئەو شوێنە تایبەتە دەڕۆن، جا نەك هەر پیاوان دەچن، بەڵکو ژنانیش بەشدار دەبن، چۆن کوڕ بەشدار دەبێت، کچیش بەشدار دەبێت، هەروەها منداڵەکانیش لەگەڵ خۆیان دەبەن، وە ماڵەکان لەلایەن پۆلیس وئاسایشی دەوڵەتەوە پارێزگارییان لێ دەکرێت، یەکێك لە ئافرەتە دیارەکان لە مێژووی ئیسلام داو لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ ناوی (اُم عَطِیە) یە، ئەم ئافرەتە ژیرو بەسەلیقەو بە هەڵوێستە وەکو نوێنەری ئافرەتان وابوو، بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوو، وە مەسەلە گرنگ وتایبەتەکانی ئافرەتانی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس دەکردو ڕاسپاردەو ئامۆژگاری پێغەمبەریشی دەگەیاندەوە ئافرەتان، جا (اُم عَطِیە) دەفەرموێت:

(أمَرَنا رَسُولَ الله ﷺ أن نخرجهن في الفطر وَ الأضحَى، العَواتِقَ وَ الحَيضَ، وَ ذَواتِ الخُدُورِ، فَأمّا الحُيَّض فيَعتَزِلنَ الصَّلاةَ وَ يَشهدنَ الخَيرَ وَ دَعوَةَ المُسلمينَ. قُلتُ – أي أُمُّ عَطيَةَ – يا رَسُولَ الله إحدانا لا يَكونُ لَها جِلبابٌ ، قال: لِتَلبسَها أُختَها مِن جِلبابِها ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە ئێمەی ئافرەت کە بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان وجەژنی قوربان لەگەڵ پیاواندا لە ماڵ بچینە

ئەرموەو ڕوبکەینە شوێن نوێژی جەژن ( مُصَلَّى ) جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با ئافرەتان هەموویان ئامادە بن، ئەوەی لە حاڵەتی پاکییەتیدایەو ئەوەشی لە سوڕی مانگانەداو خوێنی دوای منداڵ بووندایە با هەر ئامادەبێت، جا ئەو ئافرەتانەی کە ناتوانن نوێژ بکەن بە هۆی بێ نوێژییەوە، ئەوا با خۆیان بپارێزن لە نوێژی جەژنەکەو نوێژەکە لە گەڵ خەڵکەکەدا نەکەن، بەڵکو تەنها بەژداری لە گوێ گرتن لە ووتارو دوعاو پاڕانەوەی موسوڵمانان و ئەو هەموو خۆشی وفەرەحییە بکەن کە لەو مەراسیمەدا توشی موسوڵمانان دەبێت، (أم عَطِيه) دەفەرموێت: منیش عەرزی پێغەمبەری خوام کرد : ئاخر هەموو ئافرەتێك سەرپۆشی نییە کە سەروو سینەی خۆی پێ داپۆشێت، ئایا ئەوانە چی بکەن؟ فەرمووی: با خوشکە ئیماندارەکەی بەشێك لە سەرپۆشەکەی خۆی لێبکاتەوەو لەچکەکەی بکات بە دوو کەرتەوەو بەشی ئەوەیان بدات کە سەرپۆشی نییە.

ئیمانداران: وەرن بیهێننە بەرچاوتان چ عەزەمەتێکە، چ شان وشکۆیەکە، ئەو هەموو خەڵکە موسوڵمانە بە دەوڵەمەندو هەژارەوە، بە خوێندەوارو نەخوێندەوارەوە، بە خزم وناسراوو نەناسراوەوە، بەژن وپیاوەوە لەیەك جێگادا کۆ ببێتەوەو لەگەڵ فریشتەکانی ئاسمانداو لەگەڵ دەشت ودۆڵ وشاخەکان دا، بەیەك سیمفۆنیا هاوار بکەن ( أللهُ أكبَر ، أللهُ أكبَر ، لا إِلهَ إلاّ اللهُ، اللهُ أكبَر، أللهُ أكبَر، أللهُ أكبَر وَ للّهِ الحَمد ).

بەڵێ کاتێک کوفری یەهودو نەصارا ئەمە دەبینێت، ئەزانێت ئیسلام چ دینێکی گەورەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (حَتَّى تَعلَمَ اليَهودُ أَنَّ في دِينِنا فُسحَةً ).

بەڕاستی بەو کۆبونەوە گەورە جەماوەرییە، کە هەمووی خاوەنی یەک بیروباوەڕو مەبەست و ئامانجن، حیزبایەتی ولایەنگری وئەم وئەوی تێدا نییە، بەیەک دڵ و بەیەک زوبان بەبەخشندەیی و زەردەخەنەو ڕووی خۆش بەرامبەر یەکتری (تَبَسُّمُكَ في وَجهِ أَخيكَ صَدَقَة ) کە هەریەک بەوی تر دەڵێت: خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات، یاخوا جەژنت لێ پیرۆز بێت و هەموو کاتێکت خۆشی وگەشی بێت.

ئالەم ڤیستیڤاڵەدا، لەم کەرنەڤاڵە جەماوەرییە بێ وێنەیەدا ئەوەی غەمباریش بێت غەمی نامێنێت، ئەوەی نەخۆشی دەرونی هەبێت شیفای بۆ دێت، ئەوەی هەژاریش بێت پێویستییەکانی لە لایەن دەوڵەمەندەکانەوە بۆ پڕ دەکرێتەوە، ئەوەی پێشتر ناکۆکییەکی لەگەڵ براو خوشکی ئیمانداریدا بووبێت، بەو جەژنە پیرۆزەو بەو ئامادە بوونە، ئەو دڵ ودەرونەی لە ژەنگ وژاری ڕق وقین پاک دەبێتەوە.

ئای چ عەزەمەتێکە: ئەو هەموو موسوڵمانە بەو دڵە خۆشەو ڕووە گەشەوە بچنە ئەو دەشتەو ئەو نوێژە و ئەو دوعایەو ئەو گەردن ئازادییە چەند خۆشە.

لەبەر خاتری ڕۆژی جەژن، ئازادی زیاتر، بۆ خۆشی دەربڕین دەدرێت بە موسوڵمانان. پێشەوا ئیمامی موسلیم فەرموودەیەکمان بۆ

دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: عَن عائشَةَ: أنَّ أبابَكر دَخَلَ عَلَيها وَ عندَها جاريَتانِ تَغنيانِ وَ تَضربانِ وَ رَسُولُ الله ﷺ مَسجي بِثَوبِه فَانتَهرَهُما أَبُوبكر، فَكَشَفَ رَسُولُ الله ﷺ عَنهُ، وَقالَ: (دَعهُما يا أبابَكر، فَإنَّها أيّامُ عيدٍ) رَواهُ مُسلِم

واتە: دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ڕۆژی جەژن بوو لە ماڵەکەی خۆماندا دانیشتبووم، حەزرەتی ابوبکری باوکم هات بۆ ماڵمان، لەو کاتەدا دوو کچۆڵە لە ماڵمان بوون، گۆرانی وسروودیان دەوت و دەفیان لێدەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پارچە قوماشێك بەبەشێك لە بەرگەکەی خۆی داپۆشی بوو، حەزرەتی ابوبکر کە هاتە ژورەوەو ئەو دوو کچۆڵەیەی بینی کە ئاوا گۆرانی دەڵێن ودەف لێدەدەن، لێیان تورە بوو فەرمووی: بیبڕنەوە، ئەوە شەرم ناکەن لەماڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئاوا دەکەن، ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکەکەی لەسەر خۆی لابردوو فەرمووی: وازیان لێبێنە ئەی ابوبکر، چونکە ئەمڕۆ جەژنە، جەژن، با لەبەر خاتری جەژن کەیف وخۆشی خۆیان دەرببڕن.

بەڵێ ئیمانداران: سووننەتە لەم ڕۆژەدا ئینسانی موسوڵمان خۆی بشوات و جوانترین جل وبەرگ لەبەر بکات و عەترو بۆنی خۆش لە خۆی بدات.

وە یەکێك لە جوانترین سیماکانی ڕۆژی جەژن بریتییە لە: سەردان وبەجێهێنانی سیلەی ڕەحم، کە پێغەمبەری خوا ﷺ

دەفەرموێت: (مَن سرَّهُ أنْ يَبسُطَ لَهُ في رِزقِهِ أو يِنسأ لَهُ في أَثَرِهِ فليَصِلِ رَحِمَهُ) رَواهُ البخاري.

واتە: هەرکەسێك حەز دەکات کە ڕزق وڕۆزی بەرەکەتی تێبکەوێت و تەمەنی درێژو پڕ بەرەکەت بێت، ئەوا با لەگەڵ خزمەکانیدا زۆر باش بێت وسیلەی ڕەحم بەجێ بهێنێت، . وە هەروەها لە فەرموودەیەکی شیرینی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (بُلُّوا أرحامَكُم ولَو بالسَّلام) أخرجه وكيع في الزُهد، وَصَحَّحَهُ الألباني في الصَّحيحَة رَقَم: (١٧٧٧).

واتە: خزمایەتیتان تەڕو تازە بکەنەوە بە سەلام کردن لە یەکتری، بەڵێ خزمایەتی و کەسایەتی بە هاتوچۆ بچڕاندن وەکو درەخت ووشك دەبێت کاتێك ئاو نەدرێت.

کەواتە: بۆ ئەوەی ئەو خزمایەتییە نەپچڕێت، هەر هیچ نەبێت بەسەلام و جەژنە پیرۆزەیەك ئاوی بدەیتەوە، بە تایبەتی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کە زۆربەی خزم وکەس وکار تەنها جەژنەکانیان بۆ ماوەتەوە بۆ سەردان و بەیەکەوە دانیشتن، بەهۆی سەرقاڵی زۆرو فراوان بوونی بازنەی کارو ناسیاوییەوە.

وە دەبێت ئەوەش بزانین کە خزمی باش وموسوڵمانی بە هەڵوێست ئەوە نییە کە وەکو دەستیاو سیلەی ڕەحم جێبەجێ بکات ، بەڵکو ئەو کەسەیە کە بەرامبەر خزمی خراپ کە هاتوچۆی ناکات. ئەم هاتوچۆی بکات، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

(لَيسَ الواصِلُ بالمُكافيء وَ لكِنَّ الواصِلِ الّذي إذا قُطِعَت رَحِمَهُ وَصَلَها) رَواه البُخاري .

**وه داواكارم لە بەڕێزتان كە بەفرسەتێكی زێڕینی بزانن، كە لە مزگەوت مەچنە دەرەوە هەتا هەموو لایەك بەدڵ ودەرونێكی پاكەوە بەگەرم وگوڕی تەوقە لەگەڵ یەكتری بكەن، بەڵكو بەرئەو فەرموودەو موژدەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بكەون كە فەرموویەتی:** (ما مِن مُسلمِينِ يَلتَقِيانِ، فَيَتَصافَحانِ إلاّ غُفِرَ لَهُما قَبلَ أن يَتَفَرَقا ).رَواهُ أبو داود وَالترميذي وَحَسَّنَهُ الالباني.

**واتە: هەركاتێك دوو موسوڵمان توشی یەكتری بوون و بەدڵێكی پاكەوە دەستیان خستە ناو دەستی یەكترو تەوقەیان كرد، ئەوا خوای گەورە لە گوناهی هەردووكیان خۆش دەبێت پێش ئەوەی لە یەكتری جیا ببنەوە.**

**وه تەنها تەوقە كردن بەسەو پێویست بە ماچ كردن ناكات، ئەنەسی كوڕی مالیك دەفەرموێت: پیاوێك عەرزی پێغەمبەری خوای كرد ﷺ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ** ( أَحَدُنا يَلقى صَديقَهُ، أَيَنحَني لَهُ؟ قالَ: لا، قالَ: فَيَلزَمَهُ وَ يُقَبِّلُهُ؟ قالَ: لا، قالَ: فَيُصافِحَهُ؟ قالَ: نَعَم إنْ شاءَ ) رَواهُ الترمذي وَ صَحَّحَهُ الألباني.

**واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەگەر یەكێك لە ئێمە توشی برادەرو هاوڕێكەی بوو، ئایا بۆی بچەمێتەوەو دەست لەسەر سنگ سەری بۆ نەوی بكات؟ فەرمووی: نەخێر، كابرا ووتی: ئایا باوەشی**

پێدا بکات و ماچی بکات؟ فەرمووی: نەخێر، کابرا ووتی: ئەی ئایا تەوقەی لەگەڵ بکات؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر حەزی کرد تەوقەی لەگەڵ بکات. وە ئاگادارتان ئەکەمەوە کە بە هەموو جۆرێك خۆتان بپارێزن لە تەوقە کردن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم، ئافرەتی نامەحرەمیش هەموو ئەو ئافرەتانە دەگرنەوە، کەڕۆژێك لە ڕۆژان دروست بێت ژیانی هاوسەری لەگەڵ پێك بهێنیت، هەرچەندە ئێستاش دروست نەبێت، وەکو ژن خوشك و ئامۆزاو پورزاو ئامۆژن وخاڵۆژن وبراژن، تەنانەت ئەگەر ئەو ئافرەتە زۆریش بەتەمەن بێت، هەر تەوقە کردن لەگەڵی درووست نییە، کە بەداخەوە زۆر کەس هەیە لە ڕۆژی جەژندا تەوقە لەگەڵ دایکی ناکات، تەوقە لەگەڵ خوشکی ناکات، تەوقە لەگەڵ هاوسەرو هاوژینی ژیانی ناکات، دەست ناخاتە ناو دەستی خانمی ماڵ و پێی ناڵێت یاخوا جەژنت پیرۆز بێت، توخوا گەردنم ئازاد کە، بۆ ئەو هەموو ماندوو بونەو ئەو هەموو زەحمەتەی کە لەم ماڵەدا دەیکێشی و بەهۆی تۆوە ماڵم گەرمەو سفرەم ڕازاوەیەو جەژنم شادی وخۆشییە، بە داخەوە زۆر کەس هەیە تەنها ئەوەی تەوقەی گەرم وگوڕی لەگەڵ ناکات خێزانی خۆیەتی، بەڵام دەست دەخاتە ناو دەستی چەند ئافرەتی نامەحرەمەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَأن يُطعَنَ فِي رَأسِ أحَدِكُم بِمَخيَطٍ مِن حَديدٍ خَيرٌ لَهُ مِن أن يَمَّسَ إمرَأةً لا تَحِلُّ لَهُ) رَواهُ الطَبَراني في الكَبير وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامِع(٥٠٤٥) .

واتە: ئەگەر بە ئاسنی نوك تیژو قورس لەسەری یەکێك لە ئێوە بدرێت، هێشتا ئەوەی باشترە کە دەست بخاتە دەستی کەسێکەوە کە بۆی حەڵاڵ نەبێت.

کەواتە: لە خوا بترسن وئەو تاعەت وعیبادەتەی مانگی ڕەمەزان هەڵمەوەشێننەوە بەوەی کە لە ڕۆژی جەژندا بەگوێی شەیتان بکەن و تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم بکەن.

بەڵێ ئیمانداران: با جەژنەکانمان بە ئەخلاقی جوان بڕازێنینەوە. پیاو چاکێك ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات ودەفەرموێت: لەگەڵ خوادا ڕاستگۆبە، لەگەڵ خەڵکیدا بە ویژدان بە، لەگەڵ نەفس دا توندو تیژ بە، لەگەڵ پیران دا خزمەت گوزار بە، لەگەڵ هەژاران دا بەخشندە بە، لەگەڵ منداڵان دا بەسۆزو بەزەیی بە، لەگەڵ دۆستان دا هەمیشە لە ئامۆژگاریدا بە، لەگەڵ دوژمنان دا بەئارام بە، لەگەڵ نەزان دا بێدەنگی بەکاربهێنە.

وە لە کۆتایدا پێویستە ئاماژە بەم چەند خاڵەش بدەین:

١. سەردانی ماڵی دراوسێ و خزم وکەس وکار باتۆزێ درەنگ دەست پێ بکات و مەجال بدرێت بە خێزانەکان کە بە ئیسراحەت نانی جەژن بخۆن و خۆیان بۆ پێشوازی میوان ئامادە بکەن، وە لە پێش نیوەڕۆوە سەردانەکان بوەستێنرێت بۆ ئەوەی کەس لە کاتی نان خواردنی نیوەڕۆدا لەسەر سفرەکەی هەڵنەستێت، وە هەوڵ بدەن سەردانەکان کەم و کورت بن و زۆر دامەنیشن چونکە ئەو ماڵەی تۆ سەردانی دەکەی لە وانەیە ئەویش سەردانی خەڵکی تر بکات.

٢. لە ڕۆژی جەژندا بەتایبەت چاودێری منداڵان بکەن، کە بە ناوی خۆشییەوە تەقەمەنی بەکار نەهێنن و یاری بە شتە زیان بەخشەکان نەکەن، وە برا دوکاندارەکانیش لە خوا بترسن و ئەو شتانەی زیان لە تەندروستی منالْ ئەدەن و توشی زەرەرو زیانی دەکەن نەیفرۆشن و نەیهێنن بۆ دوکانەکانیان.

٣. لە ڕۆژی جەژندا بەیانی زوو لە جیاتی زەردەخەنەو جەژنە پیرۆزە مەچن بۆ سەر گۆڕستان و سەردانی مردووەکانتان، وە نۆ جەژنەو تەعزییە نویٚ کردنەوە حەرامەو تکایە خۆتان لەو بیٚ شەرعییانە بپارێزن.

لە کۆتایدا دەڵێم: یاخوا هەموو کاتێکتان هەر جەژن وخۆشی وشادی بێت و جەژنی ڕەمەزانتان لیٚ پیرۆز بێت و خوای گەورە تاعەت وعیبادەتی مانگی ڕەمەزانی لیٚ قبولْ کردبین و ئاوا بە کۆمەڵ لە قیامەتدا بە خزمەت پێغەمبەری خوا بگەین و بە دەستی موبارەکی ئاوی کەوسەر نۆش بکەین ، أللهم أمیـــــن.

# ووتاری عەرەبی بۆ جەژنی ڕەمەزان

## ووتاری یەکەم

أللهُ أكبَر – تسعاً –

اللهُ أكبَر ما تَهَلَّلَت وُجُوهُ الصّائمينَ فَرَحاً بِهذا اليَومِ المُنيــرِ، اللهُ أكبَر ما أسرَعوا إلى طاعَةِ اللهِ وَ أخرَجُوا مِن فَضلِ أموالِهِم فِطــرَةً عَلى اليَتيمِ وَ الفَقيرِ، اللهُ أكبَر ما خَرَجُوا لِــصَلاةِ العيــدِ رافعــينَ أصواتَهُم بالتَحميدِ وَ التَّهليلِ وَ التَّكبيرِ، اللهُ أكبَــر ، اللهُ أكبَــرُ مــا تَجَنَّبُوا البِدَعَ وَاتَّبَعوا شَريعَةَ سَيِّدِ البَشَرِ.

اللهُ أكبَر (ثَلاثاً)

اللهُ أكبَر ما تَعاوُنَ أهلُ الأسلامِ عَلى البِرِّ وَالتَّقوى وَ نَبَذوا أفعالَ العُصاةِ وَ المُفسدينَ، أللهُ أكبَرُ ما أخَذَت مُسلِماً الغيرَةَ عَلــى الأمــرِ بِالمَعرُوفِ وَ النَّهي عَنِ المُنكَرِ في كُلِّ وَقتٍ وَحينِ، اللهُ أكبَــرُ مــا تَصافَحَ المُسلِمونَ وَ تَصالَحُوا عَلى فِعلِ الخَيــرِ وتَرَكُــوا خِــصالَ المُعانِدينَ، اللهُ أكبَرُ، ما تَذَكَرُوا المَوتَ وَ عَمِلوا ما يَنفَعُهُم في هَــولِ يَومِ المَحشَرِ.

اللهُ أكبَر، اللهُ أكبَر، اللهُ أكبَر، اللهُ أكبَر كَبيــراً ، وَ الحَمــدُ لِلّــهِ كَثيراً، وَ سُبحانَ اللهِ بُكرَةً وَ أصيلاً، لا إلَــهَ إلاّ اللهُ وَاللهُ أكبَــر، اللهُ أكبَرُ وَ لِلّهِ الحَمدُ.

سُبحانَ الأبَديِّ الأبَد، سُبحانَ الفَردِ الصَّمَد، سُبحانَ الذي لَم يَلِد وَلَم يُولَد، وَ لَم يَكُن لَهُ كُفُواً أحَدٌ، سُبحانَ اللهِ وَ الحَمدُ لِله وَ لا إلهَ إلاّ اللهُ وَاللهُ أكبَرُ.

الحَمدُ للهِ الَّذي سَهَّلَ لِلعبادِ طَريقَ العِبادَةِ وَ يَسَّر، وَ وَفّاهُم أُجُورَ أعمالِهِم مِن خَزائِنِ جُودِهِ الَّتي لا تُعَدُّ وَلا تُحصَرُ، وَجَعَلَ لَهُم يَومَ عيدٍ سَعيدٍ يَعُودُ عَلَيهِم في كُلِّ سَنَةٍ وَ يَتَكَرَرُ، وَضاعَفَ فيهِ مَواهِبَ الإنعامِ عَلى العالَمينَ.

أحمَدُهُ وَ أشكُرُهُ . جَمَّلَ العيدَ بالسُّرُورِ. وَأوجَبَ فِطرَهُ وَحَرَّمَ فيهِ الصِّيامَ .

أستَغفِرُهُ وَأشهَدُ أنَّ لا إلهَ إلاّ اللهُ وَسَّعَ مَوائِدَ الرِّضوانِ عَلى مَن شَرَحَ صَدرَهُ بالأسلامِ، وَاَشهَدُ أنَّ سيِّدَنا مُحَمَّداً رَسُولَ اللهِ سَيِّدُ الأنامِ وَ مِصباحُ الظَّلامِ، اللهُمَّ صَلِّ وَ سَلِّم عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَأصحابِهِ وَمَن تَبِعَهُم بِأحسانٍ إلى يَومِ الدِّين.

أمّا بَعدُ فَيا عِبادَالله، أُوصيكُم وَنَفسِيَ أوَّلاً بِتَقَوى اللهِ وَ طاعَتِه.

يا مَعشَرَ مَن كُنتُم بالأمسِ صائِمينَ قائمينَ، لَقَد مَضى عَلَيكُم شَهرٌ وَأَنتُم في جِهادٍ كَريم، وَطاعَةٍ مُستَمِرَّةٍ لِلّه عَزَّوَجَلَّ، تُجاهِدونَ شَهَواتِ بُطُونِكُم وَفُروجِكُم، وَتُصبِرونَ احتِساباً لِرَبِّكُم عَلى الحِرمانِ المُؤَقَّتِ مِنها، لَقَد صُمتُم رَمَضانَ إيماناً وَإحتِساباً، وَصَلَّيتُم لِلّهِ قانِتينَ، وعَبَدتُمُوهُ خاشِعينَ، وتَقَرَّبتُم إلَيهِ بِكَثرَةِ تِلاوَةِ القُرآنِ

وَالذِّكرِ وَالدُّعاءِ وَالإستغفارِ، وأكثَرتُم مِنَ البَذلِ والإعطاءِ وَالإحسانِ، وَأخرَجتُم زَكاةَ فِطرِكُم لِلمُستَحِقِّينَ. وقَد جَعَلَها اللهُ طُهرَةً لِلصائِمِ مِنَ اللَّغوِ وَالرَفَثِ وطُعمَةً لِلمساكينِ.

فَأنتُم اليَومَ – إن شاءَالله – نُفُسوكُم مُزكاةٌ. وَأرواحُكُم طاهِرَةٌ، وَقُلُوبُكُم صافيَةٌ، سَليمَةٌ مِنَ الأكدارِ، عامِرَةٌ بالإيمانِ، وَأبدانُكُم في صِحَّةٍ وَعافيَةٍ.

فَهَنيئاً لَكُم يا عِبادَالله بِهذا التَّوفيقِ الَّذي لَم يُكتَب لِغَيرِكُم مِنَ الأُمَمِ. وَأعادَ اللهُ عَلَينا وَعَلَيكُم – مَعشَرَ الحاضِرينَ، وَعَلى جَميعِ المُسلِمينَ أمثالَ شَهرِ رَمَضانَ مُوَّفقِينَ مَقبولينَ، وَأعانَ الجَميعَ عَلى طاعَتِه ولِما يُحِبُّهُ وَ يَرضاهُ. إنَّهُ تَعالى سَميعٌ مُجيبٌ.

وَأسألَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ، أن يُعيدَهُ عَلى المُسلِمينَ، وَهُم أقوى تَمَّسُكاً بِدينِهِم. وَأوفَرَ عِزَّةً بِكَرامَتِهِم.

وَاجعَلُوا هذا اليَومَ وَسائِرَ أيامِكُم، أيّامَ طاعَةٍ وَعِبادَةٍ، وَذِكرٍ وَشُكرٍ، وَبِرٍ وَإحسانٍ، وَفَرَحٍ وَابتِهاجٍ، وَتَزاوُرٍ وَتَوائُدٍ، وَمَحَّبَةٍ وَصَفاءٍ.

أشعِروا فيها أهلكُم وَأبنائِكُم وَجيرانَكُم وَفُقَراءكُم، بالهَناءَةِ وَالسُّرورِ وَتَصافَحوا وَتَسامَحوا، وَتآزَرُوا وَتَضامَنوا، وَتَحابَبوا وَتَكاتَفُوا وَتَعاوَنوا عَلى البِرِّ وَالتَّقوى ﴿وَ سارِعوا إلى مَغفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَ جَنَّةٍ عَرضُها السَّماواتِ وَ الأرضُ أُعِدَّتْ لِلمُتَّقينَ. الَّذينَ يُنفِقونَ

في السَّراءِ وَ الضَّراءِ وَ الكاظمينَ الغَيظَ وَ العــافينَ عَــنِ النّــاسِ وَاللهُ يُحِــبُّ المُحسنينَ﴾.

أَقُول قَولي هذا وَأَستَغفِروا اللهَ العَظيمَ لي ولَكُم...

# ووتاری عەرەبی بۆ جەژنی ڕەمەزان

# ووتاری دووەم

## اللهُ أَكبَر – سَبعاً –

الحَمدُ لِلّهِ الَّذي مَدَّ لَنا مَوائدَ إحسانِهِ وَإنعامِهِ، وَأَعادَ عَلَينا في هذا اليَومِ عَوائدَ بِرِّهِ وَإكرامِهِ، وَخَصَّنا بِضيافَةِ عيدِ السُّرُورِ عَلى تَعاقُبِ أيّامِهِ، وَجَعَلنا مِن أُمَّةِ سَيِّدِ المُرسَلينَ المُشَفَّعِ يَومَ المَحشرِ.

أحمَدُهُ وَأَشكُرُهُ عَلى ما أَولى مِن جَزيلِ النِّعمِ وَأَستَغفِرُهُ، وَأَشـــهَدُ أَن لا إلهَ إلاّ اللهُ عَظيمُ الإفضالِ وَالكَرَمِ، وَأَشهَدُ أَنَّ سَيِّدَنا مُحَمَّداً رَسُولَ اللهِ سَيِّدُ العَرَبِ وَالعَجَمِ، اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّــدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ ما هَلَّلَ مُهَلِّلٌ وَكَبَّرَ.

أَمّا بَعدُ: فَيا عِبادَ اللهِ، اتَّقوا اللهَ رَبَّكُم، وَتَعاوَنوا عَلى ما فيهِ خَيرٌ لَكُم، وَنَفعٌ وَسَعادَةٌ لأوطانِكُم، وَحافِظُوا عَلى آدابِ دينِكُم، وَراقِبــوا اللهَ في أَولادِكُم وَنِسائِكُم، وَأَحسِنوا إلى نِسائِكُم. فَقَد كانَ النَبــيُّ ﷺ يُوصي بِالنِّساءِ خَيراً، وَيَأمُرُ الرِّجالَ أَن يُعاشِرُوهُنَّ بـــالمَعرُوفِ، وَعَلَيكُم بِبِرِّ الوالِدَينِ، وَالإحسانِ إلَيهِما. وَعَلَيكُم بِأَصلاحِ ذاتِ بَيــنِكُم وَصِلَةَ أَرحامِكُم وَبِأَطعامِ الطَّعامِ، وَإفشاءِ السَّلامِ، وَالتَمَسُّكِ بِمَبــادئِ الدِّينِ القَيومِ، وَالتَّخَلُّقِ بِأخلاقِ القُرآنِ العَظيمِ، وَالأهتِداءِ بِسُنَّةِ النَبــيِّ الرَّحيمِ، عَلَيهِ أَفضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَسليمِ.

ألا وَصَلُّوا وَسَلِّموا عَلى مَن أُمِـرتُم بالـصَّلاةِ وَالـسَّلام عَلَيـه عُمُوماً، بِقَولِه تَعالى – وَلَم يَزَل قائلاً عَليماً – تَنبيهاً لَكُم وَتَعظيمـاً ﴿إنَّ اللهَ وَ مَلائكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلى النَبيِّ ، يأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيه وَ سَـلِّمُوا تَسليماً﴾ فَأكثِرُوا مِنَ الصَّلاةِ عَلَيهِ تَكُونُوا مِنَ الفائزِينَ يَومَ المَحشَرِ، أللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمَ عَلَيهِ، وَارضَ عَنِ الخُلَفاء الأربعة، وبَقيَّةِ العَـشَرَةَ الكِرامِ وَأزواجِ نَبيِّكَ المُصطَفَى، وَعَن عَلي حَبيبِـك وَسِـبطَيهِ ذَوي الإخلاصِ وَالصَّفا. وَعَنِ الأنصارِ وَالمُهاجرينَ وَالتّـابعينَ لَهُـم بأحسانٍ إلى يَومِ المُستَقَرِّ.

أللّهُمَّ اغفِر لِلمُؤمنينَ وَالمُؤمِناتِ، وَالمُسلِمينَ وَالمُسلماتِ، الأحياء مِنهُم وَالأمواتِ، اللّهُمَّ انصُرِ الإسلامَ وَالمُسلِمينَ، وَأعلِ كَلِمَـةَ الحَقِّ وَالعَدلِ وَالدِّين، وَاجمَع بَينَ قُلُوب المُـسلِمينَ عَلـى المَحَبَّـةِ، وَاحفَظ عَلى أوطانِهم وَشُعُوبِهِمُ الأمنَ وَالأمانَ، وَادرَأ عَنهُم بِحَولِكَ وَقُوَتِكَ عَوادِيَ السُّوءِ وَالخُسرانِ.

اللّهُمَّ أنتَ رَجاؤُنا إذا انقَطَعَتِ الأسـبابُ، وَفَرَجُنـا إذا غُلِّقَـتِ الأبوابُ، وَمِنكَ نَطلُبُ جَزيلَ الأجرِ وَالثَوابِ، فَعامِلنا بِعَفوِكَ يا حاكِمَ الحُكّامِ، وَأحسِنْ لَنا الخِتامَ، وَخَلِّصنا مِن مَظالِمِ الأنامِ يَومَ لا يُرجَـى فيهِ سَواكَ يا عَلّام.

أللّهُمَّ اجعلنا منَ اللّـــذينَ ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَـٰرُ فِى جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ۝٩ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَـٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَـٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ۝١٠﴾ يونس: ٩ – ١٠

الحَمدُ لله رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ أجمَعينَ:

**ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: لەگەڵ هەزاران سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار کە هیدایەتی داین وپشتیوانی کردین کە بە خزمەت مانگی پیرۆزی ڕەمەزان گەیشتین و دڵمان شادو چاومان گەش بویەوە بەو نوێژو ڕۆژو کۆڕی ئامۆژگاری و قورئان خوێندن و تەراویح وشەونوێژو زەکات و صەدەقە بەخشینەی کە ئەنجاممانندا ، خوای گەورە بە لوتفی خۆی لێمان قبوڵ بکات و لە کەموکوڕییەکانمان ببورێت.**

**بەڕاستی مانگی ڕەمەزان خێرو بەرەکەتێکی گەورە بوو، بۆیە بە پێویستی دەزانم هەروەکو چۆن لە سەرەتای هاتنی دا بەگەرمی بەرەو پیری چووین و بەخێرهاتنمان کرد، لە دوای ڕۆیشتنیشی چەند ووشەیەکی ناسک بڵێین بۆ ماڵئاوایی لیێ کردنی ئەو میوانە ئازیزو دڵسۆزە، ئەو وێستگەی پاککردنەوەمان لە گوناه وژەنگ وژاری تاوان بەهیوای دیدارو بەخزمەت گەیشتنەوەی دەڵێین:**

**وا میوانی خۆشەویستمان لای خوا کاتی بڕایەوە، وا خۆی پێچایەوە، مانگی ڕەحمەت جاریێ زوو بوو، هێشتا لە دیدار تێر نەبووین...، ئێمە شاگردو تۆ وەستا، قوربان هێشتا باش فێر نەبووین، میوانی خوای میهرەبان بووی، زۆر ئازیز بووی، مُتَواضع و بیێ فیز بووی، بویتە میوانی گشت ماڵە موسوڵمانیێ، نەت ئەپرسی ماڵی پاشاو گەدا کوانیێ، چویتە سەر گشت سفرەو خوانیێ....**

ئەی ڕەمەزان: بۆ ئۆغری پڕ لە خێرت، ئێمە هەموو دەستەو نەزەر، لە مەراسیمی ( ویداع) دا ڕاوەستاوین، دڵمان گەورەو هەموو مات ومەلول ماوین، ئاخر قوربان، تۆ میوانی خوای باری بووی، دەرفەتی تەوبەکاری بووی، چەندین ئافرەت بە کاڵای سوورەتی نوری شەوی قەدرت سەرو گەردنیان داپۆشی، گوناهـ بارانن لە جیاتی مێزی قومارو پێکی ئارەق شەرابی تەوبەیان نۆشی...

ئەی مانگی شادی گشت مانگەکان، مانگی ڕۆژو تەراویح ونووری قورئان، لە دیداری شەوی ( قەدرت )دا خەومان لە چاوانمان تۆران...

ئەی ڕەمەزان تۆ خۆشەویستی ئێمە بووی، نەك هەر ئێمە لە مزگەوتا، هەتا دایە پیرەی ماڵان، هەتا مناڵانی کۆڵان، ڕێزیان لێ نای، چۆن دڵت دێ جێمان بێڵی، گریانمان دێ، بۆ سەڵای پارشێوانی تۆ، بۆ تریفەی مانگە شەوی شەوانی تۆ، بۆ زایەڵەی مەرحەبای بەخێرهاتن و ویداعی گشت یارانی تۆ، گریانمان دێ بۆ ئاوازی گەرمی فەجری کۆڕی قورئان خوێنانی تۆ، لە بۆ سەدای وتاری دەم عەسرانی تۆ، بۆ سروودی مەلەکوتی دەنگی بانگی شێوانی تۆ، کە هەموومان لەسەر بەرماڵ چاوەڕێ بووین، بانگ ببێ وڕۆژوو بشکێنین، نەفس و شەیتان ببەزێنین تا لەو ساتە ناسکەدا دەستمان بەرز بکەینەوە، بە کزۆڵی لە خوای گەورە بپاڕێینەوە، تا لەبەر لێزمە بارانی ڕەحمەتی خوای میهرەبان بژێینەوە...

ئەی ڕەمەزان: ئەی گوڵزاری ڕێزو قەدر، مانگی غەزای گەورەی بەدر، ئێمە کراسی چڵکن و تۆ سابوون و ئاوی گەرم، ئێمە هەموو

دەردەدارو تۆ دکتۆرێکی حەکیم وزۆر دڵنەرم، تۆ یەك دانە مانگی ڕەبەق لە چارەسازی نەسرەوتی، لە بەردەرگای مانگی شەعبان چاوەڕێت بووین تا دەرکەوتی، هەراسان بۆین بەدەست نەفس وشەیتانەوە، تا هاتی فریامان کەوتی... تۆ ژورێکی ئینعاش بویت ودڵانت زیندوو کردەوە، تۆ سیرەتی ژیانمانت لە ڕەشییەتی خەتاباری و نالەباری پاك کردەوە...

ئەی قوتابخانەی خواناسی، برسییەتی ڕووحت شکاندین، تێرت کردین، دەستت گرتین، فێرت کردین، بە ڕۆژووی ڕۆژووەکانی خۆت وەکو فریشتەت لێ کردین، بە تەراویح فێری تام ومانای بەندایەتیت کردین...

فەرمووت پێمان: ئەی سەوزەگیا بەهارییەکان، دنیا باڵی مێشێ ناژی، بۆ بەهەشت تامەزرۆت کردین...

دەسا خوایا، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانمان، شەفاعەت خوازی مەحشەر بێ، داوای ئیستیقامەت دەکەین، خواناسیمان هەتا سەر بێ، تینوێتیمان لەم مانگەدا زەمانەتی نۆشینی ئاوی کەوسەر بێ، تەراویحی سوننەتی شەوەکانیشی مایەی زەردەخەنەی دەمی پێغەمبەر بێ، بە بێداری شەوانی ( قەدر ) قەبرمان پێی منەوەر بێ، بە خوا حافیزی لەم مانگی ڕەمەزانە، خوای میهرەبان تۆش گەردنمان لە جەهەننەم ئازاد بکەو بەشمان بەهەشتی پڕبەر بێ...

خۆشەویستان: لە خواحافیزی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان و یەکەم ووتاری مانگی شەوالدا، ئەوە دەڵێم:

وا مـانگی ڕەمـەزان کۆتـایی هـات بـەڵام، با بـزانین ئایـا بـەر ئـەم هەڕەشـەیەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەکـەوین، یـان بـەر موژدەکـەی دەکەوین، کە لە پێچەوانەی ئەم فەرموودەوە دەخوێنرێتەوە.

(ئەبو هورەیرە) بۆمـان دەگێڕێتەوە کـە ڕۆژێکیـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ چـووە سـەر مینبـەرو لـە کـاتی سـەرکەوتندا لـە پلـەی یەکەمـدا فـەرمووی: ئـامین، دواتـر هـەنگاوی هـەڵهێناو لەسـەر پلـەی دووەمـی مینبەرەکـە فـەرمووی: ئـامین، پاشـان قاچـی موبـارەکی خـستە سـەر پلەی سێهەم و فەرمووی: ئامین. یەکێك لە هاوەڵان عـەرزی کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـشتر بـەم شـێوەیەت نـەکردووە، ئایـا دەکـرێ بۆمان باس بفەرمووی کە ئەم سێ جار ئامینـەت لەبەرچـی فـەرموو لـە کاتێکدا هیچ دووعایەك نەکراوەو ئامینیش بۆ دوعا دەکرێت؟!

پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ئـەوە جوبریـل بـوو ئێـستا لـە لام بوو، فەرمووی: ئەی محەمەد من سێ دوعا دەکەم و تۆش بڵێ ئامین:.

جـا ئیمانـداری بـەڕێز: زۆر بـە ئاگاییـەوە گـوێ بگـرەو بزانـە دووعایـەك ئـەمینی وەحـی و گـەورەی هـەموو فریـشتەکانی ئـەرزو ئاسمـان حـەزرەتی جوبریـل بیکـات و لـە بارەگـای خـوا بپاڕێتـەوەو سەردارو گەورەی هەموو پێغەمبەران ئامینی بۆ بکات، دەبێ چەند گرنگ بێ و چۆن هیچ گومانێك نییە لە گیرا بوونی دا.

دوعای یەکەم: جوبریـل فـەرمووی:( رَغِم أُنفُ مَن أدرَكَ رَمَضان فَلَم يُغفَر لَهُ).

خۆشەویستمان ﷺ فەرمووی: جوبریل لە خوا پاڕایەوەو فەرمووی: خوای گەورە لوتی بە خۆڵدا بچیٚ و لەناوچیٚ ئەو کەسەی کە دەگاتە مانگی پیرۆزی ڕەمەزان، بەڵام ئەوەندە بە جوانی پێشوازی لێناکات و ئەوەندە تەوبەو ئیستیغفاری تێدا ناکات، کە خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش بێت. ئەی محمد بڵیٚ ئامین، منیش وتم ئامین.

بەڵیٚ ڕەمەزان ( أوَّلُهُ رَحمَةٌ. وَأوسَطُهُ مَغفِرَةٌ وَآخِرُهُ عِتقٌ مِنَ النار).

سەرەتاکەی ڕەحمەتەو ناوەڕاستەکەی لێخۆش بوونەو کۆتاییەکەشی ئازاد بوونە لە ئاگر. جا هەرکەسێك لەم سیٚ وێستگەیەدا خۆی پاك نەکاتەوە، شایانی ئەوەیە مەینەتی بەشی بێت، وە مەفهومی موخالەفەی ئەم دووعایەی جوبریل ئەوەیە: خوایا گیان هەرکەسێك حورمەتی ئەم مانگە پیرۆزەی گرت و بەجوانی لە خزمەتیدا بوو، خوایا لێی خۆش بەو لە ئاگری دۆزەخ بیپارێزە، ئومێدەوارم ئێمەی دانیشتوانی ئەم مزگەوتەو هەموو ئەهلی ئیمان، بەر لێخۆش بوونی خوای گەورە بکەوین لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا.

دوعای دووەمی جوبریل: فەرمووی:( رَغِمَ أنفُ مَن أدرَكَ والِدَيهِ أو أحَدَهما فَلَم يدخل بِهِما الجَنَّة، قُل: آمين. فَقُلتُ : آمين).

لوتی بچێت بە خۆڵداو بەش مەینەت بێت ئەو کەسەی کە دایك وباوکی یان یەکێکیان بە پیری بکەونە لای و ئەوەندە خزمەتیان نەکات و ئەوەندە دڵیان ڕازی نەکات کە بڵێن: یاخوا ڕۆڵە من چەندت لیٚ ڕازیم خوای گەورەش ئەوەندەت لیٚ ڕازی بێت، بەو ڕەزامەندی

دڵی دایك وباوكەی خوای گەورە بیباتە بەهەشتەوە، ئەی محمد بڵێ ئامین ، منیش وتم ئامین.

ئای دایك وباوك چ بەرەكەتێكی گەورەن، مرۆڤ نرخیان نازانێت تا ئەو كاتەی ئەمرن ئینجا پەنجەی پەشیمانی ئەگەزێ و دەڵێت خۆزگە باشتر لە خزمەتیاندا بوومایە.

بەڵێ دوعای جوبریل و ئامینی حەزرەتی محمد المصطفی ﷺ هیچ گومان نییە لە گیرا بونیداو هەركەسێك بۆ دایك وباوكی خراپ بێت خۆشی لە ژیانی خۆی نابینێت، دونیا پڕە لە هەزاران نموونەی واقیعی.

ووتار بێژی دڵێرو بوێرو حەق گۆ، خوالێخۆشبوو، شێخ عبدالحمید كشك، دەفەرمووێ: كوڕێكی دەوڵەمەند دوای مردنی باوكی، دایكی دەكەوێتە لایی و لە ماڵی كوڕەكەی دا دەمێنێتەوە، بەڵێ پاش ماوەیەك ئەم كوڕە دەوڵەمەندە كە خاوەنی ژن ومناڵ بوو، دایكی توشی نەخۆشی ناو مێشك بوو، وورده وورده هۆش وعەقڵی لە دەستداو شێت بوو، ئیتر ژنی كوڕەكە كەوتە پرتەو بۆڵەو ناڕەزایی دەربڕین بە هۆی مانەوەی ئەم دایكەوە لەم ماڵەدا، تا سەرەنجام ڕۆژێكیان بە مێردەكەی ووت: كۆتا بڕیاری خۆم داوە، یان من لەم ماڵەدا دەچمە دەرەوەو دەبێ تەڵاقم بدەی، یاخوود دەبێت دایكت لەم ماڵە ببەیتە دەرەوە، ئیتر بۆ كوێی دەبەی ئەوەیان خۆت دەزانی.

سەرەتا كوڕەكە ووتی: ئاخر دایكم بەم حاڵەتەوە كە عەقڵ وژیری لە دەست داوە لە كوێ دەحەوێتەوە، پاشان خۆ غەیری من ئەولادێكی

نییە، ئافرەت واز لەم داوایە بێنە! بەڵام ژنەکەی نەی بیست و ووتی: هەر ئەوەیە کە پێم ووتی، یان من یان دایکت.

بەڵێ کوڕەی لاواز ئیمان، لاواز کەسایەتی، بێ وەفاو سپڵە، بڕیاری دا کە ژنەکەی هەڵبژێرێ و دایکی لە ماڵ بباتە دەرەوە! بەڵام هەرچەندە بیری کردەوەو سەری هێناو برد هیچ شوێنێکی شك نەبرد کە دایکی بۆ بەرێت، چونکە ئەم کوڕیەتی و مەعقول نییە کوڕ دایکی خۆی بەخێو نەکات و بیبات بۆ ماڵ خزمان! پاشانیش دایکی عەقڵی لەدەست دابوو تاوەکو بیبات بۆ خانەی بە ساڵا چووان، کە ئەمەش ئەگەر بشبوایە دەبووە هۆی شکستی و ئابڕووچوونی، خەڵکی دەیان ووت، فڵان کەس بەو هەموو دەوڵەمەندییەوە دایکی پێ بەخێو نەکرا.

ئاخیری شەیتان و نەفسی خراپەکار نەخشەیان بۆ کێشاو ئەمیش زۆر بە دڵخۆشییەوە قبوڵی کردو وای زانی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوەو لە بەڵایەکی گەورە ڕزگاری بووە، کاتێك لە دەست ئەم دایکە پیرەی کە بووەتە مایەی ئاژاوەی ماڵی و دڵڕەنجانی خانمی ژنی ڕزگاری دەبێت، بیرەکەشی ئەوە بوو: کە لە شەوێکی ساردو سەرماو بەستەڵەکدا دەست وقاچی دایکی لە خەودا ببەستێ و دەمی ببەستێ و پاشان بەهۆی لاوازی وبچووك بوونەوەی دایکییەوە دەتوانێ بیکاتە کۆڵ وبیباتە سەر بانی خانووە بەرزەکەیان و لەوێوە فڕێی بداتە ناو حەوشەکەوە کە لەسەر سەرو بەم شێوەیە سەری دەتەقێ و دەمرێ و پاشان دێتە خوارەوەو دەست و قاچ ودەمی دەکاتەوەو دەڕواتە ژوورەوە بۆ لای ژنەکەی و منداڵەکانی و

لێی دەخەوێتەوە وەکو ئەوەی کە هیچ ڕووی نەدابێ!! بەڵێ ئەمەی باسمان کردو لە خەیاڵی دا بوو، ڕێك وپێك بە کردەوە جێبەجێ ی کردو دایکە هەرکە سەری بەر زەوییەکە کەوت، مێشکی تەقی وکەوتە پەلەقاژەی ڕوح دەرچون و بەدەم ئازارەوە بەرەبەیان لەسەر ئەو سەهۆڵ و شەختەی ناو حەوشەکەیان گیانی لەدەستدا!!.

بەیانی کوڕەو ژنەکەی درەنگانێك وەکو ئەوەی ئاگایان لە هیچ نەبێت، دەرگایان کردەوەو ئیتر دەستیان کرد بە هاتووهاوارو دراوسێ لێیان کۆبویەوەو چی بووە چی نەبووە؟ کوڕەو ژنەکەی وتیان: نازانین بەس ئەوەتا وا دایکم مردووەو ئەمشەو هەموومان خەوتبووین و ئەویش خەوتبوو، ئیتر کە بەیانی هەڵساین لەناو جێگەکەی دا نەمابوو، کە هاتینە دەرەوە لێرەدا کەوتووەو مردووەو دیارە شوێن پێی دیارە کە چووەتە سەربان و چونکە عەقڵی لەدەستداوە خۆی فڕێ داوەتە خوارەوەو سەری تەقیوەو مردووە، خەڵکەکە هەموو بڕوایان بەم جۆری مردنە کردو ناشتیان و پرسە دانراو پاشان لە بیر چویەوە، ! بەڵام ئەی خوای گەورە، ئایا فێڵ لە خوا دەکرێت !؟ نەخێر، گوێ بگرن ولە گەڵما بن بزانین سەرەنجامی ئەم کوڕە سپڵە لاسارە بێ ویژدانە هەست ونەست مردووە دەبێت بەچی، ئایا نابێت دوعاکەی جوبریل و ئامینەکەی ڕەسولی نازداری لێ گیرا بێت؟ ئایا نابێت لوتی بچێت بە زەوی داو ڕیسوا بێت؟ بەبێ گومان ودوودڵی بەڵێ، هەر بۆیە دوای نزیکەی بیست ساڵ ئەم کوڕە لاسارە توشی هەمان نەخۆشی دایکی بوو، عەقڵی لە دەستدا،

ژنەکـەی ومناڵـەکانی لێـی بێـزار بـوون، بەهـەمان شـێوەی دایکـی شـەوێکی زۆر سـاردوو سـەرما بـوو، ژنەکـە مێـردە شـێتەکەی کـردە ئـەودیو دەرگـاو دەرگـای لەسـەر داخـست، پیاوەکـە بـە قادرمەکانـدا چووە سەربان، بەڵام ئەم بە پێی خۆی هـەر بەو شوێنەدا کە دایکی پێدا بردە سەرەوە، چووە سەربان و لە هەمان شوێنەوە خۆی فڕێ دایە خوارەوەو سەری کەوتە هەمان شوێنی دایکی و دەست بەجێ گیانی لە دەستدا.! ( الجَزاءُ مِن جِنسِ العَمَــلِ) چی بچێنیت ئەوە ئەدوریتەوە.!

دوعای سێهەمی جوبریل کە حەزرەتی ( رَســولَ الله ﷺ ) ئامینی بۆ کرد، ئەوە بوو کە فەرمووی: ( رغم أنف مَن ذكِرتَ عِندَهُ ولَم يُصلِّ عَلَيكَ، قُل: آمين، فَقُلتُ: آمين).

جوبریل فەرمووی: لوتی ئەو کەسە ڕەق بێ و بچێت بەناو خۆڵدا کە ناوی تۆ دەبیستێ و صەڵاواتت لەسەر نادات، ئەی محمد بڵێ ئامین، منیش وتم ئامین.

ئەم فەرموودەیە: حديثٌ صَحيحٌ : اخرَجَهُ الترمذي ( ٣٥٤٥) ، وَاحْمَد ( ٢٥٤/٢)، وَالبُخاري ( ٦٤٦) في الادبِ المُفرَد مُختَصرا.

بـەڵێ هەرکەسێك صەڵاوات لە پێغەمبەری خۆشەویست نـەدات، بەدبەختەو چارە ڕەشەو بەپێچەوانەشەوە هەرکەسێ زۆر صەڵاواتی لەسەر لێ بدات، بەختەوەرو سەر فرازە.

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ چۆن صڵاواتت لەسەر لێ نادەین و بە قوربانت نابین، لە کاتێکدا دڵسۆزترین کەسی بۆ ئوممەتەکەت، بە تایبەتی بۆ هەژاران.

لە فەرموودەیەکی شیرین وپڕمانادا کە پێشەوا ( مسلم: ٢٠٥٥) وە ( احمد ٢/٦، ٣) وە ( ترمذی ٢٧١٩) لە هاوەڵی بەڕێز ( میقدادی کوڕی ئەسوەد) ەوە ڕەزای خوای لێ بێت، دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: من و دوو هاوڕێم لە برسان چاومان کزو گوێمان گران بوو بوو، داوای هاوکاریمان لە صەحابەکان کرد کە هەندێك خۆراکمان بدەنێ، بەڵام ئەوانیش هەروەکو ئێمە هەژارو نەدار بوون، بۆیە کەسمان دەست نەکەوت کە هاوکاریمان بکات و شتێکمان بداتێ بیخۆین، بۆیە چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باسمان کرد کە برسییەتی کاری کردووەتە سەر بینینی چاوەکانمان و بیستنی گوێکانمان و حاڵمان خراپە، بەڵکو شتێکمان پێ ببەخشێ، ئەویش فەرمووی لێکردین بۆ ماڵی خۆیان و کە چوینە ماڵی پێغەمبەر ﷺ سێ بزنی لێ بوو کە گوانیان پڕ لە شیر بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی میقداد هەرسێ بزنەکە بدۆشەو شیرەکەیان بکە بە چوار بەشەوە منیش وەکو ئێوە برسیمە، میقداد دەفەرموێ: لە خۆشییاندا هەر خێرا هەرسێ بزنەکەم دۆشی و شیرەکەم لە مەنجەڵێك کردوو پاشان چوار پەرداخم هێناو بە یەکسانی کردمە ناویانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پەرداخێك و من پەرداخێك و دوو هاوەڵەکەی تریش یەکی پەرداخێك، من و دوو هاوەڵەکەم بەشە شیری

خۆمان خواردەوەو بە تەواوەتی تێرمان خواردەوەو ئاسوودەییەك بە هەناوماندا هات، ئای چەند خۆشە دوای برسییەتیەکی زۆر ئاوا تێر شیر بخۆیتەوە! لەو کاتەدا کەسێك هات بە شوێن پێغەمبەری خوادا ﷺو بانگی کرد بۆ کارێکی پێویست، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فریا نەکەوت بەشە شیرەکەی خۆی بخواتەوە، بەڵێ شەو بەشێکی ڕۆیشت و پێغەمبەری خوا هەر نەهاتەوە لە دڵی خۆمدا ووتم: بەخوا دیارە پێغەمبەری خوا لە ماڵێك لای داوەو ئێستا تێری خواردووە، بێشتەوە بۆ ماڵەوە پێویستی بەو شیرە نییە، بۆیە هەستام بەشە شیرەکەی ئەویشم خواردەوە، بەڵێ هەر ئەوەندەی لە خواردنەوەی شیرەکە بومەوە، ئیتر شەیتان دەستی کرد بە دڵەڕاوکێ بۆم و پێی دەوتم: (وَيحَكَ ما صنَعتَ؟! أشَرِبتَ شَرابَ مُحَمَّدٍ فَيجِئُ فَلا يَجِدهُ فَيَدعُو عَلَيكَ فَتَهلكَ فَتَذهَب دُنياكَ وَآخِرَتَكَ).

شەیتان لۆمەی دەکردم و پێی دەوتم: ئای چیت کرد، ئایا بەشە شیرەکەی محمدت خواردەوە؟ ئێستا دێتەوەو زۆری برسییەو بەتەمای ئەو بەشە شیرەیەتی، بەڵام کە زانی بەشەکەی خوراوەتەوە ئیتر بە هیلاك دەچی ، چونکە دوعات لێ دەکات بەم شێوەیە ماڵ وێرانی دونیاو قیامەت دەبیت...

بەڵێ ئیمانداران: شەیتان ئاوایە، گوناهەکەت پێ دەکات، پاشان خەفەتیشت دەداتێ کە گوناهەکەت کردووە، وە لە قیامەتا دەڵێ:

﴿ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم﴾ ئـەی گوناهبـاران لۆمـەی مـە

مەکەن ، لۆمەی خۆتان بکەن کە بەقسەتان کردم.

بەڵێ هـاوەڵی بەڕێز بەردەوامـە لەسـەر گێڕانـەوەی بەسـەرهاتەکە دەفەرموێت: هەردوو هاوڕێکەم خەوتن، بەڵام من لـە داخـان نەخـەوت جل وبەرگەکەم ئەوەندە کۆن بوو، ئەوەنـدە کورت بوبویـەوە لـە دڕاو و پینـە کـردن، ئەگـەر سـەری خـۆمم پـێ دادەپۆشـی ئـەوا تـا ئـەژنۆ دەردەکەوت، ئەگەر قاچم پێ دادەپۆشی ئەوا سـەرم دەردەکـەوت، ب خـەم وخەفەتـەوە دانیـشتبووم، کـاتێکم زانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتەوەو چووە لای پەرداخە شیرەکەیەوە، بەڵام تەماشای کرد شیر تێـدا نـەماوەو خوراوەتـەوە، بۆیـە هـەردوو دەسـتی موبـارەکی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، لە دڵی خۆمدا ووتم ئەی هاوار بەماڵم، بەخو ئێستا دوعام لێدەکات و بەهیلاك دەچم، بەڵام: نا، ئەوە پێغەمبـەری ڕەحمەتـە ووشـەی زەحمـەت بـە دەمـی پیرۆزیـدا نایـەت، میقـدا فەرمووی: گویم شل کرد تا بزانم لە دوعاکەیدا چی دەفەرموێت: گوێ لێ بوو فەرمووی:( أَللّهُمَّ أَطعِم مَن أَطعَمَني، وَاسقِ مَن سَقَاني).

خوای گەورە خۆراك بدەیتە ئەو کەسەی کە خۆراکم دەداتێ و ئە کەسەش تێراو بکەی کە من تێراو دەکات.

میقداد فەرمووی: کە گوێم لەم دوعایە بوو، ئەم هەڵـەم قۆسـتەوە لە جێگاکەم هاتمە دەرەوەو ڕام کرد چەقۆم برد یەکێ لـەو سـێ بزن کامیان زۆر قەڵەوە سەری ببڕم و پێغەمبەری خوای ﷺ پـێ تێـر بکـە

هەرچەندە هی خۆم نەبوون بەڵام ووتم با ئەو دوعایەی پێغەمبەری خوام لەدەست نەچێت، دواتر هەرچۆن بووە نرخی بزنەکە هەر پەیدا دەکەم، بەڵام (سبحان الله) کە چووم چی ببینم وا گوانیان خەریکە لە شیردا دەتەقێت! بیرم کردەوە باشە حەیوان ئێوارە بدۆشرێ چۆن بەو خێراییە گوانی پڕ دەبێتەوە لە شیر؟ میقداد فەرمووی: تەماشام کرد مەنجەڵێکی زۆر گەورە دیار بوو، کە لەبەر گەورەیی هەرگیز شیریان تیادا نەدۆشی بوو، ئەو مەنجەڵە گەورەیەم بردوو(فَحلبـتُ فِيهِ حَتَّى علتـه رغـوة) دەستم کرد بە دۆشینی هەتا کەف سەر مەنجەڵەکە کەوت، بەڵێ ئەو مەنجەڵە گەورە پڕ لە شیرەم بردە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:( أشَـربتُم شَـرابَكُم اللَّيلَـةَ؟!) ئایا شیرەکەی ئێوارەتان خواردەوە؟ میقداد دەفەرموێ: خۆم لە وەڵامەکەی دزییەوە، وتم ( إشرَب يا رَسُـولُ الله) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شیرەکەت بخۆرەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردییەوە، سێ جار وتم قوربان ئەم جارەش بخۆرەوە ئەم جارەش بخۆرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جارەکە خواردییەوە، هەتا تێری خواردەوە، ئیتر کە زانیم دوعاکەیم مسۆگەر کرد، ( ضَـحِكتُ حَتَّـى أُلقِيتُ إلى الأرضِ مِنَ الضَحِكِ ).

لە خۆشیا دەستم کرد بە پێکەنین هەتا ئەوەندە پێ کەنیم بە پشتا کەوتمە سەر زەوی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:( إحدى سَوْاتِكَ يا مِقداد) ئەمەش یەکێك لە گاڵتەو گەپ و بەزمەکانتە ئەی میقداد، ئەم

پێکەنینەت بیٚ هۆ نییە، چیت کردووە بۆم بگێڕەوە، منیش چی ڕووی دابوو بۆم گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( هــذه بَرَكَةٌ، مــا هــذه إلاّ رَحمَــةٌ مِــنَ الله ) فەرمووی: ئەمە بەرەکەتە، بەڕاستی پڕ بوونەوەی گوانی ئەو بزنە لەو هەموو شیرە زۆرە لە کاتێکدا کە ئێوارە دۆشراوە، غەیری ڕەحمەتی خوا نەبێت هیچی تر نییە، ( بەڵیٚ بەرەکەتەکەی دایە پاڵ خوای گەورە، نەیفەرموو ئەوە بەرەکەتی دوعای من بوو) پاشان فەرمووی: ( أَفَلا كُنت آذَنتَني فَنُوقِظُ صاحِبَينا فَيُــصِيبانِ مِنهــا) ئەی باشە بۆچی ئەو دوو هاوەڵەشمان خەبەر نەکردەوە تا ئەوانیش لەوەی ئێمە خواردمانەوە بخۆنەوە، میقداد دەفەرمویٚ ووتم: سوێند بەو خوایەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەری حەق وڕاست، گوێم بەوە نەداوە کیٚ لێی خواردووەتەوەو کیٚ لێی نەخواردووەتەوە، دوای ئەوەی دوعای تۆم مسۆگەر کردو لەو بەرەکەتە بەر منیش کەوت، واتە: لە خۆشییان لە بیرم چوو هەڵیان سێنم. !

بەڵیٚ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن غەیری تۆ بە چاوساغ بزانین لە کاتێکدا کە پەروەردەی ئیسلامەکەت ( عومەری کوڕی خطاب ) ی بۆ دروست کردوین، مێژووی پرشنگداری ئیسلام بۆی تۆمارکردووین کە لەو کاتەدا کە خەلیفە عومەر تەرخانی کردبوو بۆ گەڕان بە ناو هاوڵاتییان داو ئاگادار بوون لە حاڵ ووەزعی میللەت، چووە لای ماڵی پیرەژنێکی بیٚ کەس وکار، حەزرەتی عومەر چووە لایی وسەلامی لیٚ کردوو هەواڵی گوزەران وژیانی لیٚ پرسی،

پیرەژنەکــە باســی کــرد کــە ژیــانی خــۆش نییــەو گــەلێك لــە پێداویستییەکانی ژیانی بۆ جێبەجێ نەبووە، پیرەژنەکە نەیدەزانی ئەو کەسەی کە قسەی لەگەڵ دەکات حەزرەتی عومەرە، بۆیە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە حەزرەتی عومەر لێی پرسی، ئایا عومەر هیچی بۆ نەکردووی؟ پیرەژنەکە وتی: خوا حەقی منی لێ بسێنێ، حەزرەتی عومەر فەرمووی: بۆ؟ وتی لەو کاتەوەی بووە بە خەلیفەو کاربەدەستی موسوڵمانان سوودی تاڵێك پوشی بۆ من نەبووە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: جا پوورێ گیان عومەر کوا ئاگای لەم حاڵ وگوزەرانەی تۆ هەیە! پیرە ژنەکە وتی: ( سبحان الله ) سوێند بە خوا نەمزانیوە کەسێك هەبێت ببێتە سەرکردەی خەڵك و ئاگاداری حاڵ و وەزعی ئەندامانی جەماوەرەکەی نەبێت، چۆن شتی وا دەبێت؟! ئیتر ئیمامی عومەر بۆ حاڵی خۆی دەست دەکات بە گریان و دەڵێت: قوڕ بەسەرت عومەر هەموو کەس لە تۆ شارەزا ترە، تەنانەت پیرە ژنەکانیش لە تۆ ئاگادارترن، ئەی قوڕ بەسەرت بۆ ڕۆژی دوایت، بۆ حاڵی قیامەتت! دواتر دەڵێت: نەنە گیان بە چەند ئەم مەزڵومیەتییەی خۆت دەفرۆشی و لە عومەر ڕازی دەبیت؟ چونکە عومەر بە هۆی ئەم کارەیەوەو بە هۆی ئەم بێئاگاییەی لە تۆو نموونەی وەکو تۆوە دەچێتە ناو ئاگرەوە، پیرەژنەکە دەڵێت: خوا لێت خۆش بێت بۆچی گاڵتەم پێ دەکەی؟ بڕۆ گاڵتەم پێ مەکە، ئیمامی عومەر فەرمووی: سوێند بەخوا گاڵتەت پێناکەم و من لە گاڵتە کەران نیم، ئیتر قەناعەت بە پیرە ژنەکە دەکات و زۆر لە گەڵی دەدوێت تا وای لێدەکات کە بە

( ٢٥ ) دیناری ئەو کاتە گەردنی عومەر ئازاد بکات و لە کاتی ئەم قسانەدا ئیمامی( عەلی کوڕی ئەبو تالیب ) و ( عبدالله ی کوڕی مەسعوود) پەیدا دەبن و دەگەنە لای حەزرەتی عومەرو دەڵێن: ( السَّلامُ عَلَيكَ يا أَميرَ المُؤمِنينَ) کە سڵاوی لێدەکەن پیرە ژنەکە بۆی دەردەکەوێ ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ کردووە ئیمامی عومەر بووە، بۆیە دەستی دەخاتە سەر سەری و دەڵێت: ئەی خاك بەسەرم ئەمە حەزرەتی عومەر خۆی بوو من لە ڕووی خۆی دا قسەم پێ ووت!! ئیتر هەم دەترسێ وهەم تەریق دەبێتەوەو شەرمەزار دەبێت، بەڵام ئیمامی عومەر پێی دەڵێت: گوێی مەدەرێ نەنە گیان حەقی خۆتە، پاشان ئیمامی عومەر داوای پارچە قوماشێك دەکات کە ڕێکەوتن نامەکەی نێوان خۆی و پیرەژنەکەی تێدا بنوسێتەوە، لەو کاتەدا کە دەستیان ناکەوێت، بۆیە دەست بەجێ حەزرەتی عومەر پارچەیەك لە کەواکەی خۆی دەدڕێ و لەسەری دەنوسێت: ﴿بِسمِ الله الرَّحمن الرَّحيم﴾ ئەمە ڕێکەوتن نامەی نێوان عومەرو فڵان کەسە، کە گەردنی عومەری ئازاد کردووە بە ( ٢٥) دیناروو لای خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا عومەر لە مەزلومییەتی ئەم ئافرەتە تەبەرییەو عەفو کراوە، بە شاهیدی ( عەلی کوڕی ئەبو تالیب ) و ( عبد الله ی کوڕی مسعوود )، ئیتر ئیمامی عومەر پارەکە بۆ پیرەژنەکە پەیدا دەکات و پارچە قوماشەکەشی کە ڕێکەوتن نامەکەی تێدا نوسراوە هەڵدەگرێ و دەیبات بۆ عبدالله ی کوڕی و دەڵێت: ڕۆڵە گیان ئەم ڕێکەوتن نامەیە

هەڵبگرەو هەرکاتێ مردم لەگەڵ کفنەکەمدا بیخەرە گۆڕەکەمەوە تا بۆ دیوانی خوا پێم بێت لە قیامەتدا!.

ئای قوڕ بەسەر سەرکردەو بەر پرسەکانی ئەم ڕۆژە کە نەك ماڵ و خوێنی خەڵك دەخۆن، نەك هەر لە ژیانی خەڵك ناپرسنەوەن بەڵکو گاڵتەیان دێت بە فەقیرو هەژاری وڵات، دەبێت چۆن گۆڕ لە خۆیان بگرێت؟! دەبێ لەسەر چی دادگایی بکرێن؟ لەسەر دزینی سەروەت و سامانی ئەم گەل ومیللەتە، لەسەر ناعەدالەتی، لەسەر بەرتیل و واسیطە کاری ؟ لەسەر دژایەتی ئیسلام ودین؟ لەسەر گەندەڵی؟ لەسەر نەپرسینەوە لە ژیانی خەڵك؟ بۆ کوێ دەچن؟ بەخوا هەر دەمرن، بەخوا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەکرێت،!

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی:( مَن وَلاَّه الله عزوجل شيئا من أمر المسلمين فاحتجب دون حاجتهم وخلتهم وفقرهم احتجب الله عنه دون حاجته وخلته وفقره) رَواهُ أبو داود .

واتە: هەرکەسێك خوای پەروەردگار سەرپەرشتی کاری مۆسولمانانی خستە دەست، بەڵام بە دەم پێویستیاتی خەڵك و هەژاری و نەدارییانەوە نەچوو، گیرو گرفتی چارەسەر نەکردن، ئەوا لە ڕۆژی دوایی دا خوای پەروەردگار چارەسەری گیروگرفت و پێویستییەکانی ناکات و بە دەنگییەوە ناچێت و ڕزگاری ناکات.

بەڵێ ئیمانداران: ئەم مانگی ڕەمەزانە هەموو ئێوارەیەك لە تەلەفزیۆنەکانەوە ماڵی کەسێکی لێقەوماوو نەدارو هەژار بەسەر دەکرایەوە، ئێمە دەست خۆشی لەو کارە دەکەین، بەڵام ئەوەندە

دەڵێین: کێ هەیە یەك تۆز ویژدانی هەبوبێ و ئێوارەیەك نەگریابێ بۆ ئەو هەموو داماوە، ئەو هەموو نەخۆشە، ( فَقرُ الـدَّم) لەگەڵ (فَقـرُ الجَیب) هەڵی تەکاندووە، هەموو ڕۆژێکی وشەوێکی بە مردنێکەو دەست کورتی وهەژاری و کزۆڵی وکلۆڵی ڕێگای نادات سەردانی دکتۆرێکی پسپۆرو شارەزا بکات و چارەسەری بۆ بکرێت، کێ هەیە فرمێسك بەچاویدا نەهاتبێتە خوارەوە کاتێك ئەو مندالە بێ باوکانە دەبینێت، کە فرمێسك بە ڕوومەتی ئاڵ وگەشیان دا دێتە خوارەوە لەگەڵ دایکە دڵ پڕ لە خەمە ماڵ وحاڵ وێرانەکەیاندا، کێ هەیە ویژدانی نەهەژێ کاتێ ئەو هەموو بێ جێگاو ڕێگاو خانەو لایەنە دەبینێت، ئەو هەموو خەڵکانەی کە قەرزاری قەڵەمی ئەژنۆی شکاندون و توشی خەمی شەوو زەلیلی ڕۆژی کردوون، ئەی ئەو هەموو پاشماوەی بەناو ئەنفالە کە لە سەرەتایترین مافی ژیانی ئەم سەردەمە بێ بەشن، ئەمەی کە لە کەناڵەکانەوە، لە تەلەفزیۆنەکانەوە بەچاوی خۆمان بینیمان، وە ڕۆژانەش لە چوار دەورمان، لە گەڕەك وشارو شاروچکەکەمان لە گوندو شارمان دەیبینین، مشتێکە لە خەرمانێك، خەڵکی هەژارو داماوو نەخۆش و بێ نان و بێ ئاو بێ خانووی ئەم وڵاتە، کە تا نانی هەیە ئاوی نییە، تا ئاوی هەیە کارەبای نییە، کە هیچ سوودێك لەم هەموو بەرهەمەی ئەم وڵاتە نابینێت کە بەشی ئەویشی تێدایە، بەڵێ هەرچی ئەهلی ئیمانە، هەرچی ئەهلی سەر بەرماڵە، هەرچی ڕۆژووەوانە، ئەگەر بە چەند فرمێسکێك و دڵ هەڵقرچاندنێکیش بووبێ، بە دوعایەکی بە کوڵ

وبەدڵیش بوبێ، بەژداری لە خەم ومەینەتی ئەو هەژارانە کردووە، بەڵام یەك بەرپرس ولایەنی پەیوەندیدار نەهاتە جۆش و خرۆش و سەریان لە یەکێك لەو ماڵانە نەداو لە پێویستییەکانیان نەکۆڵینەوە، چونکە ئەگەر بیانکردایە دەیان جار بۆ ئیعلام و ڕاگەیاندن لە هەمان تەلەفزیۆنەوە نیشان دەدرایەوە.

لە کۆتایی ئەم ووتارەشدا جارێکی تر ئەچمەوە خزمەت حەزرەتی (عومەری کوڕی خطاب )، پێشەوای دادگەرو خەم خۆری بەکردەوەی میللەت، پێش قسەکردن و بەڵێن دانی نابەجێ.

ئەسلەم دەفەرموێ: شەوێکیان لە خزمەتی حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب دا بووم، لە شاری مەدینە چووینە دەرەوە بۆ چاودێری کردنی کاروباری دەرەوەی شاری مەدینە، نزیکەی سێ میل لە شار دوور کەوتبووینەوە چاومان کەوت بە ئاگرێك کە بە گڕو بڵێسە دەسووتا، حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی (ئەسلەم) من کۆمەڵە کەسێك لە نزیك ئەو ئاگرەوە دەبینم، وا ئەزانم کاروانچی بن و شەویان بەسەردا هاتووەو فریا نەکەوتوون خۆیان بگەیەننە ناو شار، وە لەبەر سەرماو سۆڵەکەی ئەمشەو نەیانتوانیوە ڕێ ببڕن و هەر لەو شوێنە خستوویانەو ئاگریان کردووەتەوە، خێراکە بابڕۆین بۆ لایان و لە حاڵ و هەواڵیان ئاگادار بین، بە گورگە لۆقە خۆمان گەیاندە لایان و لێیان نزیك بوینەوە، تەماشامان کرد ئەوە ژنێکەو کۆمەڵێك منالی لە دەورە، مەنجەڵێکیش خراوەتە سەر ئاگر، منالەکان برسییانەو بەردەوام هاوار لە دایکیان دەکەن کە زوو خواردنەکەیان بداتێ،

حـەزرەتی عومـەر فـەرمووی: سـەلامی خواتـان لێبێـت ئـەی ئـەهلی ڕۆشنایی، پێی ناخۆش بوو پێیان بڵـێ ئەی ئەهلی ئاگر، چونکە بە دەوری ئاگردا دانیشتبوون، کە ئەمەش ڕێزگرتنە لـە شعووری کەسـی بەرامبـەر، ئافرەتەکـە وەڵـامی سـەلامەکەی دانـەوەو حـەزرەتی عومـەر فەرمووی: ئایا ڕێگامان دەدەی نزیك بینەوە؟ ئافرەتەکە ووتی : ئەگەر نیازتان خێرو چاکەیە فەرموون وەرنە پێشەوە، بەڵێ چوونە نزیکیان و حـــەزرەتی عومـــەر فـــەرمووی: ئـــەوە بۆچـــی لـــەم چـــۆڵەوانییە خستووتانەو نەهاتونەتە ناوشار؟ ئافرەتەکە ووتی: شەومان بەسـەردا هاتوو سەرماکەش زۆری بۆ هێناین و نەمانتوانی لە ڕۆیشتن بەردەوام بین، فـەرمووی: ئـەی ئـەو منداڵانـە بۆچـی هـەر هـاوارت لـێ دەکـەن و خۆت پیـا هەڵئەواسـن؟ ئافرەتەکـە ووتـی: ئـەوە لـە برسـان وا دەکـەن، حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئـەی ئـەوە چییە لـە نـاو ئـەو مەنجەڵەدایـە کە لەسەر ئاگرەکە دەکوڵێ؟ ئافرەتەکـە ووتـی: بـەخوا هیـچی تیـا نییە تەنها ئاوی تێدایە دەمەوێ بە هەر شێوەیەك بێت بیانخافڵێنم بە ئاوی ئەوەی کە ئەوە خواردنەو هێشتا نەکوڵاوە، بەم شێوەیە هەتا دەخەون دەیانخـافڵێنم، ئـەمجا ئافرەتەکـە هەناسـەیەکی قـوڵی پـڕ لـە غـەم و پەژارەی هەڵکێشاو لە ناخی دڵەوە قسەی کردو بـەزمان دەری بڕی و ووتی: ( واللهُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عُمَرَ ) خوا لە نێوان من و عومـەردا بێـت، کە ئـاوا لێمـان بێئاگایـەو منداڵـە چاوگەشـە نـازدارە بـێ باوکـەکانم ئـاوا بە برسـییەتی شـەو دەکەنـەوە، حـەزرەتی عومـەر فـەرمووی: خوشـکەکەم ڕەحمەتی خوات لێ بێت جا کوا عومەر ئەزانێ کە تۆ حاڵـت ئاوایـە لـە

گەڵ منداڵەکانت تا بێت بە هاوارتەوە؟ ئافرەتەکە وتی: (يَتَــوَلَّى أمرَنا، ثُمَّ يَغفِــلُ أمرَنــا؟!) ئەبێتە لێپرسراوو سەرپەرشتیارمان و کەچی لێشمان بێئاگایە، ئەسلەم فەرمووی: حەزرەتی عومەر ڕووی تێکردم و فەرمووی: خێراکە شوێنم بکەوە، ڕۆیشتین و بە پەلە خۆمان گەیاندە ئەو ژوورەی کە ئاردی تێدا بوو، حەزرەتی عومەر بنە گوێنییەك ئاردی هەڵگرت لەگەڵ هەندێك ڕۆن و چەوری داو فەرمووی: ئەسلەم بیدە بە کۆڵمدا، عەرزم کرد: قوربان من لە جیاتی بەڕێزت هەڵی ئەگرم، فەرمووی: (أأَنتَ تَحمِلُ وِزري يَومَ القيامَــةِ؟!) ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا تۆ لە جیاتی من کۆڵی گوناهەکانم هەڵدەگری ؟ ئەمجا دام بە کۆڵی حەزرەتی عومەرداو ڕۆیشت و منیش بە شوێنیدا ڕۆیشتم زۆر بە خێرایی دەڕۆیشت، هەتا گەیشتینەوە لای ئافرەت ومنداڵەکان، ئەمجا حەزرەتی عومەر بە دەستی خۆی ڕۆن وئاردەکەی تێکەڵ کردوو خستیە سەر ئاگرەکەو بۆ خۆی فووی لە ئاگرەکە دەکرد، ئەسلەم فەرمووی: چاوم لێ بوو دوکەڵ لەناو ڕیشە پڕەکەی حەزرەتی عومەرەوە دەچووە دەرەوە هەتا خواردنەکەی بە تەواوی بۆ ئامادە کردن، پاشان مەنجەڵەکەی داگرت و فەرمووی: سینییەکم بۆ بێنن، خواردنەکەی لەسەر ڕۆکردوو بە دایکی منداڵەکانی فەرموو: خوشکەکەم خواردن بدە بە منداڵەکانت، منیش بۆیان سارد دەکەمەوە، بەم شێوەیە منداڵەکان تێریان خوارد، وە بەشێکی باشیش لە خواردنەکە زیاد بوو لێیان، ئافرەتەکە ڕووی گەشایەوەو بە دڵ گەشییەوە وتی: یا ڕەبی خوای گەورە پاداشتی چاکەت

بداتــەوە، بــە ڕاسـتی تـۆ لـە عومـەر شـایانتری کـە ببـی بـە ئـەمیری ئیمانـداران، حـەزرەتی عومـەر فـەرمووی دوعـای خێرمـان بـۆ بکـە، ان شـاءالله کـە هـاتی بـۆ نـاو شـاری مەدینـە بـۆ لای ئـەمیری ئیمانـداران عومـەر، منــی لــە لا دەبینــی، پاشـان خواحافیزییـان کـردو ئەسـلەم فەرمووی: حەزرەتی عومەر تۆزێ دوور کەوتەوەو لەناو تاریکییەکەدا وەسـتا بـە شـێوەیەك کـە ئافرەتەکـەو منداڵـەکان نـەیبینن، ئەسـلەم عەرزی کرد قوربان چاوەڕێی چی دەکەی؟ فەرمووی: بە گریانەوە ئەو منداڵانەم بینی، حەز دەکەم بە پێکەنینەوە جێیان بێڵم، بەڵێ بینیمـان کە منداڵەکان تێریـان خـواردوو گـەرمیان بویـەوەو بوژانـەوە دەسـتیان کرد بە گاڵتـەو گـەپ ویـاری کـردن بەیەکـەوەو پێدەکەنین و پاشـان بە ئاسوودەییەوە لە دەوری ئاگرەکە خەوتن، پاشانیش حەزرەتی عومـەر سوپاسـی خـوای گـەورەی کـردوو فـەرمووی: ئـەی ئەسـلەم ئێسـتا دڵـم شـادەو ویـژدانم ئارامـە کـە بینیم دوای ئـەوەی برسـییەتی هێنابونییـە ناڵە ناڵ، وە لە برساندا خەویان لێنەدەکەوت و وە ئـەگریان بـە دەوری دایکیانـدا، ئێـستا بـە تێـری ودڵـشادی خـەوتن و لـە خـەوێکی قـوڵ وخۆشدا بە جێیان دێڵم و ان شاءالله بەیانیش موچەو پێداویستی ژیانیان بۆ دابین دەکەین.

لەسـەر ئـەم بەسـەرهاتەی حـەزرەتی عومـەرە کـە لـە ( الکامـل ف التأریخ ) ی ( الطبری) دا گێڕدراوەتەوە کە حافظ ابراهیم ووتویـەتی:

وَمَن رَآهُ أَمامَ القِــــدرِ مُنبَطِحاً وَالنّارُ تَأخُذُ مِنهُ وَهــــوَ يُذكيها
وَقَد تَخَــلَّلَ في أَثــــناءِ لِحيَــتِهِ مِنها الدُخانُ وَفوهُ غابَ في فيها

رَأى هُناكَ أَميرَ المُؤمــنينَ عَلى حالٍ تُرَوِّعُ لعمر اللهِ رائيهــا
يَستَقبِلُ النّارَ خَوفَ النّارِ في غَدِهِ وَالعَينُ مِن خَشيَةِ اللهِ سالَت مآقيها

**دەی خۆزگایە کاربەدەستانی ئەم وڵات و گەل ومیللەتەش ئاوا بە بەزەیی بوونایە بەرامبەر هەژاران، بەرامبەر منداڵانی بێ باوك، بەرامبەر ئەو دایکە ڕوو سورانەی کە تەمەنی گەنجییەتی خۆیان دەکەن بە قوربانی پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵەکانیان، وە ناهێڵن بێ باوکیان پێوە دیار بێ، ئەمە واجبی سەرشانی کاربەدەستە، بەڵام بەخوا هەر کاربەدەستێك ترسی خواو لێپرسینەوەی قیامەتی لە دڵدا نەبێت، بێگومان ئاوا خەمخۆری گەل و میللەت نابێت.**

**داواکارم لە خوای پەروەردگار کاربەدەستانمان دڵنەرم ودڵسۆز بکات، وە میللەتیش دلێرو بوێر بکات کە داوای مافی خۆی بکات و ڕەخنەی بنیاد نەر لە دەسەڵات بگرێت و خوای گەورە بەرەکەتی خۆیمان بەسەردا برێژێ و عاقیبەتی هەموو لایەکمان خێربکات. اللهم آمیــــــــن.**

# سەرچاوەکان:.


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تریفەی مانگ ماموستا مەلا غریب پێنجوێنی

٣. خُلُق المُسْلِمْ الشیخ محمد متولی الشعراوي

٤. ٦٣ قصة مِن نهاية الظالِمين سعد يوسف أبو عزيز

٥. ڕێبەری ڕۆژووەوان ماموستا مەلا موسا حەبیب

٦. مِنَ القِصَص النَبَوي محمد صالح المُنجِد

٧. ژوانگەی سەروەران ماموستا محمد سەنگاوی

٨. فصل الخِطاب في سيرة أمير المُؤمِنين عُمَر بنُ الخَطاب

د. علی محمد محمد الصَلابي

# ووتاری دووەم

# بۆ مانگی شەوال

# بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ أجمَعينَ:

**ئیمانداران: کەسانێك هەن وا دەزانن کە مانگی پیرۆزی ڕەمەزان تەواو بوو، ئیتر خواناسی ودینداری و خوا پەرستیش تەواو بوو، بۆیە زۆر کەس لە دوای ڕەمەزانەوە واز لە نوێژکردن دێنێت، یان نوێژ دەکات بەڵام هاتوچۆی مزگەوت ناکات بۆ جومعەو جەماعەت، دوای ڕەمەزان دەست دەکاتەوە بە غەیبەت کردن، زمانی لە هیچ خراپەیەك ناپارێزێت، ئیتر زیکری خوا ناکات، کەسانێك هەن لە دوای مانگی ڕەمەزانەوە ئیتر نابەخشن، وا دەزانن بەخشین وصەدەقە کردن تەنها تایبەتە بە مانگی ڕەمەزانەوە، ئیتر قورئان ناخوێنن، بە داخەوە قورئانەکان دوای مانگی ڕەمەزان دەپێچرێنەوە، هەندێك لە خوشکان دوای ڕەمەزان سەرپۆشەکانیان لائەبەن، وەکو ئەوەی کە خۆداپۆشین تەنها لە مانگی ڕەمەزاندا واجب بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئیسلام ودینداری هی هەموو کاتێکە، مانگی ڕەمەزان وەکو وێستگەیەکی شەحن بوونەوە وایە، تاوەکو گەرم وگوڕییەکەی بۆ دوای مانگی ڕەمەزانیش بمێنێت، مرۆڤی موسوڵمان لە مانگی ڕەمەزاندا ئەوەندەی خواپەرستی کردبێت کە لە دوای ڕەمەزانیش گەرم وگوڕییەکەی بمێنێ و بەردەوام بێت لەسەر خواپەرستییەکەی.**

**کەواتە: بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی ( الإستقامة ) زۆر گرنگە. خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ

ٱسۡتَقَٰمُواْ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ الاحقاف/ ١٣،١٤

**واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن پەروەردگارمان ( الله ) یەو پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبن و ڕاست وڕەوان پەیڕەوی دەکەن و لەسەری بەردەوام دەبن، ئەوانە هیچ جۆرە ترس وبیمێکیان لەسەر نییەو دڵتەنگ نابن، ئەوانە بەهەشتین و ژیانی نەمری تیایدا دەبەنە سەر، لەپاداشتی ئەو کاروکردەوانەدا کە ئەنجامیان داوە.**

**بەڵێ خۆشەویستان: ئەگەر مرۆڤ لەسەر ئەم ڕێبازی ڕاستی ئیسلامەتییە بەردەوام نەبێت، ئەوا دەیان کوێرکە ڕێ ولاڕێ لەبەر دەمیدایە کە بانگی دەکەن بۆ ماڵوێرانی وبەدبەختی وجەهەنەم.**

**هاوەڵی بەڕێز ( عبدالله ی کوڕی مسعود ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ڕۆژێکیان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوین، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ** ( خَطَّ لَنا خَطّاً ثُمَّ قالَ: هذا سَبيلُ الله، ثُمَّ خَطَّ خُطُوطاً عَن يَمِينِهِ وَشِمالِهِ وقالَ: وَهذهِ السُّبُلُ، لَيسَ مِنها سَبيلٌ إلاَّ عَلَيهِ شَيطانٌ يَدعُوا إِلَيهِ ) **واتە: پێغەمبەری خوا هێڵێکی ڕاستی درێژی بۆ ئێمە لەسەر زەوییەکە کێشا، پاشان فەرمووی: ئا ئەم هێڵە ڕاستە ئەمە ڕێگاو ڕێبازی خوایە، پاشان چەند ووردە هێڵێکی لە لای ڕاست و لە لای چەپی هێڵە ڕاستەکەوە کێشاو فەرمووی: ئەمانەش ڕێچکۆکەکانن، لاڕێکانن، لەسەر هەریەك لەم لاڕێیانە شەیتانێك هەیەو بانگی خەڵکی دەکات بۆ ئەوەی لە ڕێگا ڕاستەکە لابدەن و ڕوو بکەنە**

ئەو کوێرکە ڕێگایە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە :﴿وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾الانعام١٥٣

واتە: بێگومان ئەمە ڕێبازی منە، کە ڕێبازێکی ڕاست ودروستەو بێ گرێ وگۆڵەو هیچ شاراوەییەکی تێدا نییە، دە ئێوەی ئیماندار شوێنی بکەون، شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون، چونکە جیاتان دەکاتەوە لە ڕێبازی خوا، ئەوەش پەروەردگارتان فەرمانی پێ کردوون بۆ ئەوەی خواناس و پارێزگار بن.ئەم فەرموودەیە: رَواهُ احمَد في مُسنَدهِ ( ٤٤٣٧ ) وَالنسائي وَالطَيالسي وَصَححهُ الألباني.

ئیمانداران: ئێمەی ئیماندار بۆ ئەوەی بەردەوام بین لەسەر خواپەرستی لە دوای مانگی ڕەمەزانەوەو سارد بونەوە ڕوومان تێنەکات ، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:.

١. بەردەوام بوون لەسەر هاتوچۆی مزگەوت: چونکە مزگەوت چاکترین شوێنی سەر زەوییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( خَيرُ البِقاعِ المَساجِد، وَشَرُّ البِقاعِ الأسواق )رَواهُ الطَبَراني في الكَبير وَحَسَّنَهُ الألباني في صَحيح الجامع(٣٢٦٦).

واتە: چاکترین شوێنی سەرزەوی مزگەوتەکانن، وە خراپترن شوێنیش بازاڕەکانن.

بەڵێ مزگەوت موحتاجی ئێمە نییە، بەڵکو ئێمەین کە موحتاجی ماڵی خواین کە هاتوچۆی بکەین.

تا ئەو دەمەی ئەم کاروانیانە ڕێ بڕن، لە بازاڕی بەندایەتی حەریری بەهەشت بێنن و بەباڵای خۆیانی بڕن، هەتا لە ترسی ڕوو زەردی ڕۆژی مەحشەر تەوبەکاران فرمێسکی سەرگۆنا بسڕن، هەرئەبێ خانەی خودایی پەرچەمەکەی شەکاوە بێ، منارەی بەرزو دیمەنی نەخشێنراو و ڕازاوە بێ...

مزگەوت درەختی بەهەشتە، وا نێژرا، کێ بۆی دەبێتە باخەوان؟ میوە دەچنێ وئاو دەدێرێ، دەنگی بانگی محمدی بۆ دەڤەری ئەم نیشتیمانە دەنێرێ، ئەوەی کە مەردی مەیدانە، بۆ بیناکەی دەبەخشێ ودەستی وا لەسەر دەست دانا، دڵخۆش دەبێت کە دەبینێت ئاوەدانە، ئەوەی ئالوودەی مزگەوتە، عەتری برایەتی پێیەو دژی بیری لارو چەوتە...

دەڵێ خەڵکە: مزگەوت یانەی ئیمانییە فەرموون وەرن تیای بسرەون، سەفارەت خانەی بەهەشتە بێن لێرەوە بۆی ڕێکەون، دەڵێ کڕیارانی بەهەشت: بۆ خانەی خوا بە پڕتەون، بە دەنگی ( حَي عَلى الصَلاة ) دژی کارن، دژی خەون، چون تەنها لە خانەی خوادا، فیکری ڕەسەن جێگیر دەبێ ، دینی تێدا ڕاگیر دەبێ، ڕەزای خوای تیا دەستگیر دەبێ.

لە خانەی خوا بەس یادی ئەو دەکرێتەوە، ئیمان پێی نوێ دەبێتەوە، دڵان پێی دەحەوێنەوە، پەژارە بیر دەچێتەوە، دەکێ خولیای نوری حەققە، با بۆ مزگەوت زوو بێتەوە، بێرە مزگەوتی

گەڕەکت، گەر ناتوانی بۆ زیارەتی ( كَعْبَةُ الله ) بەڕێ کەوی، خۆت بخەرە ناو ماڵەکەی گەر ڕاست ئەکەی بەندەی ئەوی ) .

٢. بۆ ئەوەی دامەزراو بی لەسەر خواپەرستی لە دوای مانگی ڕەمەزانەوە، هەوڵبدە نوێژەکانت لە مزگەوتا بە جەماعەت بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:( صَلاةُ الجَماعَةِ أفضَلُ من صَلاةِ الفَذِّ بسَبعٍ وَعِشرينَ دَرَجَةً)رَواهُ البُخاري وَ مُسلِم.

واتە: نوێژی بە کۆمەڵ پاداشتەکەی زیاترە لە نوێژی تەنها بە بیست وحەوت پلە، ئای چ بەخششێکی گەورەیە ئینسان هەر هەمان نوێژ ئەنجام بدات، هەر هەمان کاتی دەوێ، بەڵام چونکە لەگەڵ موسوڵمانانندا بە جەماعەت لەگەڵ پێشەوا ( امام ) دا ئەنجام دەدرێت، وەکو ئەوە وایە لە ماڵەوە بیست وحەوت نوێژت کردبێت، ئایا کەسێك بۆ قیامەتی خۆی بە تەماع بێت ڕازی دەبێت بیست وحەوت بە یەك بگۆڕێتەوە؟ بێگومان نەخێر.

وە بە تایبەت لە دوای مانگی ڕەمەزانەوە بە ئاشکرا هەست پێ دەکرێت کە مزگەوتەکان نوێژ خوێنیان تێدا کەم دەبێتەوە، صەفی جەماعەتەکان کەم دەبنەوە، بەتایبەت نوێژی خەوتنان وبەیانیان، لە کاتێکدا جەماعەتی ئەم دوو نوێژە ئەوەندە گەورەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( مَن صَلّى العِشاءَ في جَماعَةٍ فَكَأَنَّما قَامَ نِصفَ لَيلَةٍ، وَمَن صَلَّى الصبحَ في جَماعَةٍ فَكَأَنَّما قام لَيلَةً بِأكمَلِها) رَواهُ أَحمَد وَ إِسنادُهُ صَحيح.

واتە: هەرکەسێك نوێژی خەوتنان بە جەماعەت ئەنجام بدات، ئەوە وەکو ئەوە وایە کە نیوەی شەوەکەی لەسەر بەرماڵ بەسەر بردبێت، وە هەرکەسێك نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام بدات وەکو ئەوە وایە کە تەواوی شەوەکەی بە شەو نوێژو زیکرو عیبادەت کردن بەسەر بردبێت، !! بەڵێ ئەو کەسانەی کە نوێژی عیشاو بەیانی بە جەماعەت ئەنجام ئەدەن، وەکو ئەوە وایە شەو هەتا بەیانی لەسەر بەرماڵ بن و هەر خەریکی شەو نوێژو قورئان خوێندن و زیکرو دوعا بن، دەی توخوا حەیف نییە بهێڵی ئەو پاداشتە گەورەیەت لە دەست بچێت؟.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەی داوەتە ئەو کەسانەی کە بەردەوامن لەسەر هاتوچۆی مزگەوت و ئەنجامدانی نوێژی جەماعەت تێیدا، دەفەرموێ: (مَن صلَّى لله أربَعينَ يَوماً في جَماعَـةٍ، يـدرِكُ التَكبيرَةَ الأُولى، كُتبَ لَهُ بَراءَتَانِ بَراءَةٌ مِن النِّفاقِ، و بَـراءَةٌ مِـن النارِ) رَواهُ الترمذي وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامع(٦٣٦٥).

واتە: هەر کەسێك ماوەی چل ڕۆژ لەسەر یەك هەموو نوێژەکانی بە جەماعەت ئەنجام بدات، وە ئەوەندە بە پەرۆشەوە بەشداری نوێژی جەماعەتی کردبێت، کە هەموو جەماعەتەکانی ئەو چل ڕۆژەی لە ( الله اکبر) ی نوێژ دابەستنی ئیمامدا لەگەڵ ئیمامدا نوێژی دابەستبێت، ئەوە دوو بەری بوونی پێ دەبەخشرێت: یەکەم : بەری دەبێ و پارێزراودەبێت لە نیفاق ودوو ڕوویی، دووەم: بەری دەبێ و پارێزراو دەبێت لە ئاگری دۆزەخ.!

وه هەموو ئەو کاتانەی کە مرۆڤی موسوڵمان لەناو مزگەوتدا دانیشتووەو چاوەڕێ دەکات کە جەماعەتەکەی بکات، ئەوە هەموو ئەو کاتەی بە نوێژکردن بۆ دەنوسرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّكُم لَن تَزالوا في صَلاةٍ ما انتَظَرتُمُ الصَّلاة ) رَواهُ النسائي وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامع(٢٣١٣).

ئیمانداران: ئێستا با بزانین سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتە چۆن پابەند بوون بە مزگەوت ونوێژی جەماعەتەوە، حەزرەتی( عومەری کوڕی خطاب ) ڕۆژێکیان چووە ناو باخە خورمایەکەوە، هەندێ ئیشی تێدا کرد، وەختێ بە ئاگا هاتەوە نوێژی عەسر بووە، تا خۆی گەیاندە مزگەوت سەیر دەکات نوێژی عەسری بە جەماعەت فەوتا، ( نوێژەکەی نەفەوتا بەڵکو بە جەماعەت فەوتا ) بۆیە ئەوەندە لە دڵی گران بوو، باخەکەی کرد بە خێر بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو نوێژە جەماعەتەی بۆ بکرێتەوە .

هەر لە پێشینان: ( سەعیدی کوڕی موسەیەب ) کە خۆی وەکو دەربڕینی فەزڵی خوا بەسەریەوەو هاندانی ئیمانداران بۆ سوور بوون لەسەر نوێژی جەماعەت فەرموویەتی:( ما فاتَتني الصَّلاةُ في الجَماعَةِ مُنذُ أربَعينَ سَنَةً)واتە: بۆ ماوەی چل ساڵ یەك نوێژی جەماعەتم نەفەوتاوە!! نەك هەر ئەوەندە بەڵکو فەرموویەتی:( ما أَذَّنَ المُؤَذِّنُ مُنذُ ثَلاثينَ سَنَةً إلاَّ وَأنا في المَسجِدِ) واتە: بۆ ماوەی سی ساڵ ئەو کاتەی بانگ بێژ بانگی فەرمووە، من لە ناو مزگەوتا بووم.!!

خۆشەویستان: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بە بیلالی حەبەشی فەرموو: ( يا بلال بِمَ سَبَقتني إلى الجَنّة؟! قَد سَمِعتُ خَشخَشَتَكَ أمامي، فَأَخبَرني ماذا تَصنَع؟!) ئەی بیلال لە بەهەشتدا گوێم لە دەنگی پێڵاوەکانت بوو لە پێشمەوە دەڕۆشتی، پێم بڵێ چ کردەوەیەکت کردووە کە تۆی گەیاندووەتە ئەو پلەیە؟ بیلال فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی کە دڵم پێی خۆشە ئەوەیە: هەر کاتێك دەست نوێژم شتبێت، دوو ڕکات سوننەتی دەست نوێژم کردووە، وە هەر گوناهێکم کردبێت خێرا تەوبەم بە شوێنیدا کردووە.

کەواتە: بۆ ئەوەی بەردەوام بین لەسەر خواناسی و دینداری و سارد بوونەوە ڕوومان تێ نەکات، لە دوای مانگی ڕەمەزانەوە با پابەند بین بە مزگەوتەوە، وە بە هەموو شێوەیەك هەوڵ بدەین کە نوێژی جەماعەتمان نەفەوتێت.

٣. بۆ ئەوەی خوای گەورە ڕاگیراوو دامەزراومان بکات و ( استقامە ) مان هەبێت، دەبێت: زۆر دوعا بکەین ولە خوا بپاڕێینەوە بۆ ڕاگیراو بوون و دامەزراوی.

لە دایکی بەڕێزمان، دایکی هەموو ئیمانداران ( ئوم سەلەمە ) ی خێزانی پێغەمبەریان ﷺ پرسی: ( ما أكثَرَ ما كانَ يَدعوا رَسُولُ الله؟) ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بە زۆری چ دوعایەکی دەکرد؟ ئوم سەلەمە فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە زۆری ئەم دوعایەی دەکرد

**( أللهمَ يا مُقلِّبَ القلوب ثبِّت قلبي علَى دينِك) ئەی ئەو خوایەی کە دڵەکان ئاڵوگۆڕ پێ ئەکەی، دڵەکەم ڕاگیراو بکە لەسەر دینەکەت. ئوم سەلەمە دەفەرموێت: ڕۆژێکیان لە پێغەمبەری خوام پرسی: ( لِمَ تُكثِرُ مِن هذا الدُّعاء؟) بۆچی ئەوەندە ئەو دوعایە دووبارە دەکەیتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی:( إنَ القُلُوبَ بينَ أُصْبُعينِ مِن أصابِعِ الرَّحمنِ يُقَلِّبُها كَيفَ يَشاءُ) واتە: بەڕاستی دڵەکان لە نێوان دوو پەنجەی پەنجەکانی خوای میهرەباندان ئاڵوگۆڕیان پێ دەکات و ئەمدیواو ئەودیویان پێ دەکات چۆنی بوێت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾ **ال عمران /٨.**

**واتە: پەروەردگارا: دوای ئەوەی کە هیدایەت و ڕێنمونیت کردین، دڵەکانمان لامەدە لە ڕێگەی ڕاست و لە ڕەحمەت و بەخششی تایبەتی خۆت بەهرەوەرمان بکە، چونکە بەڕاستی تۆ بەخشندەو بەخشێنەری.**

**بەڕاستی ئەمڕۆ ئیمە لە سەردەمێکدا دەژین کە شەپۆلی دونیا پەرستی و ڕوو کردنە دنیاو لەبیر چوونەوەی قیامەت لە هەموو لایەکەوە ڕوو دەکاتە دڵەکان، بۆیە ئەگەر هەر تۆزێ ڕوو بکەی بەلای دونیا پەرستان و بیروباوەڕی لارو چەوتی مادیگەراییەکان، هەست دەکەی دڵت گەردی گرتووەو سارد بونەوەیەك ڕووی تێکردووی، جا**

ئەوەی لەم بەڵایەمان لادەدات: پەنا بردنە بۆ خوای پەروەردگارو پاڕانەوەیە لێی، کە دڵەکانمان ڕاگیراوو دامەزراو بکات.

بەڕێزان: لێرەدا سەرنجێك هەیە: بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دڵی کرد؟ خۆ مێشك بیر دەکاتەوەو بڕیار دەدات، لە وەڵامدا دەڵێین: تا ئەم دواییانە هەر وا دەزانرا کە دڵ تەنها کاری ناردنی خوێن و وەرگرتنەوەیەتی، وە مێشك ڕەوشت و ئاکاری مرۆڤ دیاری دەکات، بەڵام قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەت دا باسی دڵ دەکات، باسی ئەوە دەکات کە دڵ سەرچاوەی ڕەوشت وئاکاری بەرز یان نزمە، بۆ نموونە:

﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا﴾ القصص ١٠.

یـــــاخود ﴿وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْأَخِرَةِ﴾ الانعام ١١٣

یان دەفەرموێت: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ الاعراف ١٧٩

وە پێغەمبەری خواش ﷺ لە چەندین فەرموودەدا باسی دڵی کردووە، وەکو ئەم فەرموودەیەی کە باسمان کرد، بەڵێ ووتمان: تا چەند ساڵێك لەمەو بەر وا دەزانرا کە دڵ پەیوەندی نییە بە ڕەوشت وئاکاری مرۆڤەوە، تا ئەوە بوو لەم یەك دوو ساڵەی پێشوودا کەناڵی ( جەزیرەی وە ثائیقی ) باسی پەڕاوێکی کرد کە دۆزینەوەیەکی گرنگ باس دەکات کە بە هێندەی دۆزینەوەی جازبیەتی ( ئەنیشتاین) گرنگە، پەڕاوەکەش ناوی ( کۆدی دڵە ) ئەم پەڕاوە باس لەوە دەکات

کە ئەو کەسانەی دڵیان بۆ دەگۆڕدرێت، زۆر هەڵس و کەوت و ڕەفتاری ژیانیان دەگۆڕێت .

بۆ نموونە: یەکێك لەوانەی کە دکتۆرەکان دڵیان بۆ گۆڕیوە، ( دڵ گۆڕین بەو شێوەیەی کە کەسێك پەکی کەوتووە، وە لەو کاتەدا کەسێکی تر مردووە، بەڵام دڵی ڕێك وپێك کاری کردووەو هیچ نەخۆشییەکی دڵی نەبووە، بە ڕەزامەندی کەس وکاری مردووەکە، گەرماو گەرم دڵی مردووەکە دەردەهێنن و لە شوێنی دڵە نەخۆشەکەی دادەنێن و دەست دەکاتەوە بە لێدان و ئەو کەسە ژیانێکی ئاسایی دەست پێ دەکاتەوە ) جا یەکێ لەوانەی کە دڵیان بۆ گۆڕی، پێشتر لە سەتڵێك ئاو دەترسا کە ئەگەر بچێتە ناوی تێیدا دەخنکێ، کەچی دوای دڵ گۆڕینەکە، حەزی لە مەلە کردن بوو، دەچوو لە دەریاکاندا مەلەی دەکردوو هیچ سڵی لە ئاوو مەترسییەکانی نەدەکردەوە!!

کەسێکی تر لە هەموو ژیانی ڕابردووی دا نەچووبوو بەلای شعر نوسیندا، بەڵام دوای دڵ گۆڕین دەستی کردووە بە شعر نوسین.

کەسێکی تر پێش دڵ گۆڕین لەوە ترساوە بچێتە سەر تەپڵەکێك، چونکە سەری دەسوڕاو دەکەوتە خوارەوە، کەچی دوای نەشتەر گەری دڵ ودانانی دڵی کەسێکی تر بۆی ئێستا دەتوانێ بەسەر شاخدا هەڵگەڕێت.بەڵێ ئەم ڕووداوانە وای لە زانایان کرد کە دان بنێن بە گرنگی دڵ داو بڵێن بەڵێ ڕاستە دڵ بە جۆرێك لە جۆرەکان فەرمان دەکات بە مێشك و دڵ لە پێش مێشکەوەیە بۆ بڕیار دان.

کەواتـــە: بـــا شـــانازی بـــە ئیـــسلامەکەی خۆمانـــەوە بکـــەین کـــە سەرچاوەیە بۆ هەموو زانستێك.

بەڵێ ئیمانداران: دەبێت بەردەوام لە خوای خۆمان بپاڕێینـەوە کە دڵمـان دامـەزراوو ڕاگیراو بکـات لەسـەر دینـداری وخولناسـی و بـەلای ڕاست وچەپ دا نەڕۆین و لەسەر ڕێبازە ڕاستەکەی خوای پەروەردگار بەردەوام بین.

لـە فەرموودەیـەکی تـردا هـاتووە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە دوعاکانیـدا دەیفەرموو:( يا وَلِيَّ الإسلامِ وَأهلِهِ، ثَبِّتني حَتّى ألقـاكَ) ئەی ئەو خوایەی کە بۆخۆت چاودێری وسەرپەرشتی ئیسلام وئەهلی ئیسلام دەکەی، ڕاگیراوو دامەزراوم بکەی لەسـەر دینەکەت، هـەتا ئـەو کاتـەی کـە پێـت دەگەمـەوە لـە قیامەتـداو دێمـە حـزوورت و هـەموو موسوڵمانێك لەو ڕۆژی قیامەتەدا بە چاوی سەری خۆی خوای خۆی دەبینێت،

لێرەدا پێویستە سەرنجی فەرموودەکە بدەین کە فەرمووی:( حَتّى ألقاكَ) نەیفەرموو:( حَتّى أمــوت )بۆچی نەیفـەرموو ڕاگیراوم بکـەی هەتا مردن؟ چونکە ئێمەی مرۆڤ لە کاتی مردن ودوای ڕووح دەرچوون و چوونە ناو گۆڕەوە هێشتا پێویستمان بە ڕاگیراو بوون هەیە، لەو کاتەدا کە فریشتەکان پرسیارمان لێ دەکەن لەناو گۆڕەکەماندا.

حـەزرەتی رسـول الله ﷺ کاتێـك لەگـەڵ صـەحابەکان لـە ناشـتنی مردوویـەك دەبوونـەوە، لەسـەر قەبرەکـەی دەوەسـتاو دەیفـەرموو: ( إستَغفِروا لِأخيكُم وَاسألُوا لَهُ الثباتَ فَإنَّهُ الآنَ يُسألُ). رَواهُ أبو داود.

واتە: داوای لێخۆش بوون بکەن بۆ براکەتان و لە خوای میهرەبان بپاڕێنەوە کە لێی خۆش بێت، وە داوا لە خوا بکەن وبڵێن: خوایا گیان بە ڕەحمی خۆت ئەم برایەمان یان ئەم خوشکەمان ڕاگیراوو دامەزراو بکەیت لەسەر وەڵامدانەوەی فریشتەکان کە ئیستا دێنە لایی و پرسیاری لێدەکەن دەربارەی خواو پێغەمبەرو دین و ڕووگەو برایان وخوشکانی، خوایا گیان لەم کاتە چارەنوس سازەدا ڕەحمی پیٚ بکەو ڕاگیراوو دامەزراوی بکە، زمانی بێتە گۆو بە جوانی وەڵامی فریشتەکان بداتەوە.

تەماشاکەن: لەناو گۆڕەکەشدا پێویستمان بە دامەزراوی هەیە، بەڵام دڵیشتان خۆش بێت، هەرکەسێك لەم دنیایەدا لەسەر ئەم دینداری و خواناسییە بەردەوام بووبێت، هەر کەسێك بەیانیان لە دوای نوێژی بەیانییەوە کە هێشتا دنیا تاریکەو هیچ هەنگاوێکی نەناوە لە ناو ژیانی دونیایداو سەرەتای ئەو ڕۆژە نوێیەی بەوە دەست پیٚ دەکات کە بەدڵ و بەگیان دەڵیٚ و بەزمان دەری دەبڕێت کە:( رَضيتُ بِاللهِ رَبّاً وَبالإسلامِ ديناً. و بِمُحَمَّدٍ نَبيّاً وَرَسُولاً ).

لە ناخی دڵەوە دەڵێت خوایا گیان ڕازیم بەوەی کە تەنها تۆ کە (الله) ی پەروەردگارم بیت، وە ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ئاین وڕێبازی ژیانم بێت، وە ڕازیم بەوەی کە( محمد المصطفی ) ﷺ پێشەواو پێغەمبەرم بێت.. هەرکەسێك هەموو ڕۆژێك ئەم پەیمانە نویٚ بکاتەوەو لە ژیانی ڕۆژانەشیدا کردەوەی پیٚ بکات، ئەوا بە دڵنیاییەوە خوای گەورە لە دنیادا ڕاگیراوی دەکات و ناخزیٚ و

نادۆڕیێ و لە سەرەمەرگ و ناو گۆڕیشدا بە ئاسانی و ڕەوانی وەڵامی فریشتەکان دەداتەوە ( ان شاءالله ). دەی خوایا گیا ئێمەش یەکێك بین لەو کەسانەی کە لەناو گۆڕەکەماندا دامەزراوو ڕاگیراو بین لەسەر وەڵام دانەوەی فریشتەکانی ناو گۆڕ.

خۆشەویستان: لێرەدا سەرنجێك هەیە: ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە صەحابەکانی فەرموو: دوعا بۆ براکەتان بکەن کە خوا ڕاگیراوی بکات و زمانی پاراو بکات وە لێی خۆش بێت، کەواتە: پاڕانەوەی موسوڵمانان بۆ مردووی موسوڵمان لەسەر قەبرەکەیی و دوای ناشتنەکەی سوودی زۆر زۆر بە مردووەکە دەگەیەنێت.

سەرنجی ئەم ڕووداوە بدەن: لە ئاوەدانییەکدا پیاوێك هەبوو، نوێژی نەدەکرد، منداڵەکانیشی فێری نوێژکردن نەدەکرد، بەڵام بە هیچ جۆرێك زەرەری بۆ هیچ کەسێك نەبوو، وە بەردەوام ئەوەشی دەگوت کە خەجاڵەتباری بەر قاپی خوایە، ئەم تاوانبارە کە ئاوا ڕوو لە دین نەبوو، ئەم پیاوە ژیانی دونیای کۆتایی هات و ئەجەل یەخەی گرت ومرد، بەڵام هیچ کەس خۆی تێنەگەیاند، تەنانەت خەڵکی گوندو ئاوەدانییەکەش قبوڵیان نەبوو کە لە گۆڕستانی ئاوەدانییەکە بە خاك بسپێردرێت، چونکە ئەو سەردەمە دینداری و خواناسی ئەوەندە بەهێز بووە، خەڵکی نوێژ نەکەر زۆر بە کەسێکی نامۆو ناشایستە لە ناو کۆمەڵی موسوڵماناندا تەماشا کراوە، (بە پێچەوانەی ئەمڕۆوە کە بە داخەوە زۆرجار سەرقەبرانی نوێژ نەکەرو

خراپەکارو پیاو کوژ لە پیاوی صالح و ئەهلی مزگەوت قەرەباڵغ ترە)، بەڵێ ئەم کابرایە سێ کوڕی هەبوو، ناچار سێ کوڕەکەی تەرمی باوکەکەیان دەبەنە دەشت و چاڵێك بۆ باوکیان هەڵدەکەنن، برا گەورەکەیان دەڵێ: وا بزانم مردوو کە مرد دەبێت بشۆرێت ئینجا بخرێتە گۆڕەوە، بە هەرسێکیان تەرمی باوکیان دەشۆن و پاشان یەکێك لە کوڕەکان دەڵێت: وا بزانم دەبێت پێش خستنە ناو گۆڕەوە نوێژی جەنازەشی لەسەر بکرێت، بەڵام ئەم نەگبەتانە نوێژە فەرزەکان نازانن جا چ جای نوێژی مردوو! بۆیە بڕیار ئەدەن چاوەڕوان بن تاوەکو ڕێبوارێك ببینن و نوێژی جەنازە بکات لەسەر تەرمی باوکیان، پاش چەند ساتێك پیاوێکی ڕێبواری دەشتەکی بەوێدا تێپەڕ دەبێت بە سواری وڵاخێکەوە، کوڕەکان بانگی ئەم کابرایە دەکەن و حاڵ وحیکایەتی خۆیانی بۆ باس دەکەن و زۆری لێ دەپاڕێنەوە کە نوێژی جەنازە لەسەر باوکیان بکات، کابرای ڕێبوار دەڵێت: وەی بەسەر چاو ئادەی بڕۆن دەست نوێژ بگرن و هەرسێکتان لە لای یەکترییەوە بوەستن و ڕوو لە قیبلە بکەن خۆشی دەچێتە پێشەوەو دەبێتە ئیمامیان و ( الله اکبر ) دەڵێ و پاشان بە خاکی دەسپێرن و کاکەی دەشتەکی بە جێیان دێڵێت، ( سُبحانَ الله ) ئەو شەوە باوکی کوڕەکان دەچێتە خەوی هەرسێ کوڕەکەی و بە ڕوویەکی خۆش و بەزەردەخەنەوە دەڵێت: کوڕەکانم ئاممان ئاممان بەس ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێت و تەوبە بکەن و نوێژ نەفەوتێنن، چونکە یەکەم پرسیار لەسەر نوێژە، ئەوانیش دەڵێن: باوکە خۆ تۆ لە دونیادا

نوێژت نەدەکرد، ئەی چۆن ئاوەها ڕووت گەشە؟ باوکەش دەڵێت: من هەرچەندە نوێژم نەدەکرد بەڵام بەخوا لە دڵەوە ئینکاریم نەدەکرد وە بەردەوام خۆم بە خەجاڵەتباری بەرقاپی خوا دەزانی، وە خۆتان دەزانن هیچ کەس لە دەست و زمانم توشی زەرەر نەبووە، وە خوای گەورە بە هۆی دوعای کابرای دەشتەکییەوە لیم خۆش بوو!!.

بەڵێ ڕۆژ دەبێتەوەو هەرکەس خەونەکەی خۆی دەگێڕێتەوە، بۆیان دەردەکەوێت هەرسێکیان هەمان خەونیان بە باوکیانەوە بینیوە، بۆیە هەرسێکیان بڕیار ئەدەن کە کابرای دەشتەکی بدۆزنەوەو لێی بپرسن: ئاخۆ هۆی چی بووە کە باوکیان لە سزای قەبر ڕزگاری بووە؟ هەرسێکیان دەچنە دەشت و چاوەڕێی کابرا دەکەن و پاش ماوەیەك لە دوورەوە پەیدا دەبێت، هاواری بۆ دەکەن و ئەویش دەیانناسێتەوەو بەرەو پیریان دێت، خەونەکانیانی بۆ دەگێڕنەوەو داوای هۆکاری لێخۆش بوونی خوا دەکەن بۆ باوکیان لە سایەی ئەو کابرا دەشتەکییەوە، کابراش شەرم دەیگرێ، ئەوانیش زۆر ئیلحاحی لێدەکەن، پاشان کابرای دەشتەکی دەڵێت: ئازیزانم سوێند بەخوا من نازانم چۆن نوێژی مردوو دەکرێ!، بەڵام کە ئێوەم بینی بەو حاڵەوە زۆر خەفەتم بۆ خواردن و ئەوە هات بە مێشکمدا کە دڵتان خۆش بکەم، ئەوە بوو دەست نوێژم پێ گرتن و ڕیزم کردن و ڕووەو قیبلە وەستاین و من بووم بە ئیمامتان، بەڵام بەخوا منیش هیچم نەدەزانی، بەس لەو کاتەدا کە ڕووەو قیبلە وەستابوین وتم: خوایا گیان تۆ خۆت ئاگاداری کە ماڵ و خزم و سەروەت وسامانت

نەداومەتیٚ، تەنها ئەم حوشتری سوارییەم نەبێت، دەی قەسەم بە گەورەیی و عەزەمەتی زاتی بیٚ شەریکت، ئەگەر ئەم مردووە بە میوانی بهاتایە بۆ لای من حوشترەکەمم بۆ سەر دەبڕی، ئەوا ئەو مردووەو بووە بە میوانی تۆ، تۆش باشترینی باشترینەکانی، ( اجودُ الاجوَدین ) یت، تۆ لە هەموو کەس سەخی تری، لە هەموو کەس بە ڕەحم تری، لە هەموو کەس زیاتر ڕێز لەو کەسە دەگریت کە بە زەلیلی بێتە بەرقاپیت، ئەم عەبدە هەرچەندە ئەوەندە دوور لە دین بوو، خەڵکی ئامادە نەبوون نوێژی لەسەر بکەن و بهێڵن لە گۆڕستانی مردووەکانیان بنێژرێت، بەڵام خوای گەورە، ئەگەر کەس بەزەیی پێیدا نەهاتەوە، خۆ تۆ ( ارحَمُ الراحِمین ) یت، ئومێدم وایە لە ڕەحمی بیٚ کۆتاو بیٚ سنووری خۆت بیٚ بەشی نەکەیت، تۆ خوایت و ئەویش عەبدێکی بێدەسەڵاتە، هیچ لە خوایەتیت کەم نابێتەوە ئەگەر لێی خۆش بیت، دەی خوایا لێی خۆش بە...

بەڵیٚ ئەم پیاوە بە زمانی سادەی خۆی و دڵی سافی بیٚ گریٚ وگۆڵی بە کوڵ لەبەر خوا پاڕایەوە تا خوای گەورە دوعاو پاڕانەوەکەی لیٚ قبوڵ کردو لە مردووەکە خۆش بوو، وە هیدایەتی کوڕەکانیشی داو دەستیان کرد بە نوێژکردن و خواناسی.

بەڵیٚ ئیمانداران: یەکێك لە هۆکارەکانی دامەزراوی لەسەر دینداری، ژیان بردنەسەرو هاوەڵیکردنی کەسانی خواناس و ئەهلی مزگەوت و دینە، ﴿ يأَيُها الذّينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ وَ كُونوا مَعَ الصّادِقينَ﴾.

ئەگەر بتەوێ لەڕیزی ئیمانداران دا بیت و لەگەڵ لەگەڵ لەگەڵ موتەقین دا تەقوای خوای گەورە بکەیت، دەبێت لەگەڵ صادقین وڕاستگۆیان دابیت، لەگەڵ دۆستانی خوادا بیت، وە دوور بی لەو کەس و فیکرو پەیڕەوانەی کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرو دینەکەی دەکەن.

بەڵێ ئیمانداران: دەبێ بەردەوام لە خوای گەورە بپاڕێینەوە کە دڵمان دامەزراو بکات و لاڕێ نەبین، ئەوەتا چاوساغ و پێشەواو پێشەنگمان حەزرەتی محمد ﷺ ئەو پێغەمبەرەی کە وا لە بناغەی شاخ وکێوەکان مەحکەم تر بوو، لە دارخورمای بیابانەکان خۆ ڕاگرتر بوو.

* ئەوەی کە وا مرۆڤ لە خشتە دەبات و کەم کەس هەیە لە ئاستی دا خۆی ڕابگرێ سێ شتە:.

١. پارەو سەروەت وسامان..... ٢. پلەو پایەو بەرپرسیاریەتی........ ٣. ئافرەتی جوان.....

هەرسێکی خرایە بەر دەستی، بەڵام لە وەڵامی قوڕەیشدا، بە ئەبو طالیب ی مامەی دا وەڵامی بۆ ناردنەوەو فەرمووی: ڕۆژ بێتە سەر شانی ڕاستم و مانگیش بێتە سەر شانی چەپم، واتە: نەك هەر ئەم دونیا بچووکە کە ئێوە بەشێکی زۆر زۆر بچووکی ئەم سەر زەوییە دەدەن بە من، کە لەچاو فراوانی دونیاو سەر زەویدا هەر هیچ نیە، نەك هەر دەسەڵات و فەرمان ڕەوایی مەککەو هۆزی قوڕەیش، نەك هەر سەروەت وسامان وبازرگانییەکەتان، نەك هەر کچی تازە پێگەیشتووی هەڵبژاردەی ناوازەی عەرەب، بەڵکو هەموو دونیام

بدەنێ، بمکەن بە پاشای هەموو جیهان، هەموو گەنجینەکانی سەر زەوی، ئەوەی لە ناو زەویشدا شاراوەتەوە، وە چی دڵم بیخوازێ لەم دنیایە بیدەن بە من، نەك هەر ئەوەندە بەڵكو لە زەوییەوە بۆ مانگ، بە مانگیشەوە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی من، نەك هەر ئەوەندە بگرە لە زەویشەوە بۆ ڕۆژ بە هەموو ئەو ملیۆنەها ئەستێرەیەی کە لەو نێوانەدا هەیە، وە خوودی ڕۆژ بۆ خۆی ئەوەندە موسەخەر ببێت بۆم، بەو هەموو گڕووتین و بڵێسەیەوە کە هیچ شتێك ناتوانێ هەر لێشی نزیك ببێتەوە، ئەگەر ئەو ڕۆژە بێتە سەر شانم، واتە بەکورتی ئەوەی چاوی مرۆڤ ئەیبینێت تا ئاسمان، بەو ملیۆنەها ئەستێرەشەوە کە لەبەر ووردی ودووری نابینرێن، هەمووی بدەن بە من بە مەرجی ئەوەی نەك بۆ هەتا هەتایە بەڵكو بۆ ماوەی یەك چاو تروکاندن، واز لەم ئیسلامە بهێنم، دڵنیابن وازی لێ ناهێنم، ! کەچی لەگەڵ ئەو هەموو خۆڕاگریەشدا هێشتا دەیفەرموو: ( اللّهمَّ لا تَكِلني إلى نَفسي طَرفَةَ عَينٍ، وَلا أقَلَّ مِن ذلكَ وَأصلِح لي شَأني كُلَّهُ. لا إلهَ إلاَّ أنتَ) ئەی خوای پەروەردگارم نەمسپێری بە نەفسی خۆم، بۆ ماوەی چاو تروکانێك، وە کەمتریش لە چاو تروکانێك، خوای گەورە بۆخۆت هەموو کاروبارەکانم بۆ ڕێك وپێك بکەی، شایەتی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە تەنها تۆ نەبی ئەی پەروەردگارا.

بەڵێ موسوڵمانان: بەڕاستی بەردەوام بوون و سارد نەبوونەوەو دڵ دامەزراوی و بە هەڵوێستی لەسەر ئەم ئیسلامەتی و ئەم ڕێبازی خواناسییە، بەبێ پشتیوانی خواو بەبێ ئەوەی خوای گەورە

بەردەوامیت پێ ببەخشێت، لە توانای مرۆڤ دا نییە، بۆیە واجبە لەسەرمان ڕۆژی ( ١٧ ) جار تەنها لە نوێژە فەرزەکاندا بڵێین:

﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ خوای پەروەردگار ڕێنمایمان بکەی بۆ ڕێگای ڕاستی خۆت.

ئیمانداران: لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا پاراستنی دین وئیمانەکەت، وە عیبادەت وتاعەتت، وە ئەوەی کە لە ڕەمەزاندا بە دەستت هێناوە، لێبڕانی دەوێ، لە خۆ بردوویی دەوێ، جیهادی نەفسی دەوێ، بە ئاگایی موسوڵمانی دەوێ لە پلانەکانی شەیتان سیفەتان، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمووی: (يَأتي علَى النَّاسِ زَمانٌ، الصّابِرُ فيهِم علَى دِينِهِ كالقابِضِ علَى الجَمرِ) ڕۆژێك دێ بەسەر خەڵکیدا، ئەو کەسەی کە خۆڕاگرە لەسەر دینەکەی وپابەندە پێوەی، وەکو ئەو کەسە پاڵەوان ومەردو خۆڕاگرە، کە دەستی گرتووە بەسەر پشکۆیەکی داگیرساوی یەك پارچە گڕدا، لەناو دەستیایەتی و ئەوەندە ئارامگرە پشکۆ ئاگرەکە فڕێ نادات، لە کاتێکدا کەسانێك ناوێرن، دەستیشی لێ نزیك بکەنەوە.

زۆر ئاگاداری پلانی شەیتان بن، بە تایبەتی خوشکان، ئاگاداری خۆتان بن، ئەو سەرپۆش وبەرگە باڵا پۆشەی ڕەمەزانتان جارێکی تر واز لێ نەهێنن، شانازی بە باڵا پۆشییەکەتانەوە بکەن، چونکە بە

ئایەتی قورئان فەرز بووە، هەر وەکو نوێژو ڕۆژووەکەت لەچك و حیجابەکەشت هەر بەئایەتی قورئان واجب بووە لەسەرت.

بە تایبەت ئەو خوشکانەی کە دەچنە خوێندنگاو زانکۆکان، ئەوانەی لە دەرەوەی ماڵ و فەرمانگەکاندان، ئاگاداربن بە دانەپۆشراوی نەچنە دەرەوەی ماڵەکانتان، وە بە شانازییەوە بڵێن: داپۆشراوی نیشانەی مرۆڤی پێشکەوتووە، چونکە لەسەر دەمی بەردا، لەو کاتانەدا کە مرۆۋ ئاشنا نەبوو بوو بە شارستانییەت و مەدەنیەت و پۆشاکی دەست نەدەکەوت، بەڕووتی دەگەڕا، ئەو کاتەش ئەوەندەی لە توانایدا بوایەو دەستی بکەوتایە، بە گەڵای دارو پێستەی ئاژەڵ لاشەی خۆی دادەپۆشی، کەواتە ڕووتی وسفووری نەك سیمای پێشکەوتن نییە، بەڵکو نیشانەی گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی بەردین و نا شارستانییەتی، دوژمنانی ئیسلام و حەیاو حورمەتی ئافرەتی موسوڵمانان زۆر مەبەستیانە ئافرەتی موسوڵمان ڕووت بکەنەوە، وە لەو پێناوەشدا بە پلان ونەخشەی زۆر وورد کار دەکەن.

* یەکەم قوتابخانەی کچان کە لە میصر دا کرایەوە لە ساڵی ( ١٩٠٤ ) دا بوو، مامۆستاکانی ئافرەتی ئینگلیز بوون، خۆیان داپۆشی بوو، خەڵکی ناڕازی بوون کچەکانیان بچنە خوێندنگاو لەبەر چاوی خەڵکدا بەسەر شەقامەکاندا بە کۆمەڵ هاتوچۆ بکەن، ووتیان: با کچەکان باوکیان بە ئوتومبێلی داپۆشراو یان عەرەبانەو ئەسپی داپۆشراو بیان هێنن بۆ قوتابخانە، لەناو قوتابخانەش تەنها دوو

پیاوی لێیە، دەرگاوانەکە کە پیاوێکی بە تەمەنی نزیکەی ( ٦٠ ) ساڵە، لەگەڵ مامۆستای عەرەبی و پەروەردەی ئیسلامی کە پیاوێکی دیندارو بە شەخسییەتە، بەڕێوەبەرە ئینگلیزەکە لە ژوورێکی ئاسندا دەژیا بۆ ئەوەی بڵێن: ئای چەند بە ڕەوشتە، کە قوتابیان زۆر بوون، قوتابخانەکە کرا بە دوو قات، ئەوکات هەنگاوەکانیان دەستی پێکرد، وتیان: یەکی ( ٥سم ) لە کراسەکانیان کورت بکەنەوە تاوەکو پێ لەبەرگی یەکتری نەنێن لەکاتی سەرکەوتن بە قادرمەکاندا، پاشان بە کچەکانیان ووت: یەکی ( ٢سم ) لە قۆڵی کراسەکانتان کەم بکەنەوە بۆئەوەی نەکەوێتە ناو مەرەکەبەکەوە کە قەڵەمەکەی تێهەڵدەکێشن، پاش ماوەیەکی تر پێیان ووتن: سەرپۆشەکانتان بەرز بکەنەوە با چاکتر چاوتان لە تەختە ڕەشەکە بێت، بەم شێوەیە هەنگاو بە هەنگاو هەر جارەی بە ناوێکەوە جل وبەرگیان لەبەر دادەڕنین هەتا بەیەکجاری ڕوتیان کردنەوە.

بەڵام موسوڵمانی ڕاستەقینە: کە بەجوانی لە ئیسلام تێگەیشتبێ و موسوڵمانێکی مەبدەئی بێت، نەك موسوڵمانێکی چاو لێکەر، غەیری خوا سەر بۆ هیچ مۆدێك وکەسێك و یاسایەك نەوی ناکات.

مێژووی پرشنگداری ئیسلام بۆمان دەگێڕێتەوە کە کاتێك سەرکردەی موسوڵمانان ( طاریقی کوڕی زیاد ) ڕۆیشت بۆ فەتحی ئەندەلوس، نوێنەری خۆی نارد بۆ لای پاشای شارەکە، بۆ گفتوگۆ، دارودەستەی پاشا پێیان ووت: ئەبێ بۆ پاشا بچەمیتەوە، فەرمووی: ئاخر من موسوڵمانم و بۆ غەیری خوا ناچەمێمەوە، جا دەست

وپێوەندی پاشاکە وتیان: تەگبیرێکی باشمان پێیە، ئەویش ئەوەیە: با دەرگایەکی نزم لە کۆشکەکەت بکەینەوە بۆ ئەوەی کە ئەو پیاوە هاتە لات خۆی بچەمێنێتەوەو بە ناچاری سەری شۆڕ بکات، پاشا وتی: بەڕاستی تەگبیرێکی چاکە، جا کە بەیانی کابرای موسوڵمانیان هێنا، ئەو دەرگایەی بینی کە بەو شێوەیە نزمەو لەبەردەم ژووری پاشادا درووست کراوە، تێگەیشت مەبەست چییە، جا کاتێ وتیان بڕۆ ژوورەوە بۆ لای پاشا، دانیشت وهەردوو قاچی بەرو ڕووی پاشا درێژ کرد، ئەوجا لەناو دەرگاکەدا خۆی خشکاند تا لە دەرگاکەوە چووە ژورەوە، ئەوجا ڕێك هەستاو فەرمووی: پاشا من سوکایەتی بە بەڕێزت ناکەم، من پەیامێکم لە لایەن فەرماندەی موسوڵمانانەوە بۆ هێناوی، بەڵام بۆیە بەو جۆرە هاتمە ژوورەوە چونکە من موسوڵمانم و موسوڵمانیش نابێت جگە لە خوا سەر بۆ هیچ کەسێکی تر نەوی بکات و بچەمێتەوە.

دکتۆر ( عمر عبد الكافی ) دەفەرموێ: ئافرەتێکی ئەڵمانی کە تازە موسوڵمان بووبوو، بەڵام بەڕاستی موسوڵمانێکی بە حەقی لێدەرچوو بوو، هەوڵی ئەدا ئیسلام چی فەرمان پێکردووە ئەوە جێبەجێ بکات، هات بۆ لام ولێی پرسیم: سێ کوڕم هەیە قارەمانی یاری ( جۆدۆ)ن لەسەر ئاستی ئەڵمانیا، ئایا ئەگەر کوڕەکانم لە سەرەتای یارییەکەدا وەکو یاسای یاری ( جۆدۆ ) بچەمنەوە، ئایا ئەمە بە چەماندنەوە بۆ غەیری خوا دادەنرێ؟ ئەگەر وابێ، سوێند بە خوای گەورە لە یاری

مەنعیان دەکەم، چونکە ئێمە کە موسوڵمان بووین، لەوە تێگەیشتوین کە سەر بۆ غەیری خوا نەوی نەکەین.!

کەواتە: با بە شانازییەوە بڵێین: ئێمە موسوڵمانین و ئەمڕۆ فەرمانی ئیسلامەکەمان لەسەر چاومانەو بە شانازییەوە دەڵێین: ﴿إنَني مِنَ المُسلِمين﴾.

خوای پەروەردگار هەموو لایەکمان ڕاگیراو بکات لەسەر خوا پەرستی و دینداری و لە دینەکەی شارەزا ترمان بکات و لە پیلانی شەیتان و شەیتان کرداران بمانپارێزێت. اللهم امیـــــــن .

## سەرچاوەکان:.


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان بورهان محمد ئەمین

٣. الوَصایا المِنبَریة محمد عبدالعاطی بَحیري

٤. تریفەی مانگ مامۆستا مەلا غریب پێنجوێنی

٥. نەخۆشییەکانی دڵان د. عمر عبد الکافی . وەرگێرانی .عبدالجلیل

٦. حَتی یُغَیَرُ ما بأنفُسِکُم عَمرُ خالد

٧. بەرەو ئیسلام.... سەرفرازی ئەندازیار عوسمان

٨. شنەی ڕەحمی خوا ماموٚستا شەماڵ موفتی

٩. پــەیامێك بــۆ كــچانی زانكــۆ د. عمــر عبــدالكافی

وەرگێڕانی .عبدالجلیل

١٠. شــەمەندەفەری ڕۆژگــار د. عمــر عبــدالكافی

وەرگێڕانی. عبدالجلیل

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ أجمَعينَ:

**ئیمانداران: زمان لەگەڵ بچوکی قەبارەی دا کەچی زۆر دەوری گرنگ دەبینێ، زمان جگە لە تام کردنی خواردن و هەڵسوڕانی خواردن لەناو دەم داو پاڵپێوەنانی بۆ ناو قورگ، توانای قسەکردنیشی هەیە، بەڕاستی دەوری زمان لە هەموو ئەندامەکانی تری لاشە گرنگ ترە، مرۆڤ بە هۆی زمانەوە موسوڵمان دەبێ، هەر بەزمانیش کوفر دەکرێ و مرۆڤ لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە، هەر بە زمان ئیصلاح لە نێوان دوو لایەن ودوو کەسی ناکۆك دا دەکرێ و هەر بە زمانیش نێوانی دوو کەس تێکدەدرێ و ماڵی دوو کەس وێران دەکرێت، بەزمان زیکری خوا دەکرێ و هەر بەزمانیش بەرهەمی ئەو زیکرە لەناو دەبرێت.**

**جا کەواتە دەبێت زمان هەر ووشەی جوانی پێ بوترێت، خوای گەورە فێرمان دەکات کە ئاگامان لە زمانمان بێت، قسەی ناشیرین وناڕەوای پێ نەکەین، چونکە بەرهەمی چەند ساڵ عیبادەت بە ووتنی یەك ووشە لەوانەیە هەڵبوەشێتەوەو بە فیڕۆ بڕوات.**

**سەرنج بدەن: زمان توانای چەشتنی تامی ئەو خواردن وخواردنەوانەی هەیە کە ئەچنە سەری، وە بەشەکانی تام کردن بەسەر زماندا دابەش بوون، بەشی چەشتنی تامی شیرینی، لە سەرەتای زمان دایە، بەشی تام کردنی خواردن وخواردنەوە تاڵەکان، لەبەشی هەرە دواوەی زمان دایە، بەشی تام کردن و چێژ وەرگرتن لە**

خـواردن وخواردنـەوەی تـرش وسـوێر لـەملاو ئـەولای زمـان دایـە، ( سبحان الله ) ئەم جوان دابەش کردنە هەر لە خوای کارزان وکاربەجێ دەوەشـێتەوە، بۆچـی بەشـی چەشـتنی تـامی شـیرینی لـە پێشەوەیە؟ چونکە زۆربەی زۆری ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەیخوات شیرینە، ئەگەر بەشـی تـام کردنـی شـیرینی لـە بەشـی کۆتـایی زمانـدا بوایـە، ئـەوا لـە کاتی قوت دانی دا کەمترین تاممان لێدەکرد و کەمترین لەزەتمان لێ دەبرد، بـەڵام شـتی تـاڵ، خـواردن وخواردنـەوەی تـاڵ زۆر بـە دەگمـەن وزۆر بەکەمی مرۆڤ دەیانخوات، بۆیـە خـوای گـەورە بەشـی تـامکردنی تاڵی خستووەتە کۆتایی زمانەوە، بۆ ئـەوەی ئەگـەر زەرور بـوین وەکـو دەرمـان خـواردن وخواردنـەوە تاڵـەکان بخـۆین کەمترین ئازارمـان پـێ بگات و خێرا قوتی بدەین و کەمترین تامی ناخۆشی تاڵی بکەین.

وە شتێکی ئاشکرایە کە زۆربەی شتە تاڵەکان، زەهـرو مـادە زیـان بەخـشەکانن، ئـەی خـوای گـەورە چـۆن مـرۆڤ ئاگـادار دەکـات کـە ئـەو تاڵییە قوت نەدات!؟ زانایان دەڵێن: ئـەو خانانـەی کە لەسـەر زمـانن و خـوای گـەورە تایبـەتی کـردوون بـە تـامکردنی شـتە تاڵـەکان، دە هـەزارجار هەسـتیار تـرن لـەو خانانـەی کـە تـامی شـتە شـیرینەکان دەکەن.!

بۆ ئەوەی ئەوەندە مرۆڤ لێی بێزار بێت، هـەر خێرا تفی بکاتـەوەو نەهێڵێ بچێتە گەدەیەوەو توشی نەخۆشی وئازاری نەکات.

لەمەی کە باسمان کرد: تێدەگەین کە ئەی مرۆڤ با بەردەوام زمانت شیرین بێت و قسەی خۆش لەسەر دەم وزمانت بێت، وە قسە تاڵـەکان

و قسە ئازاردەرو خراپ وناخۆشەكان، بخەرە دواوەی زمانت و یەكسەر قوتی بدەرەوەو مەیخەرە دەرەوەو قسەكە قوت بدەرەوە.

وە زانایان دەفەرموون: لە زمان دا ( ١٧ ) حەقدە ماسولكە هەیە، كە دەبێتە هۆی ئاسان جوڵاندنی زمان.

بەڕێزان: دوای ئەم پێشەكییە لەسەر زمان، پشتیوان بە خوای گەورە لەم ووتارەدا باسی یەكێك لەو تاوانە گەورانە دەكەین كە بەزمان دەكرێت، لە ڕووی شەرعەوە تاوانێكی گەورەیە بەڵام بەهۆی بڵاوی ئەم تاوانەوە، بە هۆی ئەوەی بووەتە میوەو شەوچەرەی زۆربەی زۆری كۆڕو دانیشتنەكان، كە ئەویش تاوانی ( غەیبەتە ) یان بە كوردی لە پاشە ملە باس كردنی خەڵكی، لە زمانەوانی دا ئاوا پێناسەی غەیبەت كراوە:( ذِكرُ العَيب بِظَهرِ الغَيب ) باس كردنی غەیب وكەم وكوڕی كەسێك لە شوێنێك كە خۆی لەوێ نەبێت وئاگای لێ نەبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە صەحابە بەڕێزەكانی پرسی:( أَتَدرُونَ ما الغيبَةُ ) ئایا ئەزانن غەیبەت چییە؟ قالوا ( اللهُ وَرَسُولُهُ أعلَم ) عەرزیان كرد: خواو پێغەمبەرەكەی باشتر دەزانن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:( ذِكرُكَ أَخاكَ بِما يَكرَهُ ) باسكردنی براكەتان بە شتێك كە پێی ناخۆش بێت ئاوا باس بكرێت، عەرزی پێغەمبەر كرا ﷺ ( أَرأَيتَ إِن كانَ في أَخي ما أَقُولُ؟!) ئایا ئەوەی كە دەیڵێم هەمووی لە براكەم دا هەبوو؟ وە هیچم لێ زیاد نەكردبوو؟ چۆن بوو

ئاوا باسم کردبوو؟ ئایا ئەوەش هەر غەیبەتە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( إن كانَ فيهِ ما تَقُولُ فَقَدْ اِغْتَبْتَهُ، وَإن لَم يَكُن فيـــهِ فَقَـــدْ بَهَتَّهُ ).

فەرمووی: ئەگەر ئەوەی کە تۆ لە پاشەملە لە عەیب و کەم وکوڕی براکەت باسی دەکەیت، بەبێ زیادو کەم وەکو خۆی باست کردبوو، ئەوە غەیبەتت کردووە، خۆ ئەگەر ئەوەی تۆ لەبارەیەوە ووتوتە تێیدا نەبوو، ئەوە بوختانت بۆ کردووە... واتە تاوانەکە گەورەتر دەبێت چونکە بوختان لە غەیبەت تاوانترە.

بەڕێزەکان: غەیبەت کردن چەند جۆرێکی هەیە:.

١) یەکەم:غَيبَةٌ في البَدَن: بۆ نموونە دەڵێی: بە گاڵتە پێکردنەوە، فڵان کەس کوێر، کەڕ، گۆج، شەل، لاڵە پەتە، قوچ ودرێژ، کورتە باڵا، کە هەرچەندە ئەو کەسە خۆی ئەو سیفەتەی تێدایە، بەڵام حەز ناکات خەڵکی بەو شێوەو وەصفە ناوی بهێنن، دایکی ئیمانداران ( خاتو عائیـــشە ) بۆمـــان دەگێڕێتـــەوەو دەفـــەرموێت: ڕۆژێکیـــان لەگـــەڵ پێغەمبەری خوادا دانیشتبووم، لە میانەی قسەو گفتوگۆدا ووتم: ( حَسبُكَ مِن صَفيَّةَ كَذا وكَـــذا ) واتە: بەسە بۆ کەم وکوڕی لە لەش ولاری صـــەفیەدا، (صـــەفیەی کـــچی حویـــەی، هاوســـەری بـــەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ) کە ئافرەتێکی کورتە باڵایەو هەر باڵای نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەم قسەیە ڕووی لە خاتو عائیشە کردوو فەرمووی: ( لَقَد قُلتِ كَلِمَةً لَو مُزِجَت بِماءِ البَحرِ لَمَزَجَتهُ ) بەڕاستی

ئەی عائیشە ئەم قسەیەی کە لەبارەی صەفیەوە کردت ، قسەیەکی ئەوەندە خراپ ونابەجێ بوو، ئەگەر بخرێتە ناو ئاوی دەریاوە، ئەو دەریایە بەو هەموو ئاوەوە کە هیچ شتێك پیسی ناکات، بەڵام ئەگەر ئەو قسەیەی تێبکرێت کە غەیبەتە بۆگەنی دەکات.!

ئەم فەرموودەیە: رَواهُ أبو داود ( ٤٨٧٥ ) وَالترمذي ( ٢٥٠٢ . ٢٥٠٣ ) وَ قالَ حَديثٌ صَحيح .

لە فەرموودەیەکی تردا کە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە، ئەویش لە باپیرییەوە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لە صەحابە لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشتبوون، لە کاتی گفتوگۆو قسەکردندا باسی پیاوێکیان کرد کە خۆی لەوێ نەبوو، بەم شێوەیە باسیان کردو وتیان: ( لا يَأكُلُ حَتَّى يُطعَمَ وَ لا يَرحَلُ حَتَّى يُرحَلَ لَـــهُ ) بەڕاستی فڵان کەس زۆر فەقیرحاڵە، بەخوا دەبێ نان وئاوەکەشی بە دەمەوە بکەی ئەگینا خۆی نایخوات، وە دەبێ سواری وڵاخەکـەی بکـەی، لـەمڕۆدا دەبـێ دەرگـای ئوتومبێلەکـەی بـۆ بکەیتەوە، ئەگینا خۆی عەقڵی پێ ناشکێ سواربێت یان بیکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:( إغتَبتُمُوهُ ) بەڕاستی غەیبەتتان کرد. فَقالُوا:( يا رَسُولَ الله: إنَّما حَدَّثنا بِما فيهِ ) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆ ئیمە باسی ڕەوشتێکمان کرد کە تێیدایە، خۆ خوا نەخواستە هیچمان دەربارەی نەوتووە کە تێیدا نەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( حَسبُكَ إذا ذَكَرتَ أخاكَ بِمـا فيـهِ ) بەسە بۆ

ئەوەی کە غەیبەتی کەسێك بکەی، ئەوەی دەربارە بڵێی کە تێیدا هەیە، بەبێ زیادوکەم..قال الحافظ المنذري: رَواهُ الأصبهاني بِأسناد حَسَنٍ.

کەواتە: ئەمە مافی پاراستنی کەسایەتی مرۆڤە، کە ئیسلام ئەوەندە گرنگی پێ داوەو پاراستنی بە پێویست زانیوە، بە هیچ جۆرێك ڕێگەی نەداوە کەس باسی کەسێکی تر بکات.

زانایان دەفەرموون: ( ذِكرُ الغيرِ ثَلاثَــةٌ ) باسکردنی کەسێك لە لایەن کەسێکی ترەوە سێ جۆری هەیە. ( الغَيبَةُ وَالبُهتانُ والإفكُ) .

١) جا غەیبەت ئەوەیە:( أن تَقولَ مــا فيــهِ ) شتێك بڵێی کە تێیدا مەوجودە.

٢) وە بوختان ئەوەیە:( أن تَقولَ ما لَيسَ فيهِ ) شتێك بڵێی کە تێیدا نەبێت.

٣) وە ئیفك ئەوەیە :( الإفكُ أن تَقولَ مــا بَلَغَــكَ ) بەوە دەڵێن کە شتێکت لە زمان خەڵکەوە بیستووە کە دەربارەی کەسێك ووتراوە، تۆش بیڵێیتەوە. هەر بڵێی خەڵك دەربارەی فڵان کەس وا دەڵێن و وایان ووت، کە ئەوەی خەڵکیش بۆ فڵان کەسی دەڵێن لە خراپە، بوختانە بۆی دەکەن.

ئەمە جۆری یەکەمی غەیبەتە، کە باسی بکەی لە ڕووی کەم وکوڕی لاشەیەوە یان ناتەواوی ئەندامێکی لاشەی.

دووەم: غَيبَةٌ في الخُلُـقِ: غەیبەتی بکەی بەوەی کە ڕەوشتێکی نەخوازراوی تێدایە، بۆ نموونە : بڵێی: فڵان کەس بە ڕاستی چروك و بەخیلە، خۆبەزل زانە، تووڕەو تۆسنە، ترسنۆکە، بێهەڵوێستە، کە بێگومان هەموو کەسێك پێی ناخۆشە کە بەو سیفەتانە ناو ببرێت، ئەگەرچی تیاشیدا مەوجود بێت.

سێهەم: غَيبَةٌ في نَسَبِهِ : بەجۆرێك باسی بکەی کە سووکایەتی بە نەسەب ورەچەڵەکی بکەی، بۆ نموونە: بڵێی: کوڕی فڵان کەس دەڵێی، بەسوکایەتی پێکردنەوە ناوی باوکی بێنی ، ئەو شوانە، ئەو فەڕاشە، ئەو کەناسە، لە کاتێکدا دەتوانی بە شێوەیەکی ڕێزدارانە ناوی ببەیت وبڵێی: فڵان کارگوزار.

چوارەم: غَيبَةٌ في شُئُونِ الشَّخصِ الدينيَّة : کە بەڕاستی ئەم جۆرە غەیبەتەیان لە خراپترین جۆرەکانی غەیبەتە، چونکە غەیبەتکار لەسەر شێوەی کەسێکی صالح وخواناس و زۆر دیندارو واریع قسە دەکاو غەیبەتی بەرامبەرەکەی دەکات، بۆ نموونە: باسی کەسێك دەکرێت، ئەم دەڵێت، پەنا دەگرم بەخوا، فڵان کەس چاك توشی گوناه وتاوان بووە، خوا لە ئێمەش وئەویش خۆش بێت، ئەم کەسە بەشێوەی دووعاو نزای باش قسە دەکات، بەڵام لە ناخەوە مەبەستی شکاندنی ئەو کەسەیەو باس کردنی خواناسی خۆیەتی.

یاخود کاتێك باسی کەسێك دەکرێت کە هاتوچۆی کاربەدەستان دەکات، دەڵێت: سوپاس بۆ تۆ خوایە کە هاتوچۆی کاربەدەستی زاڵم ناکەین، ئەمە غەیبەتە، چونکە نیەتی ئەوەیە کە فڵانە کەس کەسێکی

خراپەکارە، هەرچەندە ناویشی ناهێنێت. یان باسی کەسێك دەکات بۆ کۆمەڵە کەسێك، دەیەوێ غەیبەتی بکات، بەڵام خۆی بە پیاوچاك نیشان دەدات و دەڵێ: بەڕاستی غەمبارم کە فڵان کەسی برادەرمان وای لێ بەسەر هاتووە، ئەمە غەیبەتە، چونکە ئەو کەسە نیەتی ڕاستی و پەرۆشی و دڵسۆزی نییە، چونکە ئەگەر ڕاست دەکات ئەوا با بچێت بۆ لای ئەو کەسەو لە لای خۆی دڵخۆشی بداتەوەو کێشەو گرفتەکەی بۆ چارەسەر بکات، نەك لە لای خەڵکی تر باسی بکات.

- پێنجەم: غَيبَةٌ تَتَعَلَّقُ بِأَمرٍ دُنيَوِي: غەیبەتێکە کە پەیوەندی هەیە بە کاروبارێکی دنیاییەوە، بۆ نموونە: کەسێك لە لای خەڵکی لە مەجلیسێکدا، باسی کەسێك بکات کە خۆی لەوێ نییە، بڵێ: ئای فڵان کەس بەردەوام خەواڵووە، ئای کە خەوگرانە، فڵان کەس چەند زۆر خۆرە، ئای کە چڵکنە، فڵان کەس بەردەوام جل وبەرگی شڕە، یاخود بڵێ: ئای فڵان کەس منداڵەکانی چەند خراپن، یان ژنەکەی خراپە، ئەمە غەیبەتە، چونکە ئەگەر ڕاست ئەکەی بڕۆ لە نزیکەوە بۆی چارەسەر بکە.

خۆشەویستان: بەڕاستی ئەمەیە شارستانییەت، ئەمەیە ڕێزگرتن لە مرۆڤ ومافی مرۆڤ و کەسایەتی مرۆڤ، ئەمڕۆ خەڵکی باسی ئەورووپا دەکەن، کە خەڵکەکەی غەیبەتی یەکتری ناکەن، کەس باسی کەس ناکات، بەڵام خۆ ئەمە هی ئیسلامەکەی خۆمانە کە ئەوان لەوێ بە کردەوە جێبەجێی دەکەن، بەهۆی ئەو بارودۆخ و ژینگەو ژیانەی کە

بۆیان فەراهەم هاتووەو دەوڵەت کارێکی وای کردووە کەس نەتوانێت مافی کەس بخوات تا ناچار بە غەیبەت کردنی ببێت.

ئیمانداران: ڕەنگە پرسیارێك لە مێشکی هەمووانـدا درووست ببێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا کەس هەیە لە دونیادا توانیبێتی غەیبەتی کەس نەکات و بە خراپە باسی کەس نەکات؟! لە وەڵام دا دەڵێین: بەڵێ، ئەوەی ئیسلام فەرمانی پێ کردووە هیچی لە موستەحیلات نییە، کە لە توانای مرۆڤ دا نەبێت جێبەجێی بکات. وە مێژووی ئیسلامی گەلێك لەو خواناس وپیاوچاکانەی باس کردووە کە لە هەموو ژیانیاندا غەیبەتی کەسیان نەکردووە.

بۆ نموونە: زاناو پێشەوای زانستی فەرمووده: ( ئیمامی بوخاری) دەفەرموێت:( أرجو أن ألقى الله ولا يحاسبني أني اغتبت أحداً)ئومێدەوارم ئەو کاتەی کە دەچمە حزووری خوای گەورە لە قیامەتدا لێپرسینەوەم لەگەڵ نەکات لەسەر ئەوەی کە غەیبەتی کەسێکم لە ژیانم دا کردبێت.!

زانای گەورە ئیمامی ( الذَهَبي ) لە کتێبە شاکارە بە نرخەکەیدا: ( سيرُ اعلام النُبَلاء ) ج ١٢ ص ٤٤١ دا لەسەر ئەم قسەیەی ئیمامی بوخاری لێکدانەوەیەکی هەیەو دەفەرموێت:( صدق رحمه الله، ومن نظر في كلامه في الجرح والتعديل علم ورعه في الكلام في الناس، وإنصافه فيمن يضعفه، فإنه أكثر ما يقول: منكر الحديث، سكتوا عنه، فيه نظر) بەخوا ڕاستی فەرمووە ئیمامی بوخاری، چونکە

هەرکەسێك تەماشای فەرموودەکانی ئیمامی بوخاری بکات، لە ( الجَرح وَالتَعْديل ) دا کە لە زانستی فەرموودەدا هەیەو ئەو کەسانە هەڵدەسەنگێنێت کە فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە، لە ویدا بۆی دەردەکەوێت کە ئیمامی بوخاری چەند خۆپارێز بووە لە خراپ بەکار هێنانی زمان، لە کاتی ناوهێنانی خەڵکیداو هەڵسەنگاندنیاندا، ئەگەر سەرنجی ووتەکانی بدەی بۆت دەردەکەوێت، چەند بە ویژدانەوە قسە لەسەر کەسەکان دەکات، ئەوانەی کە بەلاوازیان دەزانێت لە گێڕانەوەی فەرموودەدا، ئیمامی بوخاری لەبارەی ئەو کەسانەوە کە فەرموودەی لێوەرگرتون دەفەرموێت: فڵان کەس فەرموودەکانی نەناسراون، لە بارەیەوە بێدەنگن، سەرنجی لەسەر هەیە، کە ئەمە مانای ناو هێنانی ئەو کەسانەیە، زۆر بە دەگمەن فەرموویەتی فڵان کەس درۆزنە، یان فڵان کەس فەرموودە هەڵدەبەستێت، تەنانەت دەفەرموێت: هەرکاتێ ووتم: فڵان کەس لە گێڕانەوەی فەرموودەدا سەرنجی لەسەرەو جێگای تێڕامانە، ئەوە ئەو کەسە گومانی لێدەکرێ وبیری تەواو نییە، بەڵام پێم خۆش نییە ئاوا ناوی بێنم.!

یەکێکی تر لەو خواناس وزانایانەی کە بەتەواوەتی خۆیان پاراستووە لە غەیبەتی خەڵك،(وەهبی کوڕی وەرد)ە ئەم پیاو باشە دەفەرمووێت: ئەگەر واز لە غەیبەت کردنی کەسێك بهێنم، بەلامەوە خۆشترە لەوەی کە لەو کاتەوەی دونیا دروست بووە تا ئەو کاتەی کۆتایی پێ دێت، هەمووی هی من بێت و لە پێناوی خوای گەورەدا بیبەخشم.

هەر ئەم زانایە دەیفەرموو: لە خوا بترسە لەوەی کە بە ئاشکرا قسە بە شەیتان بڵێی و کەچی لە نهێنیدا بەقسەی بکەی و هاوڕێی بیت. بێگومان شەیتان بەوە زۆر دڵخۆش دەبێت کە غەیبەتی خەڵکی بکەی.

ئیمامی ( الذَهَبي ) لە ( سِيَرُ اعلام النُبلاء ) ج ٩ ص ٢٢٨ دا لە باسی ( ابنُ وَهب ) دا هێناویەتی کە ( ابنُ وَهب ) فەرموویەتی: ( نذرت إني كلما اغتبت إنسانا أن أصوم يوما، فأجهدني، فكنت أغتاب وأصوم، فنويت أني كلما اغتبت إنسانا أن أتصدق بدرهم، فمن حب الدراهم تركت الغيبة) لەسەر خۆمم نەزر کردووە کە هەرکاتێك غەیبەتی کەسێك بکەم ڕۆژێك بەڕۆژو بم، بەڵام سەیرم کرد هێشتا ناتوانم بە تەواوەتی زاڵ ببم بەسەر خۆم دا، چونکە توانای ڕۆژوگرتنم زۆر بوو، غەیبەتەکەم دەکردو ڕۆژووەکەم دەگرت، پاشان بڕیارم داو لەسەر خۆم پێویست کرد کە هەرکاتێك غەیبەتی کەسێك بکەم درهەمێك بکەم بە خێر، جا لەبەر ئەوەی پارەم کەم بوو، ئیتر لەبەر ئەوەی پارەم پێ بمێنێ و پارەکانم لە دەست نەچێت وازم لە غەیبەت کردن هێنا.!

ئای ئەو پیاو باشانە لە کوێ و ئیمە ئەمڕۆ لە کوێ، کە بە داخەوە موسوڵمانی وا هەیە پارە ئەدات بۆ ئەوەی بگاتە شوێنێك کە غەیبەتی خەڵکی تیا بکرێت.

ئیمانداران: حەز دەکەم نموونەیەکیش لە زانایانی کورد زمان بهێنمەوە کە ئاوا خۆپارێز بوون لە غەیبەت کردن، ئەم زانا خواناسە

کوردەش ( شێخ ئەمجەد زەهاوی ) یە، ئەم زانا پایە بەرزە کوردەو لە ساڵی ( ١٨٨٣ ) ی زاینی لە دایك بووەو ساڵی ( ١٩٦٨ ) وەفاتی کردووە، ئەم زانا خواناسە بەڕەوشت وخوی جوان و هەوڵ وکۆششی بەردەوامی توانی خزمەتێکی گەورە بە ئیسلام بکات لە عراق وجیهانی ئیسلامیدا، ئەم زانایە زۆر بۆ خوا صوڵحاو بووە، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بووە.

پێشەوا ( حَسَن البَنا ) لە بارەیەوە فەرموویەتی: ئەگەر ئەتەوێ ڕووی گەشی یەکێك لە هاوەڵانی حەزرەت ﷺ ببینی، ئەوا سەیری ڕووی ( شێخ ئەمجەد زەهاوی ) بکە.

( شێخ ئەمجەد ) زۆر بیرتیژو وورياو بلیمەت بووە، ڕۆژێك ( شێخ قاسم القیسی ) موفتی عراق لەگەڵیا باسی بەلاغەت و زمانی عەرەبی دەکات، کە زانایی شێخ ئەمجەدی بۆ دەردەکەوێت لەو بوارەدا، ئەڵێ: ئەی شێخ ئەمجەد من فیقه و ئوصولی فیقهم بۆ تۆ واز لێ هێنابوو، کە تۆ مامۆستاو ڕابەر بیت، بەڵام هەرگیز بۆ ئەوە نەدەچووم کە لە زمانی عەرەبی وبەلاغەتیش دا ئاوا بلیمەت و شارەزا بیت و موناقەشەم بکەیت، لە کاتێکدا من عەرەبم وتۆ کوردی، بۆیە ناچارم ئەم بوارەش بۆ تۆ بەجێ بهێڵم، بەڕاستی شێخ ئەمجەد تۆ مامۆستای من و مامۆستای هەموو عراقییەکانی لە ( مَنقول ) و ( مَعْقول) دا ، وە لەمەودواش موجادەلەت لەگەڵ ناکەم و تەنها داوای فتوات لێدەکەم.

شێخ ئەمجەد زەهاوی ئەوەندە شارەزا بوو لە فیقهی ( ئەبو حەنیفە) دا کە ( سید محسن الحکیم ) ی پێشەوای شیعە لە بارەیەوە

ووتویەتی: ئەگەر فیقهی ئیمام ئەبوحەنیفە لە جیهاندا نەمێنێت، شێخ ئەمجەد دەتوانێت لەبەر، بێ هیچ کتێبێك هەمووی بڵێتەوەو بینوسێتەوە، جا لەگەڵ ئەم هەموو بلیمەتی وزیرەکییەیدا هەردەم شێخ ئەمجەد ناوی خەڵکی زۆر نزیکی لە بیر چووەتەوە، تەنانەت ناوی منداڵەکانی خۆشی بیردەچوو.

طە جابر العلوانی دەڵێت: شێخ ئەمجەد ویستی ڕاسپاردەیەکی دەمی بۆ بگەیەنمە (شێخ محمد الصَواف) کە زۆر دۆستی بوو فەرمووی: بڵێ شێخی خاوەن عەمامە، باڵا بەرز، یەکسەر زانیم مەبەستی (شێخ محمد الصَواف)ە، بەڵام قسەم نەکرد ووتم بزانم ناوەکەی بیر دەکەوێتەوە، کەچی بیری نەکەوتەوە، لێم پرسی: بۆچی ئاوا زوو ناوت بیر نامێنێت؟ فەرمووی: لەسەرەتای لاویمەوە پاش ئەوەی کە بینیم لە قورئان وسوننەتدا چەند باسی مەترسی غەیبەت کراوەو زانیم ئەو کەسەی غەیبەت بکات چەند گوناهبارە، لە خوای گەورە پاڕامەوە یارمەتیم بدات کە هەرگیز نەتوانم غەیبەتی خەڵکی بکەم، بۆیە دەبینی هەر ئەوەندەی لێرە بڕۆیتە دەرەوە ناوەکەتم لە بیر دەچێت و ناتوانم ناوت بهێنم و غەیبەتت بکەم.

ئیمانداران : فەرموون گوێ بگرن بۆ بەڵاکانی غەیبەت:.

یەکەم: سەرپێچی فەرمانی خوایە، لە قورئان دا باسی حەرامی کراوەو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم

بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ

وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ **الحجرات/ ١٢ .**

**واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لە گومانی خراپ، لە ڕاستیدا هەندێك لەو گومانانە گوناه وتاوانن، (بۆیە حەق وایە لە هەموو گومانێك خۆمان بپارێزین)، بەشوێن کەموکوڕی و عەیب وعاری یەکتری دا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لە پاشەملە باسی یەکتری وناوی یەکتری بە خراپە مەبەن، ئایا کەستان پێی خۆشە گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت وناخۆشە، دەی کەواتە لە خوا بترسن وپارێزگار بن، چونکە بەڕاستی خوای گەورە گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆیان.**

**لەم ئایەتەدا باسی سێ ناشیرینی غەیبەت دەکات:.**

**١. غەیبەت خواردنی گۆشتی مرۆڤە..... ٢. مرۆڤەکە برای خۆتە..... ٣. براکەشت مردووە.!**

**ئای چ ناشیرینییەکە، بۆیە قورئان دەفەرموێت: ﴿فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت وناخۆشە، وەرە بیهێنە بەرچاوت، براکەت مردبێ و بچی گۆشتی بە ددان لێ بپچڕی وبیخۆی! ئەگەر ئینسان بەم ئایەتە دانەچڵەکێ و واز لە غەیبەت کردن نەهێنێت بە هیچی تر داناچڵەکێت.**

زانای پایە بەرز ( شیخ ابنُ حَجَر الهَیثمی ) لە کتێبەکەیدا ( الزَواجِر عَن اقتراف الکَبائِر ) دا دەفەرموێت: گوناهی گەورەی ( کەبیرەی ) ژمارە ( ٢٤٩ ) غەیبەتە، دەفەرموێت: ( وَقَد جَعَلَها مَن أُتيَ جَوامعَ الکَلِمِ عَدیلَةَ غَصبِ المالِ وَ قَتلِ النَّفسِ بِقَولِهِ ﷺ ( کُلُّ المُسلِمِ عَلی المُسلِمِ حَرامٌ، دَمُهُ وَ مالُهُ وَ عِرضُهُ ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جوامعی کەلیمی خۆی دا، لەو ووتە کورتانەدا بە ووشەو پیت، بەڵام گەورەو درێژو پڕوچڕ لە واتاو مانادا، غەیبەتی لە ڕیزی دوو تاوانی زۆر گەورەدا باس کردووە، کە ئەوانیش داگیرکردنی ماڵ وسامانی خەڵکە بە ناحەق ونارەوا، لەگەڵ کوشتنی کەسێکی بێ تاوان بەبێ هیچ حەقێك. هەروەکو لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت: هەموو موسوڵمانێك حەرامن لەسەر برا موسوڵمانەکەی: خوێنی، ماڵ وسامانی، کەسایەتی وئابرووی.

دووەم: دەمی غەیبەت کاران بۆگەنە:.

(جابری کوڕی عبدالله ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوین ﷺ ( فَارتَفَعَت ریحٌ مُنتِنَةٌ ) لەو کاتەدا بۆگەنێکی زۆر پیس بڵاو بوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( أتَدَرونَ ما هذهِ الرِّیحُ؟!) دەزانن ئەو بۆگەنە،ئەو هەوا بۆگەنە هی چییە؟ پاشان هەر خۆی بۆی ڕوون کردینەوەو فەرمووی: ( هذهِ ریحُ الَّذینَ یَغتابونَ المُؤمنینَ ) رَواهُ احمد.، وَقالَ الحافظ إبنُ حَجَر في الفتح(١٠/٤٨٤) سَنَدُهُ صَحیح.

ئەمە بۆگەنی ئەو کەسانەیە کە غەیبەتی ئیمانداران دەکەن.

سێهەم: غەیبەت کردن چاکەکانت لەناو دەبات: ئەو هەموو عیبادەت و چاکەو خێرو خێراتەت کە بۆتە خەرمانێکی گەورە لە چاکە، بە غەیبەت کردن لەناو دەچێت.

شێخ حەسەنی بەصری : دەفەرموێت: ( واللهِ لَلغَيبَةُ أَسرَعُ في دينِ الرَّجُلِ مِنَ الأكِلَةِ في الجَسَدِ ) واتە: سوێند بەخوا غەیبەت کردن خێراترو خراپ تر ئیمانی مرۆڤ لەناو دەبات لە (خۆرکە). ( ژێرپەنجە لەلاشەدا) .

جارێکیان بۆ شێخ حەسەنی بەصریان گێڕایەوە کە پیاوێک غەیبەتی کردووی، ئەویش بڕێک خورمای زۆر جوان و نایابی بۆ ناردوو فەرمووی: هەواڵم پێگەیشتووە کە تۆ کۆمەڵێک لە چاکەکانی خۆت بۆ من ناردووە، بۆیە ویستم لە بەرامبەردا شتێکت پێ ببەخشم، داوای لێبوردنیش دەکەم کە ناتوانم پاداشتی ئەو هەموو چاکەیەت بدەمەوە کە بۆت ناردووم، ( چونکە بە غەیبەت کردن چاکەی غەیبەت کار دەچێت بۆ غەیبەت کراو).

ئیمامی ( الذَهَبي ) لە ( سِيَرُ أعلام النبلاء ) ج ٩ ص ١٩٥دا دەفەرموێت:( عبدالرحمن ی کوڕی مهدی) فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە پێم ناخۆشە خەڵکی سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکەن، ئەوا خۆزگەم دەخواست کە هەرچی دانیشتووی وڵاتی میصرە ( کە ئەم تێیدا نیشتەجێ بووە) غەیبەتی بکردمایە، ئایا چ شتێك لەوە خۆشترە کە مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا کە تەماشای دەفتەری

کردەوەکانی دەکات ئەو هەموو چاکەیەی تێدا ببینێت کە ئەم بۆخۆی لە دنیادا ئەنجامی نەداون و بە بەلاش بۆی هاتوون.

بەڵێ هەر لەبەر ئەوەی کە غەیبەت چاکەکانت دەبات بۆ بەرامبەرەکەت ( عبدالله ی کوڕی موبارەك ) دەفەرموێت: ئەگەر غەیبەتی کەسم بکردایە، ئەوا دەچووم غەیبەتی دایك وباوکم دەکرد، چونکە ئەوان شایانترین کەسن کە کردەوەکانی خۆمیان پێشکەش بکەم..

ئیمانداری بەڕێز: هەموو کەس لە ڕۆژی قیامەتداو لە کاتی کێشانی کردەوەکانی داو دانانی تەرازوودا، موحتاجی یەك چاکەیە، چونکە زۆر کەس لەسەر یەك چاکە پەکی دەکەوێ و ئەگەر یەك چاکەی تری ببوایە ڕزگاری دەبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ، وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ المؤمنون ١٠٢. ١٠٣ .

واتە: ئەو کەسەی تەرازووی چاکەکانی قورس بێت، ئائەوانە سەرفرازو سەرکەوتوون، بەڵام ئەو کەسەی تەرازووی چاکەکانی سوك بێت، ئەوانە ئەو کەسانەن خۆیان لەدەست داوەو خۆیان خەسارو ڕیسوا کردووە.

یەکێك دەپرسێت: بۆچی خۆیان خەسارو ڕیسوا کردووە؟ چونکە پاداشتی چاکەیەك بە دەو پاداشتی خراپەیەك بە یەکە، جا ( ابن مسعود) دەفەرموێت: ( هَلَكَ مَن غَلَبَت وَحداتُهُ أعشارهُ ) بە هیلاك

چووە ئەو کەسەی کە یەکەکانی زیاترو زاڵتر بن بەسەر دە هێندەکانی دا، واتە: خراپەکانی کە یەك بە یەك بۆی نوسراون، زیاتر بن لەو چاکانەی کە لانی کەم یەك بە دە پاداشتی بۆ دەنوسرێت.

چوارەم: تاوانی غەیبەت لە زینا زیاترە:.

( ئیمامی بوخاری) لە ( الادبُ المُفرَد ، رَقَم ٧٥٨ ص ١٥٩ ) وە پێشەوای تەفسیر ( ابنُ کَثیر) لە تەفسیرەکەی دا ج٤ ص٢١٥ دا بە ( ئیسنادێکی صەحیح ) هێناویانە، لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، لە بەسەرهاتەکەی (ماعیزی کوڕی مالیکی ئەسلەم ) ی دا کە کاتێك ئەم گەنجە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە داوای کرد لە پێغەمبەری خوا کە لە تاوانی زینا پاکی بکاتەوە، بە جێبەجێ کردنی حەددی شەرعی لەسەری، بەڵێ ئەوە بوو هەر سوور بوو لەسەر داواکەی، تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەردا دا کە ڕەجم بکرێت، بەبەرد لێی بدرێ تا گیان دەسپێرێت، جا کاتێ بەرد باران کراو گیانی سپارد، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دوو کەس بوو کە یەکێکیان بەوی تریانی دەوت:( أَلَم تَرَ هذا الَّذي تستر الله عَلَيهِ فَلَم تدعه نفسه حَتّى رَجِمَ رَجَمَ الكِلابِ) ووتی: ئایا بینیت ئەم ماعیزە کە خوای گەورە تاوانەکەی بۆ پەردە پۆش کردبوو، کەس پێی نەزانیبوو، کەچی دەمی ڕانەوەستاو وازی لە خۆی نەهێنا هەتا وەکو سەگ بەرد بارانیان کردوو کوشتیان، ! پێغەمبەری خوا ﷺ جارێ هیچ قسەی نەکرد هەتاوەکو ڕۆیشتن بەلای لاشەیەکی بۆگەنی کەرێکی تۆپیودا، کە هەرچی بەو ناوەدا بڕۆیشتایە دەبوایە دەم

ولووتی خۆی بگرتایە لەبەر بۆگەنی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە فلان کەس وفلان کەس لە کوێن؟ ئەوانیش هاتن و ووتیان: قوربان لە خزمەتداین، فەرمووی:( إنزِلا، فَكُلا مِن جيفَةِ هذا الحِمارِ) فەرمووی: لە وولاخەکانتان وەرنە خوارەوەو لەو گۆشتە بۆگەنەی کەلاکی ئەو کەرە تۆپیوە بخۆن، ! بەسەر سوڕمانەوە دوو کەسەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ( وَهَل يُؤكَلُ هذا؟!) ئایا ئەمە بۆ خواردن دەشێت؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( فَما نِلتُمـــا مِـــن أخيكُما آنفاً أشَدُّ أكلاً مِنهُ، وَالَّذي نَفسي بِيَدِهِ إنَّهُ الآنَ لَفي أنهارِ الجَنَّةِ يَنغَمِسُ فيهـــا ) واتە: ئێوە بێز لەو کەلاکە بۆگەنە دەکەنەوە، بەڵام ئەوەی کە تۆزێك لەمەوبەر لە براکەتان خواردتان، زۆر لەم گۆشتە بۆگەنە خراپتر بوو، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، ئێستا ئا ئەم ماعیزە ئەو گەنجە جوانەی کە سزای دنیای هەڵبژارد بەسەر سزای قیامەتدا، بۆ ئەوەی بە ڕووی سپی بە حزووری خوای گەورە بگات، بەخوا ئێستا هەر ئێستا کە تازە خراوەتە قەبرەوە، لەناو جۆگەو ڕووبارەکانی بەهەشتدا مەلە دەکات و خۆی تێدا نقوم دەکات و هەرچی ئێش وئازارە بەلاشەیەوە نامێنێت.

جارێکی تریان: کەسێك ئیعترافی لەسەر خۆی کرد بە زینا، دوای ڕەجم کردنی پیاوێك هات وووتی: کوا ڕەجم کراوەکە؟ صەحابەکان چونە خزمەت پێغەمبەری خواو ﷺ عەرزیان کرد:( هذا جاءَ يَـــسألُ عَنِ الخَبيثِ) ئەم پیاوە هاتووە پرسیار دەکات لە جەنازەی ئەو شتە

پیسە زیناکارە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( لَهوَ أَطيَبُ عِنــدَاللهِ مِن رشيحِ المِسكِ) بەڕاستی بۆنی لاشەی ئەم کوڕە گەنجە کە تەسلیم بووە بە شەرعی خوای گەورەو ڕەجم کراوە، لە لای خوای گەورە بۆنی زۆر خۆشترە لـە بـۆنی میـسك.! ئـەو پیـاوەی کـە هـاتبوو پرسـیاری دەکـرد، بـاوکی گەنجـە ڕەجـم کراوەکـە بـوو. پاشـان صـەحابەکان یارمەتییانـدا لـە شـۆردن و کفـن کـردن و بـە خـاك سـپاردنی دا. ئـەم فەرموودەیە: رَواهُ ابو داود ( ٤٤٣٥ ) وَحَسَنَهُ الالباني في صَحيحْ ابى داود .

بەڵێ ئیمانداران: بۆیە تاوانی غەیبەت کردن لە زینا کردن خراپترو گەورە ترە، چونکە زینا بە جێبەجێ کردنی حوکمی شەرعی یان بە تەوبە کردن لەکاتی نەبوونی حوکمی ئیسلامیدا، پاك دەبێتەوەو ئەو کەسە لە چڵك وپیسی زینـاو داوێن پیسی لیخن و بۆگەنی کـردووە پاك دەبێتەوە، وە بۆنی خـۆش دەبێتـەوە، بەڵام غەیبەتکار ئەگەر بە یەگجاری تەوبە نەکات، ئەوە بەردەوام لـە تاوانداپەو خۆشـی هەسـتی پێناکات و زۆرجار هەر خۆشی بە گوناهبار نازانێت.

بـۆ نموونـە: ئـافرەتی وا هەیـە وا تەسـبیحەکەی بـە دەسـتەوەیەو تەسبیحات دەکات، کەچی لەو کاتەدا ئەگەر یەکێکی دەست کەوت بۆ قسە دەست دەکات بە غەیبەت!! وە تەوبەشی لێناکات.

پێنجەم: غەیبەت کردن لە ڕیبا خواردن تاوانترە:.

هـاوەڵی بەڕێز: ( بـەڕائی کـوڕی عـازب ) دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خوا ﷺ فـەرمووی: ( الرِّبا إثنانِ وَسَبعونَ باباً أدناهــا مِثــلُ إتيــانِ

الرَّجُلِ أُمَّهُ، وَإِنَّ أَربَى الرِّبا إِستِطالَةُ الرَّجُلِ في عِرضِ أَخيهِ ) (رَواهُ الطَّبَراني في الأوسَط، وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامع بِرَقَم: (٢٢٠٣) وَفي سِلسِلَة الصَحيحَة بِرَقَم (١٨٧١) وَ صَحيح سُنَن أَبي داود بِرَقَم(٤٨٧٦).

واتە: سوو خۆری حەفتاو دوو دەرگای هەیە(جۆری هەیە)، نزم ترینیان لای هەرە خوارەوەی تاوانی سوو خۆری وەکو ئەوەیە کەسێك زینا لەگەڵ دایکی خۆی بکات، وە لە خراپترین و گەورەترین تاوانی ڕیباو سوو خۆری ئەوەیە : مرۆڤ دەم بکوتێتە کەسایەتی برای موسوڵمانی خۆیی و غەیبەتی بکات.!!

بەڵێ ئیمانداران: یەکێك لەو شتانەی کە ئەمڕۆ وا لە خەڵکی دەکات کە غەیبەتی یەکتری بکەن، بونی ڕەئی وبۆچوونی جیاوازە، بەڵام با بۆچوون وڕەئیشمان جیاواز بێت خۆ هەر برای ئیمانی یەکترین.

( ئیمامی شافیعی ) لەگەڵ هاوەڵێکیدا بۆچوونی جیاوازی دەبێت و زۆر دانیشتن دەکەن ناگەنە ئەنجامێك و پاشان بۆ ئەوەی هاوەڵەکەی دڵی گەرد نەگرێ و شەیتان دڵی کرمێ نەکات، ئیمامی شافیعی بە هاوەڵەکەی دەڵێت: ( یا أبا موسَى ألا يَستَقيم أن نَكونَ إخواناً وَ إن لَم نَتَّفِق؟) ئەرێ ناکرێت برا بین هەرچەند لەسەر یەك قسەو بۆچوونیش ڕێك نەکەوین؟! بەڵێ دەکرێ وسەد جار دەکرێت، دەی با برا بین و شەیتان بە خۆمان خۆش نەکەین و غەیبەتی یەکتری نەکەین.

بەڵێ ئیمانداران: بەڕاستی پێویستمان بە بەخۆدا چونەوە هەیە، دەبێت خۆمان پاك بكەینەوە لە غەیبەت كردن، لە دڵ پیسی، لە گومانی خراپ بەیەكتر، تەنها ئەوەی دەبێت سوور بین لەسەری دوو شتە: یەكەم: ئیمان وئیسلامەتی ودینداری. دووەم: ئەخلاق ورەوشتە جوانەكان...

تۆ تەماشای لاشەی خۆت بكە، سەیر دەكەی بەردەوام لە گۆڕاندایە، بۆ نموونە: خانەكانی پێست، لە (سێ ) سەعات زیاتر ناژین، خانەكانی ڕیخۆڵەكان كە شلە هەرس كراوەكان دەمژن لە (چل وهەشت) سەعات زیاتر ناژین، خڕۆكە سوورەكانی ناو خوێن لە (سەدو بیست وپێنج) ڕۆژ زیاتر ناژین.

كەواتە: لە ماوەی پێنج ساڵ دا هەموو خانەكانی لەشت سەر لە نوێ نوێ دەبنەوە، بەڵام لەناو هەموو لاشەی مرۆڤدا تەنها دوو جۆر خانە هەرگیز نامرن و گۆڕانیان بەسەردا نایەت، ئەوانیش خانەكانی:

١. مێشك ودەماخ ..... ٢. خانەكانی دڵ.... (چونكە ئەگەر ئەمانە بمردنایە ئەوا مرۆڤ هیچی لەبیر نەدەما).

كەواتە: با ئێمەش زمانمان پاك بكەینەوەو دەروونمان خاوێن بكەینەوە.

شەشەم: بەڵای غەیبەت ( عەزابی قەبر) ە، (ئەنەسی كوڕی مالیك) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( لَمَّا عُرِجَ بي، مَرَرتُ بِقَومٍ لَهُم أظفارٌ مِنْ نُحاسٍ يَخمِشونَ وُجوهَهُم وَ صُدُرَهُم. فَقُلتُ مَن هؤلاءِ يا جِبريلُ؟ قالَ هؤلاءِ الَّذينَ يَأكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ وَيَقَعونَ في

أعراضهم ) (أَخرَجَهُ أَحْمَد فِي المُسنَد(٣/٢٢٤) وَ أَبو داود (٤٨٧٨) وَاللَفظُ لَهُ. وقالَ مراجع رياض الصالحين(٥٧٨): إسنادَه صَحيح).

**واتە: کاتێك بەرز کرامەوە بۆ ئاسمان لە شەوڕەوییەکەمدا ، لە ( ئیسراو میعراج ) دا ڕۆیشتم بەلای قەومێکدا کە نینۆکی درێژیان هەبوو، نینۆکەکانیان لە مس بوون!! دەم وچاوی خۆیان پێ دەڕنییەوە، وە سنگی خۆیان پێ دەڕنییەوە، ووتم: ئەی جوبریل ئەمانە کێن کە نینۆکیان لە مسەو ئاوا دەم وچاوو سنگی خۆیان دەڕنن و وە پێستی دەم وچاوو سنگیان دادەماڵن؟ فەرمووی: ئەوە ئەو کەسانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن، واتە: غەیبەتی خەڵکی دەکەن، وە دەکەونە ناو ناموسی خەڵکەوەو باسی حەیاو حورمەتی خەڵکی دەکەن.**

**لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بەلای دوو گۆڕدا فەرمووی:** ( إِنَّهُما لَيُعَذَّبانِ وَ ما يُعَذَّبانِ فِي كَبيـر ، أَماَّ أَحَدُهُما فَيُعَذَّبُ فِي البَول وَأَماَّ الآخَرُ فَيُعَذَّبُ فِي الغيبَة ) (رَواهُ أَحْمَد فِي المُسنَد(٥/٣٥-٣٦) وَقالَ الحافِظُ إبنُ حَجَر فِي الفَتح (١/٤٨٥): أَخرَجَهُ أَحْمَد وَالطَبَراني بِأسناد صَحيح).

**واتە: خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، بەڵام سزاکەیان لەسەر تاوانێك نییە کە گەورە بێت، مەبەست لەوەیە کە ئەم دوو تاوانە لە لای خەڵکی بە گوناهی گەورە ناونابرێن، یەکێکیان لەسەر ئەوە سزا ئەدرێت کە خۆی لە میز پاك نەکردووەتەوە، ئەوی تریشیان لەسەر**

ئەوە سزا ئەدرێت کە غەیبەتی خەڵکی کردووەو کردویەتی بە شەوچەرەی کۆڕو دانیشتنەکانی.

جا توخوا حەیف نییە بە زمانی خۆت ، بەبێ سوود، چونکە هیچ شتێك لە غەیبەت بێسوود تر نییە بۆ خاوەنەکەی، ماڵی چەندین ساڵەت کە قەبرەکەتە پڕی بکەی لە سزاو ئەشکەنجەو ئازار بۆ خۆت.

٧ حەوتەم: خوای گەورە غەیبەت کار سووك ورسوا دەکات:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (يا مَعشَرَ مَن آمَنَ بِلِسانِهِ وَلَم يَدخُلِ الإيمانُ في قَلبِهِ، لا تَغتابُوا المُسلِمينَ، وَلاتَتَبِعُوا عَوراتِهِم، فَإِنَّهُ مَن إتبَعَ عَوراتِهِم يَتَّبِعُ اللهُ عَورَتَهُ، وَمَن يَتَّبِعِ اللهُ عَورَتَهُ يَفضَحهُ في بَيتِهِ ) (رَواهُ أبو داود: ٤/٤٨٨٠، وَقالَ الحافظ العِراقي في الأحياء : ج٣ ص١٠٤) واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بەزمان ئیمانتان هێناوە، بەڵام ئیمان نەچووەتە ناو دڵەکانتانەوە، غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن، وە شوێنی کەم وکورییەکانیان مەکەون، چونکە هەرکەسێك شوێن عەیب وعاری موسوڵمانان بکەوێت، ئەوا خوای گەورە شوێن کەم وکورییەکانی دەکەوێت و هەرکەسێکیش خوای گەورە شوێن کەم وکورییەکانی بکەوێت، لەناو ماڵەکەی خۆیدا ئابڕووی دەبات.

لەم فەرموودەیەدا دوو سەرنج دەکرێن:

١.فەرمووی: ئەی ئەوانەی کە ئیمانەکەتان هەر بەزمانتانەو نەچووەتە ناو دڵتانەوە، ئەوانە کێن؟ ئەوانە غەیبەت کارانن و ئەوانەن کە بەشوێن عەیبی خەڵکەوەن.

٢. هەرکەسێك غەیبەتی خەڵکی بکات و عەیب وکەم وکوڕی خەڵکی ئاشکرا بکات، ئەوا بە دڵنیاییەوە خەڵکیش زمانیان لە ئاستی دا دەکرێتەوەو لەبەرچاوی خەڵکی عەیبەکانی ئاشکرا دەبن.

هەشتەم: .غەیبەت کار توشی نەخۆشی دەروونی دەبێت: واتە: وای لێدێت بەبێ باس کردنی خەڵکی و چاودێری کردنی ژیانی خەڵك ناژی.

بەداخەوە هی وا هەیە ئەوەندە چاودێری ژیانی خەڵکی دەکات، دەزانێت کێ ڕۆژانە بە کۆڵانەکەیان دا ڕۆیشتووە، وە دراوسێکانی کێ میوانی بووەو ئیشی چی بووە.!!

حەزرەتی عومەر دەیفەرموو: ( عَلَیكُم بِذِكرِ اللهِ تَعالى، فَإِنَّهُ شِفاءٌ، وَإِیاكُم وَذِكرِ النَّاسِ فَإِنَّهُ داءٌ ).

واتە: ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی کە زۆر زیکرو یادی خوای گەورە بکەن، چونکە شیفایە بۆ دڵ ودەرونتان، وە زۆر خۆتان بپارێزن لە باسکردنی خەڵکی چونکە ئەوە نەخۆشی ودەردە.

بەڕاستی ئیمانداران: دینەکەمان، ئیسلامەکەمان، دینی پێشکەوتنە، دینی مەدەنیەتە، دینی خۆشگوزەرانییە، دینی خزمەت بەیەك کردنە، ئەگەر پەیڕەوی ئەم ئیسلامە شیرینە بکەین، بە دڵنیاییەوە کەس لە زمانی کەس ناترسێت، زانایان فەرموویانە: موسوڵمان دەبێت بەم شێوەیە بێت:.

١. إن ضَعفتَ عَنِ الخَيرِ فَأمسِكَ عَنِ الشَرِّ: ئەگەر بێ توانای لە ئەنجامدانی چاکەدا، وە ناتوانی خێر پێشکەش بە دەوروبەرەکەت بکەی، ئەوا واز لە خراپە بێنەو خراپەت نەبێت بۆ خەڵکی.

٢. إن كُنتَ لا تَستَطيع أن تَنفَعَ النّاس فَأمسِكَ عَنهُم ضَرَكَ: ئەگەر ناتوانی دەستباری خەڵکی بکەیت و باری لاریان لەگەڵ ڕاست بکەیتەوە، ئەوا خۆت بپارێزە لەوەی کە باری خەڵکی کە خۆی ڕاستە تۆ لاری بکەی .

٣. إن كُنتَ لا تَستَطيع أن تَصُوم فَلا تَأكُل لُحُومَ النّــاس: ئەگەر ناتوانی ڕۆژووی سوننەت بگری، ئەوا گۆشتی خەڵکی مەخۆو غەیبەتی خەڵکی مەکە.

٩ نۆیەم: .غەیبەت کار ئەوەندە سزای سەختە لە دۆزەخدا کە دەبێتە هۆی زیاتر سزا چێشتنی دۆزەخییەکان بەهۆی ئەوەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أربَعةٌ يُؤذونَ أهــلَ النــارِ على ما بِهم مِــنَ الأذىٰ ) چوار تاقم هەن کە دەبنە هۆی ئازاردانی دۆزەخییەکان لەگەڵ ئەو هەموو سزاو تاوانەی کە خۆیان هەیانە:

١) یەکەم: ( رَجُلٌ مُغَلَقٌ عليه تابُوتٌ مِن جَمر) پیاوێکە تابوتێکی ئاگری بۆ کراوە، ئەو تابوتە ئاگرینە دەکرێتەوەو ئەم دەخرێتە ناوی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( قَد ماتَ وَ في عُنُقِه أموال الناسِ ) ئەوە کەسێکە مردووەو ماڵی خەڵکی وا لە گەردنیدایە، وەکو ئوتومبێلە گرانبەها جام ڕەشەکانی بەرپرسەکان، کۆشك وڤێلاکانیان،

کە بە پارەی میللەتی ڕەش وڕووت دروستی دەکەن، بۆیان دەبێتە تابووتی ئاگرین و ئەوەندە ئەشکەنجەیان قورسە، جەهەننەمیەکان لەبەر هاواروناڵەیان ناڕەحەت تر دەبن لە سزای خۆیان.

دووەم:( وَرَجُل يَجُر أمعاءَهُ ) پیاوێکە کە ڕیخۆڵەکانی بەشوێنیا ڕادەکێشن، وورگی دڕاوەو ڕیخۆڵەکانی لە سکی هاتونەتە دەرەوە، ئەمە کەسێکە( لا يُبالي أينَ أصابَ البَولُ منــهُ) گوێی بەوە نەداوە میز بەر کوێی دەکەوێت و خۆی پاك ناکاتەوە لە میز.

سێهەم:. ( وَرَجُلٌ يَسيلُ فُوهُ قَيحاً وَدَمــاً ) کە سێکە پڕاو پڕی دەمی کێم وخوێنی بۆگەن بە دەمیا دێتە خوارەوە. ئەمەش: ( كــانَ يَنظُرُ إلى كَلِمَةٍ فَيستَلِذُّها كَما يُستَلَذُ الرَّفــثُ ) کەسێکە کە قسەیەك دەکەوێتە بەردەمی کە باسی کەم وکوڕی کەسێکە ئەیقۆزێتەوەو وەکو کــوردەواری دەڵێــت: حــەوت گــەڕەکی پــێ دەکــات و لــە زارێــك دەیگەیەنێتە شارێك.

چوارەم:.( وَرَجُلٌ أكُــلَ لَحمَــهُ ) کەسێکە کە لەناو جەهەننەما ناچار کراوە بەوەی کە دەبێت گۆشتی خۆی بخوات، جا هەموو جارێك کە قەپ دەکات بە لاشەی خۆیدا، ئازارێکی زۆری پێ دەگات و هاواری وای لێ بەرز دەبێتەوە، کە هەرچی جەهەننەمییە ناڕەحەت تر دەبن لە ئەشکەنجەو ئازاردا سەرەڕای سزاکەی خۆیان. چونکە پچڕانی گۆشتی لاشەی خۆت بە دەمی خۆت و بە ددانی خۆت ئازارەکەی بێ سنوورە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەوە کەسێکە

کە:( يَأكُلُ لُحُومَ النّاسِ بِالغَيبَةِ وَيَمــشي بالنَّميمَـــةِ ) گۆشتی خەڵکی خواردووە بەوەی کە غەیبەتی کردوون و وە دوو زمانی لە نێوان خەڵکیدا کردووەو فیتنەیی وئاشوب بەهۆی ئەو دوو زمانییەی ئەوەوە پەیدا بووە.

ئەم فەرموودەیە: ( أخرَجَهُ ابنُ أبي الدُنيا في ذَمِ الغَيبةِ ، وَذَكَرَهُ الهَيثمي في مَجْمَع الزَوائِد ج ١ ص ٢٠٨.

بە ئومێدی ئەوەی کە دوای زانینی ئەم هەموو بەڵاو نەگبەتییە گەورانەی کە بە هۆی غەیبەت کردنەوە توشی مرۆڤی موسوڵمان دەبێت، واز لە غەیبەت کردن بهێنین و تا بەشی دووەمی ئەم باسە هەموو لایەکتان بە خوای گەورە دەسپێرم.

## سەرچاوەکان:.


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان — بورهان محمد ئەمین

٣. آياتُ اللهِ في الانسانْ — د. محمد راتب النابلُسي

٤. نَظرة النَعيم — مَجموعة منَ العُلَماء

٥. الوَصايا المِنبَرية — محمد عبدالعاطي بَحيري

٦. صَحيح وَصايا الرَسول للنِساء — سعد يوسف أبو عَزيز

٧. مَوسوعَة الاُم في تَربية الاولاد — د. احمَد مصطَفى متَولَي

٨. جَواهِر الخُطَب المُختارة اعداد — مَجموعة منَ العُلَماء

٩. ژیانەوە — ئەندازیار عوسمان

١٠. صَحيح وَصايا الرَسول — سعد يوسف أبو عَزيز

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلَى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وَصَحبهِ أجمَعينَ:

**ئیمانداران: زمان خەڵاتی گەورەی خوایە بۆ مرۆڤ، قسەکردن بەرێزترین تایبەتمەندییە کە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوە، لەبەر ئەوەی زمان وقسەکردن ئاشکراترین وێنای جیاکەرەوەی مرۆڤە لە گیانلەبەران، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ۝٤﴾ **الرحمن ٣،٤ واتە: ئادەمیزادی دروست کردووەو هەر ئەویش فێری گوفتارو ئاخاوتنی کردووە.**

**ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین، دەبینین کەنەیفەرمووە**﴿وَعَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾ **بەڵکو فەرمویەتی:** ﴿عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾ **بە بێ ( واو ) چونکە** ﴿عَلَّمَهُ﴾ **دەبێتە تەفسیر بۆ** ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ﴾ **هەربۆیە وتراوە:** ( ما الإنسان لَولا اللِّسان، إلاَّ بَهيمَة مهملة، أو صُورَة مُمَثَّلَة ) **واتە: مرۆڤ بەبێ زمان یان ئاژەڵێکی بێ گوێش وهۆشە یان هەیکەل و وێنەیەکی کێشراوو دانراوەو پەیکەرێکە.**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ۝٢٢﴾ **الروم/ ٢٢.**

واتـە: یـەکێك لـە نیـشانەو بەڵگـەکانی دەسـەڵاتی خـوای گـەورە، دروست کردنی ئاسمانەکان وزەوییە، ( کە زانایانی ئەستێرەناسی لە ئاسـتیدا سەرسـام و سـەرگەردانن ) وە لـە نیـشانەکانی عەزەمـەت ودەسـەڵاتی خـوای گـەورە جیـاوازی زمـان وڕەنگتانـە.( دەنگـی هـیچ کەس لە کەسـی تـر ناکات، سـەرەڕای سـەدەها جۆر زمـان، کـە جۆری قسەکردن و داڕشتنی هـەر گـەلێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، جگە لە هەزاران شێواز کە لـەو زمانـە سـەرەکییانە دەبێتـەوە ) بەڕاستی ئالـەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شارەزایان.

بەڵێ جیاوازی دەنگ وڕەنگ لە دوو لایەنەوەیە:

یەکەم: .جیاوازی گەل ونەتەوەو هۆزەکان لە یەکتری.

دووەم:. هـەموو کـەس تەنانـەت لـەناو خێزانەکـەی خۆشـیدا، نـە دەنگـی ونـە ڕەنگـی (١٠٠٪) لـە دەنـگ وڕەنگـی کەسـێکی تـر ناچێت.چونکە ئەگەر وا نەبوایە ژیان لەسـەر زەوی بـەڕێوە نەدەچوو، هەر بەهۆی ئەم جیاوازی دەنگ وڕەنگەوەیە کە دەتوانرێت کەسایەتی هەر کەسێك دیاری بکرێت، ئەویش لە ڕێگەی وێنـەی فۆتۆگرافی، وە دەنگە ژێکانەوە، چونکە وێنەی کەسێك لە وێنەی کەسێکی تر ناچێت لە هەموو ڕوویەکەوە، وە دەنگی کەسێك ولەرینەوەی دەنگە ژێکانی لە کەسێکی تر ناچێت.

بـەڕێزان: بـا بـزانین قسە چۆن درووسـت دەبێـت؟! دوای هەناسـە دانەوە، کـە ئـەو هەناسـەیەی مرۆڤ دەیداتـەوە گـازی کـاربۆن و هـەڵمی ئاوی تێدایە، بـە دەنگـە ژێکانـدا تێپـەڕ دەبێـت، جـا ئەگـەر لـەو کاتـەدا

مرۆڤ پێویستی بە قسەکردن هەبوو، ئەوا ئەو هەوا پیسە دەنگە ژێکان دەلەرێنێتەوەو بە یارمەتی زمان ولێوەکان قسە دروست دەبێت، بەڵام ئەو دەنگەی لە دەنگە ژێکانەوە دێت، دەنگێکی خاوە بە هاوکاری مەڵاشوووە هەروەها زمان وددانەکان و هەردوو لێوەکان پیتەکان دروست دەبن، هەروەکو خوای گەورە زۆر بە جوانی وبە ووردی ئەم ڕاستییە زانستییەمان بۆ شی دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ۝٨ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ۝٩﴾ البلد ٨. ٩

واتە: ئایا جوتێك چاومان بە مرۆڤ نەبەخشیوە؟ وە ئایا زمان ودوو لێویشمان پێ نەبەخشیوە؟ !

بەڵێ ئیماندااران: زمان ( ١٧ ) جوڵە پەیکەری هەیە، وە لێوەکانیش خوای گەورە بە شێوەیەك درووستی کردوون، کە مرۆڤ چۆنی بوێت ئاوا دەتوانێت شێوەیان بگۆڕێت، چونکە شانە خانەکانی لێوەکان زۆر بە شێوازێکی تایبەت و سەرسوڕهێنەر دروست کراون. پاك و بێگەردی و عەزەمەت هەر شایەنی ( الله )یە ( سُبحانَهُ وتَعالى ) .

جا کەواتە قسەکردن هەروا بە ئاسانی درووست نابێت، ئایا حەیف نییە لە چاکەدا نەبێت بەکاری بێنیت.!

ووتاری ڕابردوو باسی ئافاتی غەیبەتمان کرد، بەڵام پرسیارێك لەوانەیە بۆ هەموومان دروست بوبێت، ئەویش ئەوەیە: باشە کە

غەیبــەت ئەوەنــدە بەڵایــە ، ئــەی بۆچــی ئەوەنــدە زۆرەو بووەتــە شەوچەرەی هەموو کۆڕو مەجلیسەکان؟ !

١) یەکەم:.بیٚ ئیشی و دەست بەتاڵی ودڵ بەتاڵی، زۆربەی غەیبەت کاران پیاوان وژنانی دانیشتووی بەردەرگان، لە ئەوروپا بۆ غەیبەت نییــە؟ چــونکە خــەڵکی هــەموویان مەشــغولٚ و ســەرقاڵن بــە ئــیش وکارەوە، بەڵام لێرە موچەی بن دیوار وەردەگریٚ و غەیبەت دەکات!!

٢) دووەم:.ڕق وقین لە کەسێك وات لێدەکات کە لە پاشە ملە باسی بکەی وغەیبەتی بکەی.

٣) سێهەم:. ڕاگرتنی دڵی هاوڕیٚ و هاومەجلیسەکان، کە دەزانێت ڕقی لە کەسێکە ئەم غەیبەتی دەکات، بۆیە ئەمڕۆ خۆ پاراستن لە تێکەڵاوی و دانیشتنی بیٚ سوود زۆر پێویستە.

٤) چوارەم:.حەسوودی، کە دەبینێت خەڵکی بە چاکە باسی کەسێك دەکەن، ئەم کە ڕقی لێیەتی، ئاگری حەسوودییەکەی وای لێدەکات دەست بکات بە غەیبەت کردنی.

پێنجەم:. گاڵتەو گەپ وڕابواردن. تا خەڵك لە کۆڕو مەجلیسەکەدا پێبکەنن، لاسایی خەڵکی تر دەکاتەوەو دەڵیٚ فڵان کەس ئاوا قسە دەکات، ئاوا دەڕوات، ئاوا لە خەودا پرخەی دێت، دانیشتوانەکەشی پێدەکەنن، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئەم جۆرە کەسانەوە دەفەرموێت:( وَيلٌ لِلَّذي يُحَدِّثُ بِالحَديثِ لِيُضحِكَ بِهِ القَوم، فَيَكـذِب، وَيلٌ لَهُ، وَيلٌ لَهُ ).

واتە: وەیل وهاوارو شیوی جەهەننەم بۆ ئەو کەسەی کە قسە دەکات ومەبەستی لە قسەکانی ئەوەیە کە خەڵکی پێبکەنن بە قسەکانی، جا دێت درۆ دەڕازێنێتەوەو لاسایی خەڵکی دەکاتەوە، هاوارو ماڵ وێرانی بۆ ئەو کەسە.

شەشەم:. خۆشحاڵی دەربڕین بەوەی کە کەسێك توشی بەڵاو موصیبەت بووە، ئەمیش ناحەزیەتی و بۆ خەڵکی باس دەکات و مەبەستی غەمباری نییە، بەڵکو پێخۆش بوونە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:( لا تُظهِرَ الشَماتَهة لأخيكَ، فَيَرحَمَهُ اللهُ وَيَبتَليــكَ ) رواهُ الترمذي.

واتە: خۆشحاڵی خۆت بە ناڕەحەتی وگیرو گرفتی براکەت دەرمەبڕە، چونکە زۆر نزیکە خوای گەورە ڕەحم بەو بکات وڕزگاری بکات و تۆ توشی ئەو بەڵاو ناڕەحەتییە بکات.

ئیمانداران: کەسی وا هەیە غەیبەت ناکات، بەڵام گوێ لە غەیبەت دەگرێت کە باسی کەسێك دەکرێت، لە ئەسەرێکدا هاتووە ( المُستَمِعُ شريكُ المُتَكَلِّم ) گوێگر هاوبەشە لە تاوانی قسەکەر.

زانای گەورە ( ئیمامی نەوەوی ) لە کتێبە بەنرخەکەیدا ( الأذكار ) ل٣٠٤ دا فەرموویەتی: بزانە، پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە گوێی لێیە کەسێك غەیبەتی کەسێکی تر دەکات، دوو هەڵوێست وەربگرێت:.

یەکەم:. ( أن يَرُدَّها) بەرپەرچی بداتەوەو قسەکەی پێ ببڕێت.

ج دووەم:.(وَيَزجُرَ قائِلَها) وە سەر کۆنەی غەیبەت کەرەکە بکات وبڵێت: غەیبەت تاوانێکی گەورەیە، حەرامە، واز بێنە لە غەیبەتی فڵان کەسی برای موسوڵمانان. ( فَإن لَم يَنزَجِر بِالكَلامِ زَجَرَهُ بيَـدِهِ) جا ئەگەر قسە کردن لەگەڵی سوودی نەبوو، ئەوا دەبێت بە دەست وازی پێ لێ بێنیت لە غەیبەت کردن، جا ئەگەر نە قسەو نەدەست سوودی نەبوو، وە غەیبەت کار وازی لە غەیبەت نەهێنا، ئەوا ( فارِقَ ذلِكَ المَجلِسَ ) ئەو دانیشتنە بەجێ دێڵی ودەڕۆی.

بەرگری کردن لە غەیبەت کراو: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَن رَدَّ عَن عِرضِ أُخيهِ رَدَّ اللهُ عَن وَجهِهِ النَّار يَومَ القيامَةِ ) رواهُ الترمذي وَ حَسَّنَهُ.

واتە: هەرکەسێك بەرگری لە کەسێکی غەیبەت کراو بکات و نەهێڵێت کەسایەتی لەکەدار بکرێت، ئاوا خوای گەورە دەم وچاوی لە ئاگر پارێزراو دەکات.

جا ئەگەر گوێت بۆ غەیبەتەکە گرت و غەیبەتەکەت بە غەیبەت کار نەبڕی، ئەوا دەبی بەهاوبەشی تاوانەکە.

ـ یەکێك لە پیاوچاکان کە ناوی ( خالد الربعی) یە دەفەرموێت: جارێکیان لە مزگەوتێك دانیشیبووم، کۆمەڵێکی لێ بوون، باسی کەسێکیان دەکرد، منیش غەیبەتەکەم پێ بڕین، کەچی دوای ماوەیەك دەستیان کردەوە بە غەیبەتی هەمان کەس، ئەمجارەیان منیش یەك دوو قسەم کرد، شەوێ لە خەومدا گۆشتی بەرازیان بەزۆر

ەرخوارد دەدام، هەرچی هاوارم دەکرد کە من موسوڵمانم وگۆشتی بەراز حەرامە ، من چۆن گۆشتی بەراز دەخۆم؟ بێ سوود بوو، دووسێ کوتە گۆشتیان بەزۆر دەرخوارد دام، ( سُبحانَ الله ) ماوەی یەك مانگ هەرچیم دەخوارد بۆگەنی ئەو گۆشتە بەرازە هەر لەناو دەمم لانەدەچوو!!.

بەڵێ ئەمڕۆ زۆربەی موسوڵمانان شەوانە خەونی ناخۆش دەبینن، کە بەڕاستی ئەمە زۆربەی هی ئەو غەیبەتانەیە کە لە ڕۆژدا ئەنجامی ئەدەن.

( شێخ سعد یوسف ابو عزیز ) لە کتێبەکەی خۆی بەناوی . ( صَحیح وَصایا الرَسول ﷺ للنِساء ) دەفەرموێت: یەکێك لە برادەرە خۆشەویست وڕاستگۆکانم کە زۆر جێگای متمانەیە، بۆی گێڕامەوەو فەرمووی: جارێکیان لە مەجلیسێکدا غەیبەتی کابرایەکی مردوویان دەکرد، منیش نە قسەم کردوو نە دیفاعیشم لە مردووەکە کرد، بڵێم کاکە باباسی نەکەین، بۆ شەو کە خەوتم لە خەومدا مردووەکەم بینی، ئەو کەسە مردووەی کە لە ڕۆژەکەدا لە مەجلیسەکەدا غەیبەتی دەکرا، لە خەوما ئەو مردووە پێی وتم: ( يَأكُلُونَ لَحمي وَأَنتَ ساكِتٌ، هَل هذا مِنَ الاِسلامِ؟!) واتە: لەبەرچاوی تۆدا گۆشتی منیان دەخوارد تۆش بێدەنگ بوویت وهیچ دیفاعێکت لێنەکردم ئایا ئەمە ئیسلامەتی ودیندارییەو شتی وا لە موسوڵمانان دەوەشێتەوە.؟!

ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر ئەتەوێ لە غەیبەت ڕزگار بیت، ئەوا ئەم خاڵانە جێبەجێ بکە:.

یەکەم: .گومانی خراپ بە خەڵك مەبە. وە چاودێری ژیانی خەڵکی مەکەو جاسوس مەبە بەسەر هەڵس وکەوتی کەسەوە، ئەوەتا خوای گەورە لە سورەتی (الحجرات) دا کەباسی غەیبەت دەکات لە پێشەوە دەفەرموێت:

﴿اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾ خاڵی یەکەم: دەفەرموێت خۆتان بپارێزن لە گومانی خراپ بە خەڵك بردن، ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾ خاڵی دووەم: دەفەرموێت: جاسوسی بەسەر یەکتریەوە مەکەن. ئەمجا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾ غەیبەتی یەکتری مەکەن، کەواتە: بۆ داخستنی دەرگای غەیبەت دەبێت : هەردوو هۆکاری : گومانی خراپ و جاسوسی کردن و چاودێری کردنی ژیانی خەڵکی لا ببەی.

دووەم: . سەیری عەیب وکەم وکوڕی خۆت بکە، چونکە ئەگەر عەیب وکەم وکوڕی خۆتت بینی، ئەوا پێت عەیب وکەمییە باسی عەیبی خەڵکی بکەی و غەیبەتی کەسانی تر بکەی.

هەزاران ڕەحمەت لە ئیمامی شافیعی بێت کە دەفەرموێت:

إذَا شئْتَ أَن تَـحْيَا ودينك سالم . وحظك موفُورٌ وعِرْضُكَ صَيِّنُ
لِسَانَكَ ، لا تذكُرْ به عَوْرَةَ امرىء . فعندك عَـوْرَاتٌ ولِلنَّاس أَلسُنُ
وإنْ أبصرت عَيْنَاكَ عيباً فـقل لها . أيا عَيْنُ لا تنظري؛ فللناس أعيُنُ
وعَاشِرْ بمَعْرُوفٍ وجَانِبْ مَنِ اعتَدى . وفارقْ ولكنْ بالتي هي أحْسَنُ

مثال غەیبت

بەڕێزان: لەسەردەمی پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ پیاوێك بەلای کۆمەڵێکدا ڕۆیشت و سەلامی لێکردن، یەکێك لە دانیشتوان ووتی: (إنّي لَأبغضُ هذا في اللهِ تَعالى) واتە: بەڕاستی ڕقم لەو پیاوەیەو لەبەر خاتری خوا ڕقم لێیەتی، دانیشتوانی مەجلیسەکە ووتیان: بەخوا قسەیەکی خراپت کرد، یەکێکیان چوو بۆ کابرای گێڕایەوەو ووتی کە فڵانە کەس وای پێ ووتوی، کابرای غەیبەت کراو چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕایەوە، حەزرەتیش کابرای بانگ کردو فەرمووی: باشە بۆچی لەبەر خوا ڕقت لە فڵانە کەسە؟ ووتی: غەیری نوێژە فەرزەکان هیچ نوێژی سوننەتم لێ نەدیوە، کابرا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بپرسە بزانە نوێژی فەرزم فەوتاوە؟ غەیبەت کار ووتی: ئەم پیاوە کە من لەبەر خوا ڕقم لێیەتی غەیری مانگی ڕەمەزان ڕۆژوو ناگرێت، غەیبەت کراو ووتی: قوربان لێی بپرسە ئایا هیچ ڕۆژوویەکی مانگی ڕەمەزانم فەوتاندووە؟ غەیبەت کار ووتی: بۆیە لەبەر خاتری خوا ڕقم لێیەتی چونکە بەخشندە نییەو لە ماڵ وسامانەکەی نابەخشێت، غەیبەت کراو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بپرسە ئایا زەکاتی ماڵم هێشتووەتەوەو دەرم نەکردووە؟ لە هەموو جارەکاندا غەیبەت کار دەیگوت: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نە نوێژە فەرزەکانی فەوتاندووەو نەڕۆژووی ڕەمەزانی بە عەمدی خواردووەو نە زەکاتی ماڵ وسامانەکەشی هێشتووەتەوە، ئەوجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:( قُم فَلَعَلَّهُ خَيرٌ مِنكَ) هەستە برۆ لاچۆ لەبەر چاوم، ئەی غەیبەت کار، چونکە زۆر

نزیکە ئەو کەسەی کە تۆ ئاوا بە حیسابی خۆت لەبەر خوا ڕقت لێیەتی، چونکە نوێژی سوننەت ناکات و ڕۆژووی سوننەت ناگرێ و وە خێرو صەدەقە نابەخشێت جگە لە زەکاتی ماڵەکەی، لەوانەیە ئەو زۆر لە تۆ باشتر بێ و بەڕێزتر بێت لای خوای گەورە، ئیتر بۆچی غەیبەتی دەکەی وبۆچی ڕقت لێیەتی. ئەم فەرموودەیە: حَديثٌ حَسَنٌ ، أخرَجَهُ ابنُ أبي الدُنيا بِسَنَدٍ حَسَن .

بەڕێزان: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا کەی غەیبەت کردن دروستە؟ ئایا کاتێك هەیە کە موسوڵمان بتوانێت لە پاشەملە باسی موسوڵمانێکی تر بکات؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ لە ( شەش ) کاتدا پاشەملە باس کردن کە هەر بەغەیبەت ناو دەبرێت، دروستە.

) یەکەم:. کاتێك زوڵم لێکراو ( مەزڵوم ) لای حاکم و کاربەدەست داوای مافی خۆی بکاتەوە کە کەسێك بەئەستەم بەزوڵم، لێی داگیر کردووە، بەبێ زیادوکەم باسی ئەو کەسە بکات، کە چۆن ستەمی لەم کردووەو مافی داگیر کردووە، بۆ نموونە: پیاوێکی قەرز کوێر قەرزی لە کەسێك کردووەو ئێستا کاتی دانەوەی قەرزەکە هاتووە، هەشیەتی وبە ناڕەوا نایداتەوە، لەو بارەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( لَيٌّ الواجدِ يَحِلُّ عُقُوبَتَهُ وَ عِرضَهُ ) قەرز کوێری هەبوو، حەڵاڵە کە هەم سزا بدرێ و هەم غەیبەتیشی بکرێت و لە پاشەملە باس بکرێت، جا لای حاکم باسی بکەی تا داوای مافی خۆتی لێ بکەیتەوەو

قەرزەکەی لێ وەربگریتەوە، یان لای کەسێك یان کەسانێك باسی بکەی بۆ ئەوەی ئەوانیش بیناسن وقەرزی نەدەنێ و نەکەونە داوی.

دووەم: ( الإستِفتاء ) داوای فتوا کردن: بۆ نموونە: ژنێك لای دادوەر دەڵێت: هاوسەرەکەم ئەو زوڵمەم لێدەکات، ئایا بۆم هەیە چی بەرامبەر بکەم؟ هەروەکو لە ( بوخاری وموسلیم ) دا هاتووەکە: ( هیندی کچی عوتبە) عەرزی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ ( أنَّ أبا سُفيان رَجُلٌ شَحيحٌ لا يُعطيني ما يَكفيني أنا وَ وَلَدي أفَآخُذُ مِنْ غيرِ عِلمِه؟!). واتە: ئەبو سوفیانی هاوسەرم پیاوێکی ڕژدو چروکە، ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی پێداویستی خۆم وکوڕەکەم بکات، ئایا ئەگەر بەبێ ئاگاداری خۆی شتێك لە پارەو سامانەکەی هەڵگرم دروستەو حەرام نییە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( خُذي ما يَكفِكِ وَ وَلَدِكِ بالمَعروفِ) واتە : بە ئەندازەی پێویستی خۆت وکوڕەکەت، لە پارەی مێردەکەت هەڵبگرە بەبێ ئاگاداری ئەو، بەڵام زیادەڕەوی مەکەو مەصرەفی زیاد مەکە.

لێرەدا هەرچەندە ئەم باس کردنەی (أبو سوفیان ) غەیبەتە، بەڵام بۆ داواکردنی فتوا دروستە.

سێهەم: لە کاتی ڕاوێژ پێکردندا. دەبێت ڕاوێژکار چی بزانێ ئەوە بڵێت بێ زیادو کەم، ئەوە غەیبەت نییە کاتێك کەسێك لەبارەی شەریکایەتی کردنی کەسێکدا، قەرز پێدان، ژن وژن خوازی، دراوسێیەتی، پرس بە کەسێك دەکات، دەبێت هەروەکو چاکەکانی

دەڵێت، عەیبەکانیشی باس بکات. بڵێ ئاواو ئاوایە، هەروەکو (فاطیمەی کچی قەیس) دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: ( إنَّ أبا الجَهم وَمعاويَةَ خَطَبـاني) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ(ئەبو جەهم ومعاویە ) هەردوکیان هاتونەتە خوازبێنیم و داوا دەکەن کە شویان پێ بکەم، جا من پرس بە جەنابت دەکەم کامیان باشە کە شووی پێبکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( أمَّـا مَعاويَـةَ فَصَعْلُوكٌ لامالَ لَهُ ) معاویە پیاوێکی نەدارو هەژارەو هیچ سەروەت وسامانێکی نییە، خەڵك خێری پێدەکەن، دەستی کاری نییە، ( وَأَمَّا أَبُوجَهَم فضَرابٌ للنِساءِ ) وە هەرچی ئەبو جەهمیشە، ئەوە لێدەری ئافرەتانە،لە ڕیوایەتێکدا (فَلا يَضَعُ العَصبا عَن عاتِقِهِ) بەردەوام وا گۆچانەکەی بەسەر شانیەوەیەتی و هەر قسە لە دەمت بێتە دەرەوە بە گۆچانەکەی پیات دەکێشێ و ڕۆژێ بە لێدان ئەتکوژێت، کەواتە: نە معاویە ی هەژارو بێ ماڵ وبێ حاڵ، نە ئەبو جەهمی لە ژن دەرو تورە، بەکەڵکی ئەوە نایەن تۆ ئەی فاطیمە شویان پێ بکەی، ( أنكِحِـي أُسامَةَ بنِ زَيد ) شوو بە ئوسامەی کوڕی زەید بکە، بەڵێ فاطیمە ی کچی قەیس بە قسەی پێغەمبەری خوای کردو هەروەکو پرسی پێکرد، بە قسەشی کردو شووی بە ئوسامە کردو داواکەی ئەبو جەهم و مەعاویەی ڕەت کردەوە.

سەرنج بدەن: پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو خۆی باسی ئەبو جەهم و مەعاویەی کردوو کەم وکوڕییەکانی باس کردن کە زەرەر بە ژیانی هاوسەریەتی دەگەیەنن، کەواتە: ئەمە غەیبەت نییە.

وەپێویستە ئامارژە بۆ ئەوەش بکەین، کە ئەو کەسەی پرسی کردووە، نابێت بچێت قسەی ڕاوێژ پێکراوەکە بگێڕێتەوەو بڵێ فڵان کەس پێی وتم: شەریکایەتیت نەکەم یان کچی خۆمت نەدەمێ، چونکە پیاوێکی باش نیت، چونکە ئەمە دڵ عادزی وفیتنەیی لێ درووست دەبێت، وە هەروەها نابێت پرس پێ کراو، هیچ ڕق وکینێکی خۆی تێکەڵ بەو پرس پێ کردنە بکات و لە حەق و ڕاستی زیاتر بەرامبەر بەو کەسە هیچی تر نەڵێت.

چوارەم: .کەسێك سەر لە میللەت دەشێوێنێت. جا ئەو کەسە کاربەدەست بێت یان عالم ومەلا بێت، دروستە لای خەڵکی باس بکرێ بۆ ئەوەی خەڵکی فریوی نەخۆن و لێی دوورە پەرێزبن، ( سوفیانی کوڕی عویەینە) دەفەرموێت: سێ کەس هەن باسکردنی کەم وکوڕییەکانیان بە غەیبەت حیساب ناکرێت:

١. پێشەواو سەرکردەو لێپرسراوی ستەم کار کە خیانەت لە گەل ومیللەت بکات.

٢. ئەو کەسەی کە بەئاشکراو بێ شەرمانە گوناه وبێ شەرعی ئەنجام ئەدات و کۆمەڵگا ناشیرین دەکات.

٣. کەسێ بیدعەچی کە بانگەواز بۆ بیدعە دەکات و خەڵکی لەسوننەت دوور دەخاتەوە.

ئەمانە پێویستە باس بکرێن و بە خەڵکی بناسرێنرێن، بۆ ئەوەی موسوڵمانان لێیان توشی زەرەرو زیانی عەقیدەو بیروباوەڕ نەبن.

پێنجەم: ئەو کەسەی بە ئاشکرا گوناه دەکات و زەرەری بۆ موسوڵمانان هەیە. بۆ نموونە: کەسێك چاوی پیسە، حەسوودە، دوو زمانە و فیتنەیە، تانەو تەشەر لێدەر، ئەمە ئەگەر چاوت لێ بوو بەرەو ماڵت هات، یان ووتیان فڵان کەس دێت بۆ ماڵتان، ئەوە دروستەو بە غەیبەت حیساب نییە کە بە ماڵ ومناڵەکەت بڵێی: ئاگاتان لە خۆتان بێت، بەڵایەك هات، لەو بارەیەوە دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:( إِنَّ رَجُلاً إِستَأْذَنَ عَلى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِئذَنوا لَهُ، فَبِئسَ أَخُو العَشِيرَةِ ) واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خواو داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێیان ووت فڵان کەسەو داوای هاتنە ژوورەوە دەکات، فەرمووی: ڕێگەی بدەن با بێتە ژوورەوە بەڕاستی خراپترین کەسی هۆزەکەیەتی، بەڕاستی پیاوێکی بەڵایە، ( واتە: پێغەمبەری خوا پێشتر کابرای دەناسی) جا کاتێك کابرا هاتە ژورەوە، پێغەمبەری خوا ڕێزی گرت و قسەی نەرم وخۆشی لەگەڵدا کردو پاش ماوەیەك کابرا ڕۆیشت، حەزرەتی عائیشە بە سەرسوڕمانەوە عەرزی پێغەمبەری خوای کرد:( يا رَسُول اللهِ ﷺ قُلتَ لَهُ الَّذي قُلتَ، دَخَلَ أَلَنتَ لَهُ القَولُ؟!) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ووتیان فڵان کەسە ئەوەت فەرموو کە فەرمووت، فەرمووت: پیاوێکی بەڵاو خراپە، کەچی کە

هاتە ژورەوە قسەی خۆشت لەگەڵ کردو ڕێزت گرت، ئەمە چەندی بە چەند؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە:( إِنَّ شَرَّ النـــاسِ مَنزِلَةً يَومَ القيامَةِ مَن تَرَكَهُ النَّاسُ إتقاءَ فَحَشِه ) رَواهُ مُسلم (٢٩٩١).

واتە: بەڕاستی خراپترینی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسانەن کە خەڵکی لەبەر خراپەو لارو لەوێری و پێچ وپەنای، خۆی لێ دەپارێزن و حەز بە هاتوچۆو تێکەڵاوی ناکەن.

ئای ئەمڕۆ چەند کەس هەیە خەڵك لە ترسی غەیبەت وبوختان وچاوی پیسی و دەروونی پڕ لە حەسادەتی و نەشتەری زمانی، خۆی لێ دەدزنەوەو ئەگەر بیەوێ لە شوێنێك خانوو بکات، خەڵکی خانووی خۆی بەرچاو دەکەوێ، ناوێرێ دراوسێیەتی بکات، ژنی وا هەیە ، لە ترسی چاوو زمانی شڕی، خەڵك گەڕەکیان لەبەر چۆڵ کردووە! جا با ئەمانە لە خوا بترسن و هەروەکو لە دونیادا بە خراپترین خەڵك ناسراون، زوو تەوبە بکەن و واز بێنن، بۆ ئەوەی لە قیامەتیشدا بە خراپترین خەڵك ناو نەبرێن.

شەشەم.. کەسێك بە لەقەبێك، نازناوێك ناسرابێت لەناو خەڵکیداو ئەگەر بەو شێوەیە ناوی نەهێنی، نەتوانی مەبەستەکەت بگەیەنی بە گوێگر، بۆ نموونە: کەسێك بە فڵان کەسی نابینا، بە فڵان کەسی شەل، کەڕ ، ناسراوە، ئەگەر وا ناوی نەهێنی، کەسی بەرامبەر تێناگات تۆ مەبەستت کێیە، ئەمە بە غەیبەت حیساب ناکرێت، بە مەرجێك مەبەستت لە وتنی ئەو نازناوە، بۆ سووکایەتی پێکردن و شکاندن نەبێ ئەگینا حەرامە. وە دەبێت مرۆڤی موسوڵمان هەوڵ

بدات ووشەی جوان بدۆزێتەوەو ئەوەیان بڵێت، بۆ نموونە: لە جیاتی بڵێ فڵان کەسی کوێر، بڵێت فڵان کەسی نابینا، لە جیاتی فڵان کەسی کەڕ، جوانترە بڵێ فڵان کەسی نابیست، وە لە جیاتی فڵان کەسی لاڵ، جوانترە بڵێ فڵانی ناگۆ، وە ئەگەر توانیشی بەبێ ئەو نازناوە فڵان کەس بناسێنێ، ئەوە چاکترەو لە هەموو ئەم حاڵەتانەش دا دەبێت بزانین ( الضَرُورَةُ تُقَدَّرُ بِقَدَرِها ).

بەڕێزان: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا تەنها غەیبەتی موسوڵمان حەرامە، یان غەیبەتی گاورو جولەکەش حەرامە کە لەگەڵ موسوڵماناندا دەژین؟ لە وەڵامدا دەڵێین: غەیبەتی گاورو جولەکەش حەرامە، تەنانەت غەیبەتی کافرو مولحیدیش حەرامە، مادام لە ماڵی خۆیدا بێ شەرعی بکات، وەکو عەرەق خواردنەوە، مادام بە ئاشکرا نایکات نابێت غەیبەتی بکەی.

هەروەها گاورو جولەکەو ئاینەکانی تر، ئەگەر گوناهیان لە ماڵی خۆیان دا دەکردو بە ئاشکرا لەبەر چاوی موسوڵماناندا نەیان دەکرد، ئەوا بۆ هیچ موسوڵمانێك نییە بچێتە سەریان و سزایان بدات، وە لە ماڵی خۆیدا غەیبەتیان بکات وباسیان بکات.

لە مەزهەبی پێشەوا ( ابو حەنیفە ) دا دەفەرموێت:( أَمّـا الخَمـرُ وَالخِنزِيرُ إِذا مَلَكَهُما غَيرُ المُسلِمِ فَهُما مالانِ عِندَهُ، فَمَن أَتلَفَهُما عَلى الذِّمِيِّ غَرِمَ قيمَتَهُما )(غَير المُسليمينَ في المُجتَمَع الإسلامي، الدكتور يوسـف القرضـاوي ص١٥) واتە: بەڵام عەرەق وگۆشتی بەراز ئەگەر غەیرە موسوڵمان، بوو بە خاوەنیان، ئەوە لەلای ئەو دوو شتی بەنرخن

ومالّن، جا هەرکەسێك چوو عەرەقەکەی ڕشت وگۆشت بەرازەکەی فڕێ دا، یان بەرازەکەی کوشت، کە ئەو گاورە یان جولەکەیە ( زمییە ) و لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژی، ئەوە دەبێت بۆیان ببژێردرێت، واتە: بە موسوڵمانەکە دەبژێردرێت.!

جا ئایا موسوڵمانان یان هەموو خەڵکی کە داوای ئازادی بیروباوەڕ دەکەن، لە غەیری ئاینی ئیسلامدا ئاوا ڕێزی عەقیدەو بیروباوەڕی مرۆڤ گیراوە؟! بێگومان نەخێر.

هەروەها دەفەرموێت: بۆ هیچ موسوڵمانێك نییە: ( أن یَسُبَّهُ، أو یَشنَع عَلَیهِ بالکَذِبِ أو یَغتابَهُ ویَذکره بما یکره في نَفسهِ أو نَسَبهِ أو خَلقهِ، أو خُلُقِهِ ) واتە: ئەو گاورو جولەکەیەی کە لە ماڵی خۆیدا دانیشتووەو هیچ زەرەری بۆ موسوڵمانان وهاوڵاتییان نییە، وە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژی، بۆ هیچ موسوڵمانێك نییە کە جنێوو قسەی ناشیرینی پێ بڵێت، یان درۆی بە دەمەوە بکات، یان غەیبەتی بکات و لە ماڵی خۆیدا باسی عەیب وعارو کەم وکوڕییەکانی بکات. وە حەرامە تانەو تەشەر بدات لە شەخصیەت وکەسایەتی یان لە ڕەچەڵەك وبنەماڵەی، یان لە شێوەی لاشەی یان لە ڕەوشت وئەخلاقی.

( یَقُولُ الفقیه الأُصولي المالِکي: شِهاب الدِّین القرافي في کتاب – الفروق – (فَمَن إعتَدی عَلَیهِم ولَو بِکَلمَةِ سُوءٍ أو غَیبَةٍ فَقَد ضَیَّعَ ذِمَّةَ اللهِ وَ ذِمَّةَ رَسولِ الله "ﷺ" وَ ذِمَّةَ دِینِ الإسلامِ )

واتە: هەرکەسێك دەست درێژییان بکاتە سەر، واتە: سەر گاورو جولەکە، لە وڵات ودەسەڵاتی ئیسلامیدا، با ئەو دەست درێژی ونارەحەت کردنە، بە تەنها ووشەیەکیش بێت، یان بە غەیبەت کردنیان بێت، ئەوا زیمەی خواو پێغەمبەرەکەی و ئیسلامی لە دەست داوە.

لە کتێبی بەناو بانگی فیقهی حەنەفیدا( الدُّرُ المُختار – وَ حاشيَةُ إبنُ عابدِين عَلَيــهِ ج٣ ص٣٤٤) دا دەفەرموێ:( وَتَحــرم غَيبَتــهُ كَالمُسلِم – قالَ إبنُ عابدِين: لِأَنَّهُ بِعَقدِ الذمَّة وَجَبَ لَهُ ما لَنــا، فَــإذا حرمت غَيبَةُ المُسلِم حرمت غَيبَتَهُ بَل قالُوا: إن ظُلمَ الــذمِّيَ أشَــدُّ )
واتە: حەرامە غەیبەت کردنی گاورو جولەکە هەروەك غەیبەت کردنی موسوڵمانان.

( ابن عابدين ) دەفەرموێت: بۆیە حەرامە غەیبەت کردنی گاورو جولەکە، چونکە بەستنی پەیمانی پاراستنی ئەو گاورو جولەکەیە لەلایەن دەسەڵاتی ئیسلامییەوە بۆی پێویست دەبێت ئەوەی بۆ ئێمەی موسوڵمان هەیە، واتە: مافی هاوڵاتی بوونیان هەیە، وەکو هەرکەسێکی وڵاتەکە، جا کەواتە ئەگەر غەیبەتی موسوڵمان حەرام بێت، بە هەمان شێوە غەیبەت کردنی ئەوانیش حەرامە، بەڵکو هەندێك لە زانایان فەرمویانە: ستەم کردن لە ئەهلی زیممە، تاوانەکەی گەورەترە لە ستەم کردن لە موسوڵمان.!

وە هەر لە حاشییەی ( ابن عابدین ) لە فیقهی حەنەفی ج٣ ص٤١٨ دا دەفەرموێت: ( يمنَعُ المُسلِم مِن أَن يَقُولَ للذمِّيّ: يا كـــافر أو يـــا عَدُوّالله، لِتَأذيه بمِثْلِ هذهِ العِبارات، وَ يَستَحِق المُسلِمُ التَعزيرَ عَلَـــى ذلـــــك! ) واتـە: قەدەغـە كـراوە لـە موسـوڵمانێك، بـە گاورێـك يـان جولەكەيـەكی هاوڵـاتی نـاو دەوڵـەتی ئیـسلامی بڵێـت: ( كـافر) يـان دوژمنی خوا، چونكە بـەم جۆرە ووشـانە، ئـەو زیمميـە دڵـی ناڕەحـەت دەبێ و هەست دەكات كـە سوكايەتی پـێ كـراوە، لەبـەر ئـەوە دەبێـت ئـەو موسـوڵمانە، سـزا بـدرێ وتـەمێ بكـرێ، لەسـەر ئـەو قسەيەی كـە وتويـەتی بـەو گـاورە، يـان بـەو جولەكەيـە. وە بێگومـان غـەيری گـاورو جولەكەش ئيتر هـەر بيروباوەڕو بەناو ئاينێكيـان هـەبێت، هـەر هـەمان پارێزراوييان هەيە.

بەڵێ خۆ هەرچەندە گاورو جولەكە، بەڕاستی كـافرن، چونكە هـەر كەسێك بڕوای بە پێغەمبەرايەتی حەزرەتی محمد نـەبێت، ئـەوە مانـای وايـە، پێغەمبەرەكـەی خـۆی و كتێبـە ئاسمانييەكـەی خۆشـی بـە درۆ خستووەتەوە، چونكە حـەزرەتی موسـا و حـەزرەتی عيسـا و تـەورات وئينجيــل، هــەمووی هــەواڵيان داوەو موژدەيــان داوە بــە هــاتنی پێغەمبــەری ئــاخر زەمــان، خاتــەمی ئــەنبياو مورســەلين، حــەزرەتی محمدی ئەمين، هەر بۆيە هەموو گاورو جولەكەو ئاينەكانی تر كـافرن، چـونكە كتێـب و پێغەمبەرەكـەی خۆيـان بـە درۆ خـستووەتەوە، جـا ئەمانـە كـە شـك وگوومـان نييـە لـە كافرێتييـان دا، وە هـەموو كافرێـك دوژمنـی خوايـە، بـەڵام چـونكە ووتنـی ئـەم ڕاستييە لەسـەر زمـانی

موسـوڵمانێکی ڕاسـتگۆدا بـەرەو ڕووی گـاورو جولەکەیـەکی هاوڵـاتی خـاکی موسـوڵمانان دەبێتـە هـۆی دڵ ئـازاردانی، حەرامـە موسـوڵمان بـەرەو ڕووی خـۆی پێـی بڵـێ ئـەی کـافر یـان ئـەی دوژمنـی خـوا، وە ئەگەر ووتی ئەوا سزا ئەدرێت لەلایەن دادگای ئیسلامییەوە.

بەڵێ ئیمانداران: ووتارەکەمان باسی غەیبەت کردنە، بەڵام زۆر بە پێویـستم زانـی کـە ئەمانـەش، ئـەم هەڵوێـستانەش کـە هەڵوێـستی ئیسلامە بەرامبەر بە شوێن کەوتوانی بیروباوەڕەکـانی غـەیری ئیـسلام بخەمە ڕوو، چونکە ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر موسوڵمانان بە ناحەق ونـاڕەوا، ناشـیرین دەکـرێن و بـە تونـدو تیـژو دژە مـافی مـرۆڤ و دژە ئـازادی بیروبـاوەڕ نـاو دەبـرێن و نـاو دەنـرێن، بـەڵام ئایـا کـە ئەمـە هەڵوێستی دینـی پـاکی ئیسلامە، کە دینـی هەڵبـژێردراوی خوایـە بـۆ مرۆڤایەتی، ئایا تاوان نییە بڵێی غەیری ئیسلام هیچ کەس ئاوا مـافی بـە مـرۆڤ داوە، ئایـا لـە هـیچ وڵـاتێکی مـرۆ دۆسـت ودیمـوکرات و پارێزەری مافی مرۆڤی ئەمڕۆی جیهـانی عەولەمـەدا، ئـەم ڕێزگـرتن لـە مافی مرۆڤە، مرۆڤێك کە بڕوای بە یاسـاکان و بنـەماکانی ئـەو دەوڵەتـە نەبێت، ئاوا هەر بە یاسـا بپـارێزرێ و بەکردەوەش جێبـەجێ بکرێـت؟ ئەوەی تۆزقاڵێ ویژدانی زیندوو مابێت، دەڵێت نەخێر.

بەڵێ بەڕێزان: ئیسلام دینـی ئازادییـە، لـە غـەیری ئـەم ئیسلامەدا، ئازادی ڕاستەقینەی مرۆڤ تەنها نوسـینی سـەر کاغـەزە. سـەرنجی ئـەم یاسا شەرعییە بدەن:.

سەم شال ئازادی

هەر لە حاشییەی ( ابن عابدین ) دا هاتووە: ( إذا تَنــازَعَ إثنــانِ طِفلاً، وَكانَ أَحَدُهُما مُسلِماً وَالآخَرُ ذِميَّــا ) ئەگەر دوو کەس لەسەر منداڵێك بوو بەنیزاع وکێشەیان، هەر یەکەیان دەیگووت: ئەو منالە دەبێت بۆ من بێت، منداڵێکی مەلۆتکەی ساوا، ئەو دوو کەسە یەکێکیان موسوڵمان بوو، ئەوی تریان گاور یان جولەکە یان هەر بیروباوەڕێکی غەیری ئیسلامی هەبوو، چونە دادگای ئیسلامی لەبەردەم قازی موسوڵماناندا، موسوڵمانەکە وتی: جەنابی قازی ئەم منالە هی منە، چونکە کوڕی کۆیلەکەمە و باوکی نەماوەو کوڕەکەشی هەر بۆ من دەگەڕێتەوە، بەڵام جولەکەکە یان گاورەکە وتی: جەنابی قازی ئەم منالە کوڕی خۆمە، ئەوا لەو کاتەدا قازی حوکم دەدات بەوەی کە ئەو منداڵە بدرێت بە گاور یان جولەکەکە، بۆچی؟! چونکە: ( لأَنَّ تَنشِئَةَ الطِفلِ عَلى الحُرِيَةِ وَإن كانَ عَلى غَيرِ دِيــنِ الإســلام أَفضَلُ مِن تَنَشِئَتِه عَلى العُبُوديَةِ وَإن كانَ عَلى الإسلام، إذ أَن حُرِيَةَ المَرءِ وَكَرامَتَهُ يَرتَبِطانِ بِإنسانِيَتِهِ فَيَسبِقانِ دِينَهُ وَيَتَقَدَّمانِ عَلَيهِ ).

واتە: منداڵەکە دەدرێت بە غەیرە موسوڵمانەکە کە دەڵێت کوڕی خۆمە، چونکە گەورە بوون وگەشە کردنی منالْ لەسەر ئازادی و سەربەستی با لەسەر غەیری دینی ئیسلامیش بێت، چاکترەو لە پێشترە لەوەی کە گەورە ببێ وگەشە بکات لەسەر بەندایەتی وکۆیلایەتی، با لەسەر دینی ئیسلامیش بێت، چونکە ئازادی مرۆڤ و پاراستنی ڕێزو حورمەتی و ڕزگار بوونی لە تیری کۆیلایەتی

پەیوەندییان هەیە بە مرۆڤ بونییەوە، لەبەر ئەوە پێش دەکەون لە سەر ئاین و بیروباوەڕەکەی، چونکە مرۆڤ پێش ئەوەی دابەش بکرێت بۆ کافرو موسوڵمان، خوای گەورە ڕێزی مرۆڤ بوونی پێ بەخشیوە، بە ئایەتی: ﴿وَلَقَد كَرَّمنا بَني آدَم﴾ .

جا ئایا لە غەیری ئیسلام دا ئەم مافی سەربەستی و ئازادییە بە مرۆڤ بەخشراوە؟!

لە کۆتایی ئەم ووتارەدا دەڵێم: بەڵێ ئەمە ئیسلامەکەی ئێمەیەو پێویستە شانازی بە ئیسلامەکەی خۆمانەوە بکەین، ئەم ئیسلامەتییەش نیشانەیەکی هەیە، کە هەویەو ناسنامەی هەڵگرەکەیەتی ئەویش: ( المُسلِمُ مَن سَلِمَ المُسلِمونَ مِن لِسانِه وَ يَدِه) موسوڵمانی ڕاستەقینە کەسێکە : کە موسوڵمانان لە زمان ودەستی سەلامەتن، وە دەبێت ئاگاداری خۆمان بین کە بەڕاستی نوێژو ڕۆژو خێرو صەدەقە، کاتێك دەبنە مایەی ڕەزامەندی خواو چونمان بۆ بەهەشت، ئەگەر بە زمانمان ئازاری کەسمان نەدابێت، بەتایبەتی خۆمان لە بەڵای گەورەو بەربڵاوی غەیبەت بپارێزین.

خوای گەورە زمانێکی پاراوو بەزیکرو یادی خواو دوور لە غەیبەت و ناشەرعیمان پێ ببەخشێت، اللهم امیـــن.

# سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز.
٢. دَليلُ الانفس د. محمد عزَالدين توفيق
٣.الوصايا المنِبَرية محمد عبدالعاطى بَحيري
٤.صحيح وَصايا الرَسول ﷺ للنسِاء سعد يوسف أبو عَزيز
٥. وصايا الرَسول "ﷺ" د. محمد بكر اسماعيل
٦. مَوسُوعة نَظرة النَعيم .
٧. غَيرَ المُسلِمين في المُجتَمَع الإسلامي د. يوسف القرضاوي
٧. الأقليات غَير المُسلِمة في المُجْتَمَع الإسلامي دندل جبر

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ أَجمَعينَ:

**ئیمانداران: یەکێك لەو دیاردانەی کە لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا هەمووومان پێوەی پابەند بوین، قورئان خوێندن ودەورکردنەوەی قورئان وگوێ گرتن بوو لە قورئانی پیرۆز، کە ئەمە شتێکی چاوەڕوان کراوە، چونکە ڕەمەزان مانگی قورئانە، بەڵام بە داخەوە لە دوای مانگی ڕەمەزانەوە، کەمتر یان هەیە هەر بە یەگجاری قورئانەکەی دەپێچێتەوەو نایخوێنێتەوە تا ڕەمەزانی داهاتوو، کە لە ڕاستیدا دەبوایە هەموو ساتێك، لە هەموو ڕۆژو هەفتەو مانگێکدا، ئەگەرچی وەکو مانگی ڕەمەزانیش نەبوایە، قورئانمان هەر بخوێندایە، لەبەر ئەوەی گەورەترین کەناڵ بۆ ناسینی خوای گەورە، قورئانی پیرۆزە.**

**بەڵێ ئیمانداران: ئەم قورئانە موعجیزەیە، گەورەترین ئیعجازی قورئان ئەوەیە کە کەلامی خوایە، ئەو سەرچاوەیەی کە قورئانی پیرۆزی لێوە هاتووە بەڵگەیە لەسەر ئیعجازی قورئان، جا کە قورئان کەلامی خوایە، ئەوا کەلام وقسەی خوا فەزڵ و گەورەیی هەیە بەسەر هەموو قسەو گوفتارێکدا، هەروەکو خوای گەورە خۆی ( سبحانە وتعالی) گەورەیە بەسەر هەموو دروستکراوەکانی دا.**

**ئیعجازێکی تری قورئان کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان کەلامی خوایە، ئەوەیە: تەحەدای هەموو مرۆڤایەتی دەکات تا قیامەت، ﴿قُل**

لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾ الأسراء ٨٨

**واتـە: ئـەی محمـد ﷺ پێیـان بڵـێ: سـوێند بـەخوا ئەگـەر هـەموو ئـادەمیزادو پەرییـەکان کـۆ ببنـەوەو هـەوڵی بـەردەوام بـدەن، تـا قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە مەیدان، ناتوانن کاری وا بکەن وناتوانن لـە وێنـەی ئـەم قورئانـە بهێـنن، ئەگەرچـی هـەموو لایـەکییان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر.**

**ئیمانـداران: ئەگـەر سـەرنجی ئایەتەکـە بـدەین، دەبیـنین ئـەم تەحەدایانەی لە خۆی گرتووە:.**

**١. کتێبێکی وەکو ئەم قورئانە بهێنن.**

**٢. نـەك هـەر مـرۆڤ بـا جنۆکـەکانیش هاوکارییـان بکـەن و هـەموو بەیەکەوە خەریك بن.**

**٣. نەك هەریـەك کـەس بـە تـەنها خـەریك بێـت، بـەڵکو بـا هـەموویان بەیەکـەوە بێن و بچنە پـاڵ یـەکتری و کۆڕوو سیمینار بگرن و بیریـان بخەنە پاڵ یـەکترو بە بیرو عـەقڵ وزانسـتی هـەموویان کتێبێکی وەکو قورئان دابنێن.**

**٤. گەورەیی تەحەداکە: ﴿لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ﴾ ناتوانن کتێبێکی وا دابنێن، تەماشاکەن، هێشتا ئەو کافرو خوانەناسانە، ئەو نەیارانەی قورئـان کۆنەبونەتـەوەو دانیـشتنیان نـەکردووە، هـەوڵیان نـەداوە، کـە**

خـوای گـەورە سـەرئەنجامەکەی نیـشان داون، کـە دوای هـەموو کارەکانیان ناتوانن پەڕاوێکی وەکو قورئان دابنێن.

بـەڵێ خۆشەویـستان: کاتێـك ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوەو کـەس وەڵـامی پـێ نـەبوو، ئـەمجا خـوای گـەورە خـۆی فـەرمووی:

﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٣﴾ هود ١٣

واتـە: لەگـەڵ ئـەو هـەموو بەڵگـە ئاشـکراو دیارانـەدا، لەسـەر ڕاستییەتی قورئان، کەچی ئەوانە دەڵێن: محمد قورئانی بەدەم خواوە هەڵبەستووەو قسەی محمد خۆیەتی نەك کەلامی خوا، ئەی محمدی خۆشەویست تۆش پێیـان بڵـێ: جا ئێوەش دە سوڕەتی هەڵبەستراو بەدەم خواوە وەکو وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، بۆ ئەم کارەشتان جگە لە خوای گەورە هەرکەس دەتانەوێ ودەتوانن بانگی بکەن بۆ ئەوەی هاوکاریتان بکات، ئەگەر ڕاست ئەکەن.

بـەڵێ لێـرەدا خـوای گـەورە داواکارییەکـەی بـچووك کـردەوەو فەرمووی: ئەمجارەیان نەك کتێبێکی وەکو قورئان، بەڵکو دە سوڕەتی وەکو ئەو سوڕەتانەی قورئان بهێنن، کە دە سوڕەتی بچکۆلە چەند لاپەڕەیەك دەکات، خوای گەورە فەرمووی: تەنها چەند لاپەڕەیەکی زۆر کەم بە هاوشێوەی قورئان بنووسن، ئەگەر ڕاست دەکەن و دەڵێن محمـد بـۆ خـۆی قورئـانی دانـاوە، دەی خـۆ ئێـوەش مـرۆڤن و بـە

هەمووتان وەرن نەك هەموو قورئان تەنها چەند لاپەڕەیەكی وەكو قورئان بنووسن.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی دا بە گوێی دوژمنانی سەرسەختی ئیسلامداو هەموو سەریان بەیەكەوە ناو چی هەوڵیان داو سەدان شاعیرو ئەدیب ونوسەریان كۆكردەوە، كەچی ( سبحان الله ) نەیانتوانی نەك دە سوڕەت بەڵكو تەنها سوڕەتێكی وەكو قورئانیش بهێنن.

جا كاتێك كە وەڵامیان نەبوو، وە سەریان شۆڕكرد، ئەمجارەیان خوای گەورە بۆی كەمتر كردنەوەو فەرمووی:

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ البقرة ٢٣ .

واتە: ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم قورئانە پیرۆزە هەیە، كە دامان بەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان حەزرەتی محمد ﷺ ئەگەر بۆتان دەكرێت ئێوەش هەوڵ بدەن، سوڕەتێكی وەكو ئەو بهێنن، هاوپەیمان وهاوكارەكانیشتان جگە لە خوا بۆ ئەو مەبەستە بانگ بكەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن.

پاشان تەحەداكە گەورەتر دەكات و هیچ ڕێگایەكیان لەبەردەم دا ناهێڵێت و دەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ البقرة٢٤ .

واتە: خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن، کەواتە باوەڕ بهێنن وخۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سوتەمەنییەکەی خەڵك وبەردە، کە بۆ بێ باوەڕوو خوانەناسان ئامادەکراوە.

بەڵێ لەو ڕۆژەوە کە ئەم ئایەتە هاتووە، هەتا ئەمڕۆو هەتا قیامەتیش کەسێك نەیتوانی وکەسیش ناتوانێت، تەنها دێڕێك وەکو قورئان دابنێت، کە ئەمەش وەکو سەرەتا باسمان کرد ئیعجازی یەکەمی قورئانە کە کەلامی خوایە، بۆیە مرۆڤ دەستەوستانە لە دانانی بچوکترین هاوشێوەی، ئەینا هەرچی مرۆڤ بیڵێت بەبێ گومان چەندین مرۆڤی تر دەتوانن هەمان شت یان باشتر بڵێن، وە تاقە کتێبێك کە لەسەر زەوی هەیەو هەرئەویش دەبێت، قورئانی پیرۆزە کە هاوشێوەی نییە، کەواتە: سەربەرزی و گەورەییە بۆ شوێن کەوتوانی قورئان، کە پەیڕەوێکی ئاوا بێ وێنەیان هەیە بە درێژایی مێژووی ژیان.

ئیمانداران: یەکێکی تر لە ئیعجازەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەیە کە: هەرکەسێك هەرچەند دژی بێ و چاوی بە ڕووناکی ونووری ئەو قورئانە هەڵنەیەت و دژی قورئان و پەیامەکەی بێت، کەچی هەر کە گوێی لە قورئان بوو، هەر ئەوەندەی چەند ووشەیەکی قورئانی گوێ لێ بوو، ئیتر خۆی پێناگیرێ وحەز دەکات زیاتری گوێ لێبێت، بۆ نموونە: لەئەوپەڕی بێهێزی دەسەڵاتی ئیسلامداو لە سەردەمی مەککەدا کە موسوڵمانان هەموو جۆرە ئەشکەنجەو ئازارێکی مادیی ومەعنەوییان لەسەر تاقی دەکرایەوە، هەر ئەو موشریکانەی کە ئاوا

ئازاری موسوڵمانانیان ئەداو هەوڵی پەشیمان کردنەوەیان دەدان، کەچی دەترسان لە خۆیان کە گوێبیستی قورئانی پیرۆز بن، نەوەکو بۆ خۆشیان بە کاریگەری قورئانەکە ئیمان بێنن.

بەڵێ ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتییە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵ هاتە دەرەوەو ڕۆیشت لە پەنای کەعبەدا نوێژ بکات، موشریکەکانی مەککە هەموو چاویان لێ بوو، زۆریان پێ ناخۆش بوو، هەتاوەکو سەرکردەی سەرسەختی موشریکین ( ئەبو جەهل ) وتی: ئەوە محمد بە تەمایە لەبەر چاوی ئێمەدا بڕوات لە پەنای کەعبەدا سوژدە بۆ خوای خۆی ببات، سوێند بە ( لات وعوزا ) ئەگەر ئەو کارە بکات ملی ئەتەقێنم، بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەنهاو بێکەس هات بۆ لای کەعبەو نوێژی دابەست، ئەبو جەهل ڕۆیشت بۆ لای، بەڵام کاتێك کە نزیك بویەوە، بە هەردوو دەستی وەکو ئەوەی شتێك بۆ دەم وچاوی بێت، دەستی ڕادەوەشاندوو ئەو شتە نادیارەی لە خۆی دوور دەخستەوەو بە هەڵە داوان و بە شپرزەیی گەڕایەوە بۆلای سەرانی کوفری مەککە،! قوڕەیشییەکان وتیان: ئەوە بۆچی وا تێك چووی و ڕەنگ بە ڕووتەوە نەماوە؟ ئەوە چیت لە خۆت دوور دەخستەوە خۆ ئێمە هیچمان نەبینی، ئەبو جەهل وتی:( إِنَّ بَينِي وَ بَينَ مُحَمَدِ خَندَقاً مِن نارٍ وَإِنِّي أرى أجنِحَةً ) واتە: بەڕاستی لە نێوان من ومحمددا چاڵێکی گەورە هەبوو کە هەرگیز نەمدەتوانی لێی بپەڕمەوەو دەستم بگاتە محمد، وە هەروەها چەند باڵێکم بینی کە بەرەو دەم وچاوم ئەهاتن و دەمویست لە خۆمیان دوور بخەمەوە،

هەموو بە ئەبو جەهل پێکەنین و ووتیان دیارە لە محمد ترساوی، ئەگەرنا ئەچاڵ هەیەو نە باڵیش دیارە! دواتر هەندێك لەو موسوڵمانانەی کە هێشتا ئیمانەکەیان ئاشکرا نەکردبوو، وە گوێ بیستی ئەم قسانەی ئەبو جەهل بوون، بۆ پێغەمبەری خوایان گێڕایەوەو لێیان پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چی بووە کە ئەبو جەهل بینیویەتی؟ فەرمووی: ( وَالَّذي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَودَنــا – أي لَو إقتَرَبَ مِنّي – لاختَطَفَتهُ المَلائِكَــةُ عــضواً عَــضواً ) واتە: سوێند بەو خوایەی کە نەفس وگیانی محمدی بەدەستە، ئەگەر ئەبو جەهل لێم نزیك ببوایەتەوە بۆ ئەوەی ئازارم بدات، ئەوا فریشتەکان، ( کە ئەو باڵەی بینیویەتی باڵی فریشتە بووە )، پەلاماریان ئەداو پارچە پارچەیان دەکرد.

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەنگە خۆش و زوڵاڵەکەی، کە بەردو شاخە ڕەقەکانی مەککەی ئەهێنایە جۆش وخرۆش، سورەتی ( النجم ) ی دەخوێندەوە، دەنگی لێ هەڵبڕی و موشریکەکانیش وا گوێیان لێیەو لێویان دەکرۆشن، بەڵام کاتێك کە گەیشتە کۆتایی سورەتەکە کە دەفەرموێت: ﴿أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩ ﴿٦٢﴾﴾

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی تیلاوەی برد، یەکسەر هەرچی موشریك وبت پەرست هەبوون، کە لەو کاتەدا لەو شوێنەدا بوون و گوێ بیستی قورئان خوێندنەکەی پێغەمبەری خوا بوون ﷺ

**خۆیـــان بـــۆ نـــەگیراو بەیـــەك کـــەوتن بـــە ســـوژدەدا. ! ئـــەم فەرموودەیـە:** رواه البخاري في التفسير (٤٨٦٢) في كتاب السجود بسورة النجم، أيْ بسُورَةِ النَجمِ، و سجد مضعهُ المُشرِكون، و المُسلمون و الجنَ و الأنس.

**واتـــە: پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ لـــە کۆتـــایی ســـوڕەتی ( الـــنجم ) دا ســـوژدەی تـــیلاوەی بـــردو لەگـــەڵیا هـــەموو موشـــریکەکانی ئـــەو دەورو بـــەرەو موســـوڵمانان وجنۆکـــەکان و مرۆڤـــەکان ســـوژدەیان بـــرد.ئایـــا جنۆکەکانیش؟ بەڵێ ئەی خوای گەورە نافەرمووێت:** ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝١ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ۝٢ ﴾ **الجن ٢،١**

**بەڵێ ئەم سوژدە بردنەی موشریکەکان لە ژێر کاریگەری قورئانـدا بـــە هـــەموو لایەکـــدا بڵـــاو بویـــەوە، تەنانـــەت ئـــەو موســـوڵمانانەی هیجرەتیـان کردبـوو بـۆ حەبەشـە، کەئـەم خەبـەرەیان بیـست یەکسەر گەڕانەوە بۆ مەککە، وایان زانی قورەیشییەکان موسوڵمان بوون. بەڵام کاتێك موشریکەکان سەریان هەڵبڕی، خێرا پەشیمان بونەوەی خۆیـان دەربڕی و کافر بونەوە.**

**بەڵێ کاریگەری قورئانی پیرۆز لەسەر هەموو دڵەکانە بە گشتی، بەڵام ئەو کاریگەرییە لە کام دڵدا جێگیر دەبێ ودەمێنێتەوە؟ خـوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾﴾ ق٣٧.

**واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە بە ئاگاهێنەرەوەیە بۆ کەسێك کە دڵی زیندووی هەبێت، یاخود گوێ بۆ قورئان ڕادێرێت، لە کاتێکدا ئامادە بێت بۆ فەرمان بەرداری و کردنی هەموو کارێکی درووست.**

**ئیمامی عوثمان دەیفەرموو:** ( وَاللهِ لَو طهرت قلُوبُنا ما شَعبِنا مِن كَلامِ رَبِّنا ) **سوێند بە خوای گەورە ئەگەر دڵەکانمان پاك و زیندوو بن، هەرگیز لە کەلامی خوا کە قورئانە تێر نابین.**

**بەڵێ بەڕێزان: ئەم قورئانە گەورەترین دوژمنەکانی کە کافرەکانی مەککە بوون، لەسەردەمی مەککەدا شاهیدییان بۆ گەورەیی وباڵا دەستی و بێ وێنەیی داوە** ( وَالحَقُّ ما شَهِدَت بِهِ الأعداءُ ).

**گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرن: کاتێك کە ( وەلیدی کوڕی موغەیرە ) بە نوێنەرایەتی هەموو کافرەکانی مەککە چوو بۆ لای پێغەمبەری خواو پێی ووت: ئەی محمد ئەگەر تۆ بۆ سەرکردایەتی کردن ومەسئولیەت داوادەکەی، ئەوا دەتکەینە سەرکردەی خۆمان، ئەگەر بۆ ماڵی دونیاو سامان وادەکەی، ئەوا دڵنیابە هەموو بازرگانییەکەمانت ئەخەینە بەردەست و دەتکەینە گەورەترین سەرمایەداری مەککەو دەوروبەری، خۆ ئەگەر نەخۆشی و جنۆکە دەستی لێوەشاندووی، ئەوا دەتبەینە لای باشترین دکتۆرو ناودارترین نوشتە نوس و چارەسەرت دەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ**

زۆر بە هێمنی هەر گوێی گرتبوو ... د هیچ قسەیەکی نەدەکرد، کاتێك وەلید بێدەنگ بوو. پێغەمبەری خوا ... فەرمووی: هیچ قسەیەکت نەماوە؟ ووتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەی گوێم بۆ بگرە، قورئانی پیروزی بۆ خوێندەوە، وەلید دڵی نەرم بوو. قسەی نەکردو ڕۆیشت. واتە: لەبەرامبەر قورئاندا هیچی بۆ نەوتراو سیمای ڕازی بوون بە دەم وچاوییەوە دیار بوو، خۆ ئەگەر وەلیدیش موسوڵمان ببوایە، ئەوا بەشی هەرە زۆری قورەیش موسوڵمان دەبوون، چونکە گەورەترین سەرکردەو قسەزانترین وعاقڵ ترینیان بوو، ئەم دەنگ وباسە بڵاو بویەوە کە وەلید گوێی بۆ قورئان گرتووەو هیچ وەڵامی پێ نەبووە. ئەبو جەهل ترسی لێ نیشت وڕۆیشت بۆ لای وەلیدو پێی ووت: ئەی مامە وا خزم وکەس وکار هەموو کۆبونەتەوە دەیانەوێت لەناو خۆماندا سەروەت وسامانێکی زۆرت بۆ کۆبکەینەوە، وا پیتاکت بۆ کۆدەکەنەوە، بەم قسەیە دەیویست ڕقی وەلید هەڵبستێنێت، وەلید ووتی: بۆچی؟ خۆ من لە هەمووتان دەوڵەمەندترم، ئەبو جەهل ووتی: ئاخر بیستویانە کە تۆ چووی بۆ لای محمد و ویستوتە خواردن وشتی وات بداتێ و داوای پارەت لێکردووە، وەلید ووتی: ئەمە ڕاست نییە، چونکە قورەیش باش دەزانن کە من لە هەموویان سەروەت وسامانم زۆرترە، ئیتر چۆن داوای سامان لە محمدێکی هەژار دەکەم؟ ئەبو جەهل ووتی: بەڵام بۆ ئەوەی ئەو قسەیەت لەسەر لابچێت وەرە قسەیەك دەربارەی محمد بکە، تا قورەیش پێی بگاتەوە کە تۆ ناحەزو دژی ئەوی و بەقسەکانی

ڕازی نەبووی و داوای هیچت لێنەکردووە، وەلید ووتی: چی بڵێم ئەمما سوێند بەخوا کەستان تێدا نییە لە من شارەزاتر بێت لە شعرو وەزن وقافیەی شعرو ناسینی ووتەی جنۆکەدا، سوێند بە خوا ئەوەی محمد ئەیڵێت لە هیچکام لەمانە ناچێت! پاشان وەلید بە ئەبو جەهلی ووت: ئێوە پێتان وایە کە محمد شێتە؟ دەی ئایا تا ئێستا بینیوتانە شێت قسەی ئاوا پڕماناو جوان بکات؟ ئەبو جەهل ووتی: نەخێر، وەلید ووتی: ئێوە زۆرجار دەڵێن محمد فاڵچییەو بەفاڵ ئەم قورئانەی داناوە، ئایا محمد تا تەمەنی گەیشتووەتە چل ساڵی هەرگیز بینیوتانە فاڵ بگرێتەوە؟ ئەبو جەهل ووتی: نەخێر، وەلید ووتی: ئێوە پێتان وایە محمد شاعیرە، بەڵام من لە ئێوە دەپرسم: ئایا تا ئێستا محمد هیچ شیعرێك بە دەمیا هاتووە تا ئەم تەمەنەی؟ ئەبو جەهل ووتی: نەخێر، وەلید ووتی: ( وَاللهِ إنَّ لَهُ لَحَلاوَة، وَإنَّ عَلَيـهِ لَطَلاوَة، وَإنَّ أعلاهُ لمُثمر وَإنَّ أَسفَلَهُ لمغدق، وَإنَّهُ يَعلوا وَلا يُعلى عَلَيـهِ ) واتە: سوێند بەخوا ئەو ووتەیەی ئەو دەیڵێت زۆر شیرین وجوان وپڕشنگدارە، سەرو خواری هاوسەنگ وناوازە، بێگومان زاڵ دەبێت وژێر ناکەوێت، دڵنیابن هەرچی لە ژێریدا بێت تێکی ئەشکێنێت.! بەڵێ ( شَهادَةُ كـافِرٍ عَنيـدٍ لِلقُـرآن ) ئەمە شاهیدی کافرێکی دڵڕەقی دژ بە قورئانە، کە وا وەصفی قورئان دەکات. !

ئەبو جەهل ووتی: گەلەکەت لێت ڕازی نابن هەتا دەربارەی محمد ووتەیەك نەڵێیت، وەلید ووتی: لێم بوەستە تا دەربارەی محمد بیر بکەمەوە، ئینجا بە حیساب بیری کردەوەو ووتی: ئەم قورئانە

جادووەو لە پێشینانەوە وەری گرتووەو ئەمیش دەیگێڕێتەوەو لە بابلی وئاشووری و میصری وهندییەکانەوە وەری گرتووەو ناوی ناوە قورئان، بەم شێوەیە وەلید کە حەقی ناسی بەڵام لە ترسی لۆمەو تانەو تەشەری ئەبو جەهل وسەرانی قورەیش، توشی ئەم قسە ناڕاستە بێ بناغەیە بوو، کە لە دنیاو قیامەتدا ماڵوێرانی کرد، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیستەوە دڵنارەحەت بوو، خەفەتی خوارد بۆ وەلید کە چۆن دڵی نەرم بوو بوو، حەقی ناسیبوو، خەریك بوو لە ئاگرو چارەڕەشی دەهاتە دەرەوە، کەچی هەڵگەڕایەوەو پشتی لە حەق کردوو باطلی هەڵبژاردوو وەصفی سپی وبێگەردی و پاکی بە ڕەش وناشیرین کرد. خوای گەورە لە عەرشی عەظیمەوە حەزرەتی جوبریلی ناردە خوارەوەو ئەم ئایەتەی سورەتی ( المُدَثر ) ی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانە کردوو باسی حاڵی وەلید وهەموو ئەوانە دەکات کە حەق وڕاستی ئەم قورئانە دەناسن و پاشان لەبەر بەرژەوەندییەکی کورت وکەمی ئەم دنیایە پشتی تێدەکەن و دەفەرموێت: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾ تا کۆتایی سورەتەکە .

ئیمانداران: ئیعجازێکی تری ئەم قورئانە لەوەدایە، کە هەرگیز بە تێپەڕبوونی کات و زەمان و زەمین و پێشکەوتنی زانست، نەك کۆن نابێت. بەڵکو ئەمجا زیاتر گەورەییەکەی دەردەکەوێت،بۆنموونە لە بواری ژمارەدا: ئەگەر قورئانی پیرۆز بخوێنینەوە: ووشەی ( القمر ) مانگ بژمێرین، دەبینین کە وا لە ( ٢٧ ) جێگای قورئاندا هاتووە، کە ئەمەش ژمارەیەکی زۆر ووردی زانستییە کە ژمارەی ڕۆژەکانی مانگ

بریتین لە ( ٢٧ ) ڕۆژ. بە نزیکی مانگ لە نزیکترین ئەستێرە لێوەی بە ( ٢٧ ) ڕۆژ جارێك دەورێك دەکاتەوە، نەك ئەوەی کە لەسەر زەوی بە (٢٩ ) یان ( ٣٠ ) ڕۆژ ناسراوە، کە ئەمە تا ئەم سەردەمە کە زانستی جوگرافیا دروست نەبوو بوو ئەم حەقیقەتە ئاشکرا نەبوو بوو.

ووشەی ( الشمس ) ڕۆژ: لە قورئانی پیرۆزدا لە ( ٣٣ ) جێگادا هاتووە، کە بێ زیادو کەم ژمارەی خولانەوەی فەلەکی ڕۆژە، کە بە ماوەی ( ٣٣ ) سالْ جارێك تەواوی دەکات.

ئەگەر ڕۆژومانگ لەیەك ئایەتدا بەیەکەوە بێن، بۆ نموونە: وەکو ( الشَمسُ وَالقَمَر ) سُبحانَ الله ئەوە لە ( ١٩ ) شوێنی قورئاندا ئاوا بەیەکەوە هاتوون، کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لە ماوەی ( ١٩ ) سالْدا جارێك (مانگ وڕۆژ و زەوی ) لەسەر یەك هێلْ دەبن و ناوی ڕۆژەکەو ژمارەی بەرواری مانگەکە بەرامبەر یەك دەبن، بۆ نموونە: ئەو ڕۆژە دووشممە دەبێت، وە دووی مانگی عەرەبیش دەبێت، ( مەبەست لە مانگی ئاسمانییە ) وە ئەمە لە ماوەی ( ١٩ ) سالْدا جارێك ڕوودەدات.!

هەروەها ووشەی ( الشهر ) مانگ، واتە: ڕۆژەکانی مانگ، ( ١٢ ) جار لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە کە بێ زیادوکەم ( ١٢ ) مانگیش هەیە لە سالْی ڕۆژی ومانگیدا.

هەروەها ووشەی ( یوم ) ڕۆژ لە قورئانی پیرۆزدا ( ٣٦٥ ) جار هاتووە، کە بەڕاستی ڕێك وەکو ژمارەی ڕۆژەکانی سالْی شەمسی وایە کە ژمارەیان ( ٣٦٥ ) ڕۆژو چارەکە ڕۆژێکە.



ئایا بەڕێزان بە ووردی بیری لێبکەنەوە، ئەم ژمارانە ئاوا بەو ددقیقییە شەروا لە خۆوە هاتوون؟ یان بێ هیچ دوو دڵییەك دەبێ بڵێی: ئەو خوایەی کە ئەو ئەرزو ئاسمان و مانگ و ڕۆژەی دروست کردووە. هەر ئەو خوایەیە کە ئەو قورئانەی بۆ مرۆڤایەتی وەکو گەورەترین شاخەڵات بە بەڕێزترین مرۆڤی سەر زەویدا کە ( محمد المصطفى ) یە ﷺ ناردووە. هەزاران هەزار سوپاس وستایش بۆ خوای گەورە لەسەر شاخەڵاتی قورئان و پێشەوایەتی محمدی خۆشەویست. بە هەزاران صەلات وسەلامی خوای لەسەر بێت.

بەڕێزان: فەرموون با هەندێکی تر لە ئیعجازی ژمارەیی قورئانی پیرۆز باس بکەین:

* لە قورئان دا ( ١١٥) جار ووشەی ( الدنیا ) هاتووە، لە بەرامبەریشدا ( ١١٥ ) جار ووشەی (الآخرة ) هاتووە.

* ووشەی ( مَلائکة ) ( ٨٨) جار هاتووە . وە ووشەی ( شَیاطین ) (٨٨ ) جار هاتووە.

* ووشەی ( الناس ) ( ٥٠) جار هاتووە، وە ووشەی ( الأنبیاء ) (٥٠ ) جار هاتووە.

* ووشەی ( صلاح ) ( ٥٠ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( فساد ) ( ٥٠ ) جار هاتووە.

* ووشەی ( إمرَأة ) (٢٤ ) جار هاتووە ، وە ووشەی ( الرَجُل ) ( ٢٤ ) جار هاتووە.

* ووشـەی ( الحَیـاة ) (١٤٥) جـار هـاتووە، وە ووشـەی ( المَـوت ) ( ١٤٥ ) جار هاتووە.

* ووشـــەی (الـــصالِحات ) ( ١٦٧) جـــار هـــاتووە، وە ووشـــەی (السَیئات ) ( ١٦٧) جار هاتووە.

* ووشـەی (الـشِدة ) ( ١٠٢ ) جـار هـاتووە، وە ووشـەی (الـصَبر ) ( ١٠٢ ) جار هاتووە.

* ووشەی ( المَحَبة ) ( ٨٣ ) جار هاتووە، وە ووشـەی (الطاعـة ) ( ٨٣ ) جار هاتووە.

کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستی چەند بێ گوێڕایەڵیش ئەوەندەیە.

* ووشەی (الصَلاة ) پێنج جار لە قورئان دا هـاتووە، بـە ئەنـدازەی پێنج فەرزی نوێژ.

ووشـــەی ( الیُـــسُر ) ( ٣٦ ) جـــار لـــە قورئـــانی پـــیرۆزدا هـــاتووە، ووشەی ( العُسُر ) کە بەمانای تەنگانـەو ناڕەحـەتی دێـت، ( ١٢ ) جـار هاتووە، باشە بۆچی وەکو یەك نین؟ لەبەر ئەوەی کە خـوای گـەورە لـە قورئان دا فەرموویـەتی: ﴿إنَّ مَعَ العُسرِ یُسراً * إنَّ مَعَ العُـــسرِ یُـــسراً﴾ هەموو ناخۆشییەك دوو فەرەح وخۆشی بە رامبەرە. سـەرنج بـدە:( ١٢ و١٢ و١٢ دەکاتە ٣٦ )بۆ هەموو ناخۆشییەك دوو خۆشی هەیە.

لـە بـارەی نوێـژەوە: ووتمـان ( پێـنج ) جـار ووشـەی (الـصَلاة ) لـە قورئان دا هاتووە، وە پێنج نوێژی فەرزیش هەیە.

زانستی پزیشکی دەڵێت: ئەو شلەیەی کە دەوری دەماخی داوە: لە مرۆڤدا لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار تازە دەبێتەوە.

ئیمانداران: قورئانی پیرۆز تەنانەت لە ژمارەی سورەتەکانیشی دا، وە لە ژمارەی ئایەتی سورەتەکانیشی دا، ئیعجازی عیلمی هەیە، بۆ نموونە: سورەتی ( الحديد ) ئاسن. زانایان دەڵێن: کێشی ئەتۆمی ناوەندی بۆ ئاسن یەکسانە بە ( ٥٧ ) هەروەکو ژمارەی سورەتی ( الحديد ) لە زنجیرەی سورەتەکانی قورئاندا ژمارە ( ٥٧ ) ە.

هەروەها ژمارەی ئەتۆمی بۆ ئاسن، یەکسانە بە (٢٦ ) ، هەروەکو ئەو ئایەتەی سورەتی ( الحديد ) کە باسی ئاسن دەکات ، ئایەتی ژمارە ( ٢٦ ) ە ، کاتێک ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرحيم ﴾ بە ئایەت حیساب بکرێت.

هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە کە باسی کانزاکان دەکات، تەنها بۆ ئاسن فەرموویەتی: ( وَأنزَلنا ) لە ئاسمانەوە ناردوومانەتە خوارەوە.

زانای بەناوبانگ، ( أرمسترونج ) یەکێ لە چوار کەسەکەی وەکالەی ناسای ئەمریکی دەڵێت: ئاسن لە ئاسمانەوە دابەزیوە بە شێوەی نەیزەك.

هەروەها ( أرثربيرز ) لە کتێبەکەیدا ( الأرض ) دەڵێت: نەیزەك سێ جۆری هەیە:

١. ئاسنی ، کە ٩٨٪ ی ئاسن ونیکلە.

٢. (الحَديدية الحَجَرية ) ئاسنی بەردی ، بەردەکە ناوی ( أوليفين )

٣. ( النَیازك الحَجَرية ) نەیزەکی بەردی.

سالانە بە هەزاران نەیزەك دەکەونە سەر زەوی کە هەندێکیان ئەوەندە گەورەن، کێشەکەیان دەگاتە دەیان تەن، لە ساڵی ( ١٩٠٢ ) دا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، نەیزەکێك دۆزرایەوە، کە کێشەکەی ( ٦٢ ) تەن بوو، پێك هاتبوو لە ئاسن ونیکڵ.

وە هەروەها لە ویلایەتی ( ئەریزۆنا ) نەیزەکێك کەوتە سەر زەوی و چاڵێکی گەورەی دروست کرد بە قوڵی ( ٦٠٠ ) پێ و تیرەکەی ( ٤٠٠ ) پێ بوو، کە ئەم نەیزەکە بە دەیان تەن ئاسنیان لێ دەرهێنا.

ئایا ئەگەر ئەم قورئانە لە لایەن خواوە نەبێت، ئەم هەموو ئیعجازەی چۆن تێدا دەبێت؟!

ئیعجازێکی ژمارەیی تری قورئانی پیرۆز، ئایەتەکانی سوڕەتی ( البَقَرة ) بریتین لە ( ٢٨٦ ) ئایەت، جا بۆ ئەوەی ئایەتی ناوەڕاستی سوڕەتی ( البَقَرة ) بدۆزینەوە، پێویستە ژمارە ( ٢٨٦ ) دابەش بکەین بەسەر (٢) دا ئەو کاتە دەکاتە ( ١٤٣ ) جا کە تەماشای سوڕەتی ( البَقَرة ) دەکەین، ئایەتی ژمارە ( ١٤٣ ) ووشەی ( وَسَط ) ی تێدایە، وە خۆیشی ئایەتی ( وَسَط ) ئایەتەکە باسی قیبلە دەکات و پەیوەندی بە ڕووکردنە کەعبەوە هەیە، خۆ ئاشکرایە شاری مەککە بە تایبەتی کەعبەی پیرۆز دەکەونە ناوەڕاستی گۆی زەوییەوەو چەقی هەموو ووشکانی سەر زەوییە وەکو بە شێوەیەکی زانستییانە سەلماوە.

ئیمانداران: بەڕاستی ئەم قورئانە ئەوەندە ئیعجازی تێدایە، کە باس کردنیان تەواو نابێت، وە ئەم قورئانە بە تەنها پیتێك، چەندین لاپەڕە زانست بە مرۆڤ دەدات و زانایان لەسەری دەنوسن، بۆ نموونە: لە سورەتی ( التوبه ) دا ئایەتی ژمارە ( ٦٠) خوای گەورە باسی ئەو هەشت دەستەیە دەکات کە زەکاتیان پێ دەدرێت، جا ئەو هەشتە دەکات بە دوو بەشەوە . بە چواری یەکەمیان دەڵێت: ( الفُقَـــراء، المَساكين، العـــاملينَ عَلَيهـــا، المُؤَلَّفَـــةِ قُلُـــوبَهُم ) وە بۆ ئەم چوارە دەفەرموێت: ﴿ إنَّمـــا الـــصَدَقَاتُ لِلفُقَـــراء.... ﴾ . سەرنج بدەن: لامی تەملیك بەکار دێنێت، واتە: ئەم چوارە هەر کە ئەم زەکاتەیان وەرگــرت، یەکــسەر دەبنــە خــاوەنی ئــەو زەکاتــە، بــا لەگــەڵ وەرگرتنەکەشدا یەکسەر دەوڵەمەند ببن، وەکو فەقیرو هەژارەکە کە لە ڕێگایەکی ترەوە پارەیەکی زۆریان بووبێت، یان وەکو ( کارمەندی زەکات ونوێ موسوڵمانەکە ) ئەمە هەرچەند دەوڵەمەندیش بن. هەر دەبنە خاوەنی ئەو برە زەکاتەی پێیان دەدرێت، بۆیە دەفەرموێت: ﴿ لِلفُقَراء وَ المَساكين ﴾ کە ئەو لامی تەملیکە، بۆ هەر چواریانە کە بە (واو ) ی عاتیفە دەچێتە سەر هەر چواریان، پاشان بۆ چوارەکەی تر کە ( في الرِقاب ، الغارِمين، في سَـــبيلِ الله، إبـــنِ الـــسَبيل) ، لای تەملیك بەکارناهێنێ بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ وَفي الرِقاب ﴾ ( في ) بەکار دێنێت، کە ( في ) ( للظَرفية ) .

بۆچی ئەمە وایە؟ زانای گەورەی مەزهەبی شافیعی ( خەطیبی شەربیبی ) لە ( مُغني المُحتاج ) دا دەفەرموێت: بۆ چوارەکەی یەکەم: کە ﴿ فُقَراء ...﴾ ، لامی تەملیکی بەکار هێناوە، چونکە هەر کە پێیان درا یەکسەر ئەبنە خاوەنی پارەو سامانی زەکاتەکەی کە وەریان گرتووە، بەڵام بۆ چوارەکەی دوایی کە ﴿ وَفِي الرقاب ...﴾ حەرفی جەڕی (في ) بەکار هێناوە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم چوارەی دوایی بە مەرج زەکاتیان ئەدرێتێ، کە لەو پێویستییەدا خەرجی بکەن، کە بۆ ئەو مەبەستە پێیان دراوە، کۆیلە بۆ ڕزگار بوون و قەرزار بۆ قەرز دانەوەو تێکۆشەری ڕێی خوا بۆ ئەوەی لە پێناوی خوادا تێبکۆشێ و ڕێبوار بۆ خەرجی ڕێگای.

جا ئەگەر ئەم چوارە لەگەڵ وەرگرتنی پارەکەدا هۆکارەکەیان نەما، بۆ نموونە: سەفەریەکە ( ڕێبوارەکە ) کوڕێکی هات و پارەی بۆ هێنا، یان قەرزارەکە خاوەن قەرز لێی خۆش بوو، وە هەروەها موجاهیدەکە لە بەرەی جیهاد گەڕایەوەو پێویستیان پێی نەماو چووەوە سەر ئیش وکاری ئاسایی خۆی، وە کۆیلەکە خاوەنەکەی لە فیدیەی ئازادی کردو پارەی لێ وەر نەگرت، ئەمانە زەکاتەکەیان لێ دەسەنرێتەوە بە پێچەوانەی چواری یەکەمەوە، کە ئەگەر هەژارەکە لەگەڵ وەرگرتنی زەکاتەکەدا، پارەیەکی زۆری دەست کەوت، بۆ نموونە: بە میراتی بۆی هات، یان کوپەیەك ئاڵتوونی دۆزییەوە، با هەژاریش نەمابێت، تازە زەکاتەکەی لێ وەر ناگیرێتەوە، چونکە خوای گەورە بۆ ئەو

چوارەی یەکەم، لام تەملیکی بەکار هێناوە. بەڵام چوارەکەی تر لێیان وەردەگیرێتەوە. بۆیە ( فِي) ( ظرفية ) ی بەکارهێناوە.

هەروەها زانای گەورەی مەزهەبی ( حەنبەلی ) ( ابنُ قُدامة المقدسی ) لە کتێبی بەناو بانگی ( المُغني ) دا دەفەرموێت: بۆیە ئەو چوارەی یەکەم لە ( الفُقَراء، وَالمَساكِين، وَالعاملين، وَالمؤلَفَة قُلُوبِهِم ) خوای گەورە لامی تەملیکی بۆ بەکار هێناون، چونکە ئەو چوارە بە وەرگرتنی زەکاتەکە مەبەستە شەرعییەکە دێتە جێ بۆیان، کە ئەویش دەوڵەمەند بوونی فەقیرو مسکینەکەیەو ڕزگار بوونیان لە هەژاری، وە پێدانی کرێی ماندوو بونی کارمەندی زەکاتەو ڕاگرتنی دڵی نوێ موسوڵمانەکەیە..

وە زانای گەورەی تەفسیر ( ئالوسی ) لە تەفسیرەکەیدا ( رُوحُ المَعاني ) دەفەرموێت: بۆیە خوای گەورە بۆ چوار تاقمی دووەم ( فِي) بەکارهێناوە، چونکە ئەوان نابنە خاوەنی پارەو سامانی زەکاتەکە، کە وەریان گرتووە، بەڵکو دەچێتە دەستی کەسێکی ترەوە، بۆ نموونە: کۆیلە دەیدات بە خاوەنەکەی، لە پێناوی خۆ کرینەوەو ئازاد بونیدا، وە قەرزارەکە دەیدات بە خاوەنی قەرزەکە لە پێناو ڕزگار بوونی لە قەرزەکە......هتد.

جا بەڕێزان: ئێمە باسی ئیعجازی زانستی قورئانمان کرد، بۆیە ئەم باسەی ئایەتی زەکاتیشم هێنایەوە تاوەکو تێبگەین. ئەو هەموو کتێبەی کە تەفسیری قورئانی پیرۆزە، ئەو هەموو کتێبە شەرعییەی کە بە جیاوازی مەزهەبەکانەوە نوسراوە، هەمووی هەر لێکدانەوەو

شەرحی قورئانە، تەماشاکەن چۆن تەنها لەسەر ووشەی ( لام) لەگەڵ ( فِي)  چەند مەسەلەی شەرعی باسکران و حوکمە شەرعییەکان چۆن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر گۆڕان و هەموو ئەوەی کە لە چەند کتێبدا بەچەند لاپەڕە باس دەکرێت، قورئانی پیرۆز تەنها بە دوو پیتی ( لام) و( فِي) ئاماژەی پێ کردو باسی کرد، کە بەڕاستی ئەم کورتی و پوختی و پڕ ماناییە هەر لە قورئانی پیرۆز دەوەشێتەوە.

لە کۆتایی ئەم ووتارەش دا دەڵێم: با بگەڕێینەوە بۆ خزمەت قورئانەکەمان و دەستی پێوە بگرین و بیکەین بە دەستووری ژیانمان، بۆ ئەوەی بەر ئەو موژدەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوین کە فەرموی: (أبْشِرُوا فإن هذا القُرآنَ طَرَفُهُ بِيَدِ الله وطَرَفُهُ بِأيْدِيكُمْ فَتَمَسَّكُوا به فإنَّكُمْ لَنْ تَهْلَكُوا ولَنْ تَضِلُّوا بعدَهُ أبَداً ).

واتە: موژدەتان لێ بێت، بەڕاستی ئەم قورئانە سەرێکی بە دەستی خوای پەروەردگارەوەیە و سەرەکەی تریشی بە دەست ئێوەوەیە، کەواتە: توند دەستی پێوە بگرن بۆ ئەوەی هەرگیز لەناو نەچن، بەڕاستی هەرکاتێك ئێوەی موسوڵمان دەستتان بە قورئانەوە گرت، ئەوا هەرگیز بە هیلاك ناچن و هەرگیز دوژمن زەفەرتان پێنابات، وە هەرگیز توشی نەدامەتی وپەشیمانی نابن.

خوای گەورەو میهرەبان لێت دەپاڕێمەوە: لەسەر ڕێبازی قورئانەکەت دامەزراومان بکەی و لە تیاچوون وبەدبەختی بمانپارێزی و قورئانی پیرۆز بکەیتە بەهاری دڵمان و صۆمای دیدەمان و لابەری غەم و پەژارەمان و شەفاعەتکاری مەحشەرمان. اللهم آمیـــــــــن.

# سەرچاوەکان:.


١. قورئانی پیرۆز.
٢. تەفسیری ئاسان بورهان محمد ئەمین
٣. پوختەی تەفسیری قورئان محمد ملا صالّح بامۆکی
٤. الحقُوق الإسلامية محمد حَسان
٥. تەفسیری ڕامان أحمد کاکە محموود
٦. ئاشکرا بوونی موعجیزە زانستییەکانی قورئان
عبدالرزاق رزاق أحمد
٧. مُجَلة الحِوار العَدد ٦٢
٨.الإعجاز العِلمي فِي القُرآن وَالسنة م. نايف مُنير فارس
٩.مَوسوعة الأعجاز العِلمي يوسف الحاج أحمد
١٠. يَسألونَكَ د. حِسامَ الدين موسى
١١. ناوەڕۆکی ئیسلام د. سید بکر بەرزنجی

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ أجمَعينَ:

ئیمانداران: لەم ووتارەشدا بۆ تەواو کردنی ووتاری ڕابردوو، هەر لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا دەبین، ئەو قورئانەی کە پەروەردگار لە بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنْذِرَ يَـوْمَ التَّلَـاقِ﴾ واتە: خوای گەورە بە فەرمانی خۆی ڕووح دەبەخشێت بە هەر کەسێك کە بیەوێت لە بەندەکانی کە مەبەست قورئانە، کە بە حەزرەتی محمدی بەخشیوە، وەکو ڕووح وایە بۆ جەستە مردووەکان، گیان دەبەخشێت بە دەروونە ئیفلیجەکان، ژیان دەبەخشێت بە دڵە سڕەکان، لە ڕاستیشدا هەر وایە، ئەم قورئانە پیرۆزە، ئەم گوفتارە ڕەببانییە، ژیان بەخشە، نور بەخشە، هەرکاتێك دەرونە تاریکەکان ڕوویان تێکرد ڕووناك دەبنەوە، هەرکاتێك دڵە ژەنگاوییەکان ڕوویان تێکرد، لە ژەنگ وچڵك وپیسی دونیا و دونیاپەرستی ڕزگاریان دەبێت، لە پۆخڵی و تەپ وتۆزی گوناه وتاوان خاوێن دەبن، بە تایبەت ئەو قورئانە لە چەندین ئایەتدا ئاماژە دەکات بە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە.

ئیمانداران: مرۆڤی موسوڵمان کاتێك لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا بە چۆکدا دێ و هەموو لەشی دەکاتە هەست و بەدڵی بە کوڵ و چاوی پڕ ئەسرینەوە قورئان دەخوێنێت، بە تامەزرۆییەوە دەڵێت:.

پەیامەکەم: تۆ ڕووناکی ژیانمی، هێزو پێزی ویژدانمی، ئارامی بەخشی گیانمی، خۆرەتاوی ئیمانمی، هاوڕێی شەوو ویردی دەمی بەیانمی.

گەر من خوێنی بانگەواز بم، وا تۆ دڵی، من هەنگی هەڵاڵەدۆز بم، ئەتۆش گوڵی، لە ناسکی شاکارتدا، شیعرو پەخشان شەرمەزارن، هەروەکو تەرزی سەرچڵی. ئای چەند شیرین داڕێژراوی، چەندە زوڵاڵ و پاراوی، تۆ ئەو ڕێژنە بارانە بووی، لە بیابانێکی ووشکا، زەوی دڵانت نەرم کرد، دیوەخانی ساردی ژیانت گەرم کرد.

مرۆڤی چوختی وەکو دڕندەت بە ویقارو پڕ شەرم کرد، ئەوانەی پێت ئاشنا دەبوون، لە ناخەوە دەیانزانی، ئەتۆ پەیامی ئاسمانی، نێردراوی خوای میهرەبانی، بۆیە وا شیرین وجوانی.

ئەها ( وەرەقە ) ی ئوفتادە، کە سوڕەتی ( عەلەق ) یان بۆ خوێند یەکەم جار، فرمێسك بە ڕیشی سپیدا چۆڕایە خوار، ئینجا فەرمووی: خۆزگە دەمام، دەبووم بەبەرد، دەبوم بەدار، بۆ دیواری ئەم قورئانە دەخرامەکار، بۆ خاوەنی ئەم پەیامە دەبووم بەشاگردو دەسبار .

ئەی بۆ مەرگ سەدای ئاوازە ناسکەکەی قورئانەکەی جەعفەر نەبوو، لە حەبەشەی وێرانەدا، ( نەجاشی ) خستە شین وزار!

ئیمانداران: ئەوەی گرنگە لە بارەی قورئانەوە، ئەوەیە تێی بگەین و بیری لێ بکەینەوە، کە پێی دەوترێت: (التدبر) هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ القُرآنَ أَم عَلَى قُلوبٍ أَقفالُها﴾

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی بە ئیماندارانی قورئان خوێن نەکردووە کە قورئان لەبەر بکەن وەکو لەبەرکردن، چونکە ئەوکات چەند کەس هەموو قورئانی لەبەر بێت، ئەوەندە ( مصحف) لە قورئان زیادی کردووە، هەرچەندە ئەوە بەهرەیەکی گەورەیە کە مرۆڤی موسوڵمان وا لە خزمەت قورئاندا بێت کە لەبەری بکات، بەڵام ئەوەی زۆر گرنگەو خوای گەورە فەرمانی پێداوە، تێگەیشتنی قورئانەو فکر لێکردنەوەیەتی و هەڵێنجانی شتی نوێیە لێی.

پێغەمبەری خواو ﷺ صەحابەکان زۆر حەزیان لە شەو نوێژ بوو، بۆچی؟ بۆ ئەوەی تەدەبووری قورئانی تێدا بکەن، چەندین جار شەویان گەیاندۆتە بەیانی بە دووبارە کردنەوەی یەك ئایەتی قورئان، تەنها ئەو ئایەتەیان دووبارە کردەوەتەوەو جار لە دوای جار لە دڵیاندا شیرین تر بووەو باشتر لە ماناو مەبەستی تێگەیشتون و هەموو جارێك کە دووبارەیان کردووەتەوە، وایان زانیوە کە ئەوە جاری یەکەمە کە ئەیخوێننەوە.

هاوەڵی پایەبەرز ( عبدالله ی کوری عمر ) بە ماوەی یەك ساڵ ئەمجا سورەتی ( البقرة) ی خوێند، واتە ئەوەندە بە تێگەیشتن و قوڵ بوونەوە تێیدا دەیخوێند، ئەوەندە ئایەتەکانی دووبارە دەکردەوە، کە ماوەی یەك ساڵی پێ چوو، ئەمجا لە خوێندنی تەنها سورەتی ( البقرة) بویەوە، ئەمجا ئەوەندەی تام وچێژ لە خوێندنەکەی کردبوو، وای دەزانی گەورەترین دەست کەوت و گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، بۆیە لە خۆشی دەربریندا مانگایەکی گەورەی

قەڵەوی سەر بڕی و صەحابەکان و دراوسێ وخزمانی بانگ کردوو نانی بۆ دروست کردن و ئاهەنگێکی شەرعی زۆر خۆشیان ساز کرد.

بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد گوێی لە کەسێك بێت کە قورئانی بۆ بخوێنێ و ئەمیش گوێی بۆ بگرێت.

صەحابەی پایە بەرز ( عبدالله ی کوڕی مسعوود ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم و فەرمووی:( إقرَأ عَلَيَّ القُـرآن ) وەرە قورئانم بۆ بخوێنەرەوەو من گوێت بۆ دەگرم، ( ابن مسعود) دەفەرموێت: ووتم: (أأقرَؤهُ وَعَلَيـكَ أنـزِلَ ) ئەی پێغەمبەری خوا من بۆت بخوێنمەوە لە کاتێکدا کە قورئان بۆ سەر تۆ نازڵ بووە؟! خۆشەویست ﷺ فەرمووی: ( إنّـي أحِبُّ أن أسمَعَهُ مِن غَيري ) بەڕاستی من زۆر حەز دەکەم کە قورئانم گوێ لێبێت لە غەیری خۆمەوە، کە ئەو بیخوێنێ و من گوێی بۆ بگرم.

( ابن مسعود) دەفەرموێت: ئەمجا منیش لەبەر خاتری پێ خۆش بوونی دڵی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئان بەسەر پێغەمبەری خوادا، هەتا گەیشتمە ئەو ئایەتەی سورەتی (النساء) کە دەفەرموێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾ النساء ٤١

( ابن مسعود) دەفەرموێت: کە گەیشتمە ئەو جێگایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:( أمسِك يا ابنَ مَسعُود) بەسە ئەی

کوڕی مسعود، جا کە تەماشای دەم وچاوی پێغەمبەری خوام کرد ( فَئذا عَيناهُ تَذرِفانِ – أيّ الدُمُوع ) چاوی پیرۆزی فرمێسکی پێدا ئەهاتە خوارەوە، وا ڕۆچوو بوو لە مانای ئایەتەکاندا ، کاری لە دڵی کردبوو وەکو ئەوەی چاوی لەو مەشهەدەی قیامەت بێت.

ئیمانداران: عاشقانی قورئانی پیرۆز، فەرموون با ئێمەش لە قورئان وورد بینەوە لە چەند دیمەنێك دا:.

یەکەم: باشە بۆچی سورەتەکانی قورئان زنجیرەیان بۆ کراوە؟ بۆ نموونە: بە سورەتی (الفاتحە) دەست پێدەکات و پاشان ( البَقَرة ، آل عمران ، النِساء ...... هەتا بە سورەتی الناس ) کۆتایی دێت؟ ئەگەر بەو ووردی سەرنج بدەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە میحوەری . تەوەرەی . سورەتی (البَقَرة) باسی گواستنەوەی جێنشینایەتی و دەسەڵاتی سەر زەوی دەکات کە ئایەتەکانی (٣٠ ـ٣٣ ) باسی دەکەن کە چۆن ئەو دەسەڵاتە لە جولەکەکانەوە کە خراپەکارییان کرد لەسەر زەوی داو تاوانی زۆر گەورەیان ئەنجامدا ، چۆن خوای گەورە دەسەڵاتی لێسەندنەوەو دایە دەستی موسوڵمانەکان، وە لە گرنگترین هێماو ئامارژە بۆ ئەو باسە بریتییە لە گۆڕینی ( قیبلە ) ڕووگە لە ( بیت المقدس ) بۆ کەعبە.

وە ئەگەر وورد بینەوە لە سورەتی ( ال عمران ) دەبینین لەو سورەتەدا باسی ئەوە کراوە کە چۆن گاورەکانیش هەروەکو جولەکەکانی پێش خۆیان بە کەڵکی جێنشینی سەر زەوی نایەن و شایستەی ئەو کارە گەورە نین، چونکە چەندین کارو کردەوەی وا

ناشایستەو نا پەسەندیان ئەنجام داوە، کە لەگەڵ جێنشینی و ئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی دا نەدەگونجا، بۆیە خوای گەورە ئەو دەسەڵاتەی لەوانیش سەندەوە.

پاشان سورەتی (النِساء ) دێت کە لەوێشدا تەوەرەی بنچینەیی ئەو سورەتە باس لەوە دەکات، کە ئەو دوو ئاینە گەورەیە ( جولەکەو گاوور ) لەگەڵ ئەو تێکدانەی کە لە لایەن تێکدەرانی ئەو دوو ئاینەوە بەسەریان هێنرا، لەگەڵ ئەوەشدا هەردووکیان (یەهوودی و مەسیحی) هاوبەش بوون لە چەوساندنەوەو پێشێل کردنی مافی دوو چینی گەورەی ناو کۆمەڵگا، کە ئەوانیش چینی ( ئافرەتان و منداڵان ) بوون، بۆیە تەوەرەی سورەتی (النِساء ) باسی مافی ئافرەتان و منداڵان دەکات.

کەواتە دەبێت ئەم سورەتانە ئاوا بە ڕیزبەندی بێن، خۆ ئەگەر سورەتی (النِساء ) پێش ( البَقَرة و ال عمران ) بهاتایە، ئەو مەبەستە جوانە ئاوا بەرچاو نەدەکەوت.

دووەم: ئەگەر سەرنجی سورەتێکی بچکۆلەی وەکو سورەتی ( الضُحی ) بدەین، دەبینین ووشەکانی چەند ووردەکاری و لە شوێن خۆدانانی پێوە دیارە، ئەوەتا ( الضُحی ) لوتکەی کاتی ڕۆژ هەڵاتنە، کە کاتی چێشتەنگاوە، ( وَاللَیل اذا سَجَی ) ئەمیش لوتکەی تاریکی شەوە، هەردووکیانی بەرامبەر یەکتری هێنان، ئەمجا ئاشکرایە ڕۆژ هەڵاتن لە کاتی زێڕینی چێشتەنگاودا زۆر کەمترە لە کاتی تاریکی شەو، هەربۆیە دەبینین ووشەکانی ئایەتی (وَاللَیل اذا سَجَی ) زۆر

زیاترە لە ووشەکانی ئایەتی ( الضُحی ) هەروەها ئایەتی دوای ئەوە﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ دووبارە ووشەکانی ئەم ئایەتەش زیاترن لە لە ئایەتی ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى﴾ دواتر ئایەتی ﴿وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَى﴾ دێت، کە ئەویش ووشەکانی لە ئایەتی ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ زیاترن، ( سبحان الله) تەنانەت ژمارەی ئایەتەکانی لە بچووکەوە دەست پێکردووەو لە گەورەترینیان هەر لەو سوورەتەدا کۆتایی پێهێناوە.

ئایا ئەگەر ئەمە قورئانی پیرۆز نەبێت لە چ کتێب و نوسراوێکی تردا ئەم تەرتیبە جوانە ئەنجام ئەدرێت؟

سێهەم: وورد بونەوە لە ووشەکانی قورئانی پیرۆز، بۆ نموونە: ( الرَّحمَةُ وَالرَّأفة) زانایان دەفەرموون: ( الرَّأفَة: هيَ الخَوفُ مِن وقُوعِ شَخصٍ فِي مَكرُوهٍ ) ڕەئفەت بریتی یە لە ترسان لەوەی کەسێك بکەوێتە ناو ناڕەحەتی وئازارێکەوە. ( وَالرَّحمَة:هيَ الوُقوفُ إلى جانبِهِ بَعدَ الوُقوعِ فيهِ ) ڕەحمەتیش بریتییە لە وەستان لە پاڵ ئەو کەسەداو پشت بەر نەدانی دوای ئەوەی توشی تەنگانەو ناخۆشییەکە بوو. واتە: یەکەمجار خەمیەتی وئامۆژگاری دەکات کە خۆی بپارێزێ لە نزیك بونەوە لەو کارە خراپە، چونکە سەرەنجامی خراپ و ناڕەحەتییە. جا ئەگەر کەسەکە هەر بەقسەی نەکردوو توشی ناڕەحەتییەکە بوو، پێی ناڵێ تازە حەقم نییە بەسەریەوە، چونکە بە

گوێی نەکردم، بەڵکو دەستی لێبەر نادات و هەر لە پاڵیا دەمێنێتەوەو هەوڵی ڕزگار کردنی ئەدات.

جا کاتێك کە سەیری قورئان دەکەین دەبینین، هەردوو ووشەکەی بەیەکەوە بۆ پێغەمبەری خۆشەویست ودلسۆزی مرۆڤەکان و گشت بونەوەر بەکار هێناوە، کە دەفەرموێت:﴿حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ کە کاری پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەئفەت و ڕەحمەتە بۆ ئوممەتەکەی.

هەروەها هەردوو ووشەی ( العام والسنة ) کە هەردووکیان بە مانای ساڵ دێن، بەڵام کە ووترا: (السنة ) مەبەست پێی ساڵی گرانی و نەبوونی و ناخۆشییە، بەڵام کە ووترا ( عام ) ئەوە مەبەست پێی ساڵی هەرزانی و فەرەحی وخۆشییە، بۆیە لە قورئاندا هەردووکیان لە شوێنی خۆیاندا بەکار دێنێ و دەفەرموێت:﴿ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾﴾يوسف ٤٧.٤٩

نمونهیهکی تر له جوان بهکار هێنانی ووشهکانی قورئان: قورئانی پیرۆز بۆ ئافرهتی نهزۆك که منداڵی نابێت، دوو ووشه بهکار دێنێت، که ( العَقیم ) و ( العاقر ) ن، باشه جیاوازییان چییه؟

( العَقیم ) ئهو ئافرهتهیه که ههرگیز له ژیانیدا منداڵی نابێت، تهماشاکهن ههر دهربڕینی ووشهکه ئهوه نیشان ئهدات، چونکه کاتێك دهڵێی ( العَقیم ) ههردوو لێو لهکاتی پیتی ( م) دا بهیهکهوه دهنوسێن و دهم دادهخرێت، واته ئیتر تهواو دهرگای منداڵ بوون لهسهر ئهو ئافرهته داخرا! بهڵام ووشهی( العاقر ) بۆ ئهو ئافرهته نهزۆکه بهکار دههێنرێت، که ناتهواوییهك ، خهلهلێك له ڕهحمیدا ههیه، نهخۆشییهك له منداڵدانیدا ههیه، له بۆری زاوزێیدا ههیه، وه چارهسهری ههیهو ئهگهر خوای گهوره بیهوێ به دهرمان و دکتۆر چارهسهر دهکرێ و منداڵی دهبێ و نهزۆکییهکهی بهردهوام نابێت، ههربۆیه لهکاتی بهکار هێنانی ووشهی ( العاقر ) دا ههمان تێگهیشتن درووست دهبێت، کاتێك که دهڵێی: ( العاقر ) لێوهکان ناچنه سهر یهك و دهم به کراوهیی دهمێنێتهوه وهکو ئهوهی که پێمان بڵێ: زۆر نزیکه ئهم ئافرهته نهزۆکهی ئێستا ڕۆژێك منداڵی ببێت، چونکه دهرگای منداڵ بوونی لهسهر دانهخراوه.

جا کاتێك دهچینه خزمهت قورئانی پیرۆز، دهبینین له باسی خێزانی حهزرهتی زهکهریادا، دهفهرموێت: ﴿وَأَصْلَحْنَا لَـهُ زَوْجَـهُ﴾ خێزانهکهیمان بۆ چاك کردهوه، چونکه خێزانهکهی حهزرهتی زهکهریا جۆری نهزۆکییهکهی له (العاقر ) بوو، ههروهکو دهفهرموێت:

﴿وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِن وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾﴾ مريم ٥.

کەواتە بەڕێزان: دڵنیابن هیچ ووشەیەکی مرادیف کە هەمان مانای هەبێ و لە ووشەدا جیاواز بێت، لە قورئاندا نییەو هەموو ووشەیەکی قورئان مانای تایبەتی خۆی هەیەو ئەمەش لە هیچ کتێبێکی سەر زەوی دا دەست ناکەوێت، کە هەموو ووشەیەکی مانای تایبەتی خۆی هەبێت و بێ بەرامبەری هیچ ووشەیەکی تر بێت.

ئیمانداران: یەکێك لە جوانییەکانی تری قورئانی پیرۆز کە سەرنجی قورئان خوێن بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، ئەوەیە هەندێك کەس لە قورئاندا لە کاتی باس کردنیا ناوی هاتووەو هەندێك کەسیش لەکاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەیدا ناوی نەهاتووە، ئایا هۆی ئەمە چییە؟ بۆ نموونە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ ﴿١٠﴾﴾ التحريم ١٠ .

واتە: خوای گەورە نموونەی هێناوەتەو بە ژنی نوح و لوط بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، پاشان دەفەرموێت:

﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾﴾ التحريم ١١

**واتە: هەروەها خوای گەورە نموونەی هێناوەتەوە بە هاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە.**

**پاشان هەر لە هەمان سوڕەتداو ئایەتی دوای ئەوە دەفەرموێت:** ﴿وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾﴾ **واتە: هەروەها نموونەی هێناوەتەوە بە مەریەمی کچی عیمرانیش کە داوێنی خۆی بە پاکی ڕاگرت.**

**جا بەڕێزان سەرنج بدەن، سێ ئایەتی بە دوای یەکدا هاتووی لە ناو یەك سوڕەت، کە خوای گەورە نموونەی بە ئافرەتان هێناوەتەوە، کەچی کە باسی ژنی نوح و لوط دەکات وەکو ژنی خوانەناس، وە باسی ژنی فیرعەون دەکات وەکو ژنی بە ئیمان و دڵسۆز بۆ دینی خوا، ناویان ناهێنێت و نافەرموێت: ناویان چی بووە، کەچی یەکسەر باسی مریم دەکات و ناڵێ دایکی عیسا، بەڵکو بە ناوی خۆی (مریم) ناوی دێنێت، باشە بۆچی ئەمە وایە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: خوای گەورە خۆی باش دەزانێت، ژنی کافرو بێ باوەڕ لە لای مێردی موسوڵمان و ژنی ئیمانداری خواناس لە لای مێردی بێ دین و کافر لە هەموو**

سـەردەم وزەمانێکـدا تـا ڕۆژی قیامـەت بەبـەردەوامی هـەر هەیـەو دووبارە دەبێتەوە، بەڵام ( مریم ) تاکە ئافرەتێکە لە جیهاندا کە بەبێ هاوسەر، بێ ئەوەی دەستی پیاوێکی بەرکەوتبێت، منالّی ببێت، ئەمە لـە مێـژووی مرۆڤایەتیدا جارێکی تـر دووبـارە نابێتـەوە، بۆیـە نـاوی ( مریم ) دێنێت و نافەرموێت: دایکی عیسا.

بـەڵام بـۆ ئـافرەتێکی بـەڕێزی وەکـو دایکـی موسـا دەفـەرموێت: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا﴾ دەفەرموێت: دایکـی موسـا، ناوەکـەی ناهێنێـت، هەرچـەندە دایکـی حـەزرەتی موسـاش ئەوەنـدە ڕێـزدارو بـە ئیمان بووە کە خـوا خستییە دڵیـەوە کۆرپەکـەی بخاتـە ئاوی نیلـەوە، یەکسەر جێبەجێی کرد، بەڵام چونکە وەکو مـریم تایبـەت نییـە نـاوی ئەو ناهێنێت.

چـوارەم: هەنـدێ سـوڕەت لـە قورئانـدا بـە پیـت (حـرف) دەسـتی پێکردووە، ئایا نهێنی ئەمە چییە؟ خـوای گـەورە خـۆی زانـاترە، بـەڵام ئەوەی زانایـان تـا ئێسـتا پێـی گەیشتوون، ئەوەیە کە هـەر پیتێـك لـە سەرەتای هەر سوڕەتێکدا هاتبێت، ئەوا ئەو پیتە لە هـەموو پیتـەکانی تری ناو ئەو سوڕەتە زیاترە، بـۆ نموونـە: سوڕەتی ( ق ) کە بـە پیتـی (ق) دەسـتی پێکـردووە، دەبیـنین پیتـی (ق) بە تێکڕاییـەکی زیـاتر لـە هـەموو پیتـەکانی تـری هـەمان سـوڕەتدا هـاتووە، هـەروەها تێکڕایـی پیتـی ( ق ) لـە سـوڕەتی ( ق ) دا زیـاترە لـە تێکڕاییەکـەی لـە هـەموو سوڕەتەکانی تردا.

یـان لـه سوورەتی ( البَقَـرة ) و ( ال عمـران ) کـه بـه ( ألم ) دەسـتیان پێ کردووە، ئەوا دەبینین لە سوورەتی ( البَقَرة ) دا (ئەلیف(أ ) ٤٥٩٢ جـار هـاتووە)، (لام (ل)٣٢٠٤ جـار هـاتووە)، (مـیم (م) ٢١٩٥ جـار هاتووە ).

لە سوورەتی ( ال عمران ) دا :( ئـەلیف(أ ) ٢٥٧٨ ) جار هـاتووە) ، (لام (ل) ١٨٨٥ جار هاتووە) ، (میم (م) ١٢٥١ جار هاتووە ).

سەرنج بدەن چۆن ئـەلیف لـە لام و لام لـە میم زۆرتـر هـاتووە بۆیە ئاوا ڕیز کراون.!

وە لـە سـوورەتی ( العنكبـوت ) دا کـە بـە ( ألم ) دەسـتی پێکـردووە: ( ئەلیف ٧٨٤ جارو لام ٥٥٤ جارو میم ٣٤٤ جار هاتوون.

وە لــە ســوورەتی ( الرعـد) دا کــە بــە ( ألمـر ) دەسـتی پێکـردووە: ( ئـەلیف ٦٢٥ جارو، لام ٤٧٩ جارو، مـیم ٢٦٠ جارو، ڕاء ١٣٧ جـار هاتوون.

ئایـا ئەمـە هـەموو ئیعجـازی قورئـان نییـە؟ کـە بەڵگەیـەکی حاشـا هەڵنـــەگرە کـــە کـــەلامی ( رَبَ العـــالَمِین ) ەو دوورە لـــە هـــەموو دەستکارییەکی مرۆ ، کە هەر ئەمەشە وای کـردووە تاکە کتێبـی خـوا کە دەبێت پەیڕەوی لێ بکرێت قورئانە چونکە غەیری قورئان هەمووی دەسـتی مرۆڤـی تێـچووەو تـەحریف کـراوە، بـەڵام ئەگـەر قورئـانیش تـەنها بـۆ یـەکجار دەسـتی مرۆڤـی تێکـەڵ ببوایـەو لێـی زیـادو کـەم بکرایە، ئەوا بەم شێوە ڕێك وپێك و ڕیز بەندییە نەدەمایەوە.

پێنجەم: بابەتێکی تر کە لە قورئاندا پێویستی بە لێووردبونەوە هەیە، ئەوەیە کەهەموو ئەو ووشانەی لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەکاندا بەرامبەر یەکتر دێن، لە قورئاندا بێ زیادو کەم وەکو یەك هاتوون. بۆ نموونە:

ووشەی ( الحیاة ) ژیان ( ١٤٥ ) جار لە قورئان دا هاتووە، وە ووشەی ( الموت ) مردنیش ١٤٥ جار هاتووە!

ووشەی ( الدنیا )( ١١٥ )جار لە قورئان دا هاتووە، وە ووشەی ( الآخرة )( ١١٥ )جار هاتووە!

ووشەی ( الحَر ) گەرما ( ٤ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( البَرَد ) سەرما ( ٤ ) جار هاتووە!

ووشەی ( المَصائِب ) ( ٧٥ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( الشُکر ) ( ٧٥ ) جار هاتووە!

وەکو ئەوەی پێمان بڵێ هەموو موصیبەتێك بەسەرکردنەوەی خواییەو شوکری دەوێت.

ووشەی ( العَقل ) ( ٤٩ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( النور ) هەر ( ٤٩ ) جار هاتووە!

کە بەڕاستی عەقڵ وژیری نورو ڕووناکییە بۆ ژیانی مرۆڤ.

هەروەها خوای گەورە زمانی بە مرۆڤ بەخشیوە بۆ ئەوەی خێرو ئامۆژگاری پێ بە خەڵکی بڵێ بۆیە:

(٢٥) جار ووشەی ( اللسان ) لە قورئاندا هاتووەو لە بەرامبەریشدا ( ٢٥ ) جار ووشەی ( المَوعظة ) هاتووە!

ووشـــەی ( رَافَــت ) واتـــە نـــەرم ونیـــانی ( ١٣ ) جـــار هـــاتووە، لەبەرامبەردا ووشەی ( غِلظَة ) زبری و توندو تیژی هەر ( ١٣ ) جار هاتووە.

ووشەی ( الجَنة ) بەهەشت ( ٧٧ ) جار هاتووە، لە بەرامبەریش دا ووشەی ( جَهَنَم ) دۆزەخ (٧٧) هاتووە!

ووشـــەی ( الـبر ) واتـــە چـاکەکردن، ( ٢٠ ) جـــار هـــاتووە، وە لـــە بەرامبەردا ووشەی ( الثواب ) پاداشت ( ٢٠ ) جار هاتووە!.

ووشەی ( الصَيف ) هاوین ( ١ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( الشِتاء ) زستان هەر ( ١ ) جار هاتووە!

ووشەی ( محمد ) ( ٤ ) جار هـاتووە، وە ووشـەی ( السراج ) ( ٤ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( الشَریعة ) هەر ( ٤ ) جار هاتووە!

ووشەی ( الشِدة ) ( ١٠٢ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( الصَبر ) هەر ( ١٠٢ ) جار هاتووە!

ووشـەی ( ابلیس) ( ١١ ) جـار هـاتووە، وە ووشـەی ( الإسـتعاذة ) ( ١١ ) جار هاتووە!

خیانەت و ناپاکی ئەوپەڕی پیسییە ، بۆیە لە قورئاندا ( ١٦ ) جار ووشەی ( الخیانة ) هاتووە، وە ووشەی
( الخَبث) پیسی ( ١٦ ) جار هاتووە!

ئیخلاص و دڵسۆزی نیشانەی پاکییە ، بۆیە ( الإخلاص ) ( ٣١ ) جار لە قورئاندا هاتووە، ووشەی ( الطهر )
( ٣١ ) جار هاتووە!

عەرەق خواردنەوە مایەی بەدبەختی و توش بوون بە تورە بوونە، بۆیە لە قورئاندا ( ٥ ) جار ووشەی ( الخمر ) هاتووەو لەبەرامبەردا ووشەی ( النكال ) ( ٥ ) جارو ووشەی ( الغَضَب ) هەر ( ٥ ) جار هاتووە!

موسوڵمانان نابێت ژێر دەستەو چەپۆك لێدراوبن، بەڵكو دەبێت ئازاو تێكۆشەربن، هەر بۆیە لە قورئاندا ووشەی ( المسلمون) ( ٤١ ) جار هاتووە، وە ووشەی ( الجهاد ) ( ٤١ ) جار هاتووە.

وە بە سەرنج دان لە قورئانی پیرۆز دەبینین خوای گەورە دەفەرموێت: ژمارەی ئەو فریشتانەی كە سەرپەرشتی دۆزەخ دەكەن ( ١٩ ) فریشتەن، ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ۝٣٠﴾ المدثر ٣٠ .

دەی تەماشاكە ﴿ بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الـرَحيم ﴾ ژمارەی پیتەكانی بریتییە لە ( ١٩ ) پیت، وە ژمارەی پیتەكانی ﴿ لا حَوْلَ وَلا قـوةَ الا بالله ﴾ ش هەر ( ١٩ ) پیتە!

كە ئامارژەیە بەوەی هەر كەسێك لە هەمو كارێكدا بە ناوی خوا دەست پێ بكات و پشت وپەنای خۆی هەر بە خوا بزانێ ، ئەوە لە دۆزەخ بەدور دەبێت.

وە هەروەها ژمارەی ( ١٩ ) كە ژمارەی پیتەكانی ﴿ بِـسمِ اللهِ الرَحمنِ الـرَحيم ﴾ بووەتە كلیلێك بۆ زۆربەی بابەت و ووشەكانی قورئان كە بەبێ ماوە دابەش دەبن بەسەر ( ١٩ ) دا.

بۆ نموونە: لە سورەتی ( ق ) دا پیتی ( ق ) ( ٥٧ ) جار هاتووە، ئەگەر سەرنج بدەی لە قورئانی پیرۆزدا ( ١٢ ) جار ووتەی ( قَومُ لوط ) هاتووە، کەچی لە سورەتی ( ق ) دا بە شێوەی ( إخوانُ لوط ) هاتووە، خۆ ئەگەر لە سورەتی ( ق ) یش دا بە شێوەی ( قَومُ لوط ) بهاتبایە، ئەوە پیتی ( ق ) لەم سورەتەدا دەبووە ( ٥٨ ) و ئەو کاتە دابەش نەدەبوو بەسەر ( ١٩ ) دا، بەڵام ( ٥٧ ) بەبێ ماوە دابەش دەبێت بەسەر ( ١٩ ) دا.

بەڵێ ئیمانداران: هەر ووشەیەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتبێت و لەبەکار هێنانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکیدا پێچەوانەی هەبێت، ئەوا پێچەوانەکەشی لە قورئاندا بە ئەندازەی ئەو ووشەیە هاتووە، بەڵام لە دوو شوێنی قورئاندا ئەمە جێبەجێ نەبووە، بەڵکو ووشە بەرامبەرەکان لە بەکار هێناندا بەقەدەر یەکتری نین.

یەکەم: لە قورئانی پیرۆزدا ووشەی ( العُسر ) تەنگانەو ناخۆشی و نەخۆشی و گرفتاری ( ١٢ ) جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، بەڵام بەرامبەرەکەی ( اليُسر ) خۆشی وئاسوودەیی، ڕزگار بوون لە تەنگانە، ( ٣٦ ) جار هاتووە، باشە بۆچی بە ئەندازەی یەکتری نەهاتن؟ چونکە خوای گەورە خۆی فەرموویەتی﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴾ هەموو ناخۆشی و تەنگانەیەك دوو خۆشی بە دوادا دێت.

کەواتە : ( ١٢ ) و (١٢ ) و (١٢ ) دەکاتە ( ٣٦ ) جار .

یەکێ دەپرسێت دەبوایە ( ٢٤ ) جار ووشەی ( الیُسر ) بهاتایە، چونکە بە موقابیلی ناخۆشییەکە دوو خۆشی ، ئەی بۆچی ( ٣٦ ) جار هاتووە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر مرۆڤ لە تەنگانەو هەژاری و ناخۆشیدا ژیا، دوایی دوو جار خۆشی بینی، یەکسەر بە بیرکردنەوە لەو ناخۆشی و نائارامی و زەلیلیەی جارانی، لەزەت دەباو تام وچێژێکی نوێ لە خۆشییەکەی ئێستای وەردەگرێت ، کەواتە: بوو بەسێ خۆشی و کردیە ( ٣٦ ) جار.

دووەم: لە قورئاندا کە دوو ووشەی بەکار هاتوو بەرامبەر یەك وەکو یەك نین، بریتین لە ( الإیمان ) کە ( ٨١١ ) جار لە قورئاندا دووبارە بووەتەوە، لەبەرامبەردا ووشەی ( الكفْر وَالضَلالة ) ( ٦٩٧ ) جار دووبارە بووەتەوە، جیاوازی نێوان ئەم دوو ژمارەیەش ( ١١٤ ) یە، باشە بۆ دەبێت ( ١١٤ ) بێت؟ ئەی بۆچی ئیمان یان کوفر یەکی ژمارەیەك کەمتر یان زیاتر بوونایە، بۆ ئەوەی ( ١١٤ ) دەرنەچووایە، لە وەڵام دا ئەڵێین: خوا خۆی زاناترە، بۆیە ( ١١٤ ) جارە، چونکە ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز ( ١١٤ ) سورەتن، ئایا لەمەوە چی تێدەگەین؟

ئەوە تێدەگەین کە هەرکەسێك بڕوای بە هەر ( ١١٤ ) سورەتەکەی قورئانی پیرۆز نەبێت، ئەگەر بڕوای بە (١١٣) سورەتی هەبێت، تەنها بڕوای بە سورەتێکی نەبێت، خۆ ئەگەر بڕوای بەیەك ووشەی قورئانی پیرۆز نەبێت، یان بڕوای بەیەك پیت، یان بڕوای بە فەتحەو کەسرەو زەمەیەکی قورئانی پیرۆز نەبوو، ئەوە لە ڕیزی کافران وگومڕایانە.

بەڵام کاتێك مرۆڤ بڕوای بە هەر ( ١١٤ ) سورەتەکەی قورئان هێنا، ئەوە لە ڕیزی بێباوەڕان ڕزگاری دەبێت و دەبێتە ئەهلی ئیمان.

شەشەم: سەرنجی ووشەکانی قورئانی پیرۆز بدە، سەرنجی پیتەکانی بدە، بۆت دەردەکەوێت کە هیچ ووشەیەك هیچ پیتێك لە قورئاندا زیادە نییەو بەبێ هودە نەهاتووە.

بۆ نموونە: قورئان باسی میوەی دونیا دەکات، کە بۆ خواردن و گەلێك شت بەکار دێت، وەك ووشك کردنەوەو دۆشاو لێ دروست کردن و فرۆشتن، بۆیە کەباسی دەکات دەفەرموێت: ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ وەکو لە سورەتی ( المؤمنون ) ئایەتی ( ١٩ ) دا دەفەرموێت: ﴿فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾﴾واتە: ئێمە بە هۆی ئەو ئاوەوە چەندەها باخ و باخاتی خورماو ڕەزمان بەدی هێناوە بۆتان، ( لەو باخ وباخچانەدا) میوەهاتی جۆراو جۆری زۆرو زەبەندەمان بۆ بەدی هێناون، لە هەندێکیان دەخۆن.

بەڵام بۆ میوەی بەهەشت کە تەنها بۆ خواردنە دەفەرموێت: ﴿ مِنها تَأكُلُون ﴾ چونکە لەبەهەشتدا تۆ ئەگەر حەزت لە شەربەتی مێووژ یان پرتەقاڵ یان هەنار بێت، ناچیت میوەکە بێنی و بیگوشیت، یان ووشکی بکەیتەوە، بەڵکو هەر بەئامادە کراوی دێتە بەردەستت، تۆ میوەکە تەنها بۆ خواردن بەکار دێنی، بۆیە نافەرموێت: ﴿ومنها

تَأكُلُون﴾ بەڵكو ( واو ) ەكە لادەبات و دەفەرموێت: ﴿منــها تَــأكُلُون﴾ وەكو لـەم ئایەتـەدا هـاتووە: ﴿وَ تلكَ الجَنَّةُ أُرثُمُوها بِما كُنتُم تَعمَلون. لَكُـم فيها فاكِهَةٌ كَثيرَةٌ مِنها تَأكُلُون﴾ كەواتە: پیتـی (واو ) بە مەبەسـت دانـراوە لە قورئان داو مانایەكی تایبەت دەدات بە دەستەوە.

نموونەیەكی تـر: قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ الأنبياء ٣٠

واتە: لە ئاویش هەموو شتێكی زیندوومان فەراهەم هێناوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەو ڕاستییە زانستییەمان تێدەگەیەنێت كە ئاو سەرچاوەی ژیانە لـە هـەموو بونـەوەرە زیندووەكانـدا ( مـرۆڤ، ڕووەك ، ئـاژەڵ، زینـدەوەرە ووردەكـان كـە بـە ووردبـین نـەبێت نـابینرێن) وە زاناكـان لـەم دواییانـەدا كۆمـەڵێك زینـدەوەری زۆر ووردی تریـان دۆزییەوە، كە پێیـان دەوترێت ﴿الجَراثِيمَ اللاهَوائيَّة﴾ كە بـەبێ هـەوا دەژین، بەڵام ناتوانن بەبێ ئاو بژین !

ئیمانداران: بەڕاستی هەموو مرۆڤایەتی قەرزاری قورئانە، چونكە هەرچـی زانـستێك هەیـە سەرچـاوەكەی قورئانـە، وە هـەر زانایـەك زانستێكی بەدەست هێنابێت، سوودی لە قورئانی پیرۆز وەرگرتووە، بۆ نموونە:.

١. ئیبن سینا :. ئەم زانایـە سـوودی لـە تەمـەنی وەرگـرت و تـوانی دووسەدو پەنجا پەڕاو بنوسێت و یەكەم كەسە كە باسی پیس بوونی هـەوای كـردووەو یەكـەم كەسـە كـە باسـی نەخۆشـی سـیلی كـردووەو

ئەوروپییەکان پێی دەڵێن ( ئەمیری پزیشکان )و لە زانکۆیەکی فەرەنسی دا پەیکەرێکیان بۆ کردووە.

ئیبن وسینا دەفەرموێت: بەڕاستی من زۆر سوودم لە ئایەتی ﴿وَكَذلكَ جَعَلناكُم أُمةً وَسَطاً﴾ وەرگرت و لێیەوە فێر بووم کە هەموو شتێك ئەمسەرو ئەوسەری هەیەو ناوەڕاستیشی هەیە، وە دەفەرموێت: هەرکاتێك شتێکم لێ عاصی ببوایە، دوو ڕکات نوێژم دەکردوو دوعام دەکردو دەمووت: ئەی ئەو خوایەی کە منت کردووە بە ئوممەتی ( محمد المصطفى ) ﷺ کە ئوممەتی ( وَسَط ) ە هیدایەتم بدە، سوپاس بۆ خوا دوای ئەوە کارەکەم بۆ ئاسان دەبوو گرێکەم بۆ دەکرایەوە.

کەواتە: زانای بەڕاستی زانا خۆی بە خزمەتکاری قورئان دەزانێ و فەریکە خوێندەواریش کە هیچ نازانێت قورئان و ئیسلام بە کۆنە پەرستی دەزانێت.

٢. عەباسی کوڕی فیڕناس :. ئەم پیاوە بە منالّی قورئانی لەبەر کردووەو ئەم ئایەتە زۆر کاری تێکردووە،

﴿يَـٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ الرحمن ٣٣

واتە: ئەی گرۆی پەری و ئادەمیزاد ئەگەر دەتوانن بە بەشەکانی ئاسمانەکان و زەویدا دەرچن، ئەو کارە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بن کە

ئەو کارە بەهۆی دەزگای مادی و توانای مەعنەوییەوە نەبێت ئەنجام نادرێت.

عەباسی کوڕی فیرناس کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەیپرسی: ئایا کەس هەیە لە موسولمانان کە ئەم ئایەتە قورئانییەی هێنابێتەدی؟ ووتیان شك نابەین، فەرمووی: دەی من دەمەوێت یەکەم کەس بم کە ئەمە بهێنمەدی، ئەوەبوو ڕۆژێك خەڵکی شاری ( قورتوبەی ) کۆکردەوەو لەبەرزاییەکەوە وەستا، کە پەڕوو باڵی بۆخۆی دروست کردبوو، پێی ووتن: ئێوە شایەتم بن لە قیامەتدا کە هەوڵم داوە ئەو ئایەتە بهێنمەدی.

بەڵێ هەرچەندە هەوڵەکەی سەرکەوتوو نەبوو، قاچی شکا، بەڵام تا تەمەنی ( ٨٠ ) ساڵی ژیاو سەرەنجام لەم بیرەی ئەم داهێنەرە موسوڵمانەوە کە کاریگەری قورئان کاری لێکرد، فڕۆکە دروست بوو.

بەڵێ ئەمە تێگەیشتنی جوانە لە قورئان کە دەیەوێت لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی دا داهێنان بکات.

٣. ئیبن خەلدون:. ئەم زانایەش زانستی کۆمەڵناسی دامەزراندوو دەفەرموێت: ئایەتی: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾﴾ آل عمـــران ١٣٧ واتە: بەڕاستی پێش ئێوە چەندان یاساو بەرنامە تێپەڕیوە لە لایان خواوە کە سەرەنجام ئیمانداران سەر خستووەو کافرانی لەناو بردووە، دە

ئێوەش بە زەوی دا بگەڕێن و تەماشا بکەن و ئینجا سەرنج بدەن و وورد ببنەوە، بزانن سەرەنجامی ئەوانە چۆن بووە کە بەرنامەی پێغەمبەرانی خۆیان بە درۆ زانیوە؟ !

ئیبن خەلدون دەفەرموێت:ئەم ئایەتە وای لێکردم کە هەوڵ بدەم جێبەجێ ی بکەم و زانستی کۆمەڵناسی لێ بەرهەم هات.

بەڕێزان: بەڕاستی قورئان ئەوەندە کاریگەرە کە دوژمنانیشی لە ئاست گەورەیدا سەردادەنەوێنن و حەزدەکەن خزمەتی بکەن، ئەوەتا ئەورووپا خۆی خزمەتی قورئانی کردووە، لە ساڵی ( ١٥٣٧ ) ی زاینی دا یەکەم نوسخەی قورئانی پیرۆز لە شاری ( ڤینیسیا ) ( البندوقیة ) لە ئیتالیا چاپ کرا، دوای ئەوە لە ( هامبۆرگ ) ی ئەڵمانیا لە ساڵی ( ١٦٩٤ ) ی زاینی چاپ کرا، دواتر شاژنی ڕووسیا لە ساڵی ( ١٧٨٧ ) ی زاینی لە ئاستانەی دەوڵەتی عوسمانی چاپ کرا.

ئێستاش لە سعودیە لە شاری مەدینە لە کۆمەڵگای ( شافەهد ) کە لە ساڵی ( ١٩٨٤ ) دامەزراوە ساڵی زیاتر لە (١٠) ملیۆن قورئان چاپ دەکرێت.

وە هەر لە موعجیزەی گەورەی ئەم قورئانەیە کە : قورئانی پیرۆز تا زیاتر دژایەتی بکرێ ، زیاتر خەڵکی عاشقی دەبێ و لەبەری دەکات.

بۆ نموونە: لەم سێووڵاتە زۆر دژایەتی قورئانی پیرۆز کرا، زۆر هەوڵی نەهێشتنی کاریگەری قورئان درا، وایان لە خەڵکی بە گشتی و گەنجان و ڕۆشنبیران گەیاند کە قورئان سەردەمی بەسەر چووە، بەڵام

سەرنج بدەن چۆن لە هەموو وڵاتانی تر، بە تایبەتی ئەوانەی کە ڕێژی قورئانیان تێدا دەگیرێت، قورئان لەبەر ، کە هەموو قورئانیان لەبەرە زۆرترە.

١. وڵاتی پاکستان:. کە زۆر دژایەتی ئیسلامی تێدا کرا، کەچی لە پاکستاندا لە هەر سێ ماڵ حافزێکی قورئانی تێدایە، کە دەکاتە نزیکەی حەوت ملیۆن حافز قورئان، کە هەموو قورئانیان لەبەرە، ئەی ئەوانەی کە (١٠) جوزئو (٥) جوزئیان لەبەرە، ئەبێت چەند بن؟!

٢. وڵاتی میصر:. کە هەرچەندە زانکۆی ئەزهەری لێیە، بەڵام خزمەتکارانی قورئانی تێدا زیندان و شەهید دەکرێن، بۆ نموونە: لە میصردا بوو کە جمال عبدالناصر موفەسیری گەورەی قورئان ( سید قوطب ) ی شەهید کرد ، بەڵام قورئان نەك کاریگەری کەم نەبویەوە، بەڵکو ئەوەتا کەسێکی وەکو ( لۆرافا گیری ) ڕۆژهەڵات ناس دەڵێت: تەنها لە میصردا ئەوەندە حافزی قورئان هەیە، کە ژمارەیان زۆرترە لەوانەی کە لە هەموو ئەوروپادا دەتوانن ئینجیل بخوێننەوە.!!

٣. وڵاتی تورکیا:. لە ساڵی ( ١٩٢٣ ) دا کەمال ئەتا تورك لە پەرلەمانی تورکیادا ووتارێکی گاڵتە ئامێزی بە قورئانی پیرۆز داو ووتی: ئێمە ئێستا لە سەدەی بیستەم داین و ناتوانین دوای کتێبێکی وا بکەوین کە بە دوای هەنجیرو زەیتون دا بگەڕێت، کە مەبەستی ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ ی قورئانی پیرۆز بوو، واتە: قورئان کاتی بەسەر چوو لە تورکیا. کەچی دوای ئەو هەموو دژایەتییەی تورکیاو

حکومەتی کەمالی بۆ قورئانی پیرۆز سوپاس بۆ خوای گەورە ئێستا زیاتر لە ( ٤ ) ملیۆن حافزی قورئان لە تورکیادا هەیە.!!

کەواتە: هەتا دژایەتی قورئانی پیرۆز بکرێ و قەدەغە بکرێ، موسوڵمانان شەیدایانەتر باوەش بە قورئانی پیرۆزدا دەکەنەوەو هەوڵی خوێندن و لەبەر کردنی دەدەن.

بەڕێزان: قورئانی پیرۆز ئێستا بە زیاتر لە ( ١٣٠ ) زمان واتای لێکدراوەتەوەو زۆرترین کەس بە دەستی دێنێ و دەیخوێنێتەوە، بە دڵنیاییەوە هیچ کتێبێك نییە لە جیهاندا بە ئەندازەی قورئانی پیرۆز خوێنەری هەبێت، ئەمجا هەموو کتێبێك کە چەند جارێك خوێندتەوە، لێی بێتاقەت دەبی و تام وچێژی نامێنێت، بەڵام قورئانی پیرۆز هەتا زیاتر بیخوێنیتەوە، زیاتر هەست بە خۆشی دەکەی، هەموو جارێك دەڵێی ئەمە یەکەم جارتە لە خوێندنەوەی دا.!

بەڵێ لە مێژووی ئیسلامدا سەدان زانای ناودار خەریکی تەفسیرو لێکۆڵینەوەی قورئان بوون، بۆ نموونە:

( ئیمامی سیوطی ) کە لە ساڵی ( ٩١١ ) ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، لە کتێبی ( التَعبیر في عِلم الحَدیث) دا دەفەرموێت: ئەو زانیاریانەی لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە نوسراون گەیشتونەتە ( ١٠٢ ) جۆر زانست.

( داودی میصری ) کە لە ساڵی ( ٩٤٥ ) ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، لە کتێبی ( طَبَقَات المُفَسرِین) دا ( ٧٠٤ ) موفەسیری بۆ

قورئانی پیرۆز ناو بردووە، کە تەفسیری قورئانیان کردووە، ئاخۆ دەبێت ئێستا بە چەند گەیشتبن؟!

زانای گەورە ( ئیمامی نەسەفی ) لە کتێبی ( مَجمـوع العلـوم وَمَطلَع النُجُوم ) دا هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی بزانێت هەریەك لە پیتەکانی قورئانی پیرۆز چەند جار هاتووە؟ ئەمجا ئەمەی هەموو بە دەست بەبێ کۆمپیوتەر ژماردووە:.

ئەلیف ( ٤٨٧٤ ) جار ، پیتی ( ن ) ( ٧٠٠٠ ) جار ، پیتی ( ی ) ( ٢٥٧١٧ ) جار هاتوون.

ئەم هەموو ماندوو بوون و شەو نخونییە بۆ ئەوەی ببێت بە یەکێك لە خزمەتکارانی قورئانی پیرۆز.

وە بەندەش لێرەدا وەکو کوردێکی موسوڵمان، سوپاسی خوا دەکەم و بە شانازییەوە دەڵێم: گەلی کورد کە نەتەوەیەکی موسوڵمانی ( ٤٠ ) ملیۆنییە، تەنها لە نێوان ساڵەکانی (١٣٨٠ تا ١٤٣٠) ی کۆچیدا زیاتر لە (٣٠٠٠) کتێبی لە بارەی ئاینی ئیسلامەوە نوسیوە، ئەمە جگە لە هەزاران نامیلکەو بڵاو کراوە، وە سوپاس بۆ خوا ( مەلا ) ناودارەکانی کوردستان تا ساڵی (١٤٣٠ هـ) ئەوەی ئێمە لێی ئاگادار بین: ( ٤٠ ) تەفسیری قورئانی پیرۆزیان تەنها بە زمانی کوردی نوسیوە جگە لە تەفسیرەکانی تر، کە مەلای کورد بە زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی نوسیویانە، کە ئەمە زۆر دڵخۆشکەرەو بە دوژمنانی کوردو ئیسلام دەڵێت: ئەم کوردە ئەوەندە عاشقی قورئانی پیرۆزە، هەرگیز تۆوی بێ دینی لەناویا سەوز نابێت، وە ئەگەر بە زۆر

ڕوێنرا بەرهەمدار نابێت، وە بە ناحەزانی کورد دەڵێت: ئەو کاتەی کە کورد بە کافر دادەنێن و بەناو ( ئەنفالی ) بەسەردا جێبەجێ دەکەن، ئایا کورد دڵسۆزترین نەتەوە نین بۆ ئیسلام کە ئەو هەموو موفەسیرەی قورئانی تێدا هەڵکەوتووە؟!

بەڵێ ئیمانداران: ئەم قورئانە وەڵامی هەموو پرسیارێکی تێدایە، هەرچی گیروگرفت و موشکیلەی سەر ئەم زەوییە هەیە، بە قورئانی پیرۆز حەل دەکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ یونس ٥٧

واتە: ئەی خەڵکینە ، بەڕاستی ئێوە ئامۆژگارییەکی گەورەو گرنگتان لە لایەن خوای پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، کە ( قورئانە ) شیفاو چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ ودەرونەکان و ڕێنیشان دەرو ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران.

هەزاران ڕەزاو ڕەحمەتی خوای پەروەردگار لە حەزرەتی ( أبوبکری صدیق ) کە فەرموویەتی: (لَو ضاعَ مِنّي عِقالُ بَعيرٍ لَوَجَدتُهُ في كِتابِ اللهِ ) واتە: ئەگەر پەتی بەستنەوەی حوشترەکەم لێ وون ببێت، لە قورئانی پیرۆزدا ئەیدۆزمەوە.

جارێکیان کەسێکی دژ بە قورئان وئیسلام بە زانای گەورە ( شیخ محمد عەبدە ) دەڵێت: باشە ئێوەی موسوڵمانان دەڵێن قورئانەکەمان

وەڵامی هەموو پرسیارێکی تێدایە، باشە من لە تۆ ئەپرسم: ئایا فەردەیەك ئارد چەند نانی تێدا دەبێت؟ دەی ئەمەم لە قورئانەکەتاندا بۆ بدۆزەرەوە، شێخ محمد عەبدە دەفەرموێت: زۆر باشە بەیانی وەرەوە بۆ وەڵامەکەی، بۆ بەیانی کابرا دێتەوەو دەڵێت: ها مامۆستا قورئان باسی ئەوەی تێدا بوو کە فەردەیەك ئارد چەند نانی تێدایە؟ دەفەرموێت: بەڵێ تیایەتی ( فەردەیەك ئارد ئەوەندە ، ژمارەیەك دەڵێت) نانی تێدایە، کابرا دەڵێت: کوا پێم بڵێ کام ئایەتەیە؟ شێخ دەفەرموێت: ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿فَسأَلُوا أَهلَ الذِّكرِ إِن كُنتُم لا تَعلَمون﴾ منیش چووم بۆ لای نانەوایەك، چونکە ئەهلی زیکری ئەم ئیشە نانەوایەو ئەویش پێی وتم چەند نان لە فەردەیەك ئارددا هەیە، کەواتە: وەڵامەکەم هی قورئانە ، چونکە ئەو ڕێنمایی کردم مادام خۆم نازانم، بچم بۆ لای پسپۆڕی ئەو کارەو پرسیاری لێبکەم، ! ئیتر کابرا دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو!!

ئیمانداران: سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن: لەسەرەتای چەرخی چواردەهەمی کۆچیدا، نامەیەك لە ئیمپراتۆری ئەڵمانەوە دەگاتە ( سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) سوڵتانی عوسمانی، داوای کردبوو لە ڕێی زانایانی ئیسلامەوە وەڵامی ئەم پرسیارەی بدەنەوە، ( لەیەکێك لە نەخۆشخانەکانی ئاڵمانیادا دوو ئافرەت مناڵیان بووە، بەیەکەوە مناڵیان بووە، مامانەکان هەردوو مناڵەکە دەبەن لە حەوزێکدا بیانشۆرن، یەکێك لە مناڵەکان کوڕ بووەو ئەوی تریان کچ بووە، کاتێك لە شۆردنیان بونەوە، لێیان تێکچووە هەر مناڵەو هی کام

ئافرەتیانــە، دەپرســن: باشــە چــۆن بــزانین کــام منــداڵ هــی کــام ئافرەتەیانە؟

سـوڵتان عبدالحمیـد پرسـیارەکە لـە هـەموو زانایـانی ئەسـتەمبوڵ دەکـات و کـەس ناتوانێـت وەڵـامی دروسـت ودڵنیاکـەر بداتـەوە، لـە کۆتایدا زاناکان دەڵێن: ئەی سولْتان ئەم پرسیارە لە ( شێخ محمـود الحمزاوی ) موفتی دیاری شام بکە،( ئەم زانا گەورەیە لە ساڵی ١٢٩٩ ی کۆچـی بووەتـە مـوفتی گـشتی شـام و لـە سـاڵی ١٣٠٥ ی کۆچـی وەفاتی کردووە ).

بـەڵێ پرسـیارەکە ئاڕاسـتەی مـوفتی دەکـرێ و ئـەویش چـەندان زانـای گـەورەی لـە دەور بـوون، هـەموویان دیراسـەی ئـەم پرسـیارە دەکـەن، ناگەنـە فتوایـەکی قەناعـەت کـەر، بۆیـە مـوفتی شـەو لـەناو کتێبخانەکـەی خـۆی دا دەمێنێتـەوەو بـە دوای وەڵامـدا دەگـەڕێت، تەنانـەت هـەموو کتێبـەکانی شـاری دیمەشـق دەگـەڕێت، تـا شـەوێك دوای نیوەی شەو (شێخ محمودی موفتی ) هـاوار دەکـات ( وەڵامەکـەم دۆزییـەوە ) کـە سـەیر دەکـەن دەسـتی بـۆ لای خـوای گـەورە بـەرز کردووەتـەوەو بـەرەو قیبلـە وەسـتاوەو سوپاسـی خـوا دەکـات کـە وە ڵامەکەی خستووەتە دڵیەوە.

موفتی نامـەی بۆ سـوڵتان عبدالحمیـد نوسـی و فـەرمووی: شیری هــەردوو ئافرەتەکــە هەریەکــە بکرێتــە شوشــەیەکەوە، کــە هــەردوو شوشەکە لە کێشدا وەکو یەك بن، وە بزانن کـام شوشـەیان شیری کام

ئافرەتیانی تێدایە، پاشان بیان کێشن، هەر شیرێکیان دوو چەندانی ئەوی تریان قورس بوو، کوڕەکە هی ئەوەیانە.!

سوڵتان عبدالحمید بە سەر سوڕمانەوە دەڵێت: جەنابی موفتی ئەمەت چۆن زانی؟! موفتی فەرمووی: چومە خزمەت قورئانی پیرۆزو لە ژێر تیشکی ئایەتی ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ دا دۆزیمەوە.!

بەڵێ سوڵتانی عوسمانی وەڵامەکەی ناردەوە بۆ ئیمپراتۆری ئەڵمانیاو کاتێك ئیمپراتۆری ئەڵمان نامەکەی پێ گەیشت، خۆی و هەموو قەشەو پیاوانی کەنیسە سەرسوڕمانی خۆیان دەربڕی لە زیرەکی شیخ محمود الحمزاوی پاشان بە سەفیری ئەڵمانیا لە دیمەشق نامەی سوپاسگوزاری بۆ موفتی شام دەنێرێ و خەڵاتی پێشکەش دەکات.

بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ موسوڵمانان بەهۆی دوور کەوتنەوە لە خزمەتی قورئانی پیرۆز، نەك موشکیلەی خەڵکی پێ حەل ناکرێت، بەڵکو دەبێت خەڵکی چارەسەری دەردەکانی بکات.

ئیمانداران: دە با لە خزمەت قورئاندا بین، چونکە ڕۆژێك دێت کە ئەم قورئانە پیرۆزە دەپێچرێتەوەو قورئانێکی نوسراو لە تەواوی ئەم سەر زەوییە دەست ناکەوێت. ئەمەش ئەو هەواڵە سامناکەیە کە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ پێی ڕاگەیاندوین، کە فەرموویەتی: (وَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللهِ فِي لَيْلَةٍ فَلاَ يَبْقَى فِي الأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ ).

واتە: لە شەوێکدا قورئانی پیرۆز لەسەر زەوییەوە بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان و تەنها یەك ئایەتی ئەم قورئانە لەم سەر زەوییە نامێنێت.!!

شَیخُ الأسلامْ ( ابنُ تَیمیة ) لە مَجموعُ الفَتاوی ج٣ ص ١٩٨ دا دەفەرموێت: ( یُسری بِهِ فِي آخِرِ الزَمانِ مِنَ المَصاحِفِ وَالصُدُورِ، فَلا یَبقى فِي الصُدُورِ مِنهُ كَلِمَةٌ، وَلا فِي المَصاحِفِ مِنـــهُ حَـرفٌ )

واتـە: لـە کۆتـایی دونیـادا ، لـە شـەوێکدا قورئـان بـەرز دەکرێتـەوەو هەڵدەگیرێت لـەناو لاپـەڕەی قورئانەکانـداو پـەڕەکان سـپی دەبنـەوەو لەناو سنگی قورئـان زان و قورئـان لەبەرانـدا نـامێنێ و بیردەچێتەوە، لەناو سینەی هیچ قورئـان خوێنێکدا ووشـەیەك نامێنێت، وە لـە هـیچ موصحەفێکی قورئاندا هیچ پیتێك نامێنێت.

کەواتـە: بـا تـا قورئانمـان لـەناودا مـاوە دەسـتی پێـوە بگـرین، بـا لەخزمـەتی قورئـانی پـیرۆزدا بـین، چـونکە هەرکەسـێك، هـەرماڵ و خێزانێـك، هەرگـەل و نەتەوەیـەك، لـە خزمـەت قورئـانی پـیرۆزدا بێـت، خوای گەورە لە دونیاو قیامەتدا سەرفرازی دەکات، دەی کەواتە کێ دەیەوێت دونیای هەبێت، دونیایەکی پڕ بەختەوەری بەسەر ببات، با لە خزمەت قورئاندا بێت، وە هەرکەسێك حەز دەکات قیامەتی ئاوەدان بێت، لـە مەیدانی مەحشەرو سەر پردی سیراتدا ڕزگاری بێ، بـا لـە خزمەت قورئانی پیرۆزدا بێت، هەرکەسێك ئەیـەوێت دونیـاو قیامـەتی هەبێت، با لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا بێت.

خوایا گیان قورئانی پیرۆز بکەیتە بەهاری دڵمان و نوری چاومان و لابەری غەم وپەژارەمان، بیکەی بە مایەی شیفای دڵ ودەرون و نەخۆشییەکانی لاشەمان، قورئانی پیرۆز بکەیتە بەرەکەتی ماڵەکانمان. اللهم امین.

## سەرچاوەکان:.


١. تەفسیری ئاسان بورهان محمد ئەمین

٢. لەسایەی ناوە پیرۆزەکان دا بورهان محمد ئەمین

٣. مجَلَة الحِوار عدد ٦٢ تشرين الأول ٢٠٠٧

٤. رَوضةُ المُتَقين في المَجالِس الصالحين

محمد بدالعاطي البَحيري

٥. له نهێنییەکانی قورئان

د. مصطفى محمود و جمال محمد أمين

٦. ڕامان له قورئان ئەندازیار عوسمان

٧. ژیانەوە ئەندازیار عوسمان

٨. بەرەو ئیسلام ، ئارامی ئەندازیار عوسمان

٩. تەفسیری ڕامان أحمد کاکە محموود

١٠. مَنهَجَ القَرآنُ الكَريم في إصلاح المُجتَمَع

د. محمد السيد يوسف

| | |
|---|---|
| ١١. ژوانگەی سەروەران | م. محمد سەنگاوی |
| ١٢. صَحيح قِصَص الرَسول | سعد يوسف ابو عَزيز |
| ١٣. السِلسِلة الذَهَبية | محمود المِصري |

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيِدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وَ صَحبِهِ أجمَعينَ:

**ئیمانداران: پشتیوان بە خوای گەورە لەم ووتارەدا باسی یەکێك لە پێغەمبەرانی خوا دەکەین، کە ئەویش (حەزرەتی یونس) ە . بەڵام نەك وەکو چیرۆك وبەسەرهات، بەڵکو وەکو شێوازی قورئان کە بەسەرهاتەکانی ناو قورئان ( قصص ) ن نەك حیکایەت، کە بەڕاستی ئامۆژگاری زۆر بە نرخ لە ژیانی یونس پێغەمبەردا بۆ ئێمەی موسوڵمان لەم ڕۆژگارەدا هەیە.**

**حەزرەتی ( یونس) ( ٦ ) جار ناوی لە قورئان دا هاتووە، ( ٤ ) جار بەناوی ( یونس ) ئەوانیش لە سوڕەتەکانی**

**( النساء/ ١٦٣ ، الأنعام/ ٨٦ ، یونس/ ٩٨ ، الصافات/ ١٣٩ )**

**یەك سوڕەت لە قورئان دا ناوی سوڕەتی ( یونس ) ە.**

**وە لە یەك شوێنی قورئانیشدا خوای گەورە بە لەقەبی ( ذي النون ) خاوەنی حوتەکە، ناوی بردووە، ئەویش لە سوڕەتی ( الأنبیاء ) ئایەتی ٨٧ دا دەفەرموێت:** ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ﴾

**وە هەروەها لە سوڕەتی ( القَلَم ) ئایەتی ٤ بە ( صاحبُ الحُوت ) ناوی بردووەو دەفەرموێت:** ﴿فَاصبِر لِحُكمِ رَبِّكَ وَلا تَكون كَصاحِبِ الحُوتِ إِذ نادى وَهُوَ مَكظوم ﴾ .

حەزرەتی یونس یەکێکە لە پێغەمبەرە هەرە پایە بەرزەکان، چونکە خوای گەورە بە پێغەمبەری ( مُرسَل ) ناوی بردووەو دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝١٣٩﴾ الصافات ١٣٩

وە هەروەها حەزرەتی یونس کوڕی ( مَتی ) یە، ( مَتی ) ناوی دایکیەتی، وە لەناو سەرجەم پێغەمبەراندا تەنها دوو پێغەمبەر بە ناوی دایکیانەوە ناو براون، ئەوانیش: حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم کە هەر باوکی نەبووە، وە حەزرەتی یونس ی کوڕی متی .

حەزرەتی یونس دەچێتەوە سەر بنیامین ی کوڕی حەزرەتی یەعقوب، کە برای دایك وباوکی حەزرەتی یوسفە سەلامی خوای پەروەردگار لە هەموویان بێت.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ حەزرەتی یونس ی بە برای خۆی ناو بردووە، ئەوە بوو کاتێك کە لە ( طائف) گەڕایەوە و بەسەرهاتەکەی ئاشکرایە، کە سەرکردە دڵڕەق و بێ دەرگاکانی ( طائف) نەك هەر وەڵامی بانگەوازەکەیان نەدایەوە، بەڵکو زۆر بێ شەرمانە منداڵ و هەرزەیان شوێن خست و بەرد بارانیان کردو سەرەنجام قاچی پیرۆزی خوێنی پێدا دەچۆڕایەوەو پاشان لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسەی هاوەڵیدا لایاندایە پەنا باخێك و باخەوانەکە کە خزمەتکاری دوو کەسی کافر بوو، بەزەیی پێیاندا هاتەوەو هێشووێك تری ی بۆ بردن و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿ بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الرَحیم ﴾ ئینجا ترێکەی خوارد، ئەویش بەسەرنجەوە تەماشای دەم وچاوی پێغەمبەری خوای کردو ووتی:

ئەم قسەیە خەڵکی ئەم ناوچەیە نایڵێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ تۆ خەڵکی کوێی؟ وە تۆی بەڕێزو بەبەزەیی ناوت چییە؟ وە لەسەر چ ئاینێکیت؟ ووتی: من ناوم ( عەداس ) ەو لەسەر ئاینی ( نەصرانی ) م وە خەڵکی ( نەینەوا ) م .

فەرمووی: نەینەوا، گوندی پیاوە چاك و بەڕێزەکە ( یونسی کوڕی متی ) ؟! عەداس فەرمووی: تۆ چۆن یونسی کوڕی متی دەناسی و دەنگ وباسی ئەو دەزانیت؟ ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( ذاكَ أخي ) ئەو برامە، یونس پێغەمبەرو منیش پێغەمبەرم، ئەوجا عەداس کەوت بەسەر دەست وقاچی پێغەمبەری خواداو ماچی کرد.

وە هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ( لا يَقولَنَّ أَحَدُكُم إِنِّي خَيرٌ مِن يونس ) واتە: هیچ کەس لە ئێوە نەڵێت کە من باشترم لە یونس.

وە هەروەها فەرموویەتی: ( وَلا أَقُولُ إِن أَحداً أَفضَلُ مِن يُونس بن مَتَى ) رواهُ البُخاري(٣٤١٥)

واتە: من ناڵێم کە بەڕاستی هیچ کەسێك چاکترە لە یونسی کوڕی متی .

زانایان لە ڕاڤەی ئەم دوو فەرمودەیەدا دەفەرموون: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك و تەواضع و خۆ بەکەم گری ئەمەی فەرمووە، ئەگەر دوای ئەوە فەرمووبێتی: کە خوای گەورە ئاگاداری کردووە کە ئەو ڕێزدارترینی هەموو دروستکراوەکانی خوایەو سەردارو خاتەمی هەموو پێغەمبەرانە.

وە هەندێکی تر لە زانایان هەروەکو لە ( فَتحُ الباري ) دا هاتووە فەرموویانە: بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەت ناوی حەزرەتی یونسی هێناوە، لەبەر ئەوەی مەترسی ئەوەی هەبوو کە ئەو کەسەی بەسەرهاتی حەزرەتی یونس دەبیستێت، لەناو بۆچوون و بیرکردنەوەیدا ئەوە درووست ببێت کە حەزرەتی یونس کەمتەرخەمی کردووەو لە پلەو پایەی ئەو زاتە بەرزە لەبەرچاوی کەم بێتەوە، هەربۆیە ئاوا بەبەرزو بەڕێزی ناوی هێناو فەرمووی: من لەو بە باشتر دامەنێن، تاوەکو ئەو گومانە بڕەوێتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: پەیامی حەزرەتی یونس وەکو هەموو پێغەمبەران بانگەواز بووە بۆ یەکتاپەرستی و دوور کەوتنەوە لە هەموو جۆرە بت پەرستییەك، خوای گەورە ناردی بۆ سەر ئاوایی ( نەینەوا ) لە خاکی موصڵ ، کەواتە: موصڵ بە هەموو سنورەکە دەوترێ و نەینەوا یەکێك لە ئاوەدانییەکانیەتی، وە ئەم خاکە خاکی کوردو کوردستانە، حەزرەتی یونس بانگی کردن بۆ یەکتاپەرستی و ڕەوشتە جوانەکان و وازهێنان لە خراپەکاری و ستەم، بەڵام گەلەکەی یونس وەڵامیان نەدایەوە، وە گوێیان بۆ ئامۆژگارییە بە سوودەکانی نەگرت، بەڵکو گاڵتەیان بە یەکتاپەرستی و پەیامی حەزرەتی یونس دەهات، حەزرەتی یونس زۆر بێتاقەت و خەفەتبار بوو، کە گەلەکەی وەڵامی نادەنەوە، بۆیە فەرمووی: ئەگەر تا سێ ڕۆژی تر ئیمان نەهێنن خوای گەورە غەزەبتان لێ دەگرێ و بەهیلاك دەچن، بەڵام ئەوان گاڵتەیان بەو قسانە دەهات، بۆیە حەزرەتی یونس ڕقی لە

قەومەکەی هەڵساو بەبێ ئەوەی ئیزنی خوایی بۆ بێت، قەومەکەی بەجێ هێشت و ڕووی کردە دەریاو سواری کەشتی بوو، وای زانی خوای پەروەردگار ڕێگای لێناگرێت لەو دەرچوونە، چونکە لەبەر خاتری خوا تورە بووەو قەومەکەی بەجێ دێڵێت، خوای گەورە ئەو کاتەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت:

﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الأنبياء ٨٧

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ یادی ( ذو النون ) یش بکەرەوە، کە یونس پێغەمبەرە، کاتێك کە بە تورەییەوە ڕۆیشت گومانی وا بوو کە هەرگیز دونیای لێ تەنگ ناکەینەوە، بەڵام بە پێچەوانەی گومانەکەیەوە، خوای گەورە خستییە ناو سکی نەهەنگێکەوە.

وە خوای گەورە چۆنیەتی چوونە ناو سکی نەهەنگەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذۡ أَبَقَ إِلَى ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلۡمُدۡحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴿١٤٢﴾ ﴾ الصافات ١٣٩.١٤٢

واتە: بەڕاستی یونسیش لە پێغەمبەرانە، کەچی ڕای کرد بەرەو کەشتییە پڕ لە کەل و پەل و خەڵکەکە، خوای گەورە وەکو بەندەی هەڵاتوو ناوی دەبات، چونکە بەبێ فەرمانی خوا گەلەکەی بەجێ هێشت، جا کاتێك کە کەشتییەکە کەوتە حاڵەتێکی نائاساییەوە، کەشتیوان وتی: دەبێت یەکێکمان فڕێ بدرێتە ناو ئاوەکەوە، بەڵکەو تۆزێك باری سووك ببێ و کەسێکمان تیا بچێت باشترە لە هەموومان، ئەوە بوو حەزرەتی یونسیش بە ناچاری بەشداری قورعەکەی کردوو، لە ڕیزی ئەوانەدا بوو کە لە قورعەکەدا سەرنەکەوتن، لە ( البداية والنهاية ) ی (ابن كثير) دا دەفەرموێت: سێ جار قورعەکەیان کرد هەر ناوی حەزرەتی یونس دەردەچوو، ئیتر بە ناچاری فڕێیان دایە ناو دەریاکەوەو یەکسەر بە فەرمانی خوای باڵادەست نەهەنگێك قوتیدا، لە کاتێکدا کە شایانی سەرزەنشت و گلەیی بوو، چونکە پێش ئەوەی خوای گەورە مۆڵەتی بدات قەومەکەی بەجێ هێشت.

بەڵێ حەزرەتی یونس کەوتە ناو سێ تاریکیەوە:.

١. تاریکی ناو سکی نەهەنگ ..٢. تاریکی دەریا ..٣. تاریکی شەو. ( هەروەکو سێ تاریکیەکەی ناوسکی دایك ) کەواتە: چۆن کۆرپەلە لەناوسکی دایکیدا لەو سێ تاریکیەدا دەژی، ئاواش حەزرەتی یونس لەو سێ تاریکیەدا دەژیا، ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَـٰتِ أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الأنبياء ٨٧

واتە: جا حەزرەتی یونس لەناو تاریکیەکاندا ( تاریکایی شەوو ناو دەریاو ناو سکی نەهەنگ) هاوارو نزای لێ بەرز بویەوەو ووتی: پەروەردگارا هیچ خوایەك نییە جگە لە تۆ، پاك وبێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم، چونکە بەبێ فەرمانی تۆ قەومەکەم بەجێ هێشت.

﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾الانبياء ٨٨

واتە: ئێمەش بە هانایەوە چووین و ڕزگارمان کرد لەو غەم وپەژارەو تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیمانداران ڕزگار دەکەین، کاتێك کە دەکەونە تەنگانەوەو هاناو هاوار بۆ ئێمە دێنن.

بەڵێ ئەم پاڕانەوەو یادی خوایە بوو بە هۆی ڕزگار بوونی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ﴾ الصافات ١٤٣

واتە: خۆ ئەگەر یونس لەو کەسانە نەبوایە کە تەسبیحات ویادی خوای گەورە دەکەن و نەیوتایە: : پەروەردگارا هیچ خوایەك نییە جگە لە تۆ، پاك وبێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم، ئەگەر ئاوا لە خوای گەورە نەپاڕایەتەوە، ئەوا لە سکی نەهەنگەکەدا دەمایەوە تا ڕۆژێك کە هەمووان زیندوو دەکرێنەوە کە ڕۆژی قیامەتە.پاشان خوای گەورە شێوازی ڕزگار بوونەکەی باس دەکات و دەفەرموێت:

﴿ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ ﴾ الصافات ١٤٥ـ ١٤٦

**واتە: لەوەو دوا فرێماندایە چۆڵییەکی بێ گژوگیاو درەختەوە، بێ هێزو ماندو نەخۆش، ئینجا ڕووەکی کولەکەی گەورەمان بۆ پێگەیاند کە گەڵاکانی پان وگەورەیەو مێش ومەگەز نزیکی ناکەونەوە.**

**لەملاشەوە قەومەکەی حەزرەتی یونس کە زانییان حەزرەتی یونس ڕۆیشتووەو عەزابی خوای گەورە نزیك بووەتەوە بۆ سەریان، بە ژن وپیاو گەورەو بچووکەوە، مەڕومالات و ئاژەڵەکانیان بردە دەرەوەی ئاواییەکەیان و بەیەك دەنگ هاواریان کردوو پاڕانەوە کە خوای گەورە لێیان خۆش بێ و تەوبەیان وەربگرێت، خوای گەورەش بە هانایانەوە هات و تەوبەکەی لێ وەرگرتن و عەزابەکەی لەسەر لابردن.** ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ ﴾ یونس ٩٨.

**واتە: جا دەبوایە خەڵکی ئەو شارو شاروچکانەی کە هەڕەشەیان لێکرا بوو، باوەڕیان بهێنایەو باوەڕەکەیان سوودبەخش بوایە بۆیان، بەڵام باوەڕی هیچکامیان سوودی پێ نەگەیاندن، جگە لە قەومی**

یونس نەبێت ، کاتێك کە باوەڕیان هێنا سزای سەرشۆڕیمان لە دنیادا لەسەر هەڵگرتن و تاماوەیەك لە نازو نیعمەت بەهرەوەرمان کردن.

بەڵێ خوای گەورە تەوبەی لێ قبوڵ کردن و ئەوانیش بەردەوام بە دوای حەزرەتی یونس دا دەگەڕان و پاشان لەو کەناری دەریایە دۆزیبانەوەو هێنایانەوە بۆ ناو خۆیان و ئیمانیان پێ هێنا کە پێغەمبەری خوایەو لە خزمەتی فەرمودەکانیدا بوون، هەروەکو دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُواْ فَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾﴾ الصافات ١٤٧ . ١٤٨

واتە: ئینجا گەڕاندمانەوەو ڕەوانەمان کرد بە پێغەمبەرایەتی بۆ سەر سەد هەزار کەس و زیاتریش، کە قەومەکەی خۆی بوون، ئەوسا هەموویان ئیمان وباوەڕیان هێناو ئێمەش ژیانێکی خۆشمان بۆ فەراهەم هێنان، تا کاتێکی دیاری کراو.

بەڵێ ئیمانداران: ئەمە بەسەرهاتی حەزرەتی یونس پێغەمبەر بوو ﷺ کە قورئانی پیرۆز بۆی باس کردووین، بەڵام ئێمەی ئوممەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان، حەزرەتی محمد ﷺ ئایا چ دەرس و ئامۆژگاری و بەئاگا هاتنەوەیەك لەم بەسەرهاتە وەردەگرین؟

بێگومان لە ژیاننامەی پێغەمبەرانی خوادا عليهم السلام دەیان وانەی بەنرخ وڕێ نیشاندەر هەن، بەڵام پێش باس کردنی ئامۆژگارییەکان، پێم خۆشە لە خزمەت هەندێك لە سەرنج ڕاکێشی و تەعبیرو دەربڕینی نایاب و ناوازەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە لەم باسەی حەزرەتی

یـونس دا هـاتوون، بـدوێین وئـەمجا زیـاتر ئیعجـازی ئـەم قورئانـە پیرۆزەمان بۆ دەردەکەوێت.

یەکەم:.خوای گەورە ناوی حەزرەتی یونس دەبات بە ( صاحِبُ الحـوُت ) هـاورێی نەهـەنگ، وەکـو ئـەوەی کـە پێمـان بڵێـت، ئـەو نەهەنگەی کە یونسی قوتدا، یونسی زۆر خۆشدەویست بۆیە قوتی نەدا کە بیکات بە ژەمە خۆراکی خۆی، بەڵکو لەبەر ئەوە قوتیدا کە پەرۆشـی بـوو، ترسـا لـەوەی کـە نەهـەنگ وماسـی گـەورەو تیمسـاح بیخۆن، بۆیە وەکو دۆست وهاوەڵێکی بەپەرۆش، هەرکە فڕێیان دایە خـوارەوە لـە کەشـتییەکە، بە فـەرمانی خـوای باڵادەسـت زۆر بەپەلـە خۆی گەیاندێ و خستیە سکی خۆیەوەو پاراستی، کەواتە: ( صاحِبُ الحـوُت ) جـوانترین مانـای هاوڕێیـەتی نێـوان حـەزرەتی یـونس ونەهەنگەکە دەگەیەنێت.

دووەم:. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذ ذَهَبَ مُغاضِباً﴾ لـە زمـانی عەرەبیدا ( غاضب) هەیەو (مغاضب) هەیە، ( الغاضبُ يَكونُ غَضبان مِن نَفسِهِ، وَلَم يَغضبهُ أَحَد) .

( غاضـب) تـوڕە، ئـەو کەسـەیە کـە لـە خۆیـەوە تـوڕە بـووە بـەبێ ئەوەی کەس شتێکی وای بەرامبەر کردبێت، کە شایەنی تـوڕە بـوون بێت، بەڵام (مغاضب) واتە: توڕەکراو، ئەو کەسەیە کە خەڵکی بونەتە هۆی توڕە کردنی، هەروەکو چۆن،( هاجر ) مان هەیە کە کەسێکە بـێ هـیچ هۆکاروفشارێك شـوێنی خـۆی بـەجێ دێڵێـت، وە ( مهـاجر )مـان هەیە کە خەڵکی ناچاری دەکەن کە شوێنی ژیانی خۆی جێ بهێڵێت.

جا حەزرەتی یونس خوای گەورە لە بارەیەوە دەفەرموێت: مُغاضبا ) لە کتێبە خورافیات و ئەفسانە گەورەکانی ئیسرائیلیاتدا، وادەگێڕنەوە کە حەزرەتی یونس لە خوا توڕە بووبێت، بەڵام پەنا بەخوا، کە پێغەمبەران شتی وایان لێ بوەشێتەوە، بەڵکو حەزرەتی یونس لە گەلەکەی توڕە بوو، ئەو هەموو بانگەوازو بانگ کردنە بۆ لای خواو ئەو هەموو دڵڕەقی و وەڵام نەدانەوەیەی قەومەکەی، بووە هۆی ئەوەی کە لێیان پەست وتوڕە ببێت، واتە: گەلەکەی توڕەیان کرد. پاشان حەزرەتی یونس وەعدی دابوونێ کە دوای سێ ڕۆژی تر عەزابی خوایان دێتە سەر، کەچی کە لە ئاوایی چووە دەرو سێ ڕۆژەکە تەواو بوو، چاوەڕێی ئەوە بوو کە وەعدی خوا بێتەجێ و غەزەبیان لێ بگرێت، بەڵام هیچ نەبوو، وە دونیا زۆر ئارام بوو، حەزرەتی یونس توڕە بوو، بەڵام نەك لە خوای گەورە ( نَعوذُ باللە ) وە نەك لەبەر ئەوەی کە حەز بکات قەومەکەی غەزەبیان لێ بگیرێت، چونکە پێغەمبەران دڵسۆزترین و بەڕەحم ترین کەس بوون بۆ هۆزو قەومی خۆیان، بەڵکو لەبەر ئەوە توڕە بوو، کە ئەو ئاگای لەوە نەبوو کە گەلەکەی ئیمانیان هێناوە، بۆیە خوای گەورە عەزابی لەسەر لابردوون، بەڵکو وای زانی ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ناویان، لە جاران زیاتر بەدرۆی دەخەنەوەو پێی دەڵێن : کوا وەعدی خواکەت کە دەتووت: دوای سێ ڕۆژی تر غەزەبتان لێ دەگرێت، هەر بۆیە بەو توڕەییە لە قەومەکەی ڕۆیشت بۆ سەر دەریا.

سێهەم:. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَظَنَّ أن لَن نَقدِرَ عَلَيـــهِ﴾ ئەم ئایەتە ئەگەر سەیری ڕووکەشی بکەین، ڕەنگە کەسانێك هەن وابزانن کە حەزرەتی یونس وای گومان برد کە ئێمە دەستمان پێی ناگات و ناتوانین بیگێڕینەوە، بەڵام نەخێر، پێغەمبەرانی خوا هەرگیزاو هەرگیز ئەوەیان بە خەیاڵدا نەهاتووە، بەڵکو لە هەموو مرۆڤایەتی زیاتر تواناو دەسەڵاتی خوای گەورەیان ناسیوە.

هاوەڵی زاناو شارەزا بە قورئانی پیرۆز ( عبدالله ی کوڕی عباس ) دەفەرموێت: ڕۆژێکیان (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) ناردی بە شوێنم داو پێی ووتم: ( لَقَد ضربَتني أمواجُ القُرآن) واتە: شەپۆل و گێژەکانی قورئان کە وەکو شەپۆل ومەوجی دەریا بەیەکا دەچن، خەریکە دەمگرێ و سەری لێ دەرناکەم، ! منیش ووتم: وەکو چی؟ بەهۆی چییەوە؟ معاویە ووتی: بەهۆی ئەو فەرمودەیەی خوای گەورەوە کە دەفەرموێت: ﴿فَظَنَّ أَن لَن نَقدِرَ عَلَيهِ﴾ ( أَيَظُنُّ عَبدٌ مِن عَبيدِاللهِ أَنَّ اللهَ لا يَقدِرُ عَلَيهِ، فَضلاً عَن نَبِيٍّ مِنَ الأنبياء ).

واتە: ئایا هیچ عەبدێك لە عەبدەکانی خوا، گومانی ئەوەی بۆ دروست ئەبێت، کە خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی نییە بەسەریدا؟ چ جای پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خوا؟!

ابن عباس دەفەرموێت: منیش پێم ووت: ( لَيسَ ذلِكَ مِنَ القُدرَةِ، إنَّما ذلِكَ مِنَ التَقدُر، بِمَعنى التَضييقِ. [فَقَدَرَ عَلَيهِ رِزقَهُ] أي ضيقَ

عَلَيهِ رِزقَهُ ).یان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ﴾ الطلاق ٧

واتە: لێرەدا مەبەست قودرەت ودەسەڵات نییە، بەڵکو مانای ئەوەیە کە حەزرەتی یونس وای زانی کە خوای گەورە لەسەر ئەو بەجێ هێشتنەی گەلەکەی بەبێ فەرمانی خوا ، سزای نادات و زەوی ومولْکی خوا فراوانەو حەزرەتی یونس بەدڵێ خۆی ووتی: دەچمە شوێنێکی ترو لەوێ بانگەواز دەکەم و بەڵکو توشی گەل وهۆزێکی تر ببم کە باشتر قبوڵی دینی خوای گەورە بکەن و کەمتر بەربەرەکانیم لەگەڵ بکەن. وە حەزرەتی یونس بە تێگەیشتنی خۆی وای زانی کە کاری ئەو لەگەڵ گەلەکەی تەواو بووەو پێویستە بڕوات بۆ شوێنێکی تری سەر زەوی کە بانگی خەڵکەکەی بکات بۆ لای خوای گەورە.

چوارەم:. خوای گەورە ناوی ئەو نەهەنگەی کە حەزرەتی یونسی قوتدا ناوی ناوە ( نون ) ( وَذَا النون ) کە جەمعی ( نون ) بریتیە لە ( نینان ) هەروەکو جەمعی( حوت ) بریتییە لە ( حیتان ) وە ( ذَ النون ) بە مانای ( صاحبُ الحوت ) هاوڕێی نەهەنگە.

جا ( نون ) کە یەکێکە لە پیتەکانی زمانی عەرەبی، بووەتە ناویش بۆ نەهەنگەکە، هەروەکو پیتی ( ق ) بووەتە ناو بۆ شاخی ( قاف ) ، وە پیتی ( ع ) کە دەوترێت ( عین ) بە مانای کانی وسەرچاوەی ئاو، وە پیتی ( س ) کە ڕووبارێك هەیە بە ناوی ڕووباری ( سین ). کەواتە زۆرجار ناوی پیتێك دەبێتە ناوی شتێکی تر.

پێنجەم:. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذ أَبـقَ إِلـى الفُلـكِ المَشحونِ﴾ کە فیعلی ( ابقَ ) تەنها لەم شوێنەی قورئاندا هاتووە، وە لە زمانەوانیدا ( ابقَ ) بە مانای ئەو عەبدو کۆیلەیە دێت کە لە دەستی گەورەکەی ڕایکردووەو هەڵاتووە، بەڵام خۆ حەزرەتی یونس پێغەمبەری خوایەو پاك وپارێزراوە لەوەی ڕابکات و هەڵبێ لە فەرمانی خوا، وە ڕابکات وهەڵبێت لە بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ لای خوا، ئەی کەواتە لێرەدا فیعلی ( ابقَ ) مانای چییە؟

زانایانی زمانەوانی دەڵێن: ( ابقَ ) دوو مانای تری هەیە، یەکەم: ( تَباعَدَ ) واتە: دوورکەوتنەوە..

دووەم:. ( أَبقَ أي خَرَجَ سِراً مِنَ النَّاسِ ) واتە: بە نهێنی ودوور لە چاوی خەڵك دوور کەوتەوە لە خەڵکەکە، کە لێرەدا ئەم دوو مانایە بۆ فیعلی ( ابقَ ) درووستن، کە بەمانای ئەوە دێت، حەزرەتی یونس لە قەومەکەی وئاوەدانییەکەی دوورکەوتوەتەوە زۆر بە نهێنی و بە شێوەیەك کە کەس هەستی پێ نەکردوو ئاگادار نەبوو لە ڕۆشتنەکەی.

شەشەم:. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَالتَقَمَهُ الحُوتُ﴾ حوتەکە قوتیدا، سەرنجی دەربڕینی سەرنج ڕاکێشی قورئان بدە، نافەرموێت: حوتەکە خواردی، چونکە قوتدان جیاوازە لە خواردن، حوتەکە دەمی کردەوەو یونسی قوتدا بەبێ ئەوەی لە دەمیا دانی تیژی پێدا بنێ و

بیجویَ و بیکاتە ژەمە خۆراکی خۆی، وە کاتێك چووە گەدەیەوە هەرسی نەکرد.

بەڵێ نەهەنگیش درووستکراوی خوایەو نیشانەو بەڵگەیەکە لەسەر دەسەڵات و گەورەیی خالیق کە ( الله ) یە . وە نەهەنگیش سەربازێکی گوێڕایەڵی خوای گەورەیەو ئامادەیە بۆ جێبەجێ کردنی هەر فەرمانێك کە خوا پێی بسپێرێت، خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە یونس ڕزگار بکات، زۆر بە خێرایی بەرەو کەشتییەکە ڕۆیشت و دەمی کردەوەو ئامادەباش وەستابوو، بۆ ئەوەی یونس فڕێ بدەنە ناو ئاوەکەوەو بکەوێتە ناو دەمیەوە.

بەڵێ هەرکە کەوتە ناو دەمی نە هەنگەکەوە خێرا قوتیداو ناردی بۆ ناو گەدە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە نەهەنگی ئاگادار کردبویەوە لەوەی کە نابێت حەزرەتی یونس بە ددانەکانی بهاڕێت، وە نابێت بریندار بکات، هەروەکو فەرمانی پێکردبوو کە نابێت لەناو گەدەی دا ئەو ترشەڵۆکانەی کە دەڕژێنە ناو گەدەوەو خۆراك هەرس دەکەن، بڕێژێت بەسەر حەزرەتی یونس دا، وە خوای گەورە فەرمانی بە نەهەنگ کرد کە کاری ئەو پاراستنی یونسەو وەکو خەمخۆرێکی دڵسۆز دەبێ بیپارێزێت، بەڵێ نەهەنگ فەرمانی خوای گەورەی جێبەجێ کرد.

حەوتەم:.خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ واتە: یونس شایەنی گلەیی وسەرزەنشت بوو، چونکە پێش ئەوەی خوای گەورە مۆڵەتی بدات، قەومەکەی بەجێ هێشت.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە جیاوازی هەیە لە نێوان ( اللـوم ) لەگەڵ ( العقاب )، اللـوم: واتە گلەیی وسەرزەنشت، بەڵام (العقـاب) واتـە سـزادان، جـا (العقـاب) ، سـزادان بـۆ کەسـێکە کـە تـاوانێکی ئەنجام دابێت، بەهۆی ئەوەی تـەرکی واجبێکـی کردبێت، بەڵام (اللوم) سەرزەنشت ولۆمە کردن لەسەر کارێکە کە لە عەرەبیدا پێـی دەوترێـت ( خِـلافُ الأَولی ) ی ئەنجامـدابێت، هەرچـەندە بـە بۆچوون ولێکدانـەوەی خۆی درووست وڕەوان بوو، وە خوای گەورە وای بۆ نوسیبوو، کە بەو ناڕەحەتی وئازارەدا تێپەڕێت، بۆ ئەوەی ئەو وانە گەورەیە بخوێنێ و بە کردەوە تێی بگات، وە هەروەها دەبێت ئەوە بڵێین کە ناڕەحەتی وئازار چەشتن تاقیکردنەوەی خوایی بوو بۆ حەزرەتی یونس، وە تاقیکردنەوە بە ناڕەحەتی و ناخۆشی مەرج نییە هەموو جارێك هەر بەهۆی گوناه و سەرپێچی خواوە توشی مرۆڤ ببێت، بەڵکو زۆرجار بۆ بەرزکردنەوەی پلەی کەس بەڵای بەسەر هاتووە، کە لای خوای گەورە زیاتر پلەی بەرز بێتەوە، وە زیاتر لە بۆتەی تاقیکردنەوەدا قاڵ ببێتەوە .

جا ئیپتیلاو تاقیکردنەوەی پێغەمبەران بە ناڕەحەتی وناخۆشی لـەم جۆرەیانـە، وە خـوای گـەورە ئـەم میحنـەت وئـازارەی بەسـەر حەزرەتی یونس هێنا بۆ ئەوە بوو ببێت بە وانەیەك و لە ڕێگەی ئەم پێغەمبەرە دڵسۆزەوە بە هەموو ئیمانداران بگات بەگشتی و بەرچاو ڕۆشنی و چرای ڕێگا بێت بۆ بانگ خوازان بە تایبەتی، چونکە

پێغەمبەران سەرمەشقن بۆ بانگخوازان، بەڵام نەك هەر بەگوفتار ، بەڵکو بە کرداریش کە لە ژیانی خۆیاندا بەسەریان دا هاتووە.

هەشتەم:. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَولا أَنَّهُ كانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ، لَلَبِثَ فِي بَطنِهِ إِلى يَومِ يُبعَثُونَ﴾ واتە: خۆ ئەگەر یونس لەو کەسانە نەبوایە کە تەسبیحات ویادی خوا دەکەن، ئەوە دەمایەوە لە سکی نەهەنگەکەدا تا ڕۆژێك کە هەموان زیندوو دەکرێنەوە.

لێرەدا ڕەنگە کەسانێك هەبن بپرسن: باشە چۆن حەزرەتی یونس لە سکی نەهەنگەکەدا تا ڕۆژی قیامەت دەمایەوە؟ لە کاتێکدا لەسکی نەهەنگەکەدا ئەگەر بەردەوام بمایەتەوە، ئەوا بێگومان دەمرد، وە نەهەنگەکەش ڕۆژێك هەر تەمەنی کۆتایی دەهات ودەمردوو ئەوکات نە حەزرەتی یونس ونە نەهەنگەکە نەدەگەیشتنە ڕۆژی قیامەت، ئیتر چۆن خوای گەورە دەفەرموێت تا ڕۆژی قیامەت لە سکی نەهەنگەکەدا دەمایەوە؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێین: لە زانستدا بیردۆزەیەك هەیە پێی دەوترێت: ( نَظَرِيَة الإحتواء ) بیردۆزەی لەیەکدا توانەوە، بۆ نموونە: پەرداخێك ئاو کاتێك نەختێك شەکری تیَ دەکرێت، پاش ماوەیەك شەکرەکە لە ئاوەکەدا دەتوێتەوە، بەم شێوەیە هەر گەردوو گەردیلەیەکی ئاوەکە بەشێکی لەو شەکرە تەواوە لە خۆیدا هەڵ گرتووە، وە لێرەدا دەووترێت: ئاوەکە شەکرەکەی لە خۆیدا تواندەوە، چونکە ئاوەکە شەکرەکەی تواندەوە، لەبەر ئەوەی تواناو هێز بۆ زۆرترینەکەیە کە ئاوەکەیە لەم نمونەیەدا، کەواتە: هەر

بەهەمان شێوەو لەسەر هەمان بیردۆزەی زانستی کاتێك حەزرەتی یونس لە ناو سکی نەهەنگەکەدا بمردایەو پاشان نەهەنگەکەش بمردایە، بێگومان پاش ماوەیەك هەردووکیان دەگۆڕان بۆ گەردی زۆر ووردوو کارلێکیان لەگەڵ یەکتری دەکرد و بەڵگە نەویستە کە لاشەی حەزرەتی یونس زۆر بچوکترە لە نەهەنگەکە، بەم شێوەیە نەهەنگەکە حەزرەتی یونسی لە خۆیدا دەتواندەوەو هەموو گەردیلەکانی حەزرەتی یونس دەچنە گەردیلەکانی نەهەنگەکەوەو هەتا ڕۆژی قیامەت پێکهاتەی لاشەی حەزرەتی یونس لەناو پێکهاتەی تواوەی بڵاوبوەوەی نەهەنگەکەدا تا قیامەت دەمایەوە.

کەواتە: تەعبیرو دەربڕینی قورئانەکە کە دەفەرموێت:﴿لَلَبِــثَ فِي بَطنِه إِلَى يَومِ يُبعَثونَ﴾ زۆر ڕاستەو لە جێگای خۆیدایەو دەربڕینێکی زانستییە.

ئیمانداران: ئێستاش با وانەو ئامۆژگارییەکانی بەسەرهاتی حەزرەتی یونس باس بکەین بە پشتیوانی خوای گەورەو کاربەجێ ومیهرەبان:

یەکەم:. گەیاندنی پەیام ودینی خوای گەورە واجبی سەرشانی هەموومانەو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( بلِّغُوا عَنِّي ولو آيَةً ) لە منەوە ئەم ئیسلامە بگەیەنن، ئەگەرچی یەك ئایەتی قورئانیش بزانن، واجبە ئەو ئایەتەی کە دەیزانیت بەیەکێکی تری بگەیەنیت.

شـیخ الأسـلام ( ابـنُ تَیمیـة ) دەفـەرموێت: وا گومـان مەبـە کـە ئەمانەت ئەوە بێت کە دەست نوێژ بگریت و دوورکات نوێژ بکەیت لە مزگەوتـدا، بـەڵکو ئەمانـەت ئەوەیـە کـە هـەڵگری ئـەم ئاینـە بیـت بـە گەیاندنی بە خەڵکی.

جـا لـەکاتی گەیانـدنی ئـەم ئیـسلامەدا، دەبێـت صـەبروئاراممان هـەبێت ئـەوەتا خـوای گـەورە بـە پێغەمبـەری ئـاخر زەمـان ﷺ دەفەرموێت: ﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾﴾ القلم ٤٨

واتـە: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ تـۆ خـۆ ڕاگربـە لـە بەرامبـەر فـەرمانی پەروەردگارتەوە، نەکەیت وەك هـاوەڵ وخـاوەنی نەهەنگەکە بیـت، کە حەزرەتی ( یونس ) پێغەمبەرە.

لێرەدا زانایان دەفەرموون: ( الأصلُ في خِطاباتِ اللهِ لِرَسُولِهِ ﷺ أَنّها تَشمِلُ أُمَّتَهُ - إلاّ ما أُستُثنِيَ - وَلا إِستِثناء هُنا). واتـە: بنـچینەو ئەصڵ لەو بانگەوازانەی کە خوای گەورە بە پێغەمبـەری خۆشەویـست ﷺ دەفـــەرموێت: ئـــەو ڕاگەیانـــدن وبانگـــەوازە بـــۆ هـــەموو ئوممەتەکەشیەتی، مەگەر جیاکەرەوەیەکی تایبەتی هەبێت، کە لێرەدا نییە.

کەواتە: خوای گەورە بە هەموو ئیمانداران بە گشتی و بـانگخوازان بـە تایبـەتی دەفـەرموێت: کـە لـە کـاتی گەیانـدنی پـەیامی خـواداو ڕووبەڕو بونەوە لەگەڵ کەسانی دڵڕەق و نەسـەلمێن، وەکـو قەومەکـەی

حـەزرەتی یـونس بـەئارام بـن و پەلـە مەکـەن مـەئیوس مـەبن و نـا ئومێـدی نـەتانگرێت کـە بڵـێن ئـیتر تـەواو ئـەو خەڵکـە خێـری تێـدا نەماوە.

بەڵێ دەبێت دڵسۆزان و خەمخۆران و ڕاگەیەنەرانی بەرنامـەی خـوا کـە ئیـسلامە، ئارامگر بـن و تـوڕەو پەسـت و نائومێـد نـەبن ودڵنیـابن ڕۆژێك ئەم ئیسلامە هەر سەردەکەوێت.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ٦٠﴾ روم ٦٠ .

واتــە: ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویـست، وە ئـەی ئیمانـداران، دان بەخۆتان دا بگرن و ئارام بگرن، چونکە بێگومـان وەعـد وبەڵێنی خـوا حەقەو ڕاستەو هەر دێتە دی، ئەوانەش کە باوەڕیان نییە، بێ ئارامـت نەکەن وساردت نەکەنەوە.

شیخی ( ابنُ کَثیر ) لە تەفسیرەکەی دا و لە تەفـسیری ئـەم ئایەتـەدا دەفەرموێت: ڕاگیراوو دامەزراو بە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە تـۆی پـێ ڕەوانـە کـردووە، کـە ئـەم قورئانەیـە، بـانگی خـەڵکی بکـە بـۆ لای قورئان، چونکە بەڕاستی هەر تەنهاو تەنها ئـەوە حەقێکـەو ڕاسـتییەکە کـە هـیچ گومـان ودوو دڵییـەکی تێدا نییە، هـەرگیز سـارد مەبـەرەوەو ڕوو لـە غـەیری ئـەو قورئانـە مەکـە، چـونکە لـە غـەیری ئـەو قورئانـە ڕێنمـایی وبەرچـاو ڕوونـی دەسـت ناکـەوێت، کـە شـایەنی ئـەوە بێـت

مرۆڤ شوێنی بکەوێت، وە بە دڵنیاییەوە حەق وڕاستی ڕەوایی تەنهاو تەنها وا لە قورئاندا کۆبووەتەوە

کەواتە: مادام تۆ لەسەر ڕێبازی حەق و ڕاستیت، ئیتر بۆچی دەبێ ساردبونەوەو ترس ودڵەڕاوکێ ڕووت تێبکات.

دووەم:. پێویستە بانگخوازان بزانن کە خەڵکی لە وەڵامدانەوەی بانگەوازی ئیسلامدا هەموویان وەکو یەك نین، خەڵك وکەسی وا هەیە، هەر زۆر زوو وەڵام ئەداتەوەو قبوڵی هیدایەتی خوا دەکات، وەکو ئەوەی چاوەڕێی ئەوە بێت، کەسێك بۆ لای ڕێبازی خوا بانگی بکات و ئەمیش وەڵامی بداتەوە، لە وێنەی ئەم جۆرە کەسانە ( ساحیرەکانی فیرعەون ) بوون، هاتبوون حەزرەتی موسا بە درۆ بخەنەوە، بەڵام کە موعجیزەکەیان بینی، یەکسەر زانییان کە ئەمە حەقەو سیحر نییەو لەبەردەم فیرعەون ئیمانیان بە ئاشکراو ڕاشکاوانە و ئازایانە دەربڕی و هەرچی فیرعەون هەڕەشەی لێ کردن بەدەست و قاچ بڕین و هەڵواسین، بەڵام هیچ لە ئیمانی کەم نەکردنەوەو وەڵامیان تەنها ئەوە بوو: ﴿قَالُواْ لَا ضَيۡرَۖ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ الشعراء ٥٠

واتە: جادوگەرانی ئەوساو ئیماندارانی ئێستا، بێ ترس ووتیان: هیچ زەرەرو زیانی بۆمان نابێت ( لە هەڕەشە ناترسین ) چونکە ئێمە دڵنیاین کە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.

تەماشاکە لە کورتترین ماوەدا، هەر بە بینینی موعجیزەکە، بەبێ ئەوەی حەزرەتی موسا هیچ قسەیەکیان بۆ بکات، ئیمانیان هێنا، ئیمانێکی ئەوپەڕی پۆڵاین و لە چلەپۆپەدا !.

وە هەر لەو کەسانەی کە زۆر بە زوویی وەڵامی پەیامی خوایان داوەتەوە، بەبێ مشت ومڕو دڵەڕاوکێ، ئەویش حەزرەتی ( ابو بکری صدیق ) بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە دەفەرموێت:( مَا دَعوَتُ أَحَداً إِلى الإسلامِ إلاَّ كانَت فِيهِ عِندَهُ كَبوَةٌ أي تـأخر ونَظَـرٌ وتَرَدُدٌ. إلاَّ ما كانَ مِن أَبي بَكرِ بن أَبي قحافَةَ، ما عَكَمَ عنـه حـينَ ذَكَرتُهُ لَهُ، وَمَـا تَـأخر ) واتە: بانگی هیچ کەسێکم نەکردووە بۆ ئیسلام، کە لە کاتی وەڵام دانەوەمدا وەستان وبیرکردنەوەو هەڵسەنگاندن و دوو دڵییەکی پێوە نەبوبێت، تەنها یەك کەس کە ئەمانەی نەبوو، بەڵکو هەرکە پێم ووت من پێغەمبەری خوام و قورئانم بۆ هاتووە، بەبێ هیچ وەستان ودوو دڵی وگومانێك، یەکسەر ئیمانی هێنا، ئەویش ابو بکری کوڕی ئەبی قوحافەیە، ابو بکری ڕاستگۆ.

وە لە بەرامبەر ئەمانەشدا، خەڵکانێك هەن کە کاتێك پەیامی خوایان پێدەگات، درەنگ وەڵام دەدەنەوە، وە ساڵانێکی زۆر لە گومان و دوو دڵی و دژایەتیدا لە گەڵ دینی حەق دەژین، بەڵام سەرەنجام دەگەنە قەناعەت ودڵنیایی تەواو ئەمجا بە ئەوپەڕی خۆشحاڵی و دڵسۆزییەوە دەبنە سەربازێکی گوێڕایەڵی ئەم ئیسلامە، لە نموونەی ئەم جۆرە کەسانەش ( قەومەکەی حەزرەتی یونس ) بوون، کە دوای چەند ساڵ لە بانگەوازی حەزرەتی یونس بۆیان، هەر ئیمانیان نەهێنا

تا گەیشتنە ئەوەی نزیکی ئەوە بوو کە خوای گەورە عەزابیان بدات و سزای خۆی بنێرێت بۆیان، ئەمجا ئیمانیان هێنا، وە بوونە ئیمانداریکی زۆر باش و دڵسۆزانە پاشماوەی تەمەنیان لە خزمەت حەزرەتی یونس دا بردە سەر.

وە لە ناو هاوەڵانی پێغەمبەری خواش دا ﷺ ( أبو سوفیان و خالیدی کوڕی وەلید و عیکرەمەی کوڕی أبو جەهل ) کە ماوەی بیست ساڵ دوژمنایەتی ئیسلامیان کردوو بەشمشێر بەرەو ڕووی ئیسلام و پێغەمبەری خوا وەستانەوەو جەنگیان لە دژی کرد، بەڵام لە دوایدا هەر موسوڵمان بوون و خزمەتی زۆر گەورەیان بە پێغەمبەری خواو پەیامی ئیسلام کرد.

کەواتە موسوڵمانانی بەڕێز: مادام بانگەواز لەسەر هەموومان پێویستە، هەر لە مەلاوە تا جوتیارو لە مامۆستاوە تا خوێندکارو لە باوکەوە تا ژنی ماڵەوەو دایک، دەبێت صەبرمان هەبێ و ماندوو بێزار نەبین، هەیە کوڕەکەی نوێژ ناکات، کچەکەی حیجاب ناکات، برادەرەکەی دیندار نییە، نابێت بە یەك دوو جار پێ وتن کە بەقسەی نەکرد بێتاقەت ونائومێد ببێت، بەڵکو دەبێت زۆر هیوادار بێت کە ( ان شاء الله ) ڕۆژێك خوای گەورە هیدایەتی ئەدات و دوعای هیدایەتی بۆ بکات .

تەماشای ژیان نامەی پێغەمبەری خوا بکەن ﷺ ئەو هەموو ئازارەیان دا، چەند بە ناشیرینی وەڵامی ئەو بانگەوازە شیرینەیان دایەوە، کەچی هیچکات ماندوو نەبوو، هیچکات دوعای شەڕی

لێنەکردن، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەردەوام دەیفەرموو:( اللّهُـمَّ اهـدِ قَومي فَإنَّهُم لا يَعلَمونَ ).

سـەرەنجامی ئـەم دوعـا بـە سـۆزو خێرانـە، سـەرەنجامی ئـەو ئـارامگری ودامـەزراوی و بـەردەوام بوونـە، ئـەوە بـوو، کـە ئـەوەی تروسکاییەکی خێـر لـە دڵ ودەرونیدا مابێت، ئیمانی هێنـاو بوو بە گوێڕایـەڵترین کەسـی پێغەمبـەری خـواو ئـەمرو فەرمانـەکانی ئیسلام، ئەو ئیسلامەی چەندین ساڵی دورو درێژ دژایەتی دەکرا.

بـۆ نموونـە: ( هینـدی ژنـی ابـو سـوفیان) کـە ئەوەنـدە دژی پێغەمبەری خـوا بـوو ﷺ هـانی خەڵکە مەککەی ئەدا ، کە بە هـەموو توانایانەوە بەشداری جەنگی ئوحود بکەن و تۆڵەی بەدر بکەنەوە، وە ئـەوە بـوو خـودی خـۆی بەشداری کـردو هاتـە میـدانی جـەنگ و ڕقـی پـەنگ خـواردووی نـاو نـاخی بەسـەر لاشـەی حـەمزەی شـەهیدداا، هەڵڕشـت و دەسـتی خـستە جگـەری دەرهێنـراوو سـنگی شـەق کراویـەوەو کاتێك خـوێنی ئەو پاڵەوانەی ئیسلام بەناو پەنجەکانیـدا ئەهاتە خوارەوە، ئەمجا هەستی ئەکرد کەمێك ئاسوودە دەبوو، بەڵام سـەرەنجام دوای چـەند سـاڵ لـە فەتحی مەککەدا ( هینـد ) موسـوڵمان بـوو، وە موسـوڵمانێکی زۆر گوێڕایـەڵی لێدەرچـوو، بـە ڕادەیـەك لـە ووردترین کاروباری ژیانی خێزانیاندا هەتا پرسی بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکردایـە، هـیچ کـارێکی نـەدەکرد، تەنانـەت بـە بـێ پرسـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەسـتی بـۆ پـارەی نـاو گیرفـانی ابـو سـوفیانی هاوسەری نەدەبرد. !

ئیمانداران: لێرەدا کۆتایی بە ووتارەکەمان دێنین و لە ووتاری داهاتوودا ( ان شاء الله ) وانەکانی تر باس دەکەین.

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَـيدينا مُحَمَّـد وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ أجمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست: لە ووتاری ڕابردوودا باسی ئەو وانەو ئامۆژگاریانـەمان کـرد کـە لـە بەسـەرهاتی حـەزرەتی یـونس دا وەردەگیرێن، باسـی وانـەی یەکـەم ودووەم مـان کـرد، ئێستاش باسـی وانەکانی تر دەکەین پشتیوان بە خوای گەورەو کاربەجێ.**

**وانەی سێهەم:. خۆ دزینـەوە لـە بانگـەوازو خـۆ دورخستنەوە لـە خـەڵکی لـە بـەڵاو ناخۆشـی ڕزگـارت ناکـات، بـەڵکو بـەهۆی ئـەو خـۆ لادانەوە توش دەبیت، ئەوەتا حەزرەتی یونس بە لێکدانـەوەی خـۆی لـە بـەڵاو موصـیبەت دوور کەوتـەوە، بـەڵام چـونکە خـوای گـەورە فەرمانی پێی نەکردبوو کە بڕوات، پەلەی کردو ڕۆیشت، توشی بەڵاو موصیبەتی بەندی ناو سکی ماسی بوو، وە بە دڵنیاییـەوە مـرۆڤ هـەتا لـە خـوا نزیکتربێـت و شـارەزاتر بێـت لـە دیـن و پێـشەواو پێـشەنگی خـەڵك بێـت، ئـەوا گرتنـی خـوا بـۆی تونـد تـر دەبێـت، پێغەمبـەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویـەتی:**( إذا قَصَّرَ العَبدُ في العَمَلِ إبتَلاهُ اللهُ بِالهَمِّ ) **واتە: هەرکاتێك بەندە کەمتەرخەمی کـرد لـە کـاری خزمـەت کردن بە ئیسلام و کـار کـردن بـۆ دینـی ئیسلام، خـوای گـەورە توشـی غەم وپەژارەی دەکات.**

**شیخ عبدالقادری گەیلانی: لە( الفتح الربانی ) لە مەجلیسی( ٢٢ ) دا ئاوا مانای ووشەی ( الهم ) ی لەم فەرموودەیەدا لێك داوەتەوە:**

( کاتێك بەندەیەك کەمتەرخەمی دەکات لە کاری چاکەدا، خواوەند توشی خەمی ڕزقێکی دەکات کە بۆی نەنوسراوەو توشی خەمی ماڵ ومناڵ و ئازاری خێزان ونوقسانی و ناتەواوی لە قازانجەکانی گوزەرانی دونیاداو بێ گوێی مناڵ و شەڕو ئاژاوەی دەکات، ئینجا ڕوو بە هەرلایەك بڕوات پێی هەڵدەخلیسکێت.)

بانگخوازی خواناس وزانای ناودار ( بدیع الزمان ) مامۆستا سەعید نەورەسی ، لەم بارەیەوە باسی ئەزموونی خۆیی و هاوەڵانی دەکات ودەڵێت: هەرکاتێك دڵسۆزەکانی ڕێگای خزمەت کردنی قورئان سستی و کەمتەرخەمی ڕوویکاتە کارەکەیان، ئەوا زللەی میهرەبانی دەخۆن و بەم جۆرە بێدار دەکرێنەوە.

مامۆستا نەوڕەسی زیاتر لە ( ١٠٠ ) ڕووداو لە بارەی ( زللەی میهرەبانی ) یەوە دەگێڕێتەوە:

بۆ نموونە: دەفەرموێت: لە کاتێکدا خەریکی ووتنەوەی وانەی حەقیقەتەکانی قورئان بووم بە قوتابییەکانم، لە شاری ( وان ) ڕووداوەکانی شێخ سەعیدی پیران بەرپرسانی دەوڵەتی خستبوویە دڵە تەپێ و مەترسییەوە، هەرچەندەش ئەو کاربەدەستانەی لە هەموو کەسێك بە گومان بوون، بەڵام هیچ خراپەیەکیان بەرامبەرم نەکردوو هیچ بەڵگەیەکیشیان بە دەستەوە نەبوو، تاوەکو بیانوم پێ بگرن، بەڵام کاتێك لەبەر خۆمەوە ووتم: ( من چیم داوە لە خەڵکی ) وە بیرم تەنها لە خۆم کردەوەو لە مەیدانەکە کشامە دواوە، ڕۆیشتمە ناو ئەشکەوتەکانی چیای (ئەڕەك) هاتن لەم ئەشکەوتانە دەریان هێنام

وگرتیانم و نەفییان کردم، ئەمەش زللەی میهرەبانی خوای گەورە بوو کە لێم دراو بە ئاگای هێنامەوە کە لە بانگەواز نەکشێمەوە.

بەڕێزان: هی وا هەیە دەڵێت: وازیشم لە بانگەواز هێناو زللەی میهرەبانیشم لێ نەدرا؟.

لە وەڵامی ئەو کەسانەدا دەڵێین: دیارە خوای گەورە دەستی لێ بەرداویت و لەو خێرە گەورەیە بێ بەشی کردووی، چونکە دونیا پێچ کردنەوەیەکە.

مەولەوی دەفەرموێت: { کاتێکمان زانی دەوری وەردەوە..... ئێمەش چوون یاران پێچمان کەردەوە }

وانەی چوارەم:( عَمَلُ الدُّعاةِ مَحكومٌ بِالشَّرعِ ) حەزرەتی یونس هەرچەندە لەبەر خاتری خوا ڕقی لە قەومە خوانەناسەکەی هەڵسا، بەڵام چونکە بەبێ ئیزنی خوا ڕۆیشت، توشی ئەو بەسەرهاتە هات کە چووە ناو چەند تاریکییەکەوە، چووە زیندانێکەوە کە نەکەس پێش ئەو وە نە کەس پاش ئەو تێی چووە و دەچێت !

کەواتە: نابێت بانگخواز ڕق وقین یان خۆشەویستی بۆ بەرامبەرەکەی بەپێ ی ئارەزووی خۆی بێت، هەر چەندە بە دڵی خۆی زۆر بە دڵسۆزی ئەو کارەی لەبەر خاتری خوا بێت، بەڵکو دەبێت بە تەرازووی شەرع هەڵیسەنگێنێ و بەپێی شەرع هەنگاو هەڵگرێت.

کەواتە نابێت بەبێ گەڕانەوە بۆ بنەما شەرعییەکان ڕقی خۆی یان خۆشەویستی خۆی بۆ کەسێك یان لایەنێك دەربڕێت .

وانـەی پێنجـەم:. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ ١٤٢﴾ الـصافات ١٤٢. ئەمـە یەکێکـە لـەو بەڵگـە گەورانـەی کە بە هـەموو خـاوەن دڵ و هۆشـێکی زینـدووی دەسـەلمێنێت کـە ئـەم قورئانـە کـەلامی خوایـەو هـیچ قسەیەکی پێغەمبـەری خـوای ﷺ تێـدا نییـە. ئـەگینا خۆ لـە مەککـەو مەدینـەدا ئـاوی خواردنـەوە بەزەحمـەت دەست کەوتووە لەو کاتەدا، ئیتر لـە کویّ پێغەمبـەری خـوا ﷺ باسـی دەریاو ناو زەریای زانیوە. کە نەهەنگی تێدایەو ئەوەندە گەورەیە. !

حەز دەکەم ئەم زانیاریانە لە بارەی نەهەنگەوە بزانن:ـ

* نەهەنگ هەیە کێشەکەی ( ١٥٠ ) تەنە!

* هەر کاتێك دەمی کردەوە نزیکـەی ( ٤ ) تـەن ماسـی دەچـنە نـاو دەمیەوەو کە دەمی داخستەوە دەیانکات بە یەك ژەمە خۆراکی خۆی.

* نەهەنگ شیر دەرەو هەموو کاتی شیر دانێکی نزیکـەی ( ٣٠٠ ) کیلۆ شیر دەدات، کەواتە بەچکەی نەهەنگ بە سێ ژەم شیر خـواردن، نزیکەی یەك تەن شیر دەخوات.

* درێژی نەهەنگ نزیکەی ( ٣٠ ) مەترە !

* نەهـەنگ و فیل هـەردووکیان شیر دەرن، بەڵام بەچکەی فیـل لـە نێوان ( ٢٢ بۆ ٢٥ ) مانگ لە سکی دایکیدا دەمێنێتـەوە، وە بەچکـەی نەهەنگ نزیکەی ( ١٦ ) مانگ لە سکی دایکیدا دەبێت و کە لـە دایـك بوو درێژییەکەی نزیکەی نیو ئەوەندەی درێژی دایکی دەبێت.

بەچکە نەهەنگ: بەچکە نەهەنگێکی ساوا نزیکەی ( ٣ ) تەن قورسە، هەتا تەمەنی دەگاتە ( ٧ ) مانگ ، ڕۆژی یەك کیلۆ زیاد دەکات، تا وای لێدێت کێشەکەی دەگاتە نزیکەی ( ١٥٠ ) تەن.

* نەهەنگ یەك بەچکەی دەبێت و بە شیر بەخێوی دەکات، نەهەنگ گەورەترین گیانلەبەری سەر ڕووی زەوییە.

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە: باشە چۆن مرۆڤ بە گەرووی نەهەنگەوە دەچێت؟ ! بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ئەو بەسەرهاتەی مامۆستا ( شەماڵ عبدالرحمن موفتی ) باس دەکەین کە لە کتێبی ( کۆباسەکانی میحراب ) دا باسی دەکات، مامۆستا شەماڵ دەفەرموێت: ئێمە لە قۆناغی ناوەندی بووین، دەرسی بایۆلۆجیمان هەبوو، مامۆستاکەمان باسی نەهەنگی بۆ کردین و ووتی: تیرەی گەرووی نەهەنگ ( ٣٠ سم ) ەو مرۆڤ قوت نادات، باوەڕ مەکەن بە چیرۆکی حەزرەتی یونس، منیش لەو کاتەدا تەمەنم ( ١٧ ) ساڵ بوو، دەستم هەڵبڕی و ووتم: چۆن باوەڕ ناکەین بە قورئان؟! مامۆستاکە ووتی: ئەمە عیلمە، ئەمجا لەسەر تەختەکە وێنەیەکی گەورەی کردو ووتی: ئەمە نەهەنگەو پاشان نوکتەیەکی داناو ووتی: ئەمە مرۆڤە و خۆی زۆر گەورەیە، بەڵام گەرووی نەهەنگ کە ( ٣٠ سم ) مرۆڤ قوت نادات، ئیتر عیلم وا دەڵێت تۆ کەیفی خۆتە، بڕوا دەکەیت یان نا، هاتمەوەو زۆر ناڕەحەت بووم، ئیمامی مزگەوتەکەمان یەکسەر زانی زۆر دڵتەنگم وناڕەحەتم، هۆیەکەی لێ پرسیم، منیش ووتم شتێکی وا هەیە، ووتی: وەرە لە گەڵم، منی بردە

ماڵی خۆیان و دوا ژمارەی گۆڤاری ( الصين الجَديدة) ی دامیٚ کە لە وڵاتی ( صين ) دەرچوو بوو.

لەو گۆڤارەدا باسی نەهەنگێکی تێدا بوو، کە گرتبوویان و بە (٨) سڵنگ بەرزکراوەتەوە، دەمەکەیان کردووەتەوەو کۆڵەکەیان بۆ داناوە، نەك تەنها مرۆڤ بەڵکو ( لاندرۆڤەرێك ) چووەتە ژورەوە، وەکو وێنەکەی لەو گۆڤارەدا هەبوو، سەقفی لاندرۆڤەرەکە هێشتا مابووی بەر قورگی نەهەنگەکە بکەوێت، مامۆستاکە فەرمووی: ئەمە ببەو نیشانی مامۆستاکەتی بدە، منیش هەر حەزم دەکرد خێرا بەیانی بێت، بۆ بەیانی گۆڤارەکەم برد بۆ مامۆستاکەمان، بەڵام ئەویش پێش من خوێندبویەوەو ووتی: بەڵیٚ ڕاستە تاکو ئەو ڕۆژە عیلم باوەڕی نەدەکرد کە نەهەنگ مرۆڤ قوت بدات، ئیتر لە پۆلدا لەبەر چاوی قوتابیەکاندا ووتی: بەڵیٚ باوەڕ بکەن بە چیرۆکی حەزرەتی یونس کە چووەتە ناو سکی نەهەنگەوە.

وانەی شەشەم:. حەزرەتی یونس لەناو سکی نەهەنگەکەدا لە خوای گەورە پاڕایەوەو فەرمووی: ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَـٰتِ أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ٨٧﴾.

ئیمانداران: سەرنجی ووشەکانی ناو ئەو پاڕانەوەیە بدەن،

١. بە ( لآ إِلهَ إِلاَّ الله ) دەستی پێ کرد، تەوحیدی تازە کردەوە. واتە: خوایا تەنهاو تەنها تۆ دەتوانی ڕزگارم بکەی و کەسی تر نییە لەم تاریکاییانە، لەم زیندانە بێ وێنە ڕزگارم بکات، واتە: چۆن ( الله ) پەرستراوی تاکەو هاوبەشی نییە، فریادڕەس و ڕزگارکەریش هەر ئەوەو غەیری ئەو هیچ شتێك توانای بە دەنگەوە هاتنی مرۆڤی نییە.

واتە: لە تەنگانەدا تەنها دەبێت پەنا بۆ خوا ببەی، هەروەك لە کاتی خۆشیدا دەبێت تەنها شوکرو سوپاسی ئەو بکەی.

٢. فەرمووی: ﴿سُبْحَـٰنَكَ﴾ پاکی و مونەزەهی بۆ خوا بڕیاردا، واتە: خوایە تۆ زوڵمت لە من نەکردووە کە منت خستووەتە ئەم تاریکاییەوە، بەڵکو هەموو کارێکی تۆ جوانەو دوورە لە عەیب وکەم وکوڕی، واتە: موسوڵمانی ڕاستەقینە لە تەنگانەدا ناڵێ خوایە بۆچی وات لێکردم؟ !

٣. فەرمووی: ﴿إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی من لە ستەمکارانم، چونکە بەبێ پرسی تۆو فەرمانی تۆ ڕۆیشتم، هەرچەندە خوای گەورە من لەبەر خاتری تۆ ڕقم هەڵساو ڕۆیشتم، بەڵام من ستەمم کرد چونکە زوڵم وستەم پێناسەکەی ئەوەیە( وَضَعَ الشَّئِ في غَيرِ مَوضعِهِ ) دانانی شتێکە لە غەیری شوێنی خۆیدا.

جا ئەگەر ئەمە حاڵی پێغەمبەرێکی خوا بێت، ئەی ئەوەی کە بە ئاشکرا دەڵێت: خوا چی ئەمر کردووە نایکەم و چی قەدەغە کردووە ئەوە دەکەم، ئایا ئەو کەسە دەبێت چ زاڵمێك بێت!؟.

بەڕێزان: ئەم پاڕانەوەیە زۆر گەورەیەو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (دَعْوَةُ ذِي النُّونِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ ، فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا مُسْلِمٌ رَبَّهُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ اسْتَجَابَ لَهُ ) رَواهُ الترمذي وَ النسائي وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامع(٣٣٨٣).

واتە: پاڕانەوەی حەزرەتی یونس لەوکاتەدا کە لەسکی نەهەنگەکەدا بوو، ئەمە بوو: ﴿لا إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ ئەم پاڕانەوەیە هەر موسوڵمانێك پێی لە خوای گەورە بپاڕێتەوە، بۆ هەر شتێك ، ئەوا بە دڵنیاییەوە خوای گەورە وەڵامی ئەداتەوە.

بەڵێ قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: کە حەزرەتی یونس بەم پاڕانەوەیە هاواری بۆ خوای گەورە برد، خوای گەورە ڕزگاری کرد. ﴿فَستَجبنا لَهُ وَنَجَّيناهُ مِنَ الغَمِّ﴾ بەڵام ئەم وەڵام دانەوەو ڕزگار کردنە، تەنها بۆ حەزرەتی یونس نەبوو، بەڵکو ﴿وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ هەر ئیماندارێك ئاوا بەکوڵ وبەدڵ بەم پاڕانەوەیە لە خوای گەورە بپاڕێتەوە، خوای گەورە وەکو حەزرەتی یونس ڕزگاری دەکات.

وە پێغەمبەری دڵسۆز و خەم خۆرمان دەفەرموێت: ئەم پاڕانەوەیەی حەزرەتی یونس ﴿لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ ( أيُما مُسلِمٍ دعَا بِها في مَرضِه أربعينَ

مرةً فماتَ في مَرضِهِ ذلك أُعطيَ أجرَ شَهيدٍ وإن برأ برأ و قد غُفِرَ
لَهُ جَميعَ ذُنوبِهِ )أخرجهُ الحاكم (٥٠٦/١) وَ صَحَّحَهُ وَ وافقَهُ الذهبي .

واتە: هەرکەسێك لە کاتی نەخۆشیدا لەسەر جێگا کەوتووە، یان ئازار زۆری بۆ هێناوە، چل جار ئەم دوعایەی حەزرەتی یونس بخوێنێت و بە دڵ وبەگیان لە ماناکەی حاڵی ببێت و بەکوڵ وچاوی پڕ فرمێسکەوە پێی لە خوای گەورە بپاڕێتەوە، ئەوە ئەگەر لەو نەخۆشییە چاك نەبێتەوەو بمرێت، بە شەهیدی دەمرێ و پاداشتی شەهید وەر دەگرێت، وە ئەگەر لە نەخۆشییەکەشی چاك بویەوە، ئەوە خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

کەواتە موسوڵمانان: با هەموومان ئەم پاڕانەوەیە لەبەر بکەین وفێری ماڵ و مناڵ وموسوڵمانانیشی بکەین.

بەڵێ ئیمانداران: پاڕانەوەو لاڵانەوە لە خوای گەورە دەبێتە هۆی ڕزگار بونت، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ ۝١٤٢ فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ﴾ الصافات ١٤٢. ١٤٣

وە چاك وایە ئیماندار کارێکی نهێنی هەبێت کە لەبەر خاتری خوا دوور لە هەموو ڕیاو بەرچاوییەکی خەڵکی کردبێتی، لەکاتی دەست ڕۆیشتوویی و لەش ساغیدا، بۆ ئەوەی لەکاتی لێقەوماندا پێی لە خوای گەورە بپاڕێتەوە.

لە تەفسیری ( ابنُ كَثير ) دا هاتووە کە ( ابو هورەیرە ) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: کاتێك

حەزرەتی یونس لەناو سکی نەهەنگەکەدا بوو، تەسبیحاتی خوای گەورەی دەکرد، فریشتەکان وتیان: ئەی خوای پەروەردگارمان ئێمە دەنگێکی زۆر کزو لاواز لە شوێنێکی نامۆو غەریبەوە دەبیستین، ئەوە دەنگی کێیەو لە کوێیە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەوە دەنگی بەندەی من ( یونس ) ە کە بەبێ فەرمانی من گەلەکەی بەجێ هێشت، ئەوە لەناو سکی نەهەنگدا بەندم کردووە لەناو تاریکایی دەریادا، فریشتەکان بەیەك دەنگ وتیان: (العَبدُ الصالِحُ الذَّي كـانَ يَـصعَدُ اليكَ مِنهُ في كلِ يومٍ ولَيلَةٍ عَملٌ صالِحٌ ؟!) ئەی خوای پەروەردگار یونس ئەو بەندە چاك وچاكەكارەی كە هەموو ڕۆژو شەوێك كردەوەكانی بەرز دەبونەوە بۆلای تۆ، كردەوەیەكی پاك وچاكی ئەنجام دابوو، خوای گەورە فەرمووی: بەڵێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( فَشَفَّعُوا لَهُ عِندَ ذلِـكَ فَـأَمَرَ الحُوتَ فَقَذَفَهُ إلى السَّاحلِ ) رَواهُ البزار.

واتە: ئەمجا فریشتەكان هەموو داوایان لە خوای گەورە كردو تكایان كرد كە خوای گەورە حەزرەتی یونس ڕزگار بكات و خوای گەورەش فەرمانی دا بە نەهەنگەكە بردی لە لێواری دەریاكە فڕێی دایە دەرەوە.

تەماشاكەن: حەزرەتی یونس بەهۆی كردەوە چاكەكانیەوە كە لە هەموو شەوو ڕۆژێكدا بۆ لای خوای گەورە بەرز دەبونەوە، بوو بە خۆشەویستی فریشتەكان و بوون بە دۆست وهاوەڵی و كاتێك

زانییان کەوتووەتە تەنگانەوە دوعای خێریان بۆ دەکردو داوایان لە خوای گەورە دەکرد کە ڕزگاری بکات.

کەواتە: با لەکاتی لەش ساغی وخۆشیدا، لە کاتی بون و دەوڵەمەندیدا کارێکی وا بکەین کە لە نێوان خۆمان و پەروەردگارماندا بێ ، بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانەدا بڵێین: خوایا گیان ئەگەر لەبەر خاتری تۆ ئەو کردەوە جوانەم ئەنجام داوە، ئەگەر لەبەر خاتری تۆ ئەو حەرامەم نەخواردووە، خوایا ئەمڕۆ لەم تەنگانەیەدا بە هاناو هاوارمەوە وەرە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:( مَــن استَطاعَ مِنكُم أَن يكونَ لَهُ خَبيئَةٌ مِن عَمَلٍ صَالِحٍ فَليَفعَل ).

وە لە فەرمودەیەکی تردا خۆشەویستمان ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێت:( تَعَرَّف إِلى اللهِ في الرَّخاء، يَعرِفكَ في الشدَّة ).

وە فەرموویەتی ﷺ ( مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَستَجِيبَ الله لَهُ عِنْدَ الشَّدَائِدِ وَالْكُرَبِ فَلْيُكْثِرِ الدُّعَاءَ في الرَّخَاءِ )رَواهُ التِرمذي و الحاكِم وَ حَسَّنَهُ الألباني.

واتە: هەرکەسێك حەز دەکات خوای گەورە لە کاتی تەنگانەدا فریای بکەوێت، با لە کاتی خۆشیدا زۆر دوعا بکات و لە خوای گەورە بپاڕێتەوە.

ئیمانداران: بەڕاستی پێغەمبەران نورو بەرەکەت بوون بۆ ئێمە، خوای گەورە ئەو لوتفەی کە لەگەڵ ئێمەی کردووە، بوینەتە ئوممەتی پێغەمبەری ئاخیر زەمان، ( محمد المصطفى ) ( خاتَمَ الأنبياءِ

وَالمُرسَـــلِين ) ﷺ کـــە هەرچـــی بەرەکـــەت و ڕەحمـــەتی هـــەموو پێغەمبەرانە بۆ ئێمە هاتووەو لێی بەهرەمەند بوین، ئەوەتا لێرەدا ئەو پاڕانەوەیـەی حـەزرەتی یـونس بـوو بـە مـوژدە بـۆ ئێمـەش کـە خـوای گەورە فەرمووی: ﴿وَ كَذالِكَ نُنجِي المُؤمِنِين﴾ .

بەڵام بە مەرجێك ئێمەش وەکو حەزرەتی یونس لە کاتی خۆشی وئازادیدا یادی خوامان کردبێ و بە گوێی خوامان کردبێت، ئەوەتا خوای گەورە باسی حەزرەتی یونس دەکات بەوەی کە ﴿ كَـــانَ مِـــنَ المُسَبِّحِينَ ﴾ لە پێشدا لەو کەسانە بوو کە یادی خوایان دەکرد.

واتە: پێش ئەوەی بکەوێتە ناو سکی نەهەنگەکەوە یادی خوای زۆر دەکـردو بـەردەوام تەسـبیحاتی خـوای گـەورەی دەکـرد، خـوای گەورەش لەو کاتی تەنگانەو ناڕەحەتییەدا وەڵامی دوعاکانی دایەوە، دوعاکەی حەزرەتی (یـونس) یـش ئەوپـەڕی ئـەدەب وحـەیاو شـەرمی تێدایـە بەرامبـەر بـەخوای گـەورە، سـەرنجی بـدەن نافـەرموێت خوایـا ڕزگـارم بکـە، خوایـا چـۆن لێـرەدا دەتـوانم بـژیم؟ نـەخێر، بـەڵکو پـاکو بێگەردی و کاربەجێی دایە پاڵ خوای گەورەو کەمتەرخەمی وستەمی دایە پاڵ خۆی، ئیتر کارەکەی دایە دەست خوا، خوای گەورە چۆن پێی باشە با ئاوای لەگەڵ بکات، هیچ گومانی تێدا نییە خوای گەورە هـەر کارێك بەسـەر بەنـدەی خۆیـدا بێنێـت، لـە خۆشـی ولـە ناخۆشـی، هەمووی پڕ حیکمەت و پڕاوپڕ لە بەرژەوەندی ئەو بەندەیەدایە.

ئیمانـداران: گـوێ بـۆ ئـەم بەسـەرهاتە بگـرن کـە لـە کوردسـتانی خۆماندا ڕووی داوە:

پیاوێك باسی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە ساڵی ( ١٩٨٨ ) ی زاینی پێشمەرگە بووم، لەگەڵ پۆلێك لە هاوەڵەکانم لە سنووری پێنجوێن و نزیك سنووری ئێران، کەوتینە بۆسەیەکی سوپای عێراقی و هەوڵماندا هەرچۆنێك بێت خۆمان لەدەست بەعسییەکان ڕزگار بکەین و خۆمان بەدەستەوە نەدەین، ئێمە بەرەو لوتکەی شاخەکان دەڕۆیشتین و لەو کاتەشدا بەفرێکی ئێجگار زۆر باری بوو، کەش وهەواش لە ڕادە بەدەر سارد بوو، لەو کاتەدا یەکێك لە هاوەڵەکانم هەڵخلیسکاو کەوتە خوارەوەی دۆڵێك، لە خوار دۆڵەکەوە خاڵێکی چاودێری سەربازانی بەعس هەبوو، هەندێك لە برادەرانم ووتیان: جێی بهێڵین باشترەو ئەو بە تەنها بمرێت باشترە نەوەك هەرهەمووومان، بەڵام من گوێم بە قسەی برادەرەکانم نەداو چەندەی کردم ویژدانم ڕێگای پێ نەدام ئەو برادەرەم بەجێ بهێڵم کە کەوتە دۆڵەکەوە، پێشم ووتن: ئەگەر بشڕۆن من بە هیچ شێوەیەك بەجێی ناهێڵم و دەیخەمە سەر شانەکانی خۆمەوەو ڕزگاری دەکەم، بەهەر حاڵ چوومە خوار دۆڵەکەو برادەرەکەم هەڵگرت و خستمە سەر شانم و بەتەنها ڕۆیشتم ، لەبەر ئەوەی پێشمەرگەکانی تر بەجێیان هێشتین و خۆیان ڕزگار کرد.

تینی سەرماو سۆڵەو زامداری برادەرەکەم ماوەی نەداین خۆمان ڕزگار بکەین و بە ناچاری خۆمان گەیاندە خاڵی چاودێری سەربازانی حیزبی بەعس و خۆماندا بەدەستەوە، کە چوومە خاڵی چاودێرییەکە ووتم: پێشمەرگەین وهاتووین خۆمان بدەین بەدەستەوە.

دەست بەجێ ڕەوانەی ئەمنی سلێمانی کراین و دواتر بەرەو بەغدا، لەوێش دوای ئەشکەنجەو ئازارێکی ئێجگار زۆرو تێهەڵدان وئیهانە کردن، ئێمەیان بەرەو دادگا بردو بڕیاری لە سێدارەدانمان بەسەردا سەپێنرا!.

من تا ئەو کاتە سوجدەیەکم بۆ خوای گەورە نەبردبوو، هەموو شەوێك بەبەر چاوی منەوە کۆمەڵێك، بەرەو پەتی سێدارە دەبران و لە سێدارە دەدران، من هەموو کاتێك لە چاوەڕوانی ئەوەدا بووم کە بڕیارەکە بچێتە بواری جێبەجێ کردنەوەو لە سێدارە بدرێم، بەردەوام لە ناخی خۆم دەپرسی: کەی ڕەوایە تاکو ئێستا خوای خۆم نەناسیوە؟ ئایا ژیان هەر ئەوەندەیەو تەواو؟ لێرەوە خوای گەورە ڕۆشنایی باوەڕی خستە دڵمەوەو تەوبەیەکی ئیخلاصم لە حزووری خوای گەورەدا کردوو، کەوتمە نوێژ کردن و پاڕانەوە لە خوای گەورە، دەپاڕامەوەو دەمگووت: ئەی خوای گەورە من تاکو ئێستا تۆم نەناسیوەو داوات لێدەکەم مۆڵەتم بدەت و ئەمجارە ژیانم پێ ببەخشیتەوە، خوایا گیان، نەك لە ترسی مردن ولە سێدارەدان، بەڵکو بۆ ئەوەی بتوانم قەرە بووی تەمەنی فەوتاوم بکەمەوە، کە لە دووری تۆ بەسەرم بردووە، زۆر لە خوای گەورە پاڕامەوەو دەستم کرد بەنوێژو زیکرو کڕنوش بردن، زۆر گریام ولاڵامەوە و پەشیمان بونەوەی خۆم لە بەرامبەر خوای گەورە ڕاگەیاند، بەدەم دوعاو پاڕانەوەو گریانەوە ئاگام لە خۆم نەماو بۆ چەند ساتێك خەوم لێکەوت، لە خەوما دوو کەس منیان بۆ دادگا دەبرد، ئەو دوو پیاوە

توند دەستەکانیان گرتبووم، لەو کاتەدا پیاوێك بەرەو ڕووم هات و ووتی: مەترسە، بەڵێ بەرەو ژووری دادوەر بردیانم و لەمبەرو لەوبەر ماسی گەورەم بینی کە لەسەر کلکیان وەستا بوون و لەو کاتەدا پیاوێکی زۆر جوان و نورانی لەناو ماسییەکان هاتە دەرەوەو بەرەو ڕووم هات و ووتی: مەترسەو تەنها ئەمە بڵێ: ﴿لا إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەسەر سوڕمانەوە لێم پرسی: تۆ کێیت؟ ووتی: من یونس پێغەمبەرم .!!

لەو کاتەدا لە خۆشیا بەخەبەر هاتم و باوەڕ بکەن لە ژیانمدا ئەم ئایەتەم نەبیستبوو، زۆر بە جوانی و ڕەوانی لەبەرم کرد، لە دوای ئەو خەونەوە بە ماوەیەك پاسەوانی بەندیخانە هات و منیان بەرەو دادگا بردوو منیش بەدەم ڕێگاوە هەر ئەم دوعایەم دەوتەوە، کە حەزرەتی یونس لە خەونەکەمدا پێی ووتبووم، منیان گەیاندە ژووری دادگا، بەڵام ئەمجارە دادوەرەکەی پێشوتر نەبوو، کە بڕیاری لە سێدارەدانی بەسەردا سەپاندم، دڵم زۆر خۆش بوو، زۆر گەش بین بووم، دادوەر بڕیاری دادگایی بۆ خوێندمەوەو پێی ووتم: تۆ لەم جۆرە تۆمەتانە بەریت و بڕیار درا ئازاد بکرێیت.! لە خۆشیاندا باوەڕم نەدەکرد، لەبەر خۆمەوە دەمووت: دوای بڕیاری لە سێدارەدان چۆن ئازاد دەکرێم؟! ئەگەر هەرنا ڕەنگە بەشم بەند کردن بێت بۆ هەتا هەتایە یاخود دە پانزە ساڵێك، بە هەرحاڵ ئازاد کرام و ڕەوانەی یەکە سەربازییەکەی جارانم کرامەوە کە جێم هێشتبوو، بەر لەوەی ببم بە

پێشمەرگە، ئەفسەری یەکەی سەربازییەکە پێی ووتم: چۆن ئازاد کرایت؟ ئەوەندەی من تێگەیشتبم ڕەنگە بەهەڵە ئازاد کرابیت و وای بە باش ئەزانم خۆت دەربازبکەیت چونکە جارێکی تر دەستگیرت دەکەنەوە، لێرەشەوە جارێکی تر خوای گەورە بە هانامەوە هاتەوەو ئەفسەرەکە منی دەرباز کردو تاوەکو سلێمانی نەوەستام.

بەڵێ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فلو لا انَّهُ كانَ مِنَ المُسَبِّحين﴾ کەواتە: باوەڕدارانیش بێبەش نین لە یارمەتی خوای گەورە ، بەو مەرجەی باوەڕت بە گەورەیی ڕەحمی خوای گەورە هەبێت و بزانیت کە لە هەموو ناخۆشییەك خوای گەورە هاودەمتەو بە هاناتەوە دێت و فریات دەکەوێت.

وانەی حەوتەم:. حەزرەتی یونس کە هاتە دەرەوە لە سکی نەهەنگەکەدا ، خوای گەورە کولەکەی بۆ ڕواند :

﴿فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ، وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ﴾.

حەزرەتی یونس بە مانەوەی لەناو گەرمی سکی نەهەنگداو لەو ماوەیەدا کە هیچی نەخواردبوو، وەکو منداڵی ساوای لێهاتبوو، لاوازو پێستی ناسك ببویەوە، خوای گەورە فەرمانی دا کولەکەی بۆ بڕوێت، چونکە کولەکە بە کاڵی و بە کوڵاوی دەخورێ و گەڵای پانەو مێش ومەگەز پێوەی نانیشێ و بە هۆی بۆنی گەڵاکانیەوە مێش ومێشوولە بە پێستە ناسکەوە بووەکەی حەزرەتی یونسەوە نەدەنیشتنەوە.

بەڵێ خوای گەورە لە ناو هەموو ڕووەکەکاندا کولەکەی بۆ ڕواند، چونکە کولەکە گەلێك سوودی تری هەیە، جگە لەوانەی کە باسمان کردن . وەکو:.

١. کولەکە ( ٩٤,٧٪ ) ی ئاوە .... ٢. کێش دائەبەزێنێت....٣. فشاری خوێن دائەبەزێنێت.. ٤. سەرئێشە لادەبات ... ٥. زوو هەرس دەبێت.

گۆڤاری ( الأبحاث البيوكيميائية ) لە ساڵی ( ١٩٨٥ ) دا بڵاوی کردەوە کە لێکۆڵینەوەیەك لە پەیمانگای نیشتمانی ویلایەتە یەککگرتووەکان کە تایبەتە بە نەخۆشی ( ژێرپەنجە ) ئەنجام دراوەو لە کۆتایدا ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیە ڕاگەیەندرا کە: کولەکە پێکهاتەیەکی زۆر بەهێزی تێدایە کە مرۆڤ دەپارێزێت لە توش بوون بە (ژێرپەنجە) بە تایبەت کە لێکۆڵینەوە کراوە لەسەر دانیشتوانی ( نیوجرسی ) لە ئەمەریکا، کە بەهۆی زۆر خواردن و بەکارهێنانی کولەکەوە ( ژێرپەنجەی سییەکان ) لەناو دانیشتوانی ئەو هەرێمەدا زۆر زۆر کەمترە بە بەراورد لەگەڵ ئەو شوێنانەی کە کولەکە ناخۆن.

وە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ زۆر حەزی لە خواردنی کولەکە بووە، لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پیاوێکی بەرگ دروو بانگی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ بۆ ماڵی خۆی بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو خواردنە بخوات کە بۆی ئامادە کردووە، ئەنەس دەفەرموێت: منیش لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ چووم بۆ ماڵی بەرگ دروەکە، کە

خواردنەکـەیان هێنـا، شـۆربایەك بـوو نانیـان تیـا گوشـیبوو، نـاو شۆرباکە کولەکەی تێدا بوو، ئەنەس دەفەرموێت:( فَرَأيتُ النَّبي ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّباءَ مِن حَوالي القَصعَةِ ) بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بە شوێن کولەکەکاندا دەگەڕا لە لێواری قاپەکەداو دەیدۆزینەوەو دەیخواردن، ئەنەس دەفەرموێت:( فَلَم أزل أُحِبُّ الدُّباءَ مِن يَومَئذٍ ).لەو ڕۆژەوە کە بینـیم ئـاوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ حـەزی لـە کولەکەیـە ئـیتر منـیش بەردەوام حەزم لێیەتی و دەیخۆم.

وانەی هەشتەم:. هەر گەل ومیللەتێك حاڵی خۆی بگۆڕێت لە بێ دینییـەوە بـۆ دینـداری و لـە خراپەکارییـەوە بۆ چاکەکاری و لـە بێ ڕێزی بۆ پەیامی خوا بۆ حورمەت و ڕێزگرتن لە پەیام و بەرنامـەی خـوا، ئـەوە خـوای گـەورەش ڕەحمیـان پـێ دەکـات و غـەزەبی خـۆی لادەبـات لـە سـەریان و ژیـانێکی خۆشـیان پـێ دەبەخشێت، هـەروەکو قەومی حەزرەتی یونس کاتێك کە تەوبەیان کرد، خـوای پـەروەردگار عەزابی لەسەر لابردن و حەزرەتی یونسی ناردەوە بۆ ناویـان و زۆر بە خۆشی ژیانیان بردە سەر. ﴿فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ﴾ .

پێغەمبـەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت:( لا تَزالُ هذهِ الأُمَّةُ تَحتَ يَدِاللهِ وَفي كنفهِ ما لَم يُمالئ قُرّائُها أُمَراءُها، وَمـا لَـم يـزك صُلَحاءُوها فُجّارَها، وَما لَم يَهِن خيارُها أشرارَها، فَأذا هُـم فَعَلـوا ذالِك، رَفَعَ اللهُ يَدَهُ عَنهُم، ثُمَّ سَلَّطَ عَلَيهِم جَبابِرَتَهُم فَـساموُهُم سُـوْءَ العَذابِ، ثُمَّ ضَرَبَهُم اللهُ بِالفاقَةِ وَ الفَقـرِ ) حديث مُرسَل، قال الحافِظ

العراقي في (المغني عَن حَملِ الأسفار) أخرجه أبو عمرو الداني في كتاب (الفتن) مِن روايَةِ الحَسَن مُرسلاً.

واتە: بەردەوام ئەم ئوممەتە لە ژێر چاودێری و هاوكاری خوای بەبەزەیدایە، تا ئەو كاتەی كە قورئان خوێن و زاناكانیان هاوكاری دەسەڵاتدارە خراپەكان نەكەن، وە چاكەكارەكانیان پاكانە بۆ خراپەكارەكانیان نەكەن، وە هەتا چاكە خوازان سوكایەتی بە خراپەكاران نەكەن، { بەڵكو دەبێت بەزەییان پێیاندا بێتەوەو هەوڵی ڕێنمایی كردنیان بدەن } خۆ ئەگەر وایان كرد، ئەوا خوای بێ هاوتا ڕەحمەتی خۆی دەگرێتەوە لێیان، پاشان ستەمكارەكانیان بەسەردا زاڵ دەكات، ئەوانیش ناڕەحەتترین سزایان پێ دەچێژن، پاشان خوای بێ هاوتا گیرۆدەیان دەكات بە برسییەتی ونەبوونی.

خوای گەورەو میهرەبان لێت دەپاڕێینەوە، ڕەحممان پێ بكەی، بەهەشتی بەرینمان بە نسیب بكەی، لەوێدا لە خزمەت سەرداری پێغەمبەران، نوری چاومان، تكاكاری مەحشەرمان، حەزرەتی ( محمد المصطفى )دا ﷺ ژیانی هەمیشەیی و بەختەوەری بەسەر بەرین و بە خزمەت تەواوی پێغەمبەران بگەین و بچینە خزمەت حەزرەتی یونس و ئەم باس وبەسەر هاتەی لە دەمی موبارەكی خۆیەوە ببیستین و یادی ئەم كاتەی دنیامان بكەینەوە كە لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا باسی حەزرەتی یونسمان دەكردو دەرس وئامۆژگاریمان لێ وەردەگرت. الهم امیـــــن.

# سەرچاوەکان:.

١. قورئانی پیرۆز.
٢. تەفسیری ئاسان — بورهان محمد ئەمین
٣. صَحیح قِصَص القُرآن — حامد أحمد الطاهر البیسوني
٤. تەفسیری ڕەوان — مەلا محمودی گەلاڵەیی
٥. کۆباسەکانی میحراب — شماڵ عبدالرحمن موفتی
٦. گۆڤاری ڕووناکی ژ. ٤١ ساڵی پێنجەم
٧. المُستَفاد مِن قصص القُرآ — د. عبدالكريم زيدان
٨. فەرهەنگی بانگخوازان — ئەندازیار عوسمان
٩. مَوسوعة أسماء الله الحُسنى — د. محمد راتب النابلسي
١٠. هەمە چەشنەی زانیاریەکان — عەلاء نوری بابا علی
١١. وَقفات في حَياة الأنبياء — الشَيخ خالد عبدالحَكيم
١٢. قِصَص الأنبياء — محمود المصري ... ابو عمار
١٣. ژیانی پێغەمبەران — حاجی کاروان
١٤. مَوسوعة الأعجاز العلمي — يوسف الحاج أحمد
١٥. قصص الأنبياء وَالمُرسَلين — الشَيخ محمد متولى الشَعراوي
١٦. مَواقفُ الأنبياء في القُرآن — د. صلاح عبدالفتاح الخالدي

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وَصَحبهِ أجمَعينَ:

**ئیمانداران: ئیسلام ئەو ئاینەیە، ئەو پەیڕەو پرۆگرام و ڕێبازی ژیانەیە کە خوای گەورە شایەتی بۆ دەدات، کە گەورەترین شایەتییە.** ﴿قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَـٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ۚ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّآ أَشْهَدُ ۚ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾﴾ **الانعام ١٩.**

**بەڵێ ئیسلام تاکە ڕێگەی سەرفرازییە، نەك هەر لە ژیانی کورتی دنیادا، بەڵکو بەختەوەرییە بۆ دونیاو قیامەتی نەبڕاوە، بۆیە نزیکەی ( ٢٧ ) جار لە قورئاندا ووشەی ( افلَحَ ، تُفلِحونَ ، المُفْلِحونَ ) ئەدات بە گوێی مرۆڤەکانداو بە ئاگایان دێنێتەوەو ڕایان ئەچڵەکێنێت کە ئەوەی بەردەوام مرۆڤ لە هزرو بیریدایەو هەموو هەوڵ و هیممەتێکی بۆ ئەوەیە کە بە دەستی بێنێ، کە ئەویش سەرفرازی و ڕزگارییە، وا لەم پەیامی ئیسلامەدایە، دەی وەرن لێی کۆببنەوەو لەسەر سفرەی ڕەحمەتی بەهرەمەند بن.**

**بەڵێ ئیسلام دەوڵەمەندترین بەرنامەیە بەدرێژایی مێژوو، چونکە خاوەنی ئەو قورئانەیە، کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی (لا تَنقَضي عَجائِبُهُ ) عەجایبات و زانیارییە هەمە چەشنە نەبیستراوە**

سەرسوڕهێنەرەکانی قورئان هەرگیز تەواو نابن، (وَلا يَشْبَعُ مِنهُ العُلَماء) زانایان لێی تێر نابن.

زانایەکی ڕۆژئاوایی لە کۆنگرەیەکی ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەتدا بە ئامادەبووانی ووت: ئەگەر ئەو هەموو ڕاستییەی لە ئاینەکەی ئێوەدایە، لای ئێمە ببووایە، ئەوا دنیامان هەڵدەستاندە سەر پێ و نەماندەهێشت دانیشن، بەڵام بە داخەوە زۆرجار ئێمە هەر تەنها یەك لایەنی قورئان تەماشا دەکەین، کە بەشی پەرستش وعیبادەتەکانە، کە ئەگەر بە ووردی سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەین، دەبینین لە هەموو قورئاندا ئەو ئایەتانەی باسی نوێژو ڕۆژو زەکات و حەج دەکەن، لە چەند ئایەتێکی زۆر کەم لە چاو لایەنەکانی تردا، تێناپەڕێت.

ئیمانداران: لە ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، کێشمە کێشمێکی گەورە درووست بوو لە نێوان کەنیسەو زانایاندا، سەرانی کەنیسە دەیانویست کەس بیر نەکاتەوەو قسەی لەسەر قسەی ئەوانەوە نەبێت، زانایان لێکۆڵینەوەیان دەکردو بیروبۆچونی خۆیان بە خەڵکی دەگەیاندو سەرانی کەنیسەش دەیانویست ڕێزیان لێ بگرن، هەندێك زانا باسی خڕیەتی زەوییان کرد، سەرانی کەنیسە دژیان وەستانەوەو حوکمی کافر بونیان بۆ دەردەکردن، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە زانایەك لەسەر بیروبۆچوون دەربڕینی، لە لایەن کەنیسەوە حوکمی سوتاندنی بۆ دەربکرێ و بسووتێنرێت.!

ئەمــە درێــژەی کێـشا تـا ئـەو کاتـەی کەنیـسەو زانـست لەیــەك جیاکرانەوەو بیروبۆچوونی کەنیسە خرایەوە ناو چوارچێوەی خۆی، ئەمە بوو جیاکردنەوەی دین لە ژین، کە پێی دەوترێت ( عەلمانیـەت )

هەندێ کەس ویستیان ئەم ئەزموونە تاڵەش بگوێزنەوە لای ئێمەو ئیسلام لە چوار دیواری مزگەوتدا بەند بکەن. دیارە ئەمەش هەرگیزاو هـەرگیز ناچێتە سـەر، چونکە هـەرگیز ڕۆژێـك لـە ڕۆژان ئیـسلام دژی زانــست وزانیــاری نــەبووە، بگــرە هەمیــشە هــانی بیرکردنــەوەو سەرنجدانی داوەو فێر بوونێك کە لەبەر خوا بێت و پاشان ئامانج لێی سوود گەیاندن بێت بە مرۆڤایەتی، ئیسلام ئەو عیلمەی بە عیبادەت داوەتە قەڵەم. قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٣ وَفِي خَلۡقِكُمۡ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ۝٤﴾ الجاثية ٣ـ ٤

واتە: بێگومان لە ئاسمانەکان وزەوی دا، چەندەها بەڵگە هەیە بۆ باوەڕداران، وە لە دروست کردنی خۆتاندا، وە ئەو گیانلەبەرانەی بڵاو دەبنەوە، چەندین بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك کە باوەڕی پتەویان هەیە.

بەڵێ بەڕێزان: یـەکێك لـەو بوارانـەی کـە قورئـانی پیرۆز زۆر هـانی ئیمانداارانی داوە، کـە لێـی وورد ببنـەوەو لێکۆڵینـەوەی لەسـەر بکـەن، بواری ئاژەڵ وگیانداارانە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الانعام ٣٨

واتە: هیچ گەڕۆکێکی گیانلەبەر نییە لە سەر زەوی دا، کە لە کرمێکەوە کە بە چاو نابینرێت، هەتا فیلێك، وە هیچ باڵندەیەك نییە کە دەفڕێت بە هەردوو باڵەکەی، مەگەر ئوممەتانێکن وەکو ئێوە، هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە لەم کتێبەدا ( لَوحُ المَحفوظ ) یان قورئاندا، پاشان ئەوانە لە ڕۆژی دوایدا لای پەروەردگاریان کۆ دەکرێنەوە.

وە لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار بە ئاگامان دێنێتەوە، کە سەرنجی گیانلەبەران بدەین و دەفەرموێت:

﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ ۖ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ ۚ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ ﴾ النور ٤٥

واتە: خوای گەورە هەموو زیندەوەرێکی لە ئاو دروست کردووە، ئینجا هەندێك لەوانە لەسەر سك دەڕۆن، وە هەندێکی تریان لەسەر دوو قاچ دەڕۆن، وە هەشیانە لەسەر چوار پێ دەڕۆن، خوا هەرچی

بوێت دروستی دەکات، بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

بەڵێ ئیمانداران: لە قورئانی پیرۆزدا سەدان ئایەتی لەم جۆرە هەیە، کە هەمووی هانمان ئەدەن کە بە ووردی سەرنج بدەین و لە تاقیگەدا لێکۆڵینەوە لەسەر گیانداران بکەین.

لەبەر ئەوەی مرۆۋ لە ڕێی لێکۆڵینەوەی زانستیەوە ئەمجا زیاتر گەورەیی خوای پەروەردگاری بۆ دەر دەکەوێت.﴿شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ ال عمران ١٨.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَـٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُاْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر ٢٨ .

واتە: وە لە ئادەمی و زیندەوەرو ئاژەڵ و ماڵاتیشدا ڕەنگی جۆراو جۆر هەیە، بە وێنەی جیاوازی میوەهات، بەڕاستی لەناو بەندەکانی خوادا تەنها زانایان ( وەك پێویست ) لە خوا دەترسن.

بەڕێزان: تەماشاکەن لەم ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێت، مەبەست لەو زانایانەی کە بەڕاستی وەکو پێویست لە خوا دەترسن، چونکە بە دەسەڵات و گەورەیی بێ سنووری هەندێك ئاشنان، مەبەست لەو

زانایانەیە کە پسپۆڕن لە بواری زانستی زیندەوەرزانی و توێکاری لەشی مرۆڤ و زانایانی بواری ئاژەڵ ناسی و ڕووەك ناسی دەگرێتەوە، کە لە ڕێگای لێکۆڵینەوەوە ئەمجا چاکتر تواناو دەسەڵاتی خوای گەورەیان بۆ دەردەکەوێت.

کەواتە: هەروەکو چۆن واجبە کە لەناو موسوڵماناندا کە سانێك خۆیان تەرخان بکەن و فێری زانستە شەرعییەکان ببن و لەناو نەتەوەو گەلی خۆیاندا ڕێبازی خواناسی و دینداری نیشانی خەڵکی بدەن، بەهەمان شێوەش واجبە کە زانکۆو خوێندنی باڵا لە وڵاتی موسوڵماناندا هەبێ و کەسانی زاناو پسپۆڕو شارەزا تێیدا پێ بگەن لە بوارەکانی زیندەوەرزانی و ئاژەڵناسی و ڕووەك ناسی و جیۆلۆجی و بایۆلۆجی و ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە باس لەم بابەتە زانستیانە دەکرێت، شی بکرێنەوەو گەورەیی ودەسەڵاتی خوای بێ شەریك و هاوتا چاکتر بناسرێ و بە خەڵکی ڕابگەیەنرێت.

کەواتە: لە ئیسلامەکەی ئێمەداو لەناو ئایەتەکانی قورئانەکەماندا وەکو مزگەوت کە پیرۆزترین شوێنی سەر زەوییە، دەبێت لە هەموو شوێنێکدا هەبێ و خزمەت بکرێت، هەربەهەمان شێوەش دەبێت ڕێز لە زانکۆو پەیمانگاو ناوەندە زانستییەکان بگیرێ و لە هەموو گوندو شارو شاروچکەیەکدا خوێندنگا هەبێ و بە کردەوە زانستی تێدا بخوێنرێت، نەك بە داخەوە وەکو ئەمڕۆ بکرێت بە شوێنی ئاهەنگی یەکترناسین و گەشتی بەناو زانستی و جێگای نمایشی جل وبەرگی

تەسك وناشەرعی و هاوڕێیەتی بێ مەبەستی هاوسەرگیری لە نێوان کوڕان وکچاندا.

بەڕێزان: قورئانی پیرۆز بۆ ئەوەی سەرنجمان ڕابکێشێت، ناوی گەلێك لە سوڕەتەکانی بە ناوی گیاندارانەوەیە، وە جێگەی تێڕامانە کە لە زنجیرەی سوڕەتەکانی قورئاندا ئەوانەی کە سوودی ئاشکراو دیاریان بۆ مرۆڤ هەیە، لە بەشی پێشەوەن و بە شوێن یەکتردا هاتوون، وەکو ( البَقَرة :مانگا، الأنعام :مەڕوبزن وحوشتر، النَحل: هەنگ ).

ئەمانە بە ئاشکرا سوودەکەیان بۆ مرۆڤ دیارە، بۆیە بەسەر یەکەوە هاتوون، وە جێگای سەرنجە کە (البَقَرة:مانگا) لە پێش هەموویانەوەیە، وەکو ئەوەی پێمان بڵێ: کە لە هەموو ئاژەڵەکان بە سودترە بۆ مرۆڤ، چونکە حوشتر چەند بە سوودە، لە هەموو شوێنێکی سەر زەوی ناتوانێت بژی، بەڵام مانگا لە تەواوی ناوچەکانی سەر زەوی بە ناوچەی شاخاوی تا بیابان دەتوانێت بژی و سوودی لێ دەبینرێت، وە مەڕوبزن، لە ماوەیەکی کەمی ساڵدا شیر دەدەن، وە بە چەندین مەڕو بزن بە ئەندازەی مانگایەکي شیردەر شیر پێشکەش ناکەن، کەواتە لە پێشەوە بە تەنها ناوي (البَقَرة: مانگا) ی هێنا .

دوای ئەوە سەرنجی زنجیرەی سوڕەتەکانی قورئانی پیرۆز بدەوە، دەبینی کە باسی ئەو گیانلەبەرانە دەکات کە بە ئاشکرا سوودیان بۆ مرۆڤ دیار نییە، وەك ( النمل: مێرولە )، ( العنکبوت: جاڵجاڵۆکە )

وەکو دوو نمونەی جیهانی مێرووەکان، وە لە کۆتایشدا باسی ( الفیل ) وەکو سەرمەشقی گەورەترین ئاژەڵ لە قەبارەدا لەسەر ووشکانی.
وە لە ناوخۆی سورەتەکانی قورئانیشدا ناوی چەندین ئاژەڵ هاتووە کە لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا بەرچاوت دەکەون.

وە خاڵێکی سەرنجڕاکێشی تر ئەوەیە کە هەر ئاژەڵ وگیاندارێك لە قورئاندا ناوی هاتبێت، بە بەردەوامی لە ژیاندا هەیەو دەشمێنێتەوە، بە دڵنیاییەوە هەتا کۆتایی هاتنی ئەم دونیایە، بەڵام ئەوانەی کە سەردەمانێك هەبوون و نەماون قورئان باسی نەکردون وەکو ( داینەصۆڕەکان ) وە گەلێك زیندەوەرو ئاژەڵی تر کە قورئانی پیرۆز باسی نەکردوون ئێستا هەن، زانایان دەڵێن مەترسی لەناو چونیان هەیەو ڕۆژگارێك دێت کە بە یەکجاری بنەبڕ دەبن. ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە پیرۆزە کەلامی خوایەو هیچ پەیوەندی بە مرۆڤەوە نیەو پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها ڕاگەیەنەریەتی.!

پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندین فەرموودەدا هەرجارەی بە شێوەیەك باسی ئاژەڵ وزیندەوەرانی کردووە، لە فەرمودەیەکدا کە ئیمام أحمد و ئەبو داود لە ابن عباسەوە بە سەنەدێکی صەحیح دەگێڕنەوەو ئەلبانیش دەفەرموێت صەحیحە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە ئەم چوارە بکوژرێن:

( نَهى عَن قَتلِ أربَعٍ مِنَ الدَّوابِ: النَّملِ، النَّحلِ، الهُدهُد، الصُّرد ).

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا یەك سورەتی ناوناوە سورەتی ( النمل ) مێرووله، مێرووله گەلێك رەوشت و ئاكاری سەرسوڕهێنەری هەیە، یەكێك لەوانە زۆر ڕقی لە درۆ كردنە، زانای گەورە ( ابنُ القَیّم) لە ( شفاءُ العَلیل ) دا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: كەسانی باوەڕپێكراو بۆیان گێڕامەوە كە بە چاوی خۆیان بینیویانە، مێرولەیەك لە شارە مێرووەكەی دێتە دەرەوەو بە دوای خۆراكدا دەگەڕێت، لە كاتی گەڕان وهاتوچۆی دا توشی لاقە كوللەیەك دەبێت، دەیەوێت هەڵی بگرێت و بیباتەوە بۆ شارەكەی، بەڵام چەند دەكات بۆی هەڵناگیرێت، بۆیە بەپەلە ڕۆیشتەوە بۆ شارەكەی خۆی و چەند مێرولەیەكی تری لەگەڵ خۆی هێنا بۆ ئەوەی بەیەكەوە هەڵی بگرن، ئەو كەسەی كە چاودێری ئەم مێرولەیە دەكات دەڵێت: قاچە كوللەكەم لابرد لە شوێنی خۆی، كاتێك هاتنە سەر جێگاكە زۆر گەڕان نەیاندۆزییەوەو ڕۆیشتن، پاشان قاچە كوللەكەم لە شوێنی خۆی دانایەوە، دوای ماوەیەك مێرولەكە هاتەوەو دۆزییەوەو ئەمجارەش زۆر هەوڵیدا بۆی هەڵنەگیرا، ڕۆیشتەوە بۆ شارە مێرولەكەو مێرووەكانی هاوڕێ ی لەگەڵ خۆی هێنایەوە، وەكو ئەوەی پێیان بڵێ دڵنیابن كە جاری یەكەمیش ڕاستم كرد، بەڵام نازانم بۆ نەماندۆزییەوە، بەڵام هەركە نزیك بونەوە ئەمجارەش لام بردەوە، زۆر گەڕان وبە نائومێدی ڕۆیشتنەوە، جارێكی تریش هەمان شت دووبارە بویەوە، لە جاری سێهەمدا كە هاتنەوەو هیچیان نەدۆزییەوە، بینیم

مێرولەکان بە شێوەی بازنەیەك بە دەوری مێرولە هەواڵ گەیەنەرەکەدا بازنەیان بەست و بە هەموویان پەلاماریان داو پارچە پارچەیان کرد.

( ابـنُ القَـيِّم) دەفـەرموێت: ئەمـەم بـۆ مامۆسـتاکەم گێڕایـەوە، فەرمووی: ئەمە ڕاستەو خوای گەورە مێرولەی وا دروست کردووە کە زۆر ڕقی لە درۆیەو سزای درۆزن دەدەن.

بـەڵێ بـەڕێزان: خۆزگـە ئێمـەش دەرس وەرتـەمان لـە مێرولـەوە وەربگرتایەو هەرکەسێك چەند جارێك درۆی لەگەڵ کردین، ئیتر پێی نەخەڵـەتێین و بـڕوای پـێ نەکەینـەوە، جـارێکی تـر پـێش خۆمـانی نەخەین و بەڵکو سزای بدەین بەوەی کە سیقەو متمانەی پـێ نەکەین و کاروباری خۆمانی نەدەینە دەست.

وە ڕەوشـتێکی تـری مێروولـە ئەوەیـە کـە زۆر دڵـسۆزە بـۆ هاونیشتمانی خۆی، ئەوەتا خوای گەورە باسی ئەو ڕەوشتە بەرزو پەسـەندەی مێروولـەی سـەرکردە دەگێڕێتـەوەو ئـەوەشمان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە کـە سـەرکردەی شـارە مێروولـە مێیـە، بۆیـە دەفـەرموێت: کاتێـك حـەزرەتی سـولەیمان بـە سـوپا زۆرەکەیـەوە نزیـك شـارە مێرولەیـەك بونـەوە، لەوکاتـەدا ﴿قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾النمل ١٨. ١٩

خۆزگە سەرکردەو لێپرسراوی ناو مرۆڤەکانیش ئاوا خەمخۆری هاوڵاتی خۆیان دەبون و لـە کـاتی تـرس ونارەحەتی لەناو چوونداو

پشتیان لە گەلەکەیان نەکردایەو نەڕۆیشتنایە بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵکو خۆیان لە سەنگەری پێشەوەدا بونایەو چاودێری بەهێز بونایە بۆ پاراستنی هەموو ئەو کەسانەی کە ئەوانیان وەکو سەرکردەو لێپرسراوی خۆیان قبوڵ کردووەو هەڵبژاردووە.

ڕەنگە کەسێك بپرسێت و بڵێت: ئایا مێروولەکانیش وەکو مرۆڤ قسە لەگەڵ یەکتری دەکەن و لە یەکتری دەگەن؟ لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ، مادام قورئانی پیرۆز باسی کردووە ئیتر هیچ گومانێکمان نییە لەوەی کە مێروولەکانیش قسە بەیەکەوە دەکەن، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە حەز بە بەڵگەی زانستی نوێ دەکەن، ئەم ڕاستییە زانستییە دەخەینەڕوو:

چەند ساڵێك لەمەوپێش لە گۆڤارێکی ڕووسی دا کە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی بڵاوی دەکاتەو گۆڤارێکی زانستییەو جیاوازی هەیە لە نێوان گۆڤاری زانستی و ( Science in The ussr) بە ناونیشانی ئاسایدا، کە هەرکات توێژینەوەیەك یان لێکۆڵینەوەیەکت لە گۆڤارێکی زانستیدا بینی ( ١٠٠٪ ) ڕاستە، چونکە ئەگەر ئەو لێکۆڵینەوەیە ڕێك وپێك وباوەڕ پێکراو نەبێت، بڵاوی ناکاتەوەو ئەگەر ( ٢تا٣ ) لێکۆڵینەوەی ئەو پسپۆڕە بڵاو بکرێتەوە ئەوا پلەی زانستی بەرز دەبێتەوە.

لێکۆڵینەوەیەك کرابوو لەسەر مێروولە، جۆرێك لە مێروولە کە ناوی ( فۆڕمیکا) یە، کە قەبارەی کەمێك گەورەیە، چەند هەزارێکیان لەم جۆرە مێروولەیە هێناوەو لە شوشەیەکدا دایان ناوەو دەرگایان بۆ

درووست کردووە وەکو پردێك ، پاشان ووردەکارییەکی بازنەییان بۆ کردووەو وەکو سوکانی ئوتومبێل وایە، لەو بازنەیەدا ( ٦٠ ) لولەی تێدایە، لەو ( ٦٠ ) لولەیەدا یەکێکیان شیلەی شەکری تێدایەو ئەوانی تر بەتاڵن، دەرگاکەیان کردووەتەوە، مێرووولەیەکیان هێناوەو خستویانەتە ناو بازنەی لولەدارەکەوە، ئەم مێرووولەیە گەڕاوە، گەڕاوە بەناو هەموویاندا تا دەگاتە ئەو لولەیەی شیلەی تێدایە ئیتر تێر شیلەی خواردووە، پاشان گەڕاوەتەوە... لێکۆڵەرەکان تێبینی دەکەن لە گەڕانەوەیدا ، کە بەسەر پردەکەدا دەڕوات بۆ شارەکەی خۆی، دەرگاکەیان کردووەتەوە، ڕێگایان داوە کە مێرووولەیەکی تر بێتە دەرێ، ئەم مێرووولەیەی کە هاتووەتە ژوورەوەو برسییەتی، ئەمەش کە دەڕواتە دەرەوە تێرە، تەماشا دەکەن وا بەرامبەر یەکتری وەستاون و بە شاخەکانیان دەکێشن بەیەکدا، بۆ ماوەی سێ خولەك ونیو سەردەنێن بەیەکەوە، پاشان ئەو مێرووولە تێرەیان لابردووە کە بە ماوەیەکی زۆر ئەمجا شیلەی ناو لولەکەی دۆزییەوە، ئەم سێ خولەك ونیوە کە گفتوگۆیان بەیەکەوە کردووە پێی وتووە کە شیلەکە کەوتووەتە فڵان شوێنەوە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەم مێرووولە برسییە بەبێ دواکەوتن ، ڕاستەوخۆ دەچێتە ئەو شوێنەی کە شیلەکەی تێدایە، بەڵێ ئەمە زانست سەلماندی و شایەتی بە حەقیدا کە قورئانی پیرۆز کەلامی خوایەو ڕاستە مێرووولەکان بەیەکەوە قسە دەکەن.

وە لە تایبەتمەندییەکانی تری مێرووڵە ئەوەیە کە زۆر حەز بە ژیان دەکات، هەر بۆیە هەوڵ ئەدات زۆرترین خۆراك بۆ خۆی دابین بکات، وە چەندین قات لە پێداویستی خۆی هەڵدەگرێت.

دەگێڕنەوە جارێکیان حەزرەتی سولەیمان بە مێرووڵەیەکی ووت: ساڵی چەند دەخۆی؟ ووتی سێ دەنکە گەنم، حەزرەتی سولەیمان خستییە شوێنێکی داخراوەوەو سێ دەنکە گەنمی بۆ تێ کرد، دوای ساڵەکە تەماشای کرد تەنها دەنك و نیوێکی خواردووە، حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: بۆچی وات ووت و ئێستا نیوەی ئەوەت خواردووە؟ ! مێرووڵەکە لە وەڵامدا ووتی: ترسام لە بیرت بچمەوە، ویستم ساڵێکی تر تەمەنم درێژ بێت، بەڵام ئەگەر لە دەرەوە بومایە، دڵنیا بووم کە خوای گەورە هەرگیز لە یادم ناکاو هەرسێ دەنکە گەنمەکەم دەخوارد.

بەڵێ ئیمانداران: مێرووڵەش لە خزمەتی مرۆڤدایە، ئەویش بەوەی کە بەزمانی خۆی لە خوای گەورە دەپارێتەوەو داوای باران ورەحمەتی خوا دەکات بۆ سەر زەوی و زیندەوەرانی سەر زەوی.

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبی هورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە کە: لە ساڵێکی بێ بارانی و ووشکە ساڵی و نەداریدا، خەڵکی ڕۆیشتن بۆ خزمەت پێغەمبەرەکەیان بۆ ئەوەی بە کۆمەڵ لە خوا بپاڕێنەوەو داوای باران بکەن، پێغەمبەرەکەشیان فەرمانی پێدان کە بە گەورەو بچووکەوە ماڵەکانیان وئاوەدانی جێ بهێڵن و ڕوو بکەنە دەشت وبیابان و بە زمانی زەلیلی وملکەچییەوە لە خوای گەورە بپاڕێنەوە،

بەڵکو خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی بەزەیی پێیاندا بێتەوەو بارانی ڕەحمەتیان بۆ ببارێنێت، جا کاتێك هەموو خەڵکەکە لە خزمەت پێغەمبەرەکەیاندا لە دەشت ودەرەکە خەریکی پاڕانەوە بوون، پێغەمبەرەکە تەماشای کرد وا مێرووڵەیەك لەسەر پشت کەوتووەو قاچەکانی ڕووەو ئاسمان بەرز کردووەتەوەو بە زمانی حاڵی خۆی لە خوای گەورە دەپاڕێتەوەو ئەویش داوای باران دەکات، پێغەمبەرەکە کە ئەوەی بینی بانگی خەڵکەکەی کردوو فەرمووی: ( إِرجِعُوا فَقَد كُفِيتُم أَو سُقِيتُم بِغَيرِكُم ) ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە چونکە بەڕاستی بەهۆی غەیری خۆتانەوە کە ئەم مێرووڵە بچکۆلەیە، خوای گەورە بارانتان بۆ دەبارێنێ و پاڕانەوەکانی ئەوتان بەسە.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: مێرووڵەکە دەیگووت: ئەی خوای گەورە ئێمە درووست کراوێکین لە درووستکراوەکانی تۆ، خوایا بێ ئاتاج نین لە بارانی پڕ کەرەم و ڕەحمەتی تۆ، وە هەموومان موحتاجین بەوەی کە تۆ ڕزقمان بدەی و لە ئاسمانەوە بارانمان بۆ ببارێنی و گژوگیاو دانەوێڵەمان بۆ بڕوێنیت، چونکە ئەمە بە غەیری تۆ ناکرێت ئەی خوای خالیق و بەتوانا، جا خوایا گیان وا منی مێرووڵەی دروستکراوی دەستی قودرەتی تۆ، لێت دەپاڕێمەوە یان بارانمان بۆ ببارێنە، یان لەناومان بەرە، دڵنیاشم کە تۆ ڕەحمت پێش تورەبوونت کەوتووەو بارانمان بۆ دەبارێنیت، جا کە پێغەمبەرەکەی خوا گوێی لەم گفتوگۆو دوعاو پاڕانەوەو لاڵانەوە بە کوڵە بوو لەو مێروولەیەوە کە بەرز کرایەوە بۆ بارەگای خوای خالیق و ڕازقی مرۆڤ و

مێرووڵـەو هـەموو زینـدەوەرەکانی دیـارو نادیـارو گـەورەو بـچووك، فـەرمووی: ئـەی خەڵکینـە ئـیتر چـاوەڕێی بـاران بـن و خـوای گـەورە بەهۆی ئەو مێرووڵەیەوە ڕەحم بە ئێمەش دەکات.

بـەڵێ خۆزگـە مرۆڤـەکانیش ئـاوا وەکـو مێرووڵـەکان بـە دەسـتی زەلیلی لە قاپی ڕەحمـەتی خوایان بدایەو بوغرایی و خۆ بەزل زانین ڕووی نەکردایە دڵ ودەروونیان.

بـەڵێ ئیمانـداران: ڕەنگـە بپرسـی یـان ئـەو پرسـیارە بـە مێـشکتدا هاتبێـت، کـە باشـە بۆچـی یـەك سـوڕەتی گـەورەی قورئـان بـە نـاوی ( النمل: مێرووڵە ) وە ناو نـراوە؟ بەڵام ئەگـەر لـە ڕوانگـەی زانـستییەوە سەیری مێرووڵە بکەی ئـەزانی کـە کـاری خـوا چـەندە بـە جێیـەو بـەڵێ مێرووڵە حەقی خۆیەتی کە سوڕەتێکی قورئانی بە نـاوەوە بنرێـت، وە خوای گەورە لە ڕێگەی ئەو ناوی مێرووڵەیەوە بە ئاگامـان دێنێتـەوەو دەفـەرموێت: تەماشـای قـودرەت ودەسـەڵاتی مـن بکـەن، لـە چیدا؟ لـە ئەرزو ئاسمانـەکان ومـانگ وڕۆژو ئەسـتێرەو هەسارەکان و شـاخەکان ودرەختـەکان و نـاو دەریـاو زەریـاو سـەرزەوی و ئاسمانەکانـدا، وەرن سـەیری دەسـەڵاتی خـوا بکـەن لـە دروسـت کردنـی لاشـەی خۆتانـدا، بەڵام ڕەنگە کە سەیری ئـەم شتە گـەورەو بـەرزو باڵـاو بڵنـدو بەهێزانـە دەکەن، لە بیرتان بچێت کە سەیری قودرەت ودەسەڵاتی خـوا بکـەن لـە درووستکردنی مێرووڵەیەکی بچووکدا کە زۆرجار ژێر پێتان دەکـەوێ و هەر چاوتـان نایشی بینێـت، بەڵام ئـەی مـرۆڤ، ئـەی موسـوڵمان وەرە بە ووردی سەرنجی مێرووڵە بدە، ئەمجا دەرس و وانەی لـێ وەربگـرە،

پاشان لە ناخی دڵتەوە بڵێ: پاکو خاوێنی هەر بۆ تۆیە یا ( الله ) ، خوایەکی بێ شەریکی و تواناداری بەسەر هەموو شتێکدا.

جا بەڕێزان: فەرموون با هەندێکی تر لەبارەی ژیانی سەرسوڕهێنەری مێروولەوە بدوێین و بزانین چ جیهانێکی پەریتەو چۆن لەسەر نەخشەیەکی وردو داڕێژراو ژیانیان بەسەر دەبەن:-

ئیمانداران: بەڕاستی جیهانی گیانلەبەران، جیهانی زیندەوەران و مێرووەکان، جیهانێکی سەرسوڕهێنەرە، تا مرۆڤ زیاتر لێی بکۆڵێتەوە، باشتر لە دەسەڵات و گەورەیی خوای خالیق تێدەگات.

بۆ نموونە: لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دا دەرکەوتووە کە هەریەکە لە جۆرەکانی گیانداران بۆنێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، وە لە ناو هەر کۆمەڵێکی دیاری کراو لە زیندەوەران وگیانداران، بۆ هەر تاکێکی ئەو کۆمەڵەیە بۆنێکی تایبەتی هەیە کە لە بۆنی زیندەوەرێکی تر ناچێت، { هەروەکو لە مرۆڤدا بۆنی کەس لە بۆنی کەسی تر ناچێت} کەواتە ئەم بۆنە تایبەتییە بووەتە ناسنامەو پێناسەی ئەو گیاندارە یان ئەو زیندەوەرە بچووکە، وە ئەم بۆنە تایبەتییەی بۆی بووەتە پاسپۆرتی و دەتوانێت پێی بچێتە ناو شارەکەی و شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی، هەر بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە کاتێك یەکێك لە زانایانی مێژووی سروشت، کە ناوی ( رویال وکنسون )ە هەستاوە بە دانانی کتێبێك بە ناونیشانی ( شَخصيَة الحَشَرات ) کەسایەتی زیندەوەرو مێرووەکان. ئەم بۆنە تایبەتییەی هەر زیندەوەرێك لە چەند مادەیەکی کیمیایی پێك

هاتووە، کە زانایان پێی دەڵێن ( فرمونات ) بۆ نموونە: مرۆڤ زۆرێك لە خواردنەکان بە بۆن جیا دەکاتەوە، بەڵام ناتوانێت ئەم بۆن کردنە بکاتە زمانی لەیەك تێگەیشتن و قسە بەیەکەوە کردن، هەربۆیە لێکۆڵەرەوان هاتوون ووشەی ( فرمون ) یان کورت کردووەتەوە تەنها لەسەر ئەو بۆنەی کە وەکو نامەیەکی کیمیایی لە نێوان تاکەکانی یەك جۆر گیانلەبەردا دەگۆڕدرێنەوە لەنێوان خۆیاندا، کەواتە ئەم بۆنە کە زمانی لێك تێگەیشتن وقسەکردنە تەنها لە نێوان زیندەوەرانی یەك جۆر گیانلەبەردا پێی دەوترێت ( فرمون ) لە کاتێکدا لەبەرامبەر جۆرێکی تری گیانلەبەردا کە لە جنسدا لەیەك جیاوازن، تەنها بۆنێکەو هیچی تر.

بۆ نموونە: با ئەمەی باسمان کرد لەسەر مێروولە جێبەجێی بکەین، چونکە باسەکەمان لەسەر مێروولە بوو، وە لەسەر سوڕەتی ( النمل ) قسەمان دەکرد.

لە ناو مێروولەدا، مێروولەکان دەناسرێنەوە بە بۆنێکی تایبەتی خۆیان، کە زۆرجار بە ئاسانی هەستی پێ دەکەین، بۆ نموونە: کاتێك مێروولە لە پارچە شەکرێك بدات و ماوەیەك تیایدا بمێنێتەوە، دەبینین لەکاتی بەکار هێنانی ئەو شەکرەدا هەست بە بۆنێك دەکەین کە لە هیچ بۆنێکی تر ناچێت کە بۆنمان کردووە، ئەوەش بۆنی مێروولەیە، جا ئەم بۆنە تایبەتە لەناو مێروولەکانیشدا جیاوازە، ( سبحان الله ) مێروولەی هەر شارە مێروولەیەك کە بریتین لە مێروولەکانی یەك هۆزو عەشیرەت و هەموو خزم و کەسی یەکن، هەر

شارە مێرووڵەیەك مێرووەكانی یەك جۆر بۆنیان هەیەو جیاوازە لە بۆنی مێرووی شارە مێرووڵەیەكی تر.!

جا كاتێك سەرنج دەدەین كە دوو مێرووڵە بەیەك دەگەن و ئەو دوو شاخەی پێشەوەیان بەیەك دەكێشن، ئەوە بۆنی ( فرمون ) ی یەكتری دەكەن و بەو بۆنە یەكتری دەناسن كە ئایا مێرووڵەی شارەكەی خۆیەتی یان نا؟!

زانایانی توێژەرەوە لە مێرووڵەكان، چاودێرییان كردووە كە كاتێك مێرووڵەیەكی غەریب و نەناسراو چووەتە ناو شارە مێرووڵەیەكی ترەوە كە شاری خۆی نییە، ئەوە هەر لە دەرگای شارە مێرووڵەكەدا مێرووڵەی پاسەوان بۆنی پێوە كردووەو یەكسەر زانیویەتی لەوان نییەو بە دوژمنی ناسیوەو دەری كردووەتە دەرەوە. وە ئەگەر مێرووڵە غەریبەكە ویستبێتی نەڕواتە دەرەوە ئەوا بە هەموویان هێرشیان كردووەتە سەری و فڕێیان داوەتە دەرەوەی شارەكەیان.

ئەوەی جێگای سەرنج و سەرسوڕمانە ئەوەیە كە: لە كاتی تاقیكردنەوەی زانستیدا لەسەر بۆنی مێرووڵەكان، هاتوون بە ڕێگای زانستی لە شوێنی تایبەتدا، بە هۆی پێداكردنی دەرمانەوە بۆنی مێرووڵەكە كە تایبەتە بە خۆی لێیان كردووەتەوەو بۆنی مێرووڵەیەكی تر كە هی شارە مێرووڵەیەكی ترە، بە ڕێگای وەرگرتنی بۆن وەریان گرتووەو بەسەر مێرووڵەكەی پێشوویان دا كردووە ، پاشان مێرووڵەكەیان ناردووەتەوە بۆ شارەكەی خۆی، بەڵام هەرچەندە هەوڵی داوە چونكە بۆنەكەی گۆڕاوە، هەرچەند مێرووڵەی

شــارەکەی خۆشــیان بــووە، هــەر نەیانهێــشتووە بــچێتە ژوورەوەو کردوویانەتە دەرەوە.!

لـــە تاقیکردنەوەیـــەکی تـــردا، مێرووڵەیـــەکی مـــردووی شارەمێرووڵەیەکیان هەڵگرتووە کە دوای ئەوەی مردووە لە شارەکە فڕێیان داوەتە دەرەوە، زانایانی تاقیکار هاتوون بۆنی ئەو مێرووڵە مردووەیـان وەرگرتـووەو پاشـان مێرووڵەیـەکی هـەمان شـاری ئـەو مێرووڵە مردووەیان گرتـووەو بـۆنی مێرووڵـە مردووەکـەیان کـردووە بەسـەرداو ئـەمجا ناردوویانەتـەوە بـەرەو شـارە مێرووڵەکـەی خـۆی، تەماشـایان کـردووە، پاسـەوانەکانی بـەردەرگا پـەلاماریان داوەو نەیانهێـشتووە بـچێتە ژوورەوە، چـونکە بـۆنی مێرووڵـەی مـردووی لێهاتووە، چەندجار ئەم مێرووڵەیە ئەیەوێت قەناعەتیان پێ بکات کە من زیندووم و ئەوەتا ئەجوڵێم و بەقاچی خۆم دەڕۆم، بەڵام چونکە بۆنی مردووی پێوە بووە، ڕێگایـان پـێ نـەداوە کە بچێتە ژوورەوە. پاشـان کـە ماوەیـەك لـە دەرەوە ماوەتـەوەو هـەوا لێـی داوەو بـۆنی مێرووڵە مردووەکەی لێ بووەتـەوەو بۆنـە ئاساییە تایبەتەکەی خۆی وەرگرتووەتـەوە، ئەمجا کـە چووەتەوە ژوورەوە، مێرووڵـەی پاسـەوان بۆنی کردووەو ئەمجا ڕێگەی داوە کە بچێتە ژوورەوە.

سـەرنجێکی سەرسـوڕهێنەری تـر لـە مێرووڵـەوە ئەوەیـە: کـە مێرووڵـــەی دۆزەرەوەو ئاشـــکراکار ( النَملــةُ الکَـشافة ) کاتێـــك خـــواردنێکی دۆزیوەتـــەوە یەکـــسەر دەسـتی کـردووە بـە دەردانـی ( الفرمون ) بۆنە تایبەتەکەی خۆی بەسەر خواردنەکەداو، پاشان لە

چەند شوێنی ڕێگا تا دەگاتەوە هاوڕێکانی ئەم بۆنە دەڕژێنێت، بۆ ئەوەی کە هاوڕێ مێرووەکانی چوون بۆ ئەو خواردنە بەو بۆنە بزانن کە بە کوێدا بڕۆن، جا کە چوونە سەری و لێیان هەڵگرت و زانیان هێشتا هی تری لێماوە، ئەمانیش بە درێژایی ڕێگاکە ئەو بۆنە دەڕێژن بۆ ئەوەی هاوەڵەکانی تریان بنێرن بۆسەر خواردنەکەو ئەوانیش بەهۆی بۆنەکەوە ڕێگاکە بەرنادەن تا دەچنە سەر خواردنەکە.!

ئەمەی کە باسمانکرد ئەم تاقیکردنەوانە لەسەر مێرووله، لە کتێبی ( رَحيقُ العِلمِ وَالأيمان ) ی دکتۆر ( أحمد فواد پاشا ) دا نوسراون.

بەڕێزان: قورئانی پیرۆز لە سورەتی ( النمل ) دا ئاماژە بە ڕاستییەکی زانستی گەورە دەکات، کە ئەویش زیرەکی مێروولەو توانایەتی لە ڕووبەڕوو بونەوەی هەموو ئەو هەڕەشانەی کە ڕوو لە ژیانی دەکەن، کە چۆن زیرەکانە هەستی بە هاتنی سوپای حەزرەتی سولەیمان کردو دەست وبرد جەماعەتەکەی ئاگادار کردەوەو بردنیە ژوورەکانیانەوە.

لە ڕاستی دا زانستی سەردەم دۆزیویەتییەوە کە مێروولە زۆر زیرەك وبە توانایەو کرداری سەرسوڕهێنەر ئەنجام ئەدات، لەو لێکۆڵینەوانەدا زانایان بۆیان دەرکەوتووە کە مێشکی مێرووله لە دوو بەشی سەرەکی پێك هاتووە، ڕێك هەروەکو مێشکی مرۆڤ ، وە لەناو

مێشکی مێروولەدا بەو قەبارە بچووکەیەوە چەندین ناوەندی هەستکردن و ئاگادارکردنەوەو خانەی زۆر هەستیار هەن.

وە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی کردووە بە شاری مێروولە، ( وادی النمل ) دۆڵی مێروولە کە ئەمەش ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە مێروولەش دروستکراوێکی خوای گەورەیەو حەزی لە بەیەکەوە ژیان هەیە لە شوێنێکی فراوانی نیشتەجێ بووندا، وە مێروولە زۆر هاوکاری یەکترن و هەریەکەیان خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت لە ئاست مێروولەکانی تری هاوڕێی و هاو شاریدا.

وە قورئانی پیرۆز هەر لە سورەتی ( النمل ) دا ئاماژەی کردووە بە ڕاستییەکی تری زانستی کە ئەویش کاتێك فەرمووی: ﴿ وَقالَتْ نَملَةٌ ﴾ مێروولەیەکی مێ وتی، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سەرۆکی شارو کۆمەڵگای مێروولەو پاشاکەیان (مێروولەی مێیە ) ئەمجا کاتێك کە مێروولە مێیەکان گەرا دادەنێن و بەچکە هەڵدێنن، ئەمانە ئیتر کاری تریان پێ ناکرێت، لەبەر ئەوە لە لایەن سەرۆکەوە فەرمان دەردەکرێت بۆ ئەو مێروولە مێیانەی کە نەزۆکن وبەچکەیان نابێت، کە دەبێت بێکار دانەنیشن، بەڵکو دەبێت بڕۆن بۆ هاوکاری ئەو مێروولانەی کە گەراو بەچکەیان کردووەو خواردنیان بۆ ئامادە بکەن و جێگاو خانەیان بۆ پاك بکەنەوەو چاودێری بەچکە مێروولە تازە هەڵاتووەکان بکەن.

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە: ئەی باشە مێروولەی نێر بۆچی ناوو ڕۆڵی دیار نییە؟ لە وەڵامدا دەڵێین:

مێرووڵەی نێر تەنها یەك كاری پێدەكرێت لە ژیانیدا، ئەویش ئەوەیە لە كاتی گەرادانانەدا لەگەڵ شاژنی مێرووڵە جووت ببێ و پیتاندن ڕووبدات، پاشان مێرووڵەی نێر لەسەر ڕووی زەوی دەرناكەوێ تەنها لە كاتی زۆر بووندا نەبێت، جا كاتێك مێرووڵەی نێر ئیشەكەی تەواو بوو، ئەوا مێرووڵە كاركەرەكان پەلاماری ئەدەن وئەیكوژن، بۆچی؟ چونكە لە كۆمەڵگای مێرووڵەدا جێگا نییە بۆ كەسی بێكار، بەڵكو ژیان و جێگا بۆ مێرووڵەیەكە كە كاربكات و لە جوڵەدا بێت و بەرهەم پێشكەش بە شارە مێرووڵەكەو هاوڕێكانی بكات.

ئیمانداران: بەڕاستی هەر ووشەیەكی قورئانی پیرۆز پێویستی بە چەند بە دوادا چوون و لێكۆڵینەوەی زۆر ووردو زانستیانە هەیە، ئەوەتا دەفەرموێت: ( وادي النَملة ) دۆڵی مێرووڵە، كە ئەمەش سەرنجمان بۆ شوێن ومالْ وخانوو شوێنی نیشتەجێ بونیان ڕادەكێشێت، كە زانایان دەڵێن: خانوو شوێنی ژیانی مێرووڵە زۆر فراوانە، جاری وا هەیە یەك شارە مێرووڵە دۆڵ وشیوێكی گەورە دادەگرێت.

بۆ نموونە: لە شاخەكانی ( بنسلفانیا ) كە یەكێك لە ویلایەتەكانی ئەمریكایە، یەكێك لە زانایان ئاشكرای كرد كە گەورەترین شارە مێرووڵەی دۆزیوەتەوە، كە لە ژێر زەویدایەو پانتایی وڕووبەرەكەی ( ٣٠ ) فەدان دەبێت، كە چەندین ژووری تێدا درووستكراوەو ڕێگاو بان وپردی پەڕینەوەو كۆڵانی زۆر شێوە ئەندازەیی تێدایە، وە هەموو

مێرووڵەیەك ڕێگای چوونەماڵەوەی خۆی و ژووری پشووی خۆی بێ لێ تێك چوون دەزانێت.!

وە هەر شارە مێرووڵەیەك پێکهاتووە لە چەند بەشێك:.

١. بەشی هەوا گۆڕکێ: کە لە دەمی شارە مێرووڵەکەدایە.

٢. شوێنی پاسەوان کە لە شوێنێکی وادا درووست کراوە تا ئاگاداربێت و نەهێڵێت هیچ مێرووڵەیەك کە هی شارەکەی خۆیان نەبێت، بێتە ژوورەوە.

٣. مەخزەن وعەمباری گەورە بۆ پاشەکەوتی دانەوێڵە.

٤. چێشتخانە بۆ ئامادە کردنی خۆراك.

٥. شوێنی هەڵهێنانی هێلکەو گەراکانیان.

٦. شوێنی تایبەت بۆ پەروەردەو بەخێوکردنی مێرووڵە بچووکە تازە هەڵاتووەکان.

٧. قەبرستانی شارە مێرووڵە، کە ئەو مێرووڵانەی دەمرن لەو قەبرستانەدا دەیان نێژن.

٨. ژووری تایبەت و گەورە بۆ شاژنی مێرووڵە.

وە کە قورئانی پیرۆز ( وادي النَملـة ) بەکاردێنێت بەخۆڕایی نییە، ئەوەتا لە دارستانەکانی ( ئەمازۆن ) دا قوڵایی شارە مێرووڵە گەیشتووەتە ( ١٥ ) مەترو پانیەکەشی ( ٧ ) مەتر.!

بەڕاستی ئەندازیاری میعماری تیادا بەکار هاتووەو نەخشەیەکی زۆر ووردی هەیە، مێرووڵەکان بێ ماندوو بوون خەریکی ئامادە کردنی دابڕینی ژووری خەوتنی نوێن.

مێرووله زۆر ماندوو نەناسه، ئەوەتا له شاره مێروولەیەکی ئاوادا نزیکـەی ( ٤٠ ) تـەن گـڵ هەڵـدەگریٚ و لـه شـارەکەی فڕێـی ئەداتـه دەرەوە.!

وه هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، مێرووله زۆر تەماحی هەیـەو زۆرتـرین زەخـیره دابـین دەکـات بـۆ کـاتی سـەرماو نـەمانی دەغـڵ ودانەوێڵه، بەڵأم نەك هەر ئەوەندەی که کۆی بکاتـەوەو تـەواو، بەڵکو زۆر بـه شـێوەیەکی نـاوازەو زانـستی و نەخـشه بـۆ داڕێـژراو زەخـیرەو خۆراك کۆدەکاتەوەو له شوێنی زۆر گونجاودا که خۆراکەکه لـه خراپ بوون بپارێزرێـت هەڵـدەگرێت، پاشان ڕێگای پاراستنی له تێکـچوون دەگرێتـه بـەر، بـۆ نموونـه: کاتێـك گـەنمێك یـان جۆیـەك هەڵـدەگرێت، پـێش ئـەوەی بیخاتـه عـەمباری هەڵگرتنـەوە، دێـت دەیکـات بـه دوو کەرتـەوە بـۆ ئـەوەی شـین نەبێتـەوەو لـەناو نەچـێت.! وه ئـەم ڕێگایـه جێگای کـەمتر دەگـریٚ و عەمبارەکه زۆرتـر دانەوێڵه دەگرێـت، بەڵام ( سـبحان الله ) ئەگـەر ئـەو دانەوێڵـه بـه دوو کـەرت کـراویش هـەر دەڕوایـەوە، ئـەوا مێروولەکه دەیکات به چوارکەرتەوە، بۆ ئـەوەی لـه شـین بوونـەوە بیپارێزێـت.! وه ئەگـەر هـاتوو لـه کـاتی بـاران وبـەفردا عەمباری دانەوێڵەکەی ئاوی تێچوو، یـان شـێداری جێگاکه وای کـرد که ئەو دانەوێڵەیه تەڕ بوو یان خەریك بوو بۆن خنـك دەبوو، ئەوکاتـه مێرووله چاوەڕیٚ دەکات تا ڕۆژێکی خۆش که ڕۆژەکـەی سـامانٚ بـیٚ و تیـشکی خـۆر بـەدەرەوە بـیٚ و هـەوا گـەرم بێـت، ئـەوجا دانەوێڵەکـه دەهێننـه دەرەوەو لەبـەر خـۆر هـەڵی دەخـەن تـا بـه تـەواوی ووشـك

دەبێتەوە، پاشان عەمبارەکە خاوێن دەکەنەوەو دانەوێڵەو خۆراکەکە دەبەنەوە ژوورەوە.!

ئیمانداران: زانستی نویٚ کە لێکۆڵینەوەی ووردو زانستی دەکات لەسەر زیندەوەران ومێرووەکان، ڕاستییەکی زانستی نوێی ئاشکرا کرد دەربارەی مێروولە، ئەویش ئەوە بوو کە یەکێك لە زانایان کە ناوی ( رویال دیکنسون ) بوو، بۆ ماوەی ( ٢٠ ) ساڵ لە چەندین شوێنی جیاواز لە سەرتاسەری جیهان دا لێکۆڵینەوەی لەسەر مێروولە کرد، پاش ئەم هەموو ساڵ وگەڕانە ووتی: بەڕاستی ئەو ووردەکارییەی کە لە درووستکردنی شارە مێروولەدا بینیومە، لەناو شارەکانی دروستکراوی مرۆڤ دا نەمبینیوە، ئەم زانایە لەکاتی لێکۆڵینەوەدا بۆی دەرکەوت کە مێروولە ئاژەڵداری دەکات و مانگای شیردەر بەخێوو دەکات، ! ڕەنگە پێتان سەیر بێ و بڵێن: باشە چۆن مێروولە مانگا بەخێوو دەکات؟! بۆ زانیاریتان مانگای مێروولە بریتییە لە ( شەمشەمە کوێرە ) کە شیردەرە، بە بەچکەیی کە زۆر بچووکە، کاتێك کە بەردەستیان دەکەویٚ مێروولەکان خۆیان بەخێوی دەکەن و دەیبەنە قوڵایی زەوییەوەو ماوەیەکی زۆر لەناو تاریکایی زەویدا دەیهێڵنەوەو تا بە تەواوی چاوی لەدەست دەدات، ئەمجا کە گەورە بوو ناتوانیٚ بڕواتە دەرەوە، گووانەکانی کە شیریان تیٚ دێت، چونکە بەچکەی نێرو مێیان بردووەتە ژوورەوە، کە گەورە بوون و جوت بون و بەچکەیان بوو، مەمکەکانی پڕ دەبن لە شیرو مێروولەکان شیرەکەی دەخۆن.!

بەڵێ : ئەگەر مرۆڤ توانیویەتی چەند ئاژەڵێکی دیاری کراو ژێربار بکات بۆ خۆی بۆ ئەوەی سوودیان لێ ببینێت، ئەوا مێروولە توانیویەتی سەدان زیندەوەر بۆ خۆی ژێربار بکات و سوودیان لێ وەربگرێت.

بۆنموونە: حەشەرەیەکی زۆر ووردو بچووك هەیە پێی دەوترێت ( بق النَبات ) ئەم حەشەرە وورده بچکۆلەیە لەسەر ڕووەك دەژی، وه مرۆڤ زۆر بە گران دەتوانێت ئەم حەشەرەی دەست بکەوێت، چونکە بەسەدان جۆری مێروولە وا چاودێری دەکەن وچاوەڕێی ئەوەن کە هێلکە دابنێت، جا هەر کە هێلکەکانی دانا خێرا مێروولە چاودێرەکان دەگەنە سەری و هێلکەکان هەڵدەگرن و دەیبەنەوە بۆ شارە مێروولەکەیان و چاودێری دەکەن و سەرپەرشتی دەکەن هەتاوەکو کاتی تروکانی دێت و بەچکەی زۆر بچووکی لێ دێتە دەرەوە، ڕەنگە بپرسن باشە مێروولە ئەم کارە بۆ دەکات؟! مێروولە دەزانێت کە کاتێ ئەم حەشەرە بچووکە گەورە بوو پێگەیشت، شلەیەکی زۆر شیرین دەردەدات کە پێك هاتووە لە مادەی شەکرو شتی تر، کە دەتوانین بەم شلە شیرینە بڵێین: (هەنگوینی مێروولە) ئەمجا سەرکردەی شارە مێروولەکە کۆمەڵێك مێروولە دیاری دەکات و پێیان دەڵێت ئێوە هیچ کارێکتان نییە، تەنها چاوەڕێی ئەوە دەکەن هەرکە ئەم حەشەرەیە شلەکەی دەردا، بەو دوو شتەی کە وەکو شاخ لەسەر سەریەتی مێروولەکە هەنگوینەکەی لێ وەردەگرێ و دەیبات لە شوێنی تایبەتدا کۆی دەکاتەوەو پاشان بە کۆمەڵ دەیخۆن.!

شایانی باسە ئەم حەشەرە بچووکە هەموو ڕۆژێك لەکاتی بەرهەم بەخشیندا ( ٤٨ ) دڵۆپ لەو شلەیە دەردەدات کە ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە ئەم حەشەرە بچووکە سەدان قاتی مانگایەك بەرهەم ئەدات، ئەگەر بەراووردی قەبارەی ئەو حەشەرە بە مانگایەکی ئاوا قەبارە گەورە بکەین.!

جا ئیمانداراني بەڕێز: ئایا ئەم هەموو زیرەکی و ووردەکاری وماندونەناسی و نەخشەسازییەی کە مێرووڵە دەیکات بەو بچووکیەی خۆیەوە، ئایا جگە لەوەی کە بڵێ ی ئەمە تەنها خوای دروستکەری پێی بەخشیوە، هیچی تر هەڵدەگرێت؟ ئایا دەگونجێت بڵێی ئەمە هەر بەسروشت و لە خۆیەوە فێر بووە؟! بێگومان نەخێر، بەڵکو هەمووی گەورەیی و دەسەڵاتی بیٚ سنووری پەروەردگارمان نیشان دەدات، کە ئاوا سەرنجی ئێمەی ڕاکێشا بۆ لای مێرووڵەو سورەتێکی قورئانە پیرۆزەکەی ناونا ( النمل: مێرووڵە ) .

جا خوایەك ئاوا نەخشەی ژیان فێری مێرووڵەیەك بکات، ئایا دەبێت مرۆڤ نەخشەی ژیانی خۆی لە غەیری ئەو خوایە وەربگرێت؟ ! ئایا ئەوانەی کە بە پەیامی خوا کە قورئانە ڕازی نین بیکەن بە دەستووری ژیان، ئایا وەکو مێرووڵە عەقڵیان هەیە؟ بێگومان نەخێر.

جا کەواتە برواداری بەڕێز: هەرکاتێك مێرووڵەیەکت بەرچاو کەوت، ئەم ڕاستییە زانستیانەی کە باسمان کردن دەربارەی مێرووڵە، با بێنەوە یادت و بەووردی سەرنجی بدەو ئەمجا لە ناخی دڵتەوە بڵێ: پاکوبێگەردی و دەسەڵات و کارجوانی وکاربەجێی هەر شایانی

تۆیــە ئــەی خــوای پــەروەردگارم ، ئــەی پــەروەردگاری مــن و ئــەم مێروولەیەو گشت بونەوەر بە دیارو نادیاریانەوە.

سەری بەندایەتیت بۆ دائەنەوێنم و بە تاك و تەنهاو بێ شەریکت دەناسم ، خوایا تۆش لەسەر ڕێبازە جوانەکەی خۆت دامەزراوم بکەی و لە کوفرو بێباوەڕی و گومڕایی بمپارێزی.( یــــا أرحَمَ الراّحمیــن یـا الله ).

# سەرچاوەکان:-


١. قورئانی پیرۆز.

٢. پوختەی تەفسیری قورئان م. محمد مەلا صالح بامۆکی

٣. بەرەو ئیسلام، سەرفرازی ئەندازیار عوسمان .

٤. کۆباسەکانی میحراب م. شمالْ عبدالرحمن موفتی .

٥. الثِمار اليانِعة في الخُطَب الجامِعة وَحيد عبدالسَلام بالی .

٦. آيات الأعجاز العِلمي مِنْ وَحي الكتاب وَالسُنة

عبدالرحمن سَعد صبي الدين

٧. المُعجِزة وَالأعجاز في سورَة النَمل عبدالحَميد محمود .

٨. شَخصية الحَشَرات رويال وكنسون .

# ووتاری پێنجەم
# بۆ مانگیذي القعدة

# سەرنجدان و بیرکردنەوە لە گیانداران
# بەشی دووەم

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ أجمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: لە ووتاری ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە گیانلەبەرو ئاژەڵ وباڵندەکان و زیندەوەرە ووردو بچووکەکان، هەروەکو مرۆڤ بە ژیانی کۆمەڵکاری دەژین و ژیانیان وهەڵس وکەوتیان پڕە لە شتی سەرسوڕهێنەرو هەموشی ئەوەمان نیشان دەدات کە بەڕاستی خوای گەورە ئەو پەروەردگارە بە توانا و میهرەبانەیە کە وەکو دروستی کردوین ڕێنمایشی کردووین.**

﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ **طه ٥٠.**

**وە پێویستە ئێمەی ئیماندار کاتێک ئاژەڵ وباڵندەو زیندەوەرە ووردەکان دەبینین، هەروا بە سادەیی بەسەریان دا تێنەپەڕین، بەڵکو سەرنجیان بدەین و لێیان وورد بینەوەو دەرسی زیاد بوونی ئیمانی لێوە فێر ببین.**

**بەڕێزان: کاتێک دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز، دەبینین لە چەندین ئایەتدا سەرنجمان ڕادەکێشێ وفەرمانمان پێ دەکات و هانمان دەدات کە لە ئاژەڵ وباڵندەکان وورد بینەوە بۆ نموونە:** ﴿أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلى الأبِـلِ كَيفَ خُلِقَت﴾ **یان** ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىۡءِۭ بَصِيرٌ﴾ **الملك١٩.**

واتە: ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە کە بەسەریانەوە پۆل پۆل دەفڕن و باڵەکانیان لێك دەنێن، ئەو باڵندانە جگە لە خوای میهرەبان کەس بە ئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات، بەڕاستی ئەو زاتە بە هەموو شتێك بینایەو هیچی لێ وون نابێت و چاودێری هەموو دروستکراوەکانی دەکات، ( فڕۆکەو کەشتی ئاسمانی و ... هتد ) هەر ئەو زاتە بە هۆکارەکان لە ئاسماندا هاتوچۆیان پێ دەکات و ڕایاندەگرێت.

ئیمانداران: فەرموون با بەیەکەوە هەندێکی تر لە جیهانی ئاژەڵ و باڵندەکان بدوێین:

ناسینەوەی بەچکە لە لایەن دایکیانەوە: تەماشاکەن لەناو ڕانە مەڕدا هەموو بەرخەکان وەکو یەکن، کەچی مەڕەکە بەرخەکەی خۆی دەناسێتەوەو شیر نادات بە بەرخی مەڕێکی تر لەناو سەدان بەرخ ومەڕدا، چۆن ئەمە ڕوو ئەدات؟ مەڕ کە بەچکەی دەبێت زوو زوو بۆنی دەکات، ئیتر هەرگیز ئەو بۆنە لەیاد ناکات و هەتا ئەو بەرخە لە شیر دەبڕێتەوەو لە دایکی جیا دەبێتەوە، ئەو بۆنە لای دایکی تۆمارەو بەو بۆنە دەیناسێتەوە.

هەروەها گامێش و سەگیش هەر بەو بۆنە بەچکەکانی خۆیان دەناسنەوە، بەڵام( پەنگوین : بطریق ) وەکو مرۆڤ بەچکەکەی خۆی بەهۆی دەنگ وڕواڵەت و شێوەی ڕۆیشتنیەوە دەناسێتەوە، بەچکەکانیش بەهۆی دەنگیانەوە دایکیان دەناسنەوە.

بەچکەی مراوی کە لە هێلکە دێتە دەرەوەو چاوی بە دایکی دەکەوێت، وێنەی دایکی هەمیشە دێتە بەرچاوی و پێی ئاشنا دەبێت، بۆیە هەمیشە دوای دەکەوێت.!

مریشك وهەڵهێنانی جووچك: مرۆڤ ڕۆژ ژمێری لایە بۆ ئەوەی ڕۆژەکانی پێ دیاری بکات، کەچی زۆرجار لەگەڵ بونی ڕۆژ ژمێریشدا هەڵەدەکات و لێی تێك دەچێت ئەو ڕۆژە چەند شەممەیە یان چەندی مانگە، بەڵام مریشك کاتێك لەسەر هێلکەکانی کڕ دەکەوێت، ( ٢١ ) ڕۆژی خۆی حیساب دەکات بەبێ ئەوەی یەك ڕۆژی لێ تێك بچێت، هەرکە جووچك وەختی هاتنە دەرەوەی هات، مریشکەکە لە دواوە هێلکەکە دەشکێنێت، چونکە ئەگەر لە پێشەوەی هێلکەکە بدات، لەوانەیە دەنووکی بەر چاوی جوچکەکە بکەوێت وکوێری بکات، ! وە بەچکەکە لەناو هێلکەکەدا باڵەکانی بەسەر سەریەوەیەتی، بۆ ئەوەی کە هاتە دەرەوە ئێسقانی سەری بەر توێکڵی هێلکەکە نەکەوێت و ئازاری نەدات.!

بەڵێ بۆ یەکەمجار ئەو کەسەی کە ئامێری جووچك هەڵهێنانی دەستکردی درووستکرد، فەشەلی هێنا ! هەرچەندە زۆر بە زانستیانە کارەکانی دابەش کردبوو، پلەی گەرمی ناو مەکینەکە: ( ٣٧,٥ ٪ ) و ڕادەی شێ ( ٨٠٪ ـ ٨٥٪ ) بوو، پلەی گەرمییەکەی زیاد کرد بۆ ( ٩٣٪ ) ، زاناکە سەری سوڕما لەوەی کە بۆچی فەشەل دێنێ؟ بۆچی جووچکەکان لە هێلکەکە بە زیندوویی نایەنە دەرەوەو لەناو هێلکەکەدا دەمرن؟!

ئەوە بوو ڕۆژێکیان پیاوێکی بە تەمەنی جوتیار کە لەو کێڵگەیەدا کاری دەکرد پێی ووت: بەڕێز من لە دەشت وگونددا ژیاوم ومریشکم ڕاگرتووە، سەرنجم داوە مریشك بە قاچەکانی هێلکەکان هەڵدەگێڕێتەوەو ئەمدیوو ئەودیویان پێ دەکات، تۆش ئەمە تاقی بکەرەوەو هێلکەکان لەناو مەکینەکەدا هەڵبگێڕەرەوە بزانین ئەنجامەکەی چۆن دەبێت.

بەڵێ ئەوە بوو خاوەن کێڵگە بە قسەی مامە پیرەی جوتیاری کردو سەرەنجام کارەکە سەرکەوتنی بە دەست هێناو جووچکەکان بە زیندوویی لە هێلکەکان دەهاتنە دەرەوە، باشە بۆچی مریشك بە قاچەکانی هێلکەکان هەڵدەگێڕێتەوە؟! لەبەر دوو هۆ:

١. تا جەنین نەلکێت بە توێکڵەکەوە.

٢. تا خواردنەکە لەناو هێلکەکەدا بگاتە هەموو لەشی جووچکەکە.

بەڵێ زانایانی لێکۆڵەرەوە لەسەر مریشك و جووچکە هەڵهێنان، سەرنجیاندا مریشك لە دوو هەفتەی یەکەمدا هێلکەکانی توند دەگوشێت بە خۆیەوە، بەڵام لە هەفتەی سێهەمدا باڵەکانی تۆزێك بەرز دەکاتەوە، بۆچی ؟ چونکە لە هەفتەی سێهەمدا ئۆکسجینی ناو هێلکەکە بەشی جووجەڵەکە ناکات و پێویستی بە ئۆکسجینی دەرەوە هەیە!!

باشە بەڕێزان کێ ئەمەی فێری مریشك کرد؟! تەنها ( الله ) بەڵێ هەر ئەو ( الله ) یەی کە مریشکی دروست کردووە، ئەو زیرەکی وتوانایەشی پێ بەخشیوە.!

ئیمانداران: یەکێکی تر لەو شتانەی کە لە ئاژەڵ وگیانداراندا دێتە بەرچاومان، بریتییە لەوەی کە گیانلەبەران کلکیان هەیە، بەڵام گیانلەبەران هەریەکەیان بە جۆرێك سوود لە کلکیان وەردەگرن، هەندێکیان کلکیان بۆ بازدان و بەکارهێنانی کلك بۆ سەرکەوتن وهەڵنزان بە درەختەکاندا بەکار دەهێنن.

هەندێك گیانلەبەری تر چەوری لەناو کلکیدا کۆ دەبێتەوەو لەو کاتانەدا کە خواردنی دەست ناکەوێت، سوود لەو چەورییەی ناو کلکی وەردەگرێت.!

بەڵام پشیلە کە بەشوێنێکی بەرزدا، یان ڕێگایەکی باریکدا تێدەپەڕێت، کلکی بۆ لەنگەر گرتن وخۆڕاستکردنەوە لە ڕۆیشتندا بەکار دەهێنێت.

بەڵێ ئیمانداران: هەموو زیندەوەران لە خزمەتی مرۆڤدان، ئەوەتا ئەو مێش ومێشوولەو حەشەراتانەی کە لەسەر زەوین، ئەگەر خوای گەورە باڵندەی بۆ درووست نەکردنایە کە بیانخۆن، ئەوا ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو.

یەکێك لەو ژینگە پارێزانە، ( پەڕەسێلکە ) یە کە بەچکەکانی بە مێشوولەو جرو‌جانەوەری زیان بەخش بۆ مرۆڤ وکشتوکاڵ بەخێو دەکات، پەڕەسێلکە دەتوانێت بۆ ماوەی ( ٦ ) کاتژمێر لەسەر یەك

بڕوات، هەر کاتژمێرێك ( ١٥٠ ) کیلۆ مەتر ببڕێت... ئەگەر لەکاتی کۆچکردندا پەڕەسێلکەیەك نەخۆش بکەوێت، ئەوا کاروانەکە لە فڕین دەکەوێ و چاوەڕێی ئەو هاوڕێیەیان دەکەن..!

یەکێکی تر لە باڵندە ژینگە پارێزەکان: ( کوندە پەپوو ) یان ( بایە قوش ) ە ، کوندە پەپوو لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا بە نیشانەی شوومی و نەگبەتی ووێرانی تەماشا دەکرێت، بەڵام لە ڕاستیدا گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لە پاراستنی ژینگەدا. ئەم باڵندەیە لەگەڵ هەندێك ئاژەڵی تردا خوای گەورە کردوونی بە زەمانەی دڵنیایی ژینگە پارێزی، ئەم کوندەپەپووە مشك وجرج و هەندێك لە مارو مێرووەکان و چۆلەکەکان دەخوات. لە ساڵێکدا نزیکەی ( ٥٠٠ ) مشك لەناو دەبات، شێوازی ڕاوکردنی هەندێك جۆری کوندە پەپوو ئامانجدارو تایبەتە، کوندەپەپوو کاتێك بە ئاسمانەوەیەو بە دوای نێچیرەکەی دا دەگەڕێت، کەروێشکە لاوازو نەخۆشەکان هەڵدەبژێرێت و بەم کارەشی زۆر بوونی کەروێشکەکان سنووردار دەکات و ناهێڵێت لە سنووری خۆیان زیاتر ببن، وە هەروەها بە خواردنی لاوازو نەخۆشەکان ڕێگە لە بڵاو بوونەوەی نەخۆشی دەگرێت، ئەگەر ئاماژەمان بەوەدا کە کوندە پەپوو ڕۆژانە ( ١٥ ) مشك ڕاودەکات، ئەو کاتە ڕەنگە هەست بە بەسوودی و گەورەیی ئەم باڵندەیە بۆ بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بکەین.

ژینگە پارێزی ناو دەریاکان: دەریاکان بە بەردەوامی پیسی و پاشەڕۆی مرۆڤیان تێ فڕێ ئەدرێت، بۆ نموونە: دەریای ناوەڕاست

١٢٠ ) شاری لەسەرە، ساڵی زیاتر لە ( ٥٠٠ ) ملیۆن تەن خاشاك وپاشەڕۆ فڕێ ئەدرێتە ناو ئەو دەریایەوە. بەڵام ئایا وەکو لەسەر زەوی مرۆڤ خۆی لەو پاشەڕۆیانە ڕزگار دەکات و سەرزەوی لێ پاك دەکاتەوە، بەوەی کە لەسەر ووشکانییەوە فڕێی ئەداتە ناو دەریاوە، ئەی کێ ئاوی دەریاو ئەو ملیۆنەها زیندەوەرەی ژیانی تێدا بەسەر دەبەن ڕزگار بکات لەو پیسی وخاشاکە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو خوای پەروەردگارەی کە دەریاو زیندەوەرانی ناوی درووست کردووە، بێگومان مشووریشی لێ خواردووەو بۆ پاك کردنەوەی جۆرێك لە ماسی قرشی شینی درووست کردووە، کە درێژییەکەی لە نێوان ( ٧,٥ ) مەتردایە، ئەم جۆرە لە قرشی شین گۆشتی مرۆڤ دەخوات و شوێنی کەشتییەکان دەکەوێت بەمەبەستی دەست کەوتنی گۆشتی مرۆڤ ، تەماشای کاربەجێی خوای گەورە بکەن، گۆشتی مرۆڤی لای ئەم قرشە شینە بەتام کردووەو عەودالّیەتی و لەهەر شوێنێکی دەریادا مرۆڤ تێپەڕی، لە قوڵایی دەریاوە بۆنی دەکات و بە ئامانجی خواردنی دێتە سەرەوە، بەڵام زۆر دەگمەن نەبێت مرۆڤی دەست ناکەوێت، بۆیە بەم ئامانجەوە شوێن کەشتییەکان دەکەوێت و هەرچی پیسی وپاشەڕۆیەك هەیە کە لەو کەشتییانەوە فڕێ ئەدرێتە خوارەوە، ئەم قرشە خێرا دەمی بۆ دەکاتەوەو دەیخوات، تەنانەت ئەگەر تەنەکەو شووشەو قوتوش بێت.!

لەگەدەی یەکێك لە قرشە شینە سامناکەکاندا جوتێك کەللەی مەڕو بەشی دواوەی بەرازێك و سەگێك بە ساغی و جووتێك پێڵاوو نیو دەستە شووشەو نزیکەی ( ٢٠٠ ) کیلۆ گۆشتی بەسەرچو دۆزرانەوە.!

جا سەرنج بدەن ئەگەر ئەم شتانە لەناو دەریادا بمانایەتەوە، چۆن ئەو ناوەیان بۆگەن دەکردوو مرۆڤ وزیندەوەرانیان لەناو دەریادا تووشی زیان دەکرد.. شایانی باسە ئەم قرشە شینە خوێن مژە دەتوانێت لە کاتژمێرێك دا ( ٤٨ ) کیلۆ مەڵ بپڕێت.!

هەندێك گیانداری تر بە بۆنی خۆش خزمەتی مرۆڤ دەکەن، هەندێك لە گیانداران لەناو پێستی سکیان دا لولەیەك یان چەند لولەیەك هەیە، کە پڕە لە بۆنی خۆش... ناسراوترین ی ئەو جۆرە بۆنانە ( میسك )ە کە لە ژێر پێستی سکی هەندێك ئاسکدا هەیە.

ئەم بۆنە خۆشە لای هەندێك گیانداری تریش دەست دەکەوێت: وەك: ( جۆرە گایەکی کێوی و جۆرە کراوییەك لە ئوستورالیاو جۆرێکی زۆر تایبەت لە مشکی دەشتەکی لە ئەورووپاو هیندستان و جۆرە تیمساحێك لە ئەمەریکا) شایانی ئاماژە پێکردنە کە لوی میسك لە ئاسکدا تەنها لای نێرەکانیان هەیەو ئەم لووە بە ئەندازەی پرتەقاڵێك دەبێت.!

ئیمانداران: هەندێکی تر لە گیانلەبەران خزمەت بە عەقیدەو بیروباوەڕمان دەکەن! ڕەنگە بپرسی چۆن؟ ئەوەتا بە ( عَينَ اليَقين ) نیشانمان دەدەن کە ڕاستە، حەزرەتی ( عیسا ) سەلامی خوای لێ

بێت، بەبێ باوك لە دایك بووەو تەنها لە دایك دروست بووە.
بۆنموونە: مێشوولەی ئاوی بە بێ نێرە ، بە مەرجێك خواردن وگەرمی بۆ دابین بكرێ زاوزێ دەكەن.! هەروەها جاڵجاڵۆكە گەلێك جار بەبێ هاوار بردن بۆ نێرەكانیان بەچكەیان دەبێت.!

بەرێزان: بەڵنیاییەوە هیچ درووستكراوێكی خوای گەورە نییە لەوەی كە دیارەو لەبەر چاومانە لەوەشی كە بە چاو نایبینین، كە بەڕواڵەت زەرەری هەیە، بەڵام بێ سوود خوای گەورە درووستی نەكردووە، ئەوەتا بەراز كە تەنها زیانەكانی دەبینین، بەڵام جۆرێك لە بەراز هەیە كە لەسەر پیسی وپاشماوەكان دەژی و زەوی وژینگە لە بۆگەن بوون دەپارێزێت.

هەروەها لەو خزمەتانەی كە ئاژەڵ وباڵندەكان بە مرۆڤی دەكەن ئەوەیە: بەهۆی تێركردن وئاوو خۆراك پێدانیانەوە خوی گەورە لەو مرۆڤە هەرچەندە تاوانباریش بێت خۆش دەبێت.

وەكو ئەو فەرموودەیەی كە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووەو باسی ئافرەتێكی خراپەكار دەكات كە سەگێكی تینووی تێر ئاو كرد كاتێك بینی لە تینوان زمانی لە زەوییەكە ئەدات، خوای گەورە بەم كارە چاكەی لێی خۆش بوو.
وە ئەو مەڕو بزن و مانگایەی كە ئاوو كاو ئالیكی دەدەیتێ ، هەرچەندە خۆت سوودی لێ دەبینیتەوە بە وەرگرتنی شیرو بەرهەمەكانی و گۆشتەكەی، بەڵام خوای گەورە ئەو ئاڵف پێدان و تێراو كردنەشیانت هەر بە چاكە بۆ دەنووسێت.

کابرایەك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: (وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ لأَجْرًا ؟ فَقَالَ : فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ ) رواهُ البُخاري وَ مُسلِم.

وە زۆرجار بە هۆی خۆراك پێدانی پشیلەیەکەوە کە ئێسقانێك یان کوتێك گۆشتی دەخەیتە بەردەم، خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە ئەو ماڵ وخواردنەتەوە.

کەواتە: ئاژەڵانی دەورو بەرمان وێستگەیەکن بۆ گەیشتنمان بە ڕەحمی خوا، یاخوود دەبنە هۆی ئەوەی خوای گەورە بە هۆی خزمەت کردنی ئەوانەوە بەزەیی پێماندا بێتەوەو دەردو بەڵاو نەخۆشیمان لەسەر لا ببات.

فەرموون گوێ بۆ ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیە بگرن: کە لە کتێبی ( مِنْ عَجائِبِ القَدَر ) ی ( محمد عوسمان عوسمان) دا باسکراوە:

پیاوێکی دیندارو خواناس کە ژنەکەشی ئافرەتێکی خواناس ودەم پاك و دڵ پاك بووە، منداڵێکی بچکۆلەیان زۆر نەخۆش دەبێت، چەند دکتۆری پێ دەکەن بەڵام چارەسەری نابێت، هەرچی عیلاج ودەرمانی دەدەنێ هەر خراپتر دەبێت، ناچار واز لە دکتۆرو دەرمان دەهێنن و لە ماڵەوە منداڵەکە دادەنێن و ڕوو دەکەنە ڕەحمی خوا، شەوێکیان لە نیوەشەودا دایکەکە لە خەو هەڵدەستێ و سەیری منداڵەکەیان دەکات، دەبینێت وا بە حاڵ هەناسە ئەدات و تایەکی زۆر قورسی هەیە، تۆزێك ساردی دەکاتەوەو خەوی لێ دەکەوێتەوە، باوکی منداڵەکە هەڵدەستێت بۆ نوێژی بەیانی سەیر دەکات منداڵەکە وەزعی زۆر خراپە، بەڵام خۆ هیچی لە دەست نایەت، بۆیە دەست

نوێژ دەگرێت و دوو ڕكات نوێژ دەكات و دەرگا دەكاتەوە كە بچێت بۆ مزگـەوت بـۆ جەماعـەتی نوێـژی بـەیانی، سـەیر دەكـات وا لەبـەر دەرگاكەیان سێ پشیلە لە ترسی سەرمای زۆری ئەو شەوە كە بەفر باریوەو لەسەری بووەتە سامانْ و هەموو شتێكی بەستووە، دیارە ئەم سێ پشیلەیە هیچ خۆراكیان دەست نەكەوتووەو لە سەرماو لە برساندا بە قاچی كابرادا دەكەون و چاوی تێ دەبڕن و بە زمانی حاڵی خۆیان داوای ئەوەی لێ دەكەن كە خواردنیان بداتێ... بەڵێ كاتێك ئەم پیاوە ئەمە دەبینێت زۆر بەزەیی پیایاندا دێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ ژوورەوەو موجەمیدەكەیان هەڵدەداتەوەو دەبینێ پڕە لە گۆشت، سێ پارچە گۆشتی نەرمەی گەورەو باشیان بۆ دەردێنێ ودەیخاتە ئاوی گەرمەوە تا بەستنەكەیان خاوو ببێتەوەو نەرم ببێتەوە، پاش كەمێك سێ پارچە گۆشتە نەرمەكە لە ئاوە گەرمەكە دەردێنێ و بۆیان دێنێ ودەیخاتە بەردەم سێ پشیلەكە، ئەوانیش زۆر بە تامەزرۆییەوە پەلاماری گۆشتەكە دەدەن، كابرا ئەمەی بۆ خوا كردو بەرەبەیانەو هیچ كەس ئاگای لێ نییە، بەڵێ كاتێك كابرا دەچێتە مزگەوت ونوێژی بەیانی دەكات ودێتەوە، یەكسەر دەچێتە پشت سەری كوڕەكەی، كە دەستی لێ دەدات وا تایەكەی نەماوەو وەزعی زۆر باشەو داوای خواردن دەكات، كابرا لە خۆشیان هاوار دەكات وبەژنەكەی دەڵێت: هەستە ئافرەت لە خوا بە زیاد بێت كوڕەكەمان باری تەندروستی زۆر باشە، ژنەكەش دەڵێت: پیاوەكە گوێ بگرە، خوا بە خێری بگێڕێت بزانە چۆن خەونێكم بینیوە، ئێستا

پێش ئەوەی تۆ خەبەرم بکەیتەوە لە خەوما باڵندەیەك لە ئاسمانەوە دەهات ونزیك دەکەوتەوە لە کورەکەمان و دەیویست دەنووك لەسەری کورەکەمان بدات و هەڵی بگرێت و بیبات بۆ ئاسمان، بەڵام هەرئەوەندەم زانی، ( سێ ) پشیلەی لێ پەیدا بوون و بە هەرسێکیان دیفاعیان لە کورەکەمان دەکردو هەر کە باڵندەکە نزیك دەکەوتەوە بەهەرسێکیان خۆیان بۆ بەرز دەکردەوەو پەلاماریان ئەداو دووریان دەخستەوە، تا سەرەنجام باڵندەکەیان دوور خستەوەو بەرز بویەوەو رۆیشت.

کابرا زەردە خەنەیەکی کردو ووتی: ئافرەت ئەم خەوە هیچ لێکدانەوەی ناوێت و رێك ورەوانەو ئەمجا بەسەرهاتی سێ پشیلەکەی بۆ دەگێرێتەوەو منداڵەکەیان هەستاو داوای خواردنی کرد، دوای ئەوەی کە ماوەیەکی یەکجار زۆر بوو خواردنی نەخواردبوو، وە سوپاس بۆ خوا بە تەواوی چاك بویەوە بە سەبەبی بەزەیی هاتنەوە بەو سێ پشیلە برسییەدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( إرْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ ) صَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع(٩٠٩).

ئێوە بەزەیتان بەوانەدا بێتەوە کە لەسەر زەوی دەژین، تا ئەوەی کە لە ئاسمانە کە ( الله ) یە( سُبحانَهُ وَتَعالى ) بەزەیی پێتاندا بێتەوە.

بەرێزان: یەکێکی تر لەو خزمەتانەی کە ئاژەڵ وباڵندەکان بە مرۆڤی دەکەن ئەوەیە: هەرچی فرۆکەو کەشتی وئامێری کشتوکاڵی و ئامێری رێگاوبان و ئوتومبێلی جەنگی هەیە، هەمووی لەسەر شێوەو

شێوازی باڵندەو ماسی و کوللەو کیسەڵ و .... هتد دروست کراون، بۆ نموونە: فڕۆکە ئەگەرچی دوو باڵی هەبێ، بەڵام کلکی نەبێت ناتوانێت بەرز بێتەوەو بفڕێت هەروەکو باڵندەکان.

بابەتێکی تری پەیوەندیدار بە گیانداران و زیندەوەرانەوە ئەوەیە کە خاوەنی کۆمەڵێك سەیرو سەمەرەی تایبەت بەخۆیانن .

بۆ نموونە:

١. نەمرۆڤ و نە گیانەوەران و نە باڵندەکان ناتوانن هەردوو شەویلە یان هەردوو دەنووکەکانیان بۆ سەرەوەو خوارەوە بجووڵێنن، بەڵام خوای گەورە بۆ ئەوەی نیشانمان بدات کە هەموو دروستکردنێکی وەکو یەك بەلاوە ئاسانە، ( بابەهان ) ی وا درووست کردووە کە لە توانایدا هەیە دەنووکەکانی بۆ سەرەوەش وخوارەوەش بجووڵێنێت: ئەمە لە کاتێکدا کە هیچ باڵندەیەکی تر ناتوانێت ئەوە بکات.

٢. لەناو گیاندارانەدا بەردەوام چینێك لە لایەن چینێکی ترەوە پەلاماری بەچکەکانی ئەدرێت، بەڵام پەلامار دراوەکە ناتوانێت پەلاماری بەچکەکانی پەلامار دەرەکە بدات، بۆ نموونە: ( مار و چۆلەکە ) بەڵام ئەم یاسایەش خوای گەورە هەڵی وەشاندووەتەوە لە نێوان ( سەقاکوڕ و پشیلە ) دا، سەقاکوڕ حەزی لە گۆشتی بەچکە پشیلەیەو بە تام وچێژەوە دەیخوات، ! لە بەرامبەریشدا پشیلە بە هەمان شێوە حەزی لە گۆشتی بەچکەی سەقاکوڕەو تام وچێژ لە گۆشتەکەی وەردەگرێت.

٣. لــە هەناســەداندا زینــدەوەران دەمیــان بــەکار دەهێــنن بــۆ هەناسەدان، کاتێك دەمیان بگیرێت بە باشی هەناسەیان بۆ نادرێت، بەڵام لە بۆق دا بە پێچەوانەوەیە، چونکە بۆق کاتێك دەمی کراوە بێت ناتوانێت بە باشی هەناسە بدات، بۆیە ئەگەر بە هێزو کتوپڕ دەمی بکەیتــــــــەوە هەناســــــــەی دەبڕێــــــــت ودەمرێــــــــت. !

٤. لە مەلە کردنـدا: هـەموو ئـەو گیاندارانـەی کـە لەسـەر ڕووی ئـاو توانـای مەلـە کردنیـان هەیـە، هـیچ زەرەرێکیـان بـۆ مـرۆڤ نییـە لـەناو ئـاودا، تەنانـەت مـار لـەناو ئـاودا پێـوە نـادات، بەڵام ( بـەراز ) ئەگـەر بیتوانیایـە مەلـە بکـات ئـەوا ئـازاری مرۆڤـی ئـەدا بـە هـۆی شـفرە تیژەکەیـەوە، بۆیـە خـوای کاربـەجێ بـەرازی وا درووسـت کـردووە کـە هـەرگیز ناتوانێـت مەلـە بکـات، هۆکـاری ئەوەشـی کـە ناتوانێـت مەلـە بکات، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە بەراز هەردوو دەستی دەکەوێتـە نزیـك ژێر سکیەوە ، ئەگەر کەوتـە نـاو ئـاوی قوڵیشەوە، ئـەوا بـە بڕینـی زۆر خۆی دەکوژێت.

٥. ئاسـك، بـەهۆی بـە تـامی گۆشـتەکەی وجـوانی دیمەنەکـەی و میسکی نـاو سـکییەوە، بەردەوام لەبەردەم هەڕەشـەی ڕاوکـردن دایـە، هەم لە لایەن دڕندەکانی دارستانەوە، وە هەم لە لایـەن مرۆڤـەوە، بۆیـە بەردەوام لە ڕاکردندایە، جا خـوای گـەورە ئاسـکی وا دروسـت کـردووە کە بێجگە لە هەردوو کونە لوتی جێگەی تریشی هەیە بۆ هەناسەدان. خوای گەورەو میهرەبان ئەم تایبەتمەندییەی پێ بەخشیوە تا لە کاتی ڕاونانیدا تەنگە نەفەس نەبێت وپەکی نەکەوێت.

٦. لە خواردنـدا: هـەموو گیانلەبـەران خـواردن دەجـوون، پاشـان قوتی دەدەن، بەڵام ماسی لەم یاسایە بەدەرە، چونکە ماسی بەبێ جوین خواردنەکەی دەخوات، لەبەر ئەوەی بە بەردەوامی دەمی دەکاتەوەو دایدەخات. وە ئەگەر ئەو خواردنەی کە دەیخوات لە دەمیدا بیهێڵێتەوە دەخنکێت.

٧. لە بینیندا: چاو بە ئەملاوئەولادا دەسوڕێ و شت دەبینێت، لە هەندێ باڵندەدا ئەم یاسایە کە هەردوو چاو بە یەك ئاڕاستەداو بەیەك لادا دەسوڕێن و دەبینن، پێچەوانە دەبێتەوە، چونکە هەرچاوێکی بە لایەکدا دەسوڕێت بۆ ئەوەی دواوەو بەردەمی خۆشی ببینێت. بەڵام چاوی باز هەرگیز ناجوڵێتەوە، چونکە بە ماسولکەیەکی بەهێز لە کاسەی خۆی دا جێگیرە. بەڵام خوای گەورە ئەمەی بۆ قەرەبوو کردووەتەوە کە دەتوانێت بەبێ جوڵاندنی لەشی، بەسەری بازنەیەکی(٣٦٠) پلەیی دروست بکات.لە کاتێکدا هەر گیانداریکی ترملی ئاوا با بدرێت ملی ئەشکێت.!

٨. ئەو زیندەوەرانەی کە بچووکن وبێ دەسەڵاتن و خۆیان پێ ناپارێزرێت لە دوژمن، خوای گەورە ئەوەی فێرکردوون کە دوژمنەکەیان لە چی دەترسێت... بۆ نموونە: بۆق کاتێك پشیلە لێی نزیك دەبێتەوە کە پەلاماری بدات وبیخوات، لەوکاتەدا بۆقەکە شلەیەك فڕێ ئەدات کە بۆنێکی هەیە، پشیلە زۆر ڕقی لەو بۆنەیەو یەکسەر لێی دوور دەکەوێتەوە.

باڵندەیەك هەیە ( لەق لەق ) ی پێ دەڵێن، لە هەندێك شوێن دوژمنێکی هەیە، کە جۆرە باڵندەیەکە دێت هێلکەکانی دەشکێنێت، ئەم لەقلەقە گەڕاوە تا جۆرە ڕووەکێکی دۆزیوەتەوە کە ئەو باڵندەیە پێی پەست دەبێت، دەچێت ئەو ڕووەکە لە دەوروبەری هێلانەکەی دادەنێت، ئیتر ئەو باڵندەیە لە ترسی بۆنی ئەو ڕووەکە ناتوانێت نزیك هێلانەکەی بکەوێتەوە.!

ئایا ئەگەر ئەمە خوای گەورە هیدایەت وڕێنمایی نەکردبێت، بەچی فێر بووە.؟

وە نموونەیەکی سەردەمیانە کە لە کوردستانی خۆماندا لم ساڵانەی ڕابرووردا ڕووی داوە، باس دەکەین کە لە کتێبی ( ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم ) دا بەم شێوەیە بۆمان دەگێڕێتەوە:

ئەو کەسەی شایەتحاڵی ئەم ڕووداوەیە دەڵێت: لە نێوان دوو شاردا سەفەرمان ئەکرد، لەناو پاصێکی نەفەر هەڵگردا بووم، لەیەکێك لە چێشتخانەکانی سەر ڕێگا، شۆفێرەکە لای داو ئێمەش دابەزین و هەبوو نانی ئەخواردو هەبوو تەنها چایەك یان ئاوێکی دەخواردەوەو کەسانێکیش کاری سەر ئاویان هەبوو. پاشان هەمووەمان تەواو بووین وخەریك بوو بڕۆین سەرکەوینەوە، بەڵام ڕووداو دیمەنێکی سەرنجڕاکێش هەموومانی ڕاگرت، ئەویش ئەمە بوو: چۆلەکەیەکی زۆر جوان لەسەر گڵۆپی سەر پەنجەرەی چێشتخانەکە بوو، لە جیکە جیکی وباڵە تەپێ ی سەرمان سوڕما، بێچووەکانی دەستیان کرد بە ملە قوتێ و لە هێلانەکەیاندا خۆیان

چکۆله کردەوە، چۆلەکەکە هەڵفڕ هەڵفڕی دەست پێ کردو لە ئێمە نزیك بویەوە، پاشان لە ئێمە دوورکەوتەوەو بەرەو سوچێکی دیوارەکە ڕۆیشت... کە سەرنجماندا بە دووری چەند مەترێك وا ( مار ) ێك سەری دەرهێناوەو بە نیازە بەرەو هێلانەی چۆلەکەکە بکشێت، چۆلەکەکە زۆر هەوڵی دا یارمەتی بدەین، بەڵام ئێمە حەزمان بە سەیرکردنی ئەو جەنگە دەکرد، بزانین کامیان سەردەکەون، پاش چەند خولەکێك کە ئێمە هیچ یارمەتی چۆلەکەکەمان نەدا، مارەکەش تەنها مەترێکی مابوو بۆ هێلانەکەو خواردنی بەچکە چۆلەکەکان، چۆلەکەکە فڕی ولە ئێمە نا ئومێد بوو دوور کەوتەوە. لە خەیاڵی خۆماندا ووتمان: ڕەنگە چۆلەکەیەکی تر لەگەڵ خۆی بهێنێت بۆ هاوکاری، بەڵام وا نەبوو، پاش چەند چرکەیەك زۆر بە خێرایی گەڕایەوە، مارەکە تەنها دوو بستی مابوو بگاتە بەچکە چۆلەکەکان، دەمی کردبویەوە بۆ بێچووەکان و زۆر بە تامەزرۆییەوە تەماشای دەکردن، خاوەن چێشتخانەکە ووتی: ئەوە بۆ کەس ئەو مارە ناکوژێت؟ پەلاماری دارێکی درێژی داو هات مارەکە بکوژێت، بەڵام ئێمە ووتمان جارێ بوەستەو با بزانین سەرەنجامیان چی لێ دێت؟ بەڵێ مارەکە بێ ئاگا بوو لە هەوڵی چۆلەکەکە، چۆلەکەکەش بە دەنووکە بچکۆلەکەی دڕکە زەردەیەکی گەورەی پێ بوو، لەگەڵ دەمکردنەوەی مارەکە بۆ قەپاڵ گرتن لە بێچووەکان و قوت دانیان، چۆلەکەکە زۆر بە خێرایی دڕکە زەردەکەی خستە ناو دەمی مارەکەوەو مارەکەش دەمی داخست وهەستی بە ئازاری دڕکە

زەردەکە کردو زۆر بە خێرایی کەوتە خوارەوە.! ئێمەش کە مارەکە کەوتە نزیکمان بەربوینە لاشەی مارەکەو بێ گیانمان کرد.

چۆلەکەکەش لە ناڕەحەتییەکی گەورە بە قودرەتی پەروەردگار و هێزی مێشك وبیری ، خۆیی و بێچووەکانی لە دوژمنی گەورە ڕزگار کردو زۆر بە ئاسوودەیی چووە سەر هێلانەکەی و بێچووە خۆشەویستەکانی بە سەرکەوتنی دایکیان شادومان بوون و لە ژێر باڵی دایکیانەوە تەماشایان دەکردین.

بەڵێ ئازیزان: ئەمە جەنگێکی دەستەو یەخە بوو لە نێوان زاڵم وبێتاواندا، ئەمە ململانێیەکە بۆ مانەوە ( الصِراعُ مِنْ اجْلِ البِقاء ) .

چۆلەکەکە لە ئێمە نا ئومێد بوو، بەڵام بە پشت بەستنی عەقڵی و توانایەکی زۆر کەم، توانی سەر بکەوێت بەسەر دوژمنێکی سەرسەختدا، کە چەندین بەچکەی تری خواردبوو وە چەندین هێلانەو لانەی شێواند بوو، بەڵام ئیتر زوڵم گەیشتە ئەستووری و ئەمجارە بۆی نەچووە سەرو بە مەرگی خۆی گەیشت و ئێمەش کردمانە پەندێکی زۆر باش بۆ ژیانی خۆمان، کە فێر ببین بە هیوای کەس نەبین بۆ هاوکاریمان و ڕزگارکردنمان لە دوژمن، تەنها ڕەنج وماندوو بوونی خۆمان نەبێت.

شاعیرێك دەفەرموێت:

لە دنیادا پشت بە هیچ کەس مەبەستە...
ئەوەی مایەی ژیانە هێزی دەستە...
کە دەستت بوو هەموو کەس دۆست وکەستە...

## قسەو باسیان وەکو ماستاوی خەستە...

٩. گیانداران لە زوڵم وستەمی مرۆڤ بێزارن و هەوڵی خۆ کوشتن ئەدەن:

بۆ نموونە: مارێکیان لەناو کیسەیەکدا زیندانی کردبوو، دوای کۆششێکی زۆر نەیتوانی بوو خۆی ڕزگار بکات، دابووی بە خۆیەوەو لە پاش کەمێك گیان لەدەست ئەداو خۆی لە دیلی ڕزگار ئەکات.

هەروەها لە ( ئوستورالیا ) چەند ساڵێك لەمەو پێش شتێکی سەیر ڕوویدا، ئەویش ئەوە بوو سەدەها هەزار ماسی لەناو ئاوەوە خۆیان هەڵئەدا بۆ ووشکانی بۆ ئەوەی بمرن، کە خەڵکیش هەڵیان ئەگرتنەوەو ئەیانخستنەوە ناو ئاوەکە دووبارە خۆیان هەڵئەدایەوە بۆ سەر ووشکانی!، ئەو کەسانەی لەو ناوەدا چاودێری ئەو ماسییانەیان ئەکرد، بۆیان دەرکەوتبوو کە بە درێژایی ( ٢٠٠ ) کیلۆ مەتر هەرچی ماسی هەبوون خەریکی خۆ کوشتن بوون و لە ژیانی ناو ئاو بێزار بوون، جگە لە خۆ فڕێدان بۆ ووشکانی، سەری خۆیان لە ئاوەکەدا دەر ئەهێنا بۆ ئەوەی بمرن، ( وەکو مرۆڤ لە ژیانی سەر زەوی بێزار دەبێت، ئەگەر ئیمان وبڕوای پتەوی بە خواو پاداشت وسزای قیامەت نەبێت، خۆی ئەخاتە ناو ئاوەوە بۆ ئەوەی بمرێت، یان هەوا لە خۆی دەبڕێ وخۆی دەخنکێنێت ) .

زانایان لە بەرامبەر ئەم بێزار بوونی ماسییانەدا لە ژیان، بۆچوونی جیاوازیان هەبوو، هەندێکیان وتیان: بە هۆی تیشك

دانەوەی ئەتۆمەوە لەناو ئاودا لە ژین بێزار بوون. هەندێکی تریان ووتیان: بە هۆی کەمی ئۆکسجینەوە بووە... هەرچۆنێك بێت دوای چوار ڕۆژ ماسییەکان وازیان لە خۆ کوشتن هێنا.

بەڵێ ماسی ناو دەریاکان لە مرۆڤە بێدینەکان بێزارن کە چەکە کوشندەکان وگازە ژەهراوییەکان بەکار ئەهێنن و مرۆڤی لەسەر زەوی پێ قڕ دەکەن و ماسییە جوان وبێتاوانەکانی ناو ئاوەکانیشی پێ بێزار دەکەن.

هەر ماسی ناو ڕووبارو دەریاکانیشە کە دوعای خێر بۆ زانایان و چاکان وخواناسان دەکەن، کە ڕێگەی چاکەو چاکەکاری نیشانی خەڵکی ئەدەن و خەڵکی فێری ئەوە دەکەن کە نەك هەر زوڵم لە یەکتری نەکەن، بەڵکو ژینگەش پیس نەکەن، میزو پیسایش نەکەنە ناو ئاوەوە، وە ئاوەکان پیس نەکەن، ماسییەکان ئازار نەدەن، ئەم ماسییانە دوعای خێر بۆ ئەو زانایانەو چاکە خوازانە دەکەن، هەروەکو لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری پێشەوامانندا ﷺ هاتووە: ( إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ وَأَهلَ السَّماواتِ وَالأرضِ حَتَّى النَّملَةَ فِي جُحرِها وَحتَّى الحُوتُ لَيُصلّونَ عَلى مُعَلِّمي النَّــاسِ الخَيــر ) رَواهُ الترمذي وقالَ: حَديثٌ حَسَنٌ(رياضُ الصّالحين – كتاب العِلم–)

ئیمانداران: بۆ زانیاریتان لە جیهاندا چەند جارێك ئاژەڵ وزیندەوەران دادگایی کراون: بۆ نموونە:

١. لە ساڵی ( ١٥٨٥ ) ی زاینی دا لە ( ڤالانسی ) هەرێمی درۆمی فەڕەنسادا، دادگا دانیشتنێکی تایبەتی ساز کرد بە مەبەستی

دادگـایی کردنـی کرمێـك کـە نەخۆشـی خـستبووە نـاو کێڵگـەی جووتیارێکەوە، لە کۆتایدا دادوەر بڕیاربدا سزای کوشتنی بەسەردا نەسەپێنرێت بەڵام دەبێت لەو هەرێمە دوور بخرێتەوە.!

٢. لە ساڵی ( ١٢٦٦ ) ی زاینی دا بەرازێك بە تۆمەتی کوشتنی منداڵێك ڕەوانـەی دادگـای هـەرێمی ( فـونتی ) فەڕەنسا کـرا، دوای دادگایی کردن دادوەر سزای لە سێدارەدانی بە سووتاندن سەپاند بەسـەر بەرازەکەدا،ئەوە بـوو لـە ناوەڕاسـتی شـاردا ئـاگرێکی گـەورە کرایـەوەو بـە ئاشـکراو بەبەرچـاوی هـەموو خەڵکـەوە بەرازەکـەیان سووتاند.!

٣. هەروەها لە ساڵی ( ١٣٨٦ز ) دا دادگای ( لافالیزی ) فەڕەنسا حوکمی مل پەڕاندنی بەسەر بەرازێکدا سەپاند لە بەرامبەر تاوانەکەی دا کە بریتی بوو لە بڕینی سەروقاچی منداڵێك، لە گۆڕەپانی شاردا ئەو سزایە بەسەر ئەو بەرازەدا جێبەجێ کرا.

لـە کـوردەواری خۆشمانـدا کـە پـشیلەیەك چـووەتەماڵێکـەوەو جووچکەی مریشکی زۆر خواردووەو نەیهێشتووە زیاد بکەن، خاوەن مـاڵ سـزای داوە، بـەڵام بـێ دادگـایی هێناویـەتی نـەوتی کـردووە بەسەرداو سوتاندویەتی. تەنانەت دەڵێن: جارێکیان پشیلەیەکی ئاگر تێبەردراو کە بە ئاگرەوە ڕادەکات خۆی دەکات بە کادێنی ماڵەکەداو بە تەواوی کادێن وشوێنی ئاژەڵەکانیان دەسوتێنێت.

ئـەم ڕووداوە لـەناو هـەموو میللـەتی کـوردی زیـاتر لـە ( ٤٠ ) ملیۆنیـدا لـە کوردسـتانی گـەورەدا ڕەنگـە لـە دوو سـێ جـار

تێنەپەڕیبێت، ئەویش لە لایەن خەڵکانێکی بێئاگا لە دین و دوور لە مزگەوت و پەیامی خوا، ئەگینا سوپاس بۆ خوا لە سایەی نووری ئیسلام ومزگەوت وحوجرەو مامۆستای دڵسۆزی ناو مینبەرو میحرابەوە، ئەم میللەتی کوردە وەکو گەلانی تری موسوڵمان لە ڕەحمەتی ئیسلام وپێغەمبەرە پڕ ڕەحمەتەکەیەوە، فێر بووە چۆن بەزەیی بێتەوە بە هەموو گیاندارێکدا، تەنانەت سەگ وپشیلە کە زۆرجار ئازاری داون یان ماڵی پیس کردوون، لە وەختی گرانی و نەبوونی دا خواردنی خراپ کردوون، کەچی هەر نەیکوشتوون و ئازاری نەداون، وە بە ئاگر ئازاری ئاژەڵی نەداوە. چونکە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان فەرموویەتی ﷺ : ( لا يَنبَغي أن يُعَذِّبَ بالنَّار إلاَّ رَبُّ النَّار ).

وە بەزەیی بە ئاژەڵدا هاتووەتەوە لە کاتی سەربڕیندا، چونکە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ رَحِمَ وَلَوْ ذَبِيحَةَ عُصْفُورٍ رَحِمَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ) رَواهُ البُخاري في الأدَب المُفرَد. وَالطَبَراني في الكَبير وَصَحَحَّهُ الألباني في صَحيح الجامع(٦١٣٧).

واتە: هەر کەسێك بەزەیی بە چۆلەکەیەکدا بێتەوە لە کاتی سەربڕیندا، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بەزەیی پیایدا دێتەوە، جا لێرەدا ناوی چۆلەکەی بە تایبەتی هێناوە، چونکە بچووکترین شتە کە گۆشتی بخورێ و سەر ببڕێت.

بەڵام ئەو کەسانەی کە ئاشنا نین بە پەیامی خوا، ئەو کەسانەی کە ئیسلامەتی و شەریعەتی ئیسلامیان پێ کۆنە پەرستی بوو،

ئەوانەی کە ئیشتراکییەتی ولادینی دروشمیان بوو، کە بەعسییەکان بوون، کە دام ودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی حکومەتی لەناو چووی عێراق بوون، بەبەرچاوی خۆمانەوە بینیمانن کە چۆن بە چەکی کۆمەڵکوژو قەدەغە کراوی نێودەوڵەتی، بە چەکی کیمیایی لە میللەتی کوردیاندا، وە لەو ناوەدا بە هەزاران گیانداری بێ تاوان، بە ملیۆنەها شارە مێروولە و هێلانەی کۆترو چۆلەکەو باڵندەو ئاژەڵە کێویەکان ، بەو گازە ژەهراوییە زۆر بە زەلیلی سووتان ومردن و تەنانەت تا نزیکەی ( ١٨ ) ساڵە لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستان هەندێك لەو گیانلەبەرانە هێشتا بە کەمی دەردەکەونەوەو بە خەستی بنەبڕ بوون، کە لە کافرو دژ بە ئیسلام هەر ئەوە چاوەڕێ ئەکرێت.

١٠. یەکێکی تر لەو شتانەی کە جێگەی سەرنجن لە ئاژەڵدا ئەوەیە: کە خوای گەورە وەکو ژێرباری کردووە بۆ مرۆڤ، کە ئەگەر خوای گەورە مل کەچی نەکات هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت نەك سوودی لێ وەر بگرێت، بەڵکو هەر نزیکیش ببێتەوە لە مانگایەك، نابینیت جاربەجارێك مانگایەك شێت دەبێت چۆن بە هیچ کەسێك ناگیرێت، کەچی ئەم مانگا گەورەیە خوای گەورە ژێرباری کردووەو کچێکی بچکۆلە دەست لە گووانی ئەدات و ئەیدۆشێت، ئەسپ وماین وهێستر منداڵێك ڕای دەکێشێ و چۆنی بوێت ئاوا دەڕوات، جا لەگەڵ ئەم ژێربار کردنەدا، خوای گەورە سۆزو بەزەیشی خستووەتە دڵی ئەو ئاژەڵانەوە کە لە کاتی بێ دەسەڵاتی مرۆڤدا بە هانایەوە بێت.

بە یادی هەمیشە لە یادمان، مامۆستای گەورە: مامۆستا ( مەلا عبدالکریم ی مودەڕیس ) بەهەشت جێگای بێت، ئەم ڕووداوە دەگێڕینەوە کە مامۆستای بەڕێز لە تەفسیرە بەناو بانگ وبە نرخەکیدا، ( تەفسیری نامی ) بەرگی دووەم، لە تەفسیری سوڕەتی ( آل عمران ) ئایەتی ( ۳۷ ) دا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: لەم گوێ چەمی ( باوەجانی )یە، لافاوێکی گەورە هەڵدەستێ و چەند ماڵو بەرە وێران دەکات، بێشکەیەك بە منداڵەوە بەر لافاوی ئاوەکە دەکەوێت، لافاو بێشکەکە دائەماڵێ و ئەیبات و بۆ ماوەیەکی زۆر دووری ئەخاتەوە، دوایی بێشکەکە بە لقی بیەکەوە دەوەستێتەوە، بزنێکی کۆڵ فێر دەبێت هەموو ڕۆژێك دەچێتە لای بێشکەکەو خۆی شۆڕ دەکاتەوە بە سەریداو مناڵەکەش دەم دەنێت بە گوانیەوەو تێر دەیمژێت هەتا تێر دەخوات.! ماڵی خاوەن بزن لە کابرای شوان دەکەونە گومانەوەو دەڵێن: تۆ بزنەکەی ئێمە دەدۆشیت، بۆیە هەموو ڕۆژێك گوانی خاڵییە، شوانەش ئاگای لە هیچ شتێك نیەو ناچێتە ژێربارو سوێندیان بۆ دەخوات کە ئاگای لە هیچ نییە، تا ڕۆژێکیان کابرای خاوەن ماڵ دەکەوێتە بناوانی باسەکەو دوور و نزیك شوێن بزنەکەی دەکەوێت تا دەگاتە گوێ چەمەکە، دەبینێت بزنە کۆڵەکەیان لە ڕانەکە دائەبڕێ و دەڕوات بۆ گوێ چەمەکە، ووردە ووردە شوێنی دەکەوێ و تا بزنە کۆڵە دەچێتە سەر بێشکەکەو وەکو عادەتی ڕۆژانەی خۆی منداڵەکە تێر شیر دەکات.! کابرا کە ئەم ڕووداوە عەجیبە دەبینێت شوکری خوا دەکات و شایەتومانی بە حەق

دەڵێتەوەو بێشکەکە بە کۆڵیا ئەدات وئەیهێنێتەوە بۆ ئاوەدانی و ئەیداتەوە بە باوك ودایكی.

ئەم منالە گەورە دەبیٚ و دەبێتە گەنج وژن دێنیٚ و دەبێتە خاوەن منالٚ و دواتر نەوەی ئەم منالە گۆشتی بزنی کۆڵ ناخۆن وەکو یادکردنەوەی ئەو ڕووداوە.

وە هەر لەسەر ئەم ڕووداوەیە کە مامۆستای مودەڕیس لە شیعرێکی جوان دا فەرموویەتی:

ناوی قۆجاڵی بوو ئەو ڕۆڵەی کەوا
شیری پاکی بزنی کۆل بۆی بوو بەقووت...
شان وقۆڵت تا هەیە هەولیٚ بدە
تاقە حاتەم تۆش لەگەڵ ئەو بە بەجووت...
بیٚ حسێبە ڕزقی ئەو بۆ گیانلەبەر
بەحرو بەڕو ئاسمانە کانی قووت...
بەس ئەتۆش تا هێزی هەستانت هەیە
هەستە خۆت مەمرێنە وەك ڕێوی سکووت...
حەولی تۆ فەڕزە ئەگەرنا هەر خودا
ڕازیقە بۆ پادشاو بۆ پیاوی پووت...

بەڵیٚ ئیماندارانی بەڕێز: ئەگەر ئەمە ڕووداوی پێش سەد ساڵ لەمەوبەر بێت، ئەوا لەم سەردەمەدا لەم یەك ودوو ساڵەی ڕابردوودا

ڕووداوێكی تری هەمان شێوە ڕووی دایەوە، كە گۆڤاری ( خاك ) كە ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك دەری دەكات، لە ژمارە ( ٨٦ ) دا بڵاوی كردەوە دەڵێت: لە ڕووسیا لە نزیك شاخەكانی( سیبریا) لەسەر زەوییەك و دارستانێك خێزانێك دەژین، كە پێك دێن لە: ژن وپیاوێك ومناڵەكەیان، بە هۆی ئەوەی كە پیاوەكە ئالوودە دەبێت بە ( تریاك ) خۆری، بەردەوام لەگەڵ خێزانەكەی ئاژاوەیان دەبێت، سەرەنجام بڕیاری لە یەكتر جیابونەوە دەدەن و ژنەكە دەڕوات ومناڵەكە بۆ پیاوەكەی بەجێ دەهێڵێت، پیاوەكەش واتە باوكی مناڵەكە، خۆی لە خۆی بێزارە چ جای مناڵێكی شیرەخۆرەی دوو مانگانە بەبێ دایك بەخێو بكات، هەر بۆیە لە ژوورەكەدا بەجێی دێڵێ و دەرگاش پێوە نادات و ئەویش بەرەو شارێك سەری خۆی هەڵدەگرێت، دوای ( ٧ ) ساڵ لەم ڕووداوە، كۆمەڵە كەسێك بە مەبەستی ڕاوشكارو گەڕان ڕوو دەكەنە ئەو شوێنە چۆڵ و سەرماو بەفراوییە، بەڵام تووشی شتێكی زۆر سەرنج ڕاكێش دەبن، ئەویش ئەوەیە كە: سەگێكی پیر وا كۆمەڵێك بەچكەی لەگەڵەو ئەوەی سەیرە، مناڵێكی ( ٧ )ساڵانەشیان لەگەڵەو مناڵێكی كوڕەو وەكو بەچكە سەگەكان لەسەر دەست دەڕوات و دەوەڕێ و شیری سەگەكە دەمژێت! ئەویش وەكو سەگەكان لە مرۆڤەكان هەڵدێت.!

بەڵێ پۆلیس ئاگادار دەكرێ وسەرەنجام دوای لێكۆڵینەوە كە كێ لێرە ژیاوەو ئەم مناڵە چۆن كەوتووەتە لای ئەم سەگە؟ باوكی مناڵەكە دەدۆزنەوەو بەسەر هاتەكەیان بۆ دەگێڕێتەوە، پاشان بە هەوڵێكی

زۆر ئـەم مناڵـە لـە سـەگەکان جیـا دەکەنـەوەو دەیخەنـە ژێـر بـواری ڕاهێنان و پەروەردەکردنەوە کە هەست بەوە بکات کە مرۆڤە و سەگ نییە، بەڵام سەیر دەکەن کە نانی بۆ دادەنێن، هەتا بۆنی پێوە نەکات نایخوات! وە زۆر هەوڵی لەگەڵ ئەدەن کە بە پێوە بوەستێ و لەسەر دەست نـەڕوات، کەچـی فێـر نابێـت، بـەڵام هەوڵـەکان لەگـەڵی هـەر بەردەوامن..

١١. ئـەم زینـدەوەرو باڵنـدەو ئـاژەڵ ومێروانـە ، سـەربازێکن لـە سەربازە بێ شوومارەکانی خوای پـەروەردگار، ﴿وَما يَعلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إلاَّ هُوَ﴾ وە بەم سەربازە بچووکانەی خۆی ژیان لە ستەمکاران و زۆرداران تاڵ دەکات، هەروەکو ئەوان ژیان و ژینی خەڵکیان تاڵ کردووە.

ئەوەتا خوای گەورە باسی ( طَيراً أبابيل ) مان بۆ دەکات، کە چۆن ( ئەبرەهە ) وسوپاکەی بە هیلاك بردن، وە بە مێشوولەیەك ژیانی لە (نمرود)ێك تـاڵ کـرد، کـە حـەزرەتی ئیبراهیمی خستە نـاو ئـاگرەوەو دەیگـووت:﴿أنا أحيِ وَ أُميـــت﴾ . وە دارو دەستەی فیرعەونی بە بۆق وکوللەو ئەسپێ هەراسـان کـردو ڕۆژیـان لـێ بوو بوو بە شەو، بەڵێ ئـەمانیش بـەردەوام لـە ئامـادە باشـییان بـۆ جێبـەجێ کردنـی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار.

لە کۆتایدا دەڵێم:

١. بـابیر لـە دروسـتکراوەکانی خـوای گـەورە بکەینـەوەو زیـاتر لـە بەرامبـەر دەسـەڵاتی بـێ سـنووری پـەروەردگارمان دا کـە ( الله ) یـە،

سەری بەندایەتی بخەینە سەر زەوی و بڵێین: ( سُبحانَ رَبِّــيَ العَظــيم، سُبحانَ رَبِّيَ الأعلى ).

٢. با بیر بکەینەوە، ئایا خوایەکی ئاوا بە دەسەڵات کە ئاوا ژیانی گیانداران وئاژەڵـانی ڕێك خستووە، ئایا بەرنامەکەی کە ئیسلامە ژیانی مرۆڤی پێ ڕێك ناخرێ و دەبێ ئەم دینە لە ژیان و ژینگە دابڕێ و یاسای دەستکردی مرۆۋ بخرێتە شوێنی؟!

٣. وەکو باسمان کرد هەموو درووستکراوەکانی خوا لە خزمەتی مرۆڤدان، دە با ئێمەی مرۆڤیش لە خزمەتی پەروەردگارماندا بین و شوکری بکەین و زیکری بکەین و بیر لە دروستکراوەکانی بکەینەوەو گەورەیی و دەسەڵاتی خوای تێدا ببینین.

٤. ئایا جێگای خۆی نییە دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بە تایبەت تەلەفزیۆنەکان، لە جیاتی فیلمی بیانی کە هەمووی شەڕو کوشتن و خیانەتی هاوسەری و کلیپی گۆرانی، فیلمی ئاژەڵان لێ بدرێ و سوودیان وهەماهەنگییان لەگەڵ مرۆڤدا باس بکرێت، تاوەکو کاتی ئەو خەڵکە هەروا بە بەلاش بە دیار تەلەفزیۆنەوە نەڕوات و لە جیاتی ئەوە بە بیرکردنەوە لە درووستکراوەکانی خوای گەورە بکرێت بە عیبادەت؟.

ئەمەش بەوە دەبێت کە ئەم ژیانەو دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە دەستی خەڵکی خواناس و ئاکار پەسەندو دڵسۆزی گەل ومیللەتەوە بن، چونکە ئەو تەلەفزیۆنە هەردوو لایەنەکەی هەیە: یان ماڵ وێران

دەکات و عومرت بە خۆڕایی و بەهەوانتە دەڕوات، یان دەبێتە هۆی ئەوەی کە تەماشا کردنەکەی بە عیبادەت بنووسرێت .

( شێخ حەسەنی بەصری ) فەرموویەتی: ( تَفَكُّر ساعَةٍ خَيرٌ مِــن قيامِ لَيلَةٍ ) بیرکردنەوەی سەعاتێك لە دەسەڵات وگەورەیی و بەزەیی خوا لە ڕێگەی دروستکراوەکانیەوە، بۆ زیندوو کردنەوەی ئیمان و گەرم وگوڕ بوون لە عیبادەتدا، چاکترەو باشترە لە شەو نوێژی شەوێکی تەواو .

خوای گەورەو میهرەبان داوات لێدەکەین دڵێکی بە ئاگاو چاوێکی بە هەست و زمانێکی پاراو بە زیکرو یادی خۆتمان پێ خەڵات بکەی .. اللهم امیــــــــــن ....

# سەرچاوەکان:.

١. قورئانی پیرۆز.
٢. فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ
٣. هەمە چەشنەی زانیاریەکان علاء نوری بابا علي .
٤. کوڕی شیرینم ئەمەیە بیرو باوەڕەکەت سیف الدين احمد محمد .
٥. ژیان وئیعجاز سەروەر حەسەن علی .
٦. سەیرو سەمەرەکانی جیهان سهير سمور ومصطفى سعيد علي .

٧. کۆباسەکانی میحراب م. شەماڵ عبدالرحمن موفتی .

٨. مِن عَجائِبِ القَدَر محمد عثمان عُثمان .

٩. ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم ئاوات أبوبكر أحمد .

١٠. عِبادات التَفَكر عَمرو خالد .

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وصَحبِهِ أجمَعينَ:

ئیمانداڕانی بەڕێز : جەژنی قوربان لە هەموو ئێوەی بەڕێزو تەواوی موسوڵمانان پیرۆز بێت، هەمیشە دڵشاد بن و هەر دڵگەش وڕووخۆش و دەم بە خەندە بن ( إن شاءالله ) .

بەڕێزان: ئەمڕۆ کە جەژنی قوربانە، پێشی دەوترێت جەژنی حاجییەکان، لەبەر ئەوەی حاجییەکان دوێنێ لەسەر کێوی عەرەفەدا بوون بە حاجی، چونکە ( الحَجُ عَرَفَة ).

حاجیەکان ئەمڕۆ کە خەریکی تەواوکردنی مەناسیکی حەجن، دڵخۆشن بەو هەموو ڕەحمەت ومیهرەبانی و سۆزەی خوای پەروەردگار، کە بەسەریاندا ڕژاوە، کە دوێنێ بە ئاشکرا هەستیان پێ کردووە، چۆن خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت تەماشایان دەکات و لە گوناهەکانیان دەبورێت، کە بەڕاستی بۆ مرۆڤی ئیماندار ئەو کاتە جەژنە کە خوای گەورە لێی ڕازی بێت، ئەو کاتە بۆی جەژنە کە عیبادەتێکی گەورەی ئەنجام دابێت و توێشوویەکی بۆ قیامەتی خۆی زیاد کردبێت، هەر بۆیە ئێمەی موسوڵمان دوو جەژنمان هەیە، جەژنی ڕەمەزان: کە لە دوای بەڕۆژو بوونی مانگێك جەژن دەگێڕین و خۆشحاڵی خۆمان دەردەبڕین، وە لە جەژنی قوربانیشدا، جەژنمانە چونکە حاجییەکانمان بوون بە حاجی و ڕوکنێکی ئیسلامەتییەکەیان تەواو کردووەو ئێمەش لێرە بە قوربانی سەربڕین و ڕۆژووی عەرەفەو

بەرەکاتی ڕۆژەکانی نۆمینەی حاجییان دڵخۆشین و ئەمڕۆ کە ( ١٠ ) ی مانگی ( ذي الحِجه ) یە، جەژنی قوربانە بۆ موسوڵمانان.

بێگومان لەم کاتەدا هەمووومان دڵ ودەرونمان گەرمەو خۆزگە دەخوازین کە ئێستا ئێمەش لە مەککەو مەدینە بوینایە، خۆزگە ئێمەش وەکو حاجییەکان لە تەوافی کەعبەو صەفاو مەروەدا بوینایە، خۆزگە ئێمەش لە کێوی عەرەفات بوەستاینایە، خۆزگە بەرگی سپی ئیحرامەمان بپۆشیایە، لە ئاوە پیرۆزەکەی زەمزەم دەم و دەرونمان تەڕ بکردایە، بە تۆزی ژێر پێی حەزرەتی فەخری عالەم و یاری بیْ قەراری غاری چاومان بڕشتایە، خۆزگە دەست لەسەر سینگ و مل کەچانە شیعاری بەرزی بەرێزی ( لَبَيكَ اللهُمَ لَبَيك ) مان بوتایەتەوە، خۆزگە لە دەوری کەعبەدا کە میعادگەی خەڵکی زەمین و ئاسمان ومرۆڤ و فریشتەکانە، چەند نوێژێکمان ئەنجام بدایەو بە هەر نوێژێکی پاداشتی سەد هەزار نوێژمان بۆ تۆمار بکرایە...

خۆزگە بۆمان برەخسایە کە سەیرێکی شیوە پڕ شیوەن و بیْ شێوەکەی ( ابو طالب ) مان بکردایەو کە گەڕاینەوە سەرێکمان لە گڵکۆی یارو هاوسەرو خەمخۆرە دڵسۆزەکەی سەرورمان، دایە خەدیجەی ئازیزمان، بدایەو ماوەیەك لە خزمەتیدا دابنیشتینایە، وە پاشان کوچە بە کوچەی مەککە بگەڕاینایە تا لەوسەری شارەوە بە خزمەت ماڵە پڕ یادگارییەکەی ( ئەرقەم ) بگەیشتینایە، دواتر بڕۆشتینایە بۆ شاری مەدینەی پێغەمبەرمان و ڕاستەوخۆ بچوینایەتە

مزگەوتە پیرۆزەکەی سەروەرمان و ( تَحیةُ المَسجِد ) ێکمان تێدا ئەنجام بدایەو فەزڵی یەك نوێژ بە هەزار نوێژمان دەستگیر ببوایە.

ئەمجا زۆر بە ئەدەبەوە، بە هێواشی لە نێوان ماڵ ومینبەرەکەیدا، لەو باخچەی بەهەشتەدا ئاراممان بگرتایەو ئەمجا بە هەموو خانەو ڕەگ ودەماری لەشمانەوە، بچوینایەتە خزمەت گۆڕی پڕ نووری فەخری عالەم، خاتەمی ئەنبیاو موڕسەلین، سەرداری هەموو چاکان وپاکان، نوری چاومان، شەفیعی مەحشەرمان، حەزرەتی ( محمد المصطفی ) ﷺ بە هێواشی و بە ئەدەبەوە سەلاممان لێبکردایە، ( السَلامُ عَلَیكَ یا رَسولَ الله ). کە بە دڵنیاییەوە وەڵامی ئەداینەوە بە ئیزنی خوا.

ئای چ بەختەوەرییەکە بچیتە خزمەت ئەو پێغەمبەرەی کە خۆشەویست ترین کەسمانە، کە بەردەوام صڵاوات لە دیداری لێ ئەدەین، ئەو پێغەمبەرەی کە هەموو سات وکاتێك لە دڵ ودەرونماندایەو هەرگیز لە ناومان دەرناچێت، هەرچەند بە لاشە لەناوماندا نییە، هەموو ساتێك لەناو دڵ وڕوحماندایەو لەگەڵ ناو هێنانی، تەواوی جەستەمان موچوڕکەی خۆشی دایدەگرێت...

پاشان سەلام لە ( أبو بکری صدیق ) هاوەڵی دڵسۆزی حەزرەتی ( رَسولَ الله ) ﷺ بکەین، ئەمجا سەلام لە فاروقی ئیسلام، حەزرەتی ( عومەری کوڕی خطاب ) بکەین، بە ئومێدی ئەوەی لە بەهەشتی بەریندا بە خزمەتیان شاد ببین.

سا خوایە لەم ڕۆژی پیرۆزی قوربانەدا لەگەڵ ئەو خۆزگە پیرۆزانەدا، تکایەکی بچکۆلانەمان هەیەو داوایەکی عابیدانە دەکەین، تکا دەکەین ولێت دەپاڕێینەوە کە مەمان مرێنەو کۆتایی بە ژیانی فانی دنیامان مەهێنە، تا شەرەفی زیارەتی بەیت و ڕەوزەمان پێ خەڵات دەکەیت و تاجی ( حاجی ) دەکەینە سەرمان . آمیــــن .

ئیمانداران: پیرۆزترین کار کە لەم ڕۆژەدا ئەنجام بدرێت و خوای گەورە زۆری پێ خۆش بێت، بریتییە لە قوربانی کردن، قوربانی کردن لای ئیمامی شافیعی سوننەتە، لای ئیمام ابو حەنیفە و لای ئیمام مالیك واجبە، لەسەر هەر کەسێك کە خانووی نیشتەجێ بوونی هەبێت و کەل وپەلی پێویستی ماڵەوەی هەبێت و قەرزار نەبێ وپێویستی ڕۆژانەی جەژنی خۆی و ماڵ و منالی هەبێت، لای ئیمامی ئەحمەد دروستە پارە قەرز بکات بۆ ئەوەی حەیوانێکی قوربانی پێ بکڕێت، بە مەرجێك شتێکی وای هەبێت کە دواتر بیفرۆشێ و قەرزەکەی پێ بداتەوە، کە ئێستا ئەو شتەی بۆ نافرۆشرێ و کڕیاری نییە، ئەمەش بە دەلیلی ئایەتی ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ وە بە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (من وَجَدَ سعةً فلم يُضحِّ فلا يقربَنَّ مُصلاَّنا ).

واتە: هەرکەسێك توانای قوربانی کردنی هەبێت و نەیکات، ئەوە با لەگەڵمان نەیەت بۆ شوێنی نوێژی قوربانی.

وە قوربانی کردن بۆ هەموو ساڵێکە نەك وەکو زۆرێك لە موسوڵمانان وا حاڵی بوون کە ئەگەر یەك جار لە تەمەنیدا قوربانی

کرد ئیتر تەواو، نەخێر بەڵکو بۆ کەسی دەست ڕۆیشت و واچاکە هەموو ساڵێك حەیوانی قوربانی سەر ببڕێت.

لە وڵاتانی وەکو ئەندەنوسیاو مالیزیا لە نەخشەی خانوودا شوێنی تایبەت هەیە کە دیاری کراوە بۆ سەربڕینی حەیوانی قوربانی، هەموو خانویەك ئەو ژوورە بچکۆلەیەی تێدایە، چونکە هەموو ساڵێك حەیوانی قوربانی سەر دەبڕن.

قوربانی سەر بڕین فێری بەخشینمان دەکات، کە هەروەکو خۆمان لە خۆشیدا دەبین، دڵی خەڵکیش خۆش دەکەین، نەك وەکو جەژنی سەری ساڵی مەسیحی و بۆنەی مولحیدەکان، کە بەسەر خۆشی ماڵی خۆیان وخەڵکی وێران دەکەن و ماڵ وسامان بە فیڕۆ دەدەن و هەموو ساڵێك لە ڕاگەیاندنەکانەوە دەبیستین کە لە فڵان شار لە ئاهەنگی سەری ساڵدا، بەهۆی یارییە ئاگرینەکانەوە سەدان کەس بونە قوربانی و فڵان بینا سووتا.!

وە پێویستە ئەوە بە باشی بزانین کە مەبەستی سەرەکی لە قوربانی کردن، تەنها گۆشت دابەش کردن و گۆشت خواردن نییە، بەڵکو مەبەست لە قوربانی سەربڕین، بە گەورە زانینی درووشمەکانی خوای گەورەیە، ( تَعَظم شعائِر الله ) ، وە سەر بڕینی حەیوانی قوربانی هۆکارێکە لە هۆکارەکانی، لە ڕێگاکانی شوکرانە بژێری خوای گەورەو بەرزو بەڕێز ڕاگرتنی قوربانییەکەی حەزرەتی ( ابراهیم ) ( عَلَیهِ الصَلاةُ وَ السَلام ) هەروەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت:

﴿وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞۖ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ۝٣٦﴾ **الحـــج ٣٦**

**سەرنج بدەن لە باسی قوربانی کردن دا ئەم تەعبیرە قورئانییە سەرنج ڕاکێـــشانە دەبیـــنن:** ﴿مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ﴾ ﴿لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞ﴾ ، ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا﴾ ، ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا﴾ ، ﴿سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ﴾، ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ .

**کە هەموو ئەمانە ئەوەمان تێدەگەیەنن کە ماناو مەبەستی قوربانی سەربڕین جیاوازە لە ئاژەڵ سەربڕینی ئاسایی و کردنی بە خێرو صەدەقە، هەروەکو شیخ الأسلام ( ابنُ تَیمیة ) لە ( مَجموعُ الفَتاوی ) ج٢٦، ص٣٠٤ دا فەرموویەتی :** ( وَالأُضحِيَةُ وَ العَقِيقَـــةُ وَ الهَـــديُ أفضَلُ مِنَ الصَّدَقَةِ بِثَمَنِ ذلِكَ، فَإذا كانَ مَعَهُ مالٌ يُرِيدُ التَقَرُّبَ إِلَـــى اللهِ كانَ لَهُ أن يُضَحي بِهِ وَالأكلُ مِنَ الأضحِيَةِ أفضَلُ مِنَ الصَّدَقَةِ ) **واتـە: قوربـانی کـردن و حەوتـەم بـۆ منـاڵ و سـەربڕینی حـەیوانی ( الهَدي ) لە حەجدا بۆ حاجی گەورەترو خێر ترە لەوەی کە پارەکەی ببەخشێت، جا ئەگەر کەسێك پارەیەکی دانا بوو، وویستی بیکات بە خێرو صەدەقەو پێی لە خوای گەورە نزیك ببێتەوە، ئەوە بۆی هەیە کە بیدات بە حەیوانێکی قوربانی و لە جەژنی قورباندا سەری ببڕێت،**

وە خــواردن لــە گۆشــتی قوربــانی خــۆت گــەورەترەو چــاکترە لــە بەخشینی پارە.

کەواتە: با ئەمە وەڵام بێت بۆ ئەو کەسانەی کە لێمان دەپرسن: ئایا پارەی حەیوانی قوربانی وەکو پارە بدەین بە هەژاران، باشتر نییە کە پێویستییەکانی خۆیانی پیٚ دابین بکەن؟ ئایا ئەگەر لە جیاتی حەیوانی قوربانی، بایی ئەو پارەیە گۆشت لای قەصابێك بکڕین و بیبەخشین یان مریشکی پیٚ بکڕین و بیدەین بە هەژاران، کە ڕێژەیەکی زۆرتر لە خەڵکی لە گۆشت ومریشکەکە سوودمەند دەبن، وە حەیوانەکەش بەشێکی زۆری وەکو وورگ وڕیخۆڵە فڕیٚ ئەدرێت، ئایا گۆشتی حازری لای قەصابەکە یان مریشکەکە خێری زیاتر نییە؟ لە وەڵامی ئەوانە هەموویاندا دەڵێین: نەخێر، بەڵکو ئەوانە هیچی لە جیاتی قوربانی ناکەون و پاداشتیان ناگاتە خێرو پاداشتی قوربانی کردن، چونکە وەکو ووتمان: قوربانی سەربڕین مەبەست لێی ڕاگرتنی دروشمەکانی خوای گەورەیەو تەنها مەبەست سەربڕین وگۆشت دابەش کردن نییە.

بەڵیٚ ئەو کەسەی کە قوربانی دەکات، ئەوەندە بەڕێزە لای خوای گەورە، وەکو ئەو کەسە وایە کە لە ژێر ئیحرامی حەجدایە! بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:( مَنْ كَانَ عِنْدَهُ ذِبْحٌ يُرِيدُ أَنْ يَذْبَحَهُ فَإِذَا أَهَلَّ هِلاَلُ ذِى الْحِجَّةِ فَلاَ يَمَسَّ مِنْ شَعَرِهِ وَلاَ ظُفُرِهِ شَيْئًا حَتَّى يُضَحِّىَ ) رواهُ مُسلِم .

واتە: هەرکەسێك حەیوانی قوربانی ئامادە کردو نیازی قوربانی کردنی هەبوو، ئەوە چاك وایە کە لەیەکەم ڕۆژی مانگی ( ذي الحِجة ) ، وە هەتا ڕۆژی جەژن کە قوربانییەکەی سەر دەبڕێت، هیچ موویەکی لاشەی لا نەبات ونینۆکی نەکات.

زانای گەورە ( ئیمامی نەوەوی ) لە شەرحی صەحیحی ( موسلیم ) دا فەرموویەتی: ( وَالحِكمَةُ في النَّهي أَن يَبقى – أي المُضَحي – كامِلَ الأجزاءِ لِيَعتِقَ مِنَ النَّار ).

واتە: مەبەست لە قەدەغە کردنی لابردنی موو، وە نینۆك کردن، ئەوەیە کە ئەو کەسەی قوربانییەکە دەکات، تەواوی لاشەی لە کاتی قوربانی کردندا ، هەر لە یەکەم ڕۆژی مانگی ( ذي الحِجة ) وە تا وەختی قوربانی سەربڕینەکە، هەموو لاشەی تەواو بێت و تەنانەت موویەك و نینۆکێکی لێ نەبووبێتەوە بۆ ئەوەی لە ئاگر ڕزگاری بێت، واتە ئەو قوربانی کردنە خاوەنەکەی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێت. ( ان شاء الله ) .

وە چۆن ئەو کەسانەی کە لەژێر ئیحرامدان نابێت موو لە لاشەیان بکەنەوە، یان نینۆکیان بکەن، ئەو کەسەش کە قوربانی دەکات، دەچێتە ڕیزی ئەوانەوەو وەکو ئەوان دەکات.

بەڵام پێویستە ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە ئەگەر کەسێك ڕیشی تاشی یان نینۆکی کرد، بەهۆی ئەوەی لە بەشی سەربازی و وەزارەتی ناوخۆ دەوامی دەکردو ناچار بوو هەموو ڕۆژێك ڕیشی بتاشێت، یان نینۆکی زۆر هاتبوو پێشتر نەیکردبوو، ئەمانە ئەگەر موویان لە

لاشـەیان کـردەوە، یـان نینۆکیـان کـرد، هــیچ لـە خێـرو پاداشــتی قوربانییەکەیان کەم نابێتەوە . ( ان شاء الله ) .

ئیمانـداران: بـۆ ئـەوەی پاداشــتی تــەواوی قوربانیتـان دەســت بکەوێت، ( ان شاءالله ) . دەبێت ئەم خاڵانە جێبەجێ بکەن:

یەکـەم: نیـەتتان خـاوێن بکەنـەوە، دڵ ودەرونتـان بـا بێتـە گـۆو لـە ناخەوە بڵێت: خوایە گیـان ئـەم ئاژەڵـە تـەنهاو تـەنها لەبەر ڕەزامەنـدی تۆ سەر دەبڕم، وە نابێت هـیچ ڕیـایی و خـۆ نوانـدن ومنـەت کردنێکـی بۆ سەر کەس تێدا بێت، چونکە یەکێك لە گەورەترین جوانییەکانی ئـەم ئیـسلامەی ئێمـە، ئەوەیـە: کـە ئـەو کەسـەی کـە چـاکە دەکـات ویارمـەتی پێشکەش بـە کەسـانی تـر دەکـات، نابێـت هـیچ منـەتێکیان لەسەر بکات، یان مەبەستی ئەوە بێت خـەڵکی باسـی بکـەن و وەصـف وسەنای خێرۆمەندی بکەن، خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَـٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ الحج٣٧ .

واتە: لەو ئاژەڵانەی کە بۆ قوربانی سەریان دەبڕن، نـە گۆشـتیان و نە خوێنیـان ناگـات بـە خـوای گـەورە، بـەڵکو تـەنها پـاکی وپارێزگـاری ئێوەی پێ دەگات، کە یەکلا بونەتەوە بۆ ئەو، نەك وەك قوڕەیشییەکان کــە ئاژەڵیــان ســەر دەبــڕی و خوێنەکــەیان بــە کەعبــەی پــیرۆزدا هەڵئەسوو، بتەکانیشیان پێ ڕەنگ دەکرد، ئابەو شێوەیە دەبیـنن کـە

خوای گەورە چوار پێی بۆ ئێوە کەوی ورام کرد، هەتا خوای گەورە لە بەرامبەر ئەوەوە ڕێگەی ڕاستی نیشان داون، بە گەورە ڕای بگرن..

موژدەش بە خێرخوازان و چاکەکاران بدە ئەوانە بیریان چاکە، بۆچونیان چاکە، خواپەرستییان چاکە، چاکیش ئەزانن کە چۆن پەیوەندی بە خواوە بکەن.

✍ بەڵێ خوای گەورە نە گۆشتی دەوێ و نە خوێن، بەڵکو تەماشای تەقوای مرۆڤ دەکات، تەقواش وا لەناو سینەدا (التَقوى هاهُنا) پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی کرد بۆ سنگی و سێ جار فەرمووی: تەقواو خواناسی و لە خوا ترسان ئە ئەوەتا وا لێرەدایە.

کەواتە هەرچەند حەیوانی قوربانییەکەت گەورە بێت، گۆشتی زۆر بێت، گرانبەها بێت، ئەگەر ناو سینەت پاك و بێگەرد نەبێت، پێش سەربڕینی حەیوانەکەی قوربانیت، نەفسی پیس و بوغزو حەسوودی و ڕق و قینت لە دڵتدا سەر نەبڕی بێ و فڕێ نەدابێت، ئەو قوربانییە خوای گەورە وەری ناگرێت، بەڵام ئەگەر حەیوانی قوربانییەکەت بچووکیش بێت، گۆشتیشی کەم بێت، لە نرخدا زۆر گران نەبێت، بەڵام دڵ ودەروونت خاوێن بێت، بەڵام هەموو لاشەت لە خۆشیدا بێت کە خەڵکی لە دەستی تۆ سوودمەند دەبن، بەڵام هەزارجار شوکری خوا دەکەی کە ئەوەندەی پێ داوی توانای قوربانی سەربڕینت هەیە، دڵت ساف وبێگەردە، ڕقت لە کەس نییە، گەردنی هەموو کەست ئازاد کردووە، ئەوە بزانە کە خوای گەورە ( ان شاءالله ) بە قوربانییەکی گەورەو بەهادار لێت وەردەگرێت، وە بە هەموو مو و خوری و

نیسقانێکی ئاژەڵەکە تا گۆشتەکەی لە تای تەرازووی خێرت دا جێگا بگرێ و زەخیرەی قیامەتت دەبێت، وە ئەو قوربانییە دەبێتە لادەری بەلاو موصیبەت لەسەرت و شیفای نەخۆشیت و بەرەکەتی ڕزق وڕۆزیت بە پشتیوانی خوای باڵا دەست.

کەواتە: خاڵی یەکەم خاوێنی و دڵ و دوور بوونە لە ڕیاو منەت کاری و باس کردنی خێرەکەت لەناو خەڵکیدا.

دووەم: دەبێت حەیوانی قوربانی جوانترین حەیوان بێت، لە زەکاتدا کە زەکاتی ئاژەڵ ئەدرێت، شەرع داوای باشترین حەیوان ناکات، بەڵام لە قوربانیدا دەبێت جوانترین حەیوان بێت، دەبێت لە ڕووی تەمەنەوە گەشەی تەواوی کردبێت:

١. مەڕ: دەبێت ساڵێکی تەواو کردبێ و چوبێتە ساڵی دووەمی تەمەنیەوە، یان پێش ئەوەی تەمەنی ببێت بە ساڵێك کە بەرگنەکەی بوبێت بە خوری، ئەوە بۆ قوربانی دروستە، لای پێشەوا ( ابو حەنیفە ) ئەگەر مەڕ شەش مانگی تەواو کردبێت، بە مەرجێك جوان خزمەت کرابێ و قەڵەو بێت، بۆ قوربانی دەبێت.

٢. بزن: دەبێت دوو ساڵی تەواو کردبێ و پێی نابێتە ساڵی سێهەمەوە، لای هەندێك لە زانایانی شەرع، بزن ئەگەر یەك ساڵیش لە تەمەنی تێپەڕی بێ و چووبێتە ساڵی دووەمەوە، بە مەرجێك قەڵەو بێت و مەرجەکانی تری تێدا بێتەجێ، کە باسیان دەکەین بۆ قوربانی درووستە.

٣. ڕەشە وڵاخ: دەبێت دوو ساڵی تەواو کردبێ و چوبێتە ساڵێ سێهەمی تەمەنیەوە.

٤. حوشتر: دەبێت پێنج ساڵی تەواو کردبێ و چووبێتە ساڵی شەشەمیەوە.

وە حەیوانی قوربانی لە ڕووی جەستەو لاشەوە دەبێت هیچ عیب و کەم وکوڕییەکی نەبێت.

کەواتە: نابێت کوێرو یەك چاو بێت، شەل نەبێت، بەڵام کەمێك شەلین زەرەری نییە، نەخۆشییەکی وای نەبێت کاری لە گۆشتەکەی کردبێت، نابێت ئاژەڵێکی لەڕی لاوازی بێ مۆخ بێت.

- ئەگەر ئاژەڵێك یەك تۆز گەڕی پێوە بێت، بۆ قوربانی نابێت، نابێت حەیوانی قوربانی حۆل و گێژ بێت، نابێت شێت بێت، نابێت برین بە لەشیەوە بێت، نابێت بالووکەی زۆری پێوە بێت، لای ئیمامی شافیعی زەرەری نییە شکانی ( ٢ یان ٣ یان ٤ ) ددان، وە هەروەها زەرەری نییە گوێچکەی قلشا بێت، یان کون بوبێت، ئەگەر گۆشتەکەی دانەکەوتبێت، وە زەرەری نییە ئەگەر لە ئەساسدا گووانی نەبێت، یان شاخی نەبێت، یان گوێی کەڕیلە بێت، یان کلکی نەبێت، یان دوگی نەبێت، وە شکانی شاخ زەرەری نییە، بەڵام ئەگەر یەك تۆز لە کلکی براببوو، یان لە گوێی براببوو، یان لە دوگی براببوو، یان گوانی براببوو، با تۆزێکیش بێت هەر بۆ قوربانی نابێت.

لـە حاشـییەی شـیروانی لەسـەر توحفـە لـە ج٩ دا دەفـەرموێت:
پێشەوا( أبو حەنیفە ) فەرموویەتی: ( إِن كانَ المَقطُـوعُ مِـنَ الأُذُنِ دُونَ الثُلُث أجزَأَهُ...).

ئەگەر ئەوەی لە گوێی ئاژەڵەکە بووەتـەوە کـەمتر بـوو لـە سـێیەکی گوێی، دروستە ئەو ئاژەڵە بکرێت بە قوربانی.

وە هەروەها حەیوانی خەسێنراو و ئاوس بۆ قوربانی درووستن.

وە قوربانی عیبادەتێکی سەربەخۆیەو کاتەکەی دیاری کراوە، لـە ڕۆژهەڵاتنی ڕۆژی جەژنەوە تاکو سیٚ ڕۆژ دوای جەژن، واتـە هـەمووی چوار ڕۆژە، دروستە قوربانی سەر ببڕدرێت.

کەواتە: ئەو کەسـەی لـە شـەوی جەژنـدا یـان پێش هـەتاو کـەوتنی بەیانی جەژن، حەیوانەکەی سەر بڕی ئەوە بە قوربانی ناشێت.

پێـستی حـەیوانی قوربـانی: نابێـت پێـستەکەی بفرۆشـریٚ و پارەکەی هـەڵبگیرێت، بەڵام دروستە بکرێت بە مەشکە، بەڵام نابێت ئەو مەشکەیە بە کریٚ بدرێت، پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفـەرموێت:( مَن باعَ جِلدَ أُضحيَتِه فَلا أُضحيَةَ لَهُ ).رواهُ الحاكم وقال الألباني حَسَنٌ.

واتـە: هەرکەسـێك پێـستی حـەیوانی قوربانییەکـەی بفرۆشـیٚ و پارەکەی بۆ خۆی هەڵبگرێت، ئەوە قوربانییەکەی قبولٚ نابێت.

بـەڵام پێـشەوا ( أبـو حەنیفـە ) فەرموویـەتی: دروسـتە پێـستی حـەیوانی قوربـانی بفرۆشـریٚ و پارەکـەی بکرێـت بـە خێـرو بدرێتـە فەقیرو هەژاران.

بە نیسبەت قەصابەکەوە، ئەگەر کەسێك خۆی توانای سەربڕینی حەیوانی قوربانی نەبوو، ئەوە دروستە کەسێك بکات بە وەکیل بۆ سەربڕینی قوربانییەکەی، وە وا چاکە لەو کاتەدا بۆ خۆی لە لایەوە بوەستێت، جا ئەگەر قەصابەکە بە کرێ بۆی سەر دەبڕی، ئەوە دروست نییە کە پێستی حەیوانەکە یان هەندێك لە گۆشتی حەیوانەکە لە جیاتی کرێ بدرێت بە قەصابەکە، بەڵکو دەبێت پارەی بدرێتێ ئەگەر بە پارە بۆی سەر بڕی بوو.

بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە نابێت قەصابەکە لەو گۆشتە بخوات و وەر بگرێت بۆ ماڵ ومناڵی بەخێر، بەڵکو لەگەڵ وەرگرتنی کرێ ی سەربڕینەکەشدا، ئەگەر قەصابەکە هەژار بوو، یان دەوڵەمەندیش بوو، بەڵام دۆستی قوربانی کەرەکە بوو، ئەوا وەکو ماڵە هەژارێك یان وەکو هەدیەو دیاری لە گۆشتی قوربانییەکە پێی دەبەخشرێت.

وە چاك وایە ئەو کەسەی کە حەیوانی قوربانی سەردەبڕێت، کەسێکی دیندارو خواناس بێت.

٢ زانای گەورە ( القَرافي ) لە ( الذَخيرة ) ج ٤ دا دەفەرموێت: ( كـانَ النَّاسُ يَتَخَيَّرُونَ لِضَحاياهُم أهلَ الدِّينِ، لأَنَّهُم أولى بـالتَّقَرُبِ، فَـإِن وَكَّلَ تارِك الصَّلاةِ، أُستُحبَّ لَهُ الإعادَةَ لِلخِلافِ في حِلِّ ذَكاتِه ).

واتە: جاران خەڵکی ئەهلی دینداری و خواناسیان هەڵدەبژارد بۆ سەربڕینی قوربانیەکانیان، جا ئەگەر کەسێك نوێژ نەکەرێکی کرد بە وەکیل تاوەکو قوربانییەکەی بۆ سەرببڕێت، یان دوایی بۆی دەرکەوت

که قەصابەکەی نوێژ نەکەر بووە، ئەوە سوننەتە حەیوانێکی تر بکات بــە قوربــانی و قوربانییەکــەی دووبــارە بکاتــەوە، چــونکە زانایــان هەندێکیان لەسەر ئەوەن کە سەر بڕاوی دەستی نوێژ نەکەر پیسە.

**خــواردن لــە گۆشــتی قوربــانی:** قوربانی دوو جۆرە: قوربانی نەزرو قوربانی سوننەت، قوربانی نـەزر ئەوەیە کەسێك بڕیار بدات و بڵێت: ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان لە کرێچییەتی ڕزگارم بوو، وە بووم بە خاوەنی خانووی خۆم، ئەوە نەزر بێت لەسەرم کە حەیوانی قوربانی تێدا سەر ببڕم، یان نەزر بێت لەسەرم ئەگەر فڵان ئیشم بۆ بکرێت، لە کاتی قوربانیدا نەزر بێت قوربانییەکە بکەم.. یان کەسێك لەبەر ئەوەی ڕاڕایەو لە بڕیارەکانی پەشیمان دەبێتەوەو متمانەی بە خۆی نییە، بۆ ئەوەی مەجالی پەشیمان بونەوەی نەمێنێت بڵێ: نەزر بێت لەسەرم ئەم حەیوانە بکەم بە قوربانی، یان نەزر بێت لەسەرم ئەمساڵ قوربانی بکەم، ئەوە ئەو کەسە چونکە نەزری کردووەو نەزریش خێرکردنی کەسی ڕەزیل و بەخیلە، دەبێت سزاکەی وەربگرێت، کە ئەویش ئەوەیە نابێت خۆی و ژنەکەی و منداڵەکانی و باوك و دایکی لێی بخۆن.

بەڵام دەبێت موسوڵمانان لەوە ئاگادار بن، هەر بەوەندەی ووتی: ئەم حەیوانەم داناوە بۆ قوربانی، هیچ نیەتی نەزر لە دڵیدا نەبوو، ئەوە نابێت بە نەزر، وە لە کتێبی ( الفقه الإسلامي وأدلته ) ج٤ دا دەفەرموێت: ئەگەر کەسێك ویستی حەیوانێك دیاری بکات بۆ قوربانی، ئەوا بۆ ئەوەی لە نەزر دەر بچێت، بڵێت: ( إن شاء الله )

ئەگەر خوا بە نسیبی بکات، ئەم حەیوانە لەم جەژنی قوربانەدا دەکەم بە قوربانی، ئەوە نابێت بە نەزر.

کەواتە: ووشەی پیرۆزی (إن شاء الله) بەکار بهێنن و لە نەزر ڕزگار دەبن.

بەڵام ئەگەر قوربانییەکەت سوننەت بوو، واتە: نەزر نەبوو، ئەوە وا چاکە کە دوای سەربڕین و کەوڵ کردن و پارچە پارچە کردن گۆشتەکە بکرێت بە سێ بەشەوە، بەشێك لەو سێ بەشە گۆشتە بۆ خواردنی خۆی و ماڵ و منداڵ و میوانی جەژنی دابنێت، وە دروستە لێشی بکاتە سەلاجەو موجەمیدەوەو هەڵی بگرێت بۆ کاتی پێویست بۆ دوای جەژن بیخوات.

خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران دەفەرموێت:( لَقَد كُنَّا نَرفَعُ الكَراعَ -أي كَتَف الشاة- فَنَأكُلُهُ بَعدَ عَشرَةِ أيَامٍ ) رَواهُ الترمذي .

واتە: ئێمە لە ماڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ کە حەیوانی قوربانیمان سەر دەبڕی، دەستێکمان لە حەیوانەکە بۆ خۆمان هەڵدەگرت و تا دوای ( ١٠ ) ڕۆژ هەر لێمان دەخوارد.

کە بەڕاستی لەم فەرموودەیەی حەزرەتی عائیشەوە یاسای گۆشت خواردن فێر دەبین، کە لە ڕوانگەی زانستی و پزیشکییەوە گۆشتی ئاژەڵ خواردنی زۆر لێی و بە بەردەوامی لەسەر یەك باش نییە بۆ تەندروستی مرۆڤ، لەبەر ئەوە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی ( ١٠ ) ڕۆژ هێشتا دەستێکی مەڕێك یان کاوڕێکیان نەخواردووە.

پاشان سێیەکی دووەمی گۆشتەکە جیا بکەرەوەو بە تایبەتی بگەڕێ بە شوێن ئەو ماڵانەی کە زۆر هەژارن، زۆر دەست کورتن، بە ماوەی مانگ گۆشت ناخۆن، ئەو سێیەکەش لە گۆشتەکە بدەی بەوان، جا لێت نزیك بن و دراوسێت بن، یان لێت دوور بن.

سێیەکی کۆتایی بکە بە دیاری: ( وَيَهدِي إِلى الأقرِباء وَالأصدقاء وَالجيرانِ وَإنْ كانُوا أغنيـاءَ ) ئەمە عیبارەتی ( الفقـه الإسـلامي وأدلته) ج٤ ە کە دەفەرموێت: ئەم بەشە دەکرێت بە دیاری بۆ خزمان، با ماڵیان لێت دوور بێت یان با لە شارو گوندێکی تریش بژین. جا ( خوشکتە، براتە، خاڵ ومام و ئامۆزاتە، پورو پورزاتە ) ئەزانێت قوربانیت کردووە، جێگای خۆیەتی بەشێکی وەکو دیاری بۆ بنێریت، کە ئەمە سیلەی ڕەحمی پێ نوێ دەبێتەوەو پاداشتی گەورەی لەسەر وەر دەگریت، وە بە دیاری بینێرە بۆ برادەرو دۆستانت، لە دائیرەکەت لەگەڵ کەسێکدا هاو پیشەی یان دراوسێ دوکانتە، یان لە کۆنەوە برادەرێکی ڕاستەقینەو دڵسۆزتە، ئەمە بەشێکی لەو گۆشتی قوربانییە بە دیاری بۆ بنێرە، وە هەروەها دراوسێکانی خۆت لە بیر نەچێ و بەشی هەموویان بدەی، جا ئەم خزمەت، یان برادەرو هاوڕێیەت، یان دراوسێیەت، هەرچەندە دەوڵەمەندیش بن، هەر درووستە لەو گۆشتی قوربانییە بەشیان بدەی، وە ( ان شـاء الله ) پاداشتی تەواوی لەسەر وەردەگریت.

وە بزانن ئەگەر دراوسێکەت ڕوو لە دینیش نەبوو، گاورو جولەکەش بوو، هەر بیرو باوەڕو دینێکی غەیری ئیسلامی هەبوو،

هەر دەبێت لەو گۆشتی قوربانییە بەشی بدەیت، وە لە کتێبی ( الفقهُ الشَرعي المُيَسَر ) کە دانراوی زانای پایە بەرز ( محمد علی الصابونی ) یە لە ج ٨ دا دەفەرموێت:( إذا ضَحى الفَقيرُ أو المُتَوَسِــطُ الحــالِ بذبحِ شاةٍ، فَلا حرَجَ عَلَيهِ أن لا يَتَصدَقَ بِشَيءٍ منها، ويَتركها كُلَّهــا لِعَيالِه تَوسعَةً عَلَيهم، لأنَّ الغَرَضَ منَ الأضحيَةِ إراقَةُ الــدَّمِ تَقَرُبــاً إلى الله سُبحانَهُ، وَالتَّصَدُقُ بِشَيءٍ منها مُستَحَبُّ، ولَيسَ بِواجِبٍ وقَــد نَصَّ عَلى ذلكَ الفُقَهاء، فَقالُوا: يُستَحَبُ لِمَن كانَ فَقيــراً أَنْ يتركهــا كلها لِعَيالِه تَوسعَةً عَلَيهم...).

واتە: ئەگەر کەسێك هەژار بوو، یان ژیانێکی مامناوەندی هەبوو، نە دەوڵەمەند بوو نە زۆریش هەژار بوو، حەزی کرد کە قوربانی بکات، بزنێك یان مەڕێکی هەبوو کردی بە قوربانی، ئەوا هیچ لە خێری قوربانییەکەی کەم نابێتەوەو لۆمەی ناکرێت، ئەگەر هیچی لێی نەدات بە کەس، وە هەمووی بۆ ماڵ ومناڵی خۆی بگێڕێتەوە بۆ ئەوەی بە تەواوی لێی بخۆن و پاشەکەوتی لێ بکەن، بۆ ڕۆژانی دوای جەژن و کاتەکانی تر، چونکە مەبەست لە قوربانی سەر بڕین، ڕشتنی خوێنی حەیوانێکە بە مەبەست ونیەتی نزیك بونەوە لە خوای گەورە، ئیتر کە حەیوانەکە سەر بڕدراوە لەم ماڵە هەژارەدا، مەبەستی قوربانییەکە هاتووەتە جێ، ئیتر لەوەو دوا بەخشینی هەندێك لەو گۆشتی حەیوانی قوربانییە سوننەتە، وە واجب نییە، وە زانایان بە ڕوونی قسەیان لەم بارەیەوە کردووەو فەرموویانە: سوننەتە بۆ

کەسێك کە هەژارە هەموو گۆشتی قوربانییەکەی بۆ خۆیی و ماڵ و منداڵی بگێڕێتەوەو هەڵی بگرێت، بۆ ئەوەی بە تەواوی تێرو تەسەلیان بکات.

( سُبحانَ اللە ) لە بەخشندەیی خوای گەورەو ڕێزی ئیسلام بۆ هەژارانی دڵ دەوڵەمەند، بەو هەژارییەوە کە مەڕێك یان بزنێکی هەیە، یان پارەی کڕینی حەیوانێکی قوربانی هەیە، بەڵام ئەوەندە دڵی دەوڵەمەندەو چاوی تێرەو حەزی بەبەرز ڕاگرتنی درووشمەکانی خوای گەورەیە، چونکە قوربانی ( مِنْ شَعائرِ اللە ) یە.

جا ئەم هەژارە خێزاندارە بۆی هەیە تەواوی گۆشتی قوربانییەکەی بۆ خۆی و ماڵ ومناڵی بخوات و سەرف بکات.

وە بزانن: ڕەشە وولاخ بۆ حەت کەس دەبێت، جا ئەو حەوت کەسە هی یەك ماڵ بن و هی یەك خێزان بن، یان حەوت برادەرو هاوڕێ بەیەکەوە بە هەر حەوتیان ڕەشە وولاخێکی تەمەن دوو ساڵ تەواو کردو بکڕن، هەر دروستە، وە بزن و مەڕ بۆ یەك کەس دەکرێت بە قوربانی. بەڵام ئەگەر پیاوێك کە خاوەنی خێزانەو منالی هەیە، ویستی قوربانی بکات و مەڕێك یان بزنێکی کڕی، ئەوە ئەو مەڕە یان ئەو بزنە، بۆ تەواوی ئەو خێزانە لە جیاتی قوربانی دەکەوێ و لە کاتی سەربڕیندا پیاوەکە دەڵێت: ( بِسمِ اللە، اللهُ أكبَر ) خوایە گیان وا من لە پێناوی ڕەزامەندی تۆدا ئەم حەیوانە سەر دەبڕم و دەیکەم بە قوربانی بۆ خۆم وخێزانم و تەواوی منداڵەکانم.

ڕەحمی خواو کەرەمی خوای بەخشندە ئەوەندە زۆرە، مادام ئەم خێزانە ڕێزو حورمەت و خۆشەویستی لە نێوانیاندایە، تەباو خۆشەویستن لەناو یەکتردا، خوای میهرەبان ئەو تاکە حەیوانی قوربانییە لە جیاتی هەموویان وەردەگرێت.

بەڵام ئەبێت ئاگاداری ئەوە بین، کە ئەمە تەنها کاتێك وایە کە سەرۆك و کاسپکارو مشورخۆری خێزانەکە کە پیاوەکەیەو نەفەقەی ژن ومنداڵەکەی لەسەرە، حەیوانەکە بکڕێ و بیکات بە قوربانی.

بەڵام ئەگەر ژنەکە بە پارەی خۆی حەیوانێك ( مەڕێك یان بزنێك ) ی کڕی، بۆ قوربانی یان کوڕێکی ماڵەکە، یان کچێکی ماڵەکە، هەر لەگەڵ دایك و باوکی دەژی و پارەی خۆی هەیەو دەیەوێت قوربانی بکات، ئەوە تەنها لە جیاتی خۆی دەکەوێت و بری هەموو خێزانەکە ناکەوێت.

ئیماندارانی بەڕێز: یەقینتان ببێت هەر ماڵێك قوربانی تێدا بکرێت، خوای گەورە بەرەکەتی تێدەخات. وەعدی خوای گەورەیە:

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ السبأ ٣٩

دەی موسوڵمانی بەڕێز: خوای گەورە زۆری پێداوی، دە تۆش بە بەشێکی کەمی خوای گەورە لە خۆت ڕازی بکە، ئەمڕۆ کە بە دەستەوەیە بە فرسەتی بزانە، چونکە ڕەنگە ڕۆژێك بێتە پێشەوە هیچت بە دەستەوە نەمێنێت.. چەندین کەسمان بینی بە سەدان سەر مەڕو بزنی هەبوو، ئاژەڵدارێکی گەورە بوو، کەچی قوربانییەکی لێ نەکرد تا هەمووی لە دەست چوو، یان مردوو فریا نەکەوت قوربانی

بکات و ئەو هەموو پاداشتە گەورەیەی نەبرد بۆ قیامەتی خۆی. قیامەتێك کە مرۆڤ تێیدا موحتاجە بە یەك چاکە، وە کەس ئامادە نییە چاکەیەکی خۆی بدات بە کەسێکی تر.

بەڕێزان: ئەوەی جەژنەکەمان ڕازاوەترو پرشنگدارترو خۆشتر دەکات، ئەمانەیە:

١. خێزانەکان: ژن و مێردەکان، ڕۆڵەکان لەگەڵ دایك و باوکیاندا، ئەوپەڕێ خۆشەویستی بۆ یەکتری دەربڕن، چەند جوانە پیاو کە لە مزگەوت ڕۆیشتەوە لە نوێژی جەژن، یەکەم کەس پیرۆزبایی لە خێزانەکەی بکات و داوای گەردن ئازادی لیّ بکات و دەست خۆشی لیّ بکات، بۆ ئەو هەموو عەزیەت و ماندوو بوونەی کە لە پێناوی خۆی و میوان و منداڵیدا ئەیدات، وە پێی بڵێت بەڕاستی هاوسەری خۆشەویستم دوعای خێرت بۆ دەکەم لای خوای گەورە، خوا لەش ساغ و دڵشادت بکات، بە هەمیشەیی، کە جوانی ماڵم، گەرمی مەتبەخم، بەهۆی جوهدو هەوڵی شەوو ڕۆژی تۆوەیەو هەموو کاتێکت هەر جەژن بێت، ئەمجا تەوقەی گەرمی لەگەڵدا بکات، نەك وەکو هەندێك پیاو کە لە جەژندا تەوقە لەگەڵ هەموو ئافرەتێکی نامەحرەمدا دەکەن، کە حەرامەو سزای خوایی لەسەرە، کەچی تەوقە لەگەڵ خێزانە حەڵاڵەکەی خۆیدا ناکات.! وە بە هەمان شێوە ژنیش بە ڕووی خۆش بە تەوقەی گەرم، بەبۆنی خۆش، بە ئامێزی پڕ سۆز، بە زەردەخەنەی سەر لێوو، بە نیگای سەرنج ڕاکێش، بە خێرهاتنەوەی هاوسەرەکەی بکات و جەژنە پیرۆزەی لیّ بکات و دوعای لەش ساغی

و تەمەن درێژی بۆ بکات. وە منداڵەکان فێر بکات و هانیان بدات کە دەستی باوکیان ماچ بکەن و جەژنە پیرۆزەی لێ بکەن.

٢. سەردانی خزم و کەس وکارمان بکەین: بە تایبەتی ئەگەر خزمێکت عاجزیەکت لەگەڵی هەیەو ساردییەك لە نێوانتاندا دروست بووە، ئەم جەژنە فرسەتێکی زێڕینە بۆ ئاشت بونەوەی دڵەکان و بەستنەوەو دروستکردنەوەی پەیوەندییە پچڕاوەکان.

٣. وە دڵ و دەرونمان بەرامبەر تێکڕای خەڵك: هەموو ئەوانەی کە لەگەڵیان دەژین، لە فەرمانگە، لە خوێندنگە، لە کارگە، لە هەر جێگایەکدا بەیەکەوەین، کە هاوڕێ ی یەکترین، کە دراوسێ و هاومالین، بە دڵی پاکەوە جەژنە پیرۆزە لە یەکتری بکەین، زمان ودڵمان وەکو یەك شیرین بێت، نەك( زمانی شیرین و دڵ گورگ بین ) با هەوڵ بدەین لە چاکترین مرۆڤەکان بین.

لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی: کێ چاکترین کەسە؟ فەرمووی:( كُلُّ مَخمُومِ القَلْبِ، صَدُوقِ اللِّسانِ). عەرزیان کرد: ( صَدُوقُ اللِّسان ) ئەزانین مانای ڕاستگۆ لە قسەکردندا، ئەی (مَخموم القلب) کێیە؟ فەرمووی: ( هُوَ التَّقِيُّ النَقيُّ لا إِثمَ فيهِ وَلا بَغيَ وَ لا غِلَّ وَ لا حَسَدَ ) حَديث صَحيح، رَواهُ إِبن ماجة وَ الطَبَراني.

واتە: ئەو دڵە پاکە خاوێنە پارێزکارە بێ گەردەیە، کە گوناه وتاوان وبیرکردنەوە لە خراپەکاری و ستەم وڕق وقین و حەسوودی بەرامبەر بە کەس تێدا نییە.

ووشەی ( مَخْموم ) لە ( خَمَمَتِ البَیت ) وە هاتووە، واتە: گسکدان لەناو ماڵ و پاك کردنەوەی.

دەی ئەگەر ڕۆژانە ناو ماڵەکانمان گەسك ئەدریٚ و خاوێن ئەکرێتەوە، دە با لانی هەرە کەمی ساڵانە لە جەژندا گەسکێکیش لە دڵی پیس بومان بدەین و خاوێنی بکەینەوە، لە پیسی و گەردو تۆزی ڕق وقین و حەسوودی و خراپەکاری.

ئەمڕۆ ئێمە لەم دوانەمان کەمە، بەخوا بە ماڵانیشەوە نەگەڕێیت، تەنها ئەم دوو تایبەتمەندییەت تێدا بێت باشترین عەبدی خوا دەبیت. ئای چەند خۆشە مرۆڤ ( صَدُوقُ اللِّسان ) بێت، جا ( صَدُوقُ اللِّسان) هەر مانای ئەوە نییە کە لەکاتی قسەکردن وگێڕانەوەی باسێکدا درۆ نەکەی، بەڵکو ئەوەیان گەورەترە کە بەزمان بە کەسێك مەڵێ خۆشم ئەوێی و ڕێزت لامەو برای بەڕێزیت، کەچی هەر کە پشتی هەڵکرد، هەزار تانەو توانج لە خۆی و ماڵ ومناڵی بدەیت.

زۆر کەس لە جەژندا بۆ جەژنە پیرۆزە بە ماڵانەوە دەگەڕێت، بەڵام هەرکە لەم ماڵ چووە ماڵێکی تر، زەمی ماڵەکەی پێشوو کەم وکوڕییەکانیان دەکات .

ئای چەند خۆشە مرۆڤ ( مَخموم القَلب ) بێت، دڵی پاك وبێگەرد بێت، چ سوودی هەیە، بە لاشە جەژنە پیرۆزە لە یەکتری بکەی، بەڵام ناو دڵت بۆگەن بێت، بە داخەوە بیٚ دینی کەناڵە تەلەفزیۆنییە نا مەسئولەکان، فیلمە خراپەکان، ئەمْ میللەتی کوردەیان فێری ئەوە کرد کە درۆ لەگەڵ یەکتری بکەن، سەرکردە درۆ لەگەڵ میللەت دەکات،

میللەتیش هەر بەزمان وچەپڵە لێدان دڵسۆزی سەرکردەیە، یان لە ترسانە یان لە برسانە، نیفاقی سیاسی دروست بووە، مونافەسەی دەوڵەمەندی وای لێکردوین، بە داخەوە کێ بەدڵ حەز بە قازانجی کێ دەکات، مەگەر ئەو کەسەی لە خواترس بێت، ئەو خەڵکە دڵپاکە هەژارەی کە لە دێیەکدا دەژیان، لەبەر هەژاری نەیانئەتوانی هەموویان بۆ بەیانی جەژن یەك جۆر خواردن ئامادە بکەن، بەڵام دڵ وزمانیان بەیەکەوە ڕاست وپاك بوو، نانی جەژنیان بە یەکەوە لە مزگەوت دەخوارد، ( چێشتی مجێور ) لەوەوە هاتووە، ئەو گوندە ئەگەر بە ژمارەو خانوو سەد ماڵ بوبن، بەڵام هەروەکو یەك ماڵ بەیەکەوە ژیاون، ئای چ سەردەمێکی بەختەوەری و دڵئاسوودەیی بوو.

٤. ئەوەی کە جەژنەکەمان خۆشترو ڕازاوەتر دەکات ئەوەیە: حکومەت بەزەیی بە میللەتی خۆیدا بێتەوە، یەکەم: بەزەیی مەعنەوی، بەوەی شتی خراپ و ڕەوشت لەناوبەرو دژ بە بنەماکانی ئیسلام لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیەوە نیشانی ڕۆڵەکانی میللەتەکەی نەدات. حەیفە لە ڕۆژی جەژندا فیلمی شەڕوو کوشتن وبەکارهێنانی چەك و لە یەکتردان، نیشانی منداڵ وهەرزەی ئەم میللەتە بدرێت، زۆربەی منداڵان لە جەژندا ئەو پارەیەی کە وەکو جەژنانە وەری دەگرن، دەیدەن بە دەمانچەو تفەنگی میروو، یاری ئاگری، بۆچی؟ چونکە ئەوەندەی فیلم لەو بارەیەوە بینیوە لێی بووەتە قارەمانی، لە وڵاتاندا تەنانەت ئەو وڵاتانەشی کە بەردەوام شەڕو کوشتاریشی تێدا بووە، وایان لە منداڵەکانیان نەکردووە، کە حەزیان لە چەك بێت،

جارێکیان لە ڕادیۆیەکی مەحەلییەوە گوێم لێ بوو کە ووتی: کابرایەکی کوردی عراقی دەچێتە لوبنان، منالەکەی دەباتە شوێنی کڕینی شتی مندالان، منالە کوردەکە لەو هەموو لەعابەو یاری مندالانەدا، داوای تفەنگێکی میرو دەکات، کابرای دوکانداری لوبنانی دەلێت: هەر بەخۆڕایی بۆخۆت، چونکە چوار سالە لەم دوکانەدایەو بەو شوێنەوە هەلواسراوە، بەلام هیچ منالێکی لوبنانی دەستی بۆ ڕانەکێشاوەو داوای نەکردووە.!

جا ئێمەش کە فەوتاوی چەك و تەقەمەنی وئاگرین، با نەهێلین مندالەکانمان ئەم جۆرە شتە بێ سوودە بەلام پڕ مەترسییە بەکار بهێنن، چونکە ڕووداوی دلتەزێنی لێ کەوتووەتەوەو چاوی مندالی بێ تاوانی تێدا کوێر کراوە کە جەژنی چەندین مالی کردووە بە شیوەن.

لەبەر ئەوە داواکارم لە دوکاندارە بەڕێزەکان، کە ئەو جۆرە شتانە مەهێنن و بە منالی مەفرۆشن، چونکە پارەکەی حەرامە، وە تکام وایە دام ودەزگاکانی ئاسایش و پۆلیسیش کە لەبەر خاتری پاراستنی ژیانی خەلك، خۆیان لە جەژن کردن لەناو مال ومندالیان حەرام کردووە، ئەو چاکەیەش لەگەل ڕۆلەکانی میللەتەکەی خۆیان بکەن، کە هەر دوکاندارێك ئەم شتانەی فرۆشت دوکانەکەی پێ دابخەن و غەرامەی بکەن، وە لە دەستی منال و هەرزەکارانی بستێنن.

دووەم: بەزەیی ماددی: چەند خۆش دەبوو حکومەت جەژنانەی بدایە بە میللەت، لانی کەم بەو مالانەی کە موچەیەکیان نییە، کە زۆر

هەژارییان پێوە دیارەو لەم گرانییەی بازاڕدا توانای کڕینی پێداویستی و جل وبەرگی جەژنیان نییە، چەند جێگای دڵخۆشی هەموو لایەکمان دەبوو کە حکومەت هەفتەیەك پێش جەژن پارەیەکی باشی بەو ماڵانە ببەخشییایەو وەکو جەژنانە پێشکەشی بکردنایەو ئەوانیش سەدان دوعای بە کوڵ و بەدڵیان بۆ بکردنایە. کە بەڕاستی دوعای ئافرەتێکی بە شەرەفی ڕوو سووری بە عززەت کە دانیشتووە بە دیار چەند منداڵێکی بێ نازی بێ باوکەوە، دوعای پیرەژن و پیرە مێردێکی پەك کەوتە، کە هیچ سەرچاوەیەکی داراییان نییە، کە دوعا بۆ حکومەت و کاربەدەستانی بکات، کاتێك دەبینێت ئەم حکومەتە چاوی تیژەو ئەوانیش دەبینێ و لە یادیان ناکات و لە جەژنا ناهێڵێت بێ نازییان پێوە دیار بێت. ئەمانە دوعای بۆ دەکەن کە خوا ئەو حکومەت و سوڵتەیە ڕاگیراوو پارێزراو بکات، دڵنیابن ئەو دوعا بە کوڵ ودڵانە لە هەزاران پاسەوان و گونجی چیمەنتۆی دەوری بارەگاکانتان باشترو بەهێزترن بۆ پارێزگاریتان، وە لەم ڕۆژە پیرۆزەدا، لەم بەرەبەیانی ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانی پیرۆزەدا، ئەم بەسەرهاتە دەکەم بە دیاری و جەژنانەو بۆ کاربەدەتانی حکومەتی کوردستانی دەنێرم.)

ڕۆژی پێش جەژن بوو کچەکانی خەلیفە ( عومەری کوڕی عبدالعزیز ) هاتنە لای باوکیان و وتیان:( يا أَميرَ المُؤمنين، العيدُ غَداً، ولَيسَ عِندَنا ثِيابٌ جَديدَةٌ نَلبسُها ) ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەی باوکە گیان، بەیانی جەژنەو ئێمەش هیچ جل وبەرگێکی تازەمان نییە

کە بۆ ئەم جەژنە لەبەری بکەین و جل وبەرگەکانی کە هەشمانە، هەمووی کۆن بووەو پینەی پێوەیە، ئێمەش حەز دەکەین وەکو ئەو خەڵکە کە لەخوا بەزیاد بێت، هەمووی وەزعی باشەو جلی جوان وتازەی بۆ جەژن کردووە، بەرگێکی تازەمان لەبەردا بێت، خەلیفەی دادگەر، کە ئەوەندە بە دڵسۆزی و دەست پاکی ودادپەروەرییەوە حوکمی دەکرد، هێشتا دوو ساڵ لە ماوەی دەسەڵاتەکەی تێنەپەڕیبوو، کە باری ئابووری وولات بە تەواوی گەشایەوەو بژێوی ژیانی خەڵك بە تەواوی باش بوو، کەچی ئەوە حاڵی کچە جگەر گۆشەکانی خۆیەتی! بەڵێ خەلیفەی دادگەر حەزرەتی ( عومەری کوڕی عبدالعزیز ) تەماشایەکی کردن وزۆر بە سۆزەوە بۆی ڕوانین و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە فەرمووی:( يا بَناتي لَيسَ العيدُ لمَن لَبِسَ الجَديد، إنَّما العيدُ لمَن خافَ يَومَ الوَعيد ).،

ئەی کچە خۆشەویستەکانم، جەژن بۆ ئەو کەسە نییە کە جلی جوانی لەبەردایەو پۆشاکی تازەی پۆشیوە، بەڵکو جەژنی ڕاستەقینە بۆ ئەو کەسەیە، کە ترسی ڕۆژی وەستانی بەردەم خوای پەروەردگاری خۆی هەیەو لە ترسی شەرمەزاری ئەو ڕۆژە، نەیتوانیوە ئەوەندە پارە لە خەزێنەی دەوڵەت هەڵبگرێت، کە جگە لە مەصرەفی نان وپێخۆری سادەی ڕۆژانەی پاشەکەوتێکی هەبێت، کە لە جەژندا پارچە جلێکی تازە بۆ کچەکانی بکڕێت.! لەو کاتەدا وەزیری دارایی لە خزمەت خەلیفەدا بوو، عەرزی کرد: ئەی ئەمیری ئیمانداران، چ قەیدی هەیە ئەگەر موچەی مانگێکت بۆ پێش بخەین و ئێستا وەری

بگری و جل وبەرگی تازە بۆ ماڵ ومناڵت بۆ جەژن بکڕی و پاشان لە مانگی داهاتوودا موچەکەت نادەینێ و لە جیاتی ئەمە دەیگێڕینەوە، خەلیفە نەیفەرموو: بەڕاستی پێشنیارێکی بەجێیە، خۆ ئەمە تەنها قەرز کردنێکە لە خەزێنەی دەوڵەت و پاشان دەیدەمەوەو بە ئاگاداری وەزیری دارایی و خەزنەدار دەبێت، نەخێر، بەڵکو فەرمووی: ئای چیت پێ بڵێم، ئایا تۆ ئاگاداری زانستی غەیبت هەیە کە بزانی من تا بەیانی بە زیندوویەتی دەمێنم، چ جای مانگێکی تر؟ ئیتر چۆن دەتوانم کاری وا بکەم؟ چونکە کە مردم موچەکەم دەبێت ببڕدرێ و ئەوسا بە چی قەرزەکەم بۆ بدەنەوە؟ !! پاشان دڵنەوایی کچەکانی کردو ئەوانیش بە ئامۆژگارییەکانی قەناعەتیان کرد.

لە کۆتایشدا دەڵێم: ڕۆژی جەژن ڕۆژی دڵخۆش بوون و شوکرانە بژێری خوایە، نەك ڕۆژی تاعزیە نوێ کردنەوەو چوونە سەر قەبران و نۆ جەژنەو گریان.

لەبەر ئەوە نۆ جەژنەو تاعزیە نوێ کردنەوە حەرامەو چونە سەر قەبری مردووانتان بخەنە کاتێکی ترو ڕۆژێکی ترو هەر لە ماڵەوە دوعای خێریان بۆ بکەن و قورئانیان بۆ بخوێنن و صەدەقەو خێریان بۆ بکەن و جەژن لە خۆتان وماڵ ومنداڵتان مەشێوێنن.

جارێکی تریش جەژنتان پیرۆزو هەموو کاتێکتان هەر خۆشی و شادی بێت.

الحَمدُ لِلَّهِ الَّذي جَمَّلَ الأعيادَ بالسَّرُورِ، وضاعَفَ لِلمُتَّقينَ جَزيـــلَ الأُجُورِ، وَقَبِلَ مِنَ الحُجَّاجِ وَالعُمَّارِ سَعيَهُمُ المَشكُورِ، وكَمَّلَ الضِّيافَةَ في يَومِ العيدِ لِعُمُومِ المُؤمِنينَ.

أَشهَدُ أَن لآ إِلَهَ إِلاَّ الله مُعِزُ أوليائِهِ، وَأَشـــهَدُ أَنَّ سَـــيِدَنا مُحَمَّـــداً رَسُولَ اللهِ سَيِّدُ رُسُولِهِ وَ أنبيائِهِ.

أللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمَ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَ أَصحابِهِ، وَمَـــن اهتَدى بِهَديِهِ إِلى يَومِ الدِّين.

أُصيكُم عِبادَ اللهِ وَنَفسي قَبلَكُم بِتَقوى اللهِ وَطاعَتِهِ ﴿ياأَيُّهـــا الَّـــذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ وَ لا تَمُتُّونَّ إلاّ وَ أَنتُم مُسلِمون﴾ .

قالَ اللهُ سُبحانَهُ تَعـــالى:﴿وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞۖ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ۝٣٦﴾الحج٣٦

وَاعمَلُوا أَنَّهُ يُسنُّ الأضحيَةُ بَعدَ صَلاةُ العيد، وَالتَّـــصَدَقُ بِثُلُثِهـــا، وَإِهداءُ ثُلُثِها، وَأَكلُ ثُلثِها، وَقَد ضَحَّى النَّبِّيَ ﷺ في صَبيحَةِ العيـــدِ بِكَبشَينِ أَملَحَينِ أَقرَنَين...

تَقَبَّلَ اللهُ الحَجَّ مِن إِخوانِنا الحُجَّاجَ، وكَتَبَ لَهُمُ السَّلامَةَ وَالأَمـــانَ في رُجُوعِهِم إِلى بِلادِهِم، وَ وَفَقنا لأَداءِ الحَجَّ إِلى بَيتِهِ المُكَرَّم.

تَقَبَّلَ مِنَّا يا رَبَّ العالَمين، وَ الحَمدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمينَ.

سُبحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفونَ وَسَّلامُ عَلَـــى المُرسَـــلِينَ وَ الحَمدُ لِلَّه رَبِّ العالَمين.

## سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز.

٢. فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری نازدار ﷺ

٣. يَسأَلُونَكَ — د. حُسام الدين بن موسى عَفانة

٤. الفِقهُ الشَرعيُ المُيَسَر — محمد على الصابوني

٥. رَوضَةُ الخُطَباء — د. مصطفى مُراد

٦. الصَحيح مِنَ الأثر في خُطَب المِنبَر — فَيصَل بن عبده الحاشيدي

٧. الفَقهُ الأسلامي وَادلَتُهُ — د. وَهبة الزُحَيلي

٨. صَحيح وَصايا الرَسول ﷺ — سَعد يوسف أبو عَزيز

٩. سلوكيات المَرأة المُسلِمة — محمد عبدالعاطي بَحيري

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيِدنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ أجمَعينَ:

**سوپاس بۆ خوای گەورە، سیمای ئیمانداری و خەمخۆری بۆ قیامەت وتەرازووی مەحشەر، لە دڵ و دەروونی ئەم میللەتە ئیماندارەدا بەرزو گەشاوەیە، لەم ڕۆژانەدا بە دەیان موسوڵمان لە پیاو و لە ژن، لە برایان ولە خوشکانمان، لە گەنجە خواناس وریش سپییە نورانییەکانمان، لێمان دەپرسن: ئایا کەی ( ١٠ ) ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان، کە لە کوردەواریدا بە ( نۆمینەی حاجییان ) ناسراوە، دەست پێ دەکات؟ بۆ ئەوەی لەم فرسەتە زێڕینەدا، زادو زەخیرەیەك بخەن، توێشەبەرەیان پڕکەن بۆ ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژی ڕۆژانە، کە خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ٨٩﴾ **(الشعراء ٨٨-٨٩).**

**ئەو ڕۆژەی کە نە ماڵ سوود دەبەخشێت وفریای ئادەمیزاد دەکەوێت، نەمنداڵ ونەوە، مەگەر کەسێك بە دڵ ودەروونی پاك و بێگەردو پڕ لە ئیمان بەخزمەت پەروەردگار گەیشتبێت.**

**ئای ڕۆژی قیامەت چ ڕۆژێکی چارەنوس سازە،** ﴿يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦﴾.

**ئەو ڕۆژەی کە هەموو خەڵکی بە پێوە دەوەستن لەبەردەم دەسەڵاتی پەروەردگاری جیهانیاندا.**

ئـەو ڕۆژە ڕۆژێکـی زۆر سـامناك و ترسـناك وگەورەیـە،﴿يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾.

ئـەو ڕۆژەی کـەس فریـای کـەس ناکـەوێت، کـەس هـیچ شـتێکی لەدەسـت نایـەت بـۆ کەسـانی تـر، ئـەو ڕۆژە هـەموو شـتێك بـە دەسـت خوایە، فەرمان تەنها فەرمانی پەروەردگاری دادپەروەرە.

جـا مـرۆڤ کە لـەم مـاوە کورتـەی ژیـانی دونیـادا، کە ئەگـەر ( ٦٠ ) سـاڵ بـژی، پـانزەی منداڵـەو چـل وپێنجەکـەی تـری بیسـت سـاڵی هـەر خـەوتووە، مایـەوە بیـست وپێـنج سـاڵ تەمـەن، ئـەویش زۆری بـە کاروکاسـپی وخوێنـدن و سـەرقاڵی دونیـاوە بەسـەر دەبرێـت، کـە ئەمانەش ئەگـەر لەسـەر ڕێبازی ئیسلام ئـەنجام بـدرێن و بـە نیـەتێکی پاکەوە بکرێن، هەر بە خـوا پەرستی ئـەژمێردرێن، ( ان شاءالله ) ئـەوا ماوەیـەکی زۆر کـەممان بـۆ دەمێنێتـەوە کـە بـە عیبـادەت ئـاوەدانی بکەینـەوە، بۆیـە خـوای بـە بـەزەیی، چـەند دیـاری وخـەڵاتێکی بـەم ئوممەتـەی پێغەمبـەر ﷺ بەخـشیوە، کـە بـە کـات وزەمـەن کەمـە، وە عیبادەتەکە ساناو ئاسانە، بەڵام پاداشتەکەی هەر خوای گەورە خۆی پێـی زانایـە کـە چـەندە گەورەیـە، بـۆ ئـەوەی کـە لـە ماوەیـەکی کەمدا ئەگەر بە نیەتێکی خاوێن و دڵێکی پاك و پڕ لە ئیخڵاصەوە عیبادەتی خوای خۆمانی تێدا بکەین، پاداشتێکی گەورەمان دەست دەکەوێت، جـا یـەکێك لـەو خەڵاتـە گەورانـە: کـە هـەلێکی زێڕینـە تـاوەکو توێـشەبەرەی چاکەمانی تێـدا پڕکـەین، ئـەم چـەند ڕۆژەی سـەرەتای

مانگی (ذي الحجَة) یە، کە ئەوەندە گەورەن خوای گەورە سوێندی پێ خواردوون، کە دیارە خوای گەورە هەرگیز سوێند ناخوات بە شتێك، مەگەر ئەو شتە زۆر گران قەدر بێت، جا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلْفَجْرِ ۝ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ۝ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ﴾ الفجر ١ـ ٣.

واتە: سوێند بە بەرەبەیان، سوێند بە ( ١٠ ) شەوی مانگی ذي الحجَة ، کە کاتی ئەنجامدانی حەجە، وە سوێند بە شەوە جووت وشەوە تاکەکان .

زانایان دەفەرموون: ( الشفع ) ڕۆژی جەژنی قوربانەو ( الوتر ) ڕۆژی عەرەفەیە، کە ڕۆژی نۆی مانگی (ذي الحجَة) یە.

بەڵێ نۆمینەی حاجییان واتە: نۆ ڕۆژی یەکەمی مانگی قوربان، ڕۆژانێکی زۆر گەورەو گرنگن، کە بەسەر موسوڵماناندا تێدەپەڕن، ڕۆژانێکن کە خوای گەورە پێی خۆشە تەواوی عیبادەتەکان تێیدا ئەنجام بدرێت، حەج کە لە ڕۆژی عەرەفەدا ، لە نۆی مانگ دا دەکرێت، ( الحَجُ عَرَفة ) وە بەڕۆژو بون تێیدا وە تەوبە کردن وە قورئان خوێندن.

لەبەردەم گەورەیی ئەم چەند ڕۆژەدا دەچینە خزمەت قورئان ودەبینین، لە پێنج شوێندا خوای گەورە باسی ئەم چەند ڕۆژەی کردووە: ﴿وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ﴾ البقرة ٢٠٣ ،

﴿وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ﴾ الحج ٢٨ ، ﴿وَلَيَالٍ عَشۡرٖ﴾
﴿وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ﴾ الأعراف ١٤٢ ، ﴿وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ﴾.

**ئـەم چـەند شـوێنەی قورئـانی پـیرۆز بـەپێی ڕای هەنـدێك لـە موفەسیرین، مەبەست لە ( ١٠ ) ڕۆژی ذي الحِجَة یە.**

**لـە فـەرموودەی پێغەمبـەری خۆشەویـستماندا ﷺ باسـی فـەزڵ وگـەورەیی عیبـادەتی ئـەم ( ١٠ ) ڕۆژە بـە گـشتی هـاتووە، لەوانـە: ( ئیبن عباس ) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:** ( ما مِن أيامِ العَمَلُ الصّالِحُ فيها أَحَبَّ إِلى اللهِ عَزَّوَجَلَّ مِن هذهِ الأيام. يَعنـي أيَّامِ العَشرِ. قالُوا: يا رَسُولَ اللهِ وَلا الجِهادُ في سَبيلِ الله؟! قالَ: وَلا الجِهادُ في سَبيلِ اللهِ، إلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفسِهِ وَ مالِهِ، ثُمَّ لَم يَرجِع مِن ذالِكَ بِشَيءٍ ) رَواهُ البُخاري.

**واتە: هیچ ڕۆژانێك نییە كە كردەوەی باش تیایاندا بەقەدەری ئەم ( ١٠ ) ڕۆژە خۆشەویـست بێـت لای خـوای گـەورە. عـەرزیان كـرد: تەنانەت جیهادیش لە ڕێی خوادا؟! فەرمووی: تەنانـەت جیهادیش لـە ڕێی خوادا، مەگەر كەسێك بە نـەفس ومالـەوە بچێتە جیهادو هیچێك لەوانە نەگێڕێتەوە، بە نەفس ومالەوە لە ڕێی خوادا بڕوات.**

**كەوابوو ئەم ( ١٠ ) ڕۆژە واتـە لەیـەكی (ذي الحِجَة ) هـەتا ( دەی ) (ذي الحِجَة ) فرسـەتێكی زێڕینـە بـۆ عیبـادەت و پەرسـتن، پێویـستە كەسـی موسـوڵمان ئـەم فرسـەتە بقۆزێتـەوەو بـە خوێنـدنی قورئـان**

وزیکرو ڕۆژوو پەیوەست بوون بە جەماعەتەوەو پاڕانەوەی زۆرەوە کاتەکانی ئەم چەند ڕۆژەی برازێنێتەوە.

وە یەکێك لە کردەوە چاکەکان کە موسوڵمانان زۆر پرسیاری لەبارەوە دەکەن، بەڕۆژوو بوونی ئەم ڕۆژانەیە، کە مەبەستمان هەشت ڕۆژەکەیە، چونکە ڕۆژی عەرەفە کە ڕۆژی نۆیەمە، وە هیچ کەس گومانی نییە لە سوننەتیەتی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە، وە هەشت ڕۆژەکەی تریش کە فەرموودەکە باسی گەورەیی عیبادەتی تێدا کردن، بێگومان ڕۆژوو گرتنیش دەگرێتەوە. بگرە ڕۆژوو لە عیبادەتە زۆر گەورەو بەرزەکانەو لە فەرموودە شیرین و صەحیحەکانیشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم نۆ ڕۆژەدا بەڕۆژوو بووە، لەوانە:

لە خێزانەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە ( كَانَ رَسُولُ الله ﷺ يَصُومُ تِسعَ ذي الحَجَّة ) ئەبو داود ڕیوایەتی کردووەو شێخ ئەلبانی بە صەحیحی داناوە.

وە هەروەها بە ڕیوایەتێکی تریش هاتووە، کە دەفەرموێت: ( أَنَّ النَبيَّ ﷺ كانَ يَصُومُ يومَ عاشوراء، وَ ثَلاثَةَ أَيامٍ من كُلِّ شَهرٍ ) رَواهُ النِّسائي وَ صَحَّحَهُ الألباني، صَحيح وَ ضَعيف سُنَن النِّسائي(٦/١٦) بِرَقَم(٢٣٢٧) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی عاشورا واتە: ( ١٠ ) ی مانگی موحەڕڕەم، بەڕۆژوو بووە، وە هەموو مانگێك سێ ڕۆژ تێیدا بەڕۆژوو بووە.

کەواتە: ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم نۆ ڕۆژەدا، بەڕۆژوو بووە.

وە هەروەها زانایانی هەرچوار مەزهەب کۆکن لەسەر سونەتیەتی ڕۆژووی نۆمینەی حاجییان، هەروەکو لە ( مجلَة البُحوث الإسلامية ) دا هاتووە، ئەمەش ووتەی هەندێك لە زانایانی گەورەیە:

( ئیمامی نەوەوی ) دەفەرموێت: ( قُلتُ: وَمِنَ المَسنونِ، صَـــومُ عَشر ذي الحِجَّةِ، غيرَ العيدِ ) رَوضَةَ الطالبين(٤٥٦/٤٧) واتە: من دەڵێم: لە ڕۆژووە سوننەتەکانە، ڕۆژووی دەی (ذي الحِجَة ) جگە لە ڕۆژی جەژن.

هەروەها هەر ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیم دا دەفەرموێت: ( فَلَيسَ في صَومِ هذهِ التِسعَةَ كراهة، بَل هيَ مُـــستَحَبَّةٌ إستِحباباً شَديداً لا سيَما التاسِعَ مِنها. وَهوَ يَـــومَ عَرَفَـــةَ ) واتە: لە ڕۆژووی ئـەم نـۆ ڕۆژەدا، کەراهــەت نییــە، بگــرە زۆر موســتەحەبە، بەتایبەتی ڕۆژی نۆیەمی کە ڕۆژی عەرەفەیە .

وە ( ابــن حــەزمی زاهــیری ) لــە کتێبەکەیــدا ( المحلـــى ) دا دەفەرموێت: ( وَنَستَحِبُّ صيامُ أيّام العَشرِ مِن ذي الحِجَّة ) واتە: بە سوونەتی دەزانین، ڕۆژووی دە ڕۆژەکە لە مانگی (ذي الحِجَة ) .

هـەروەها ( شـێخ بـن بـاز ) لـە وەڵـامی پرسـیارێکدا دەفـەرموێت: ڕۆژی عەرەفە ئەو ڕۆژەیە، کە خەڵکی تێیدا ڕادەوەستن لە عەرەفە، ڕۆژوو تێیدا سوننەتە، بۆ غەیری ئەوەی کە لە حەجدایە. ئەگەر

ویستت ڕۆژێك لە پێشدا بەڕۆژوو بیت، ئەوە قەیناکات و ئەگەر هەر نۆ ڕۆژەکە بەڕۆژوو بویت، ئەوە باشە، چونکە ئەم ڕۆژانە پیرۆزن و سوننەتە تیایدا بەڕۆژوو بیت. فَتــاوى اللّجنَــة الدائمِيَــة (ج١٠ ، ص٣٩٣).

وە لە فەتوایەکی تردا، هەر لە فَتــاوى اللّجنَــة الدائمِيَــة (ج١٠، ص٣٨٥) دا هاتووە ( أفضَلُ الأيامِ لِصيامِ التطــوع... وَعَــشر ذي الحِجَّة ) واتە: گەورەترینی ڕۆژەکان بۆ بەڕۆژوو بوون، چەند ڕۆژێکن، یەکێك لەوانە، ڕۆژووی دەی (ذي الحِجَة ) یە.

( ئـیبن عوسـەیمینیش ) سەرباسـێك دەڕازێنێتـەوە بـە نـاوی ( مَشروعية صــيام عَــشر ذي الحِجَّــة ) اللقاء الشهري(٣٤/٥) لەم بابەتـەدا بـە درێـژی باسـی سـوننەتی ڕۆژووی نۆمینـەی حاجییـان دەکات.

هـەروەها لـە ( لَطـائِفُ المَعـارف ) دا هـاتووە کـە ( ئـیبن عومـەر ) بـەڕۆژوو بـوونی ئـەم نـۆ ڕۆژەی هـەرگیز تـەرك نـەکردووە، هـەروەها گێڕدراوەتـەوە لـە هەریـەك لـە ( حەسـەنی بەصـری و ئـیبن سـیرین و قەتادە)وە کە ئەم ڕۆژووەیان تەرك نەکردووە.

کەواتـە ئیمانـداران: تـەنها گومانێـك کـە لەسـەر ڕۆژووی نۆمینـە هەبێت، ئەوەیە: کەسێك بە نەزانی لەم فەرمایشتەی دایکی ئیمانداران ( خاتوو عائیشە ) بڕوانێت، کە ئەفەرموێت: ( ما رَأيتُ النَبــيَّ ﷺ صائِماً في العَشرِ قَــطُ ) صَحيح وَ ضَعيف سُنَن الترمذي (٢٥٦/٢)

واتە: هەرگیز نەمبینیوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە ڕۆژەکەدا بە ڕۆژوو بوبێت.

لە ڕووکەشی ئەم فەرمایشتەدا پێ دەچێت کە ڕۆژووی نۆمینە سوننەت نەبێت و پێغەمبەری ئازیزمان نەیگرتبێت، ئەمەش پێچەوانەی ئەو فەرمایشتە صەحیحانەیە کە ڕابوردن، وەلێ زانایان بە چەندین چەشن وەڵامیان نوسیوە، لەوانە:

١. پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هەندێك جار کردەوەیەکی تەرك کردووەو زۆریش حەزی کردووە کە بەجێی بهێنێت، لە ترسی فەرز نەبوون بەسەر ئوممەتەکەیدا، (تُحفَة الأحوذي ج٢، ص٢٩٧).

٢. دەگونجێت لەبەر نەخۆشی و سەفەر نەیگرتبێ و عائیشە نەیبیستبێت، پێشەوا نەوەوی ئەم وەڵامەی نوسیوە.

کەواتە: با بە هیممەتەوە ئەم ڕۆژووە پیرۆزانە بگرین و بیکەین بە توێشووی ڕۆژی قیامەتمان.

خۆشەویستان: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ باسی کردەوەی چاك دەکات ، کە لەم ڕۆژانەدا ئەنجامی بدەن، وە کردەوەی چاکیش مەیدانەکەی زۆر فراوانە، کەسێك نییە بڵێت لەم مەیدانە فراوانەدا ناتوانم کارێکی چاکە ئەنجام بدەم، بەڕاستی لەم ڕۆژانەدا خوای گەورە کاروکردەوەی چاکی لە عەبدەکانییەوە زۆر پێ خۆشە، ئەم کردەوە جوانانە ئەبنە مایەی هیدایەتی مرۆڤ، کە هیدایەت وبەرچاوڕونی باشترین دەستکەوتن، کە مرۆڤ بە دەستیان بێنێت. وە خوای گەورە چاکە دێنێتەوە ڕێگات ئەگەر پاش ماوەیەکیش بێت، وە

مرۆڤی کافر کاتێك کارو کردەوەیەکی جوان ئەنجام ئەدات، لای خوای گەورە بە فیڕۆ ناچێت. جا ئەگەر قابیلی هیدایەت بێت، بە هۆی ئەو کردەوە جوانەوە خوای گەورە هیدایەتی ئەدات بۆ موسوڵمان بوون. شَرح صَحیح مُسلِم ج٨، ص٧١.

ئەوەتا لەم سەردەمەشدا ئەوانەی کە ڕۆژانە لە ڕۆژئاوادا موسوڵمان دەبن، هەموو کەسانی زاناو کەسانی سوودبەخشن بۆ خەڵکی، بۆیە ئەم چاکانەیان دێتەوە ڕێگایان و سەرەنجام بەو پەڕی شادومانی و شانازییەوە موسوڵمان دەبن.

بەڵام ئەوانەی کە هەر خەریکی پیلان گێڕی و کوشتن وئازاردانی خەڵکی بێتاوانن، زۆر بە دەگمەن کەسێکیان هیدایەت وەربگرێ و موسوڵمان ببێ و سەرفرازی بەدەست بهێنێت... بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەمان، سەرنجی ئەم ڕووداوەی ناو مێژووی سەرەتای ئیسلام بدەن، کە لە سەردەمی پێغەمبەری خۆشەویستماندا ﷺ ڕووی داوە. (١)

لە مەککەدا، کابرایەك هەبوو ناوی ( عوسمانی کوڕی تەڵحە ) بوو، بازرگانێکی سەرکەوتوو بوو، کەسێکی ناودارو دەوڵەمەند بوو، بەڵام دژایەتی ئیسلامی دەکرد، تا کاتی هیجرەت هات، ( ئوم سەلەمە ) کەس وکارەکەی نەیانهێشت لەگەڵ مێردەکەیدا کۆچ بکات، تاقە کوڕێکیشی هەبوو، کەس وکاری مێردەکەی لێیان سەندەوەو بردیانە لای خۆیان، ئەم ئافرەتە یەك ساڵ لە مەککەدا مایەوەو مێردەکەی لە مەدینەو منداڵەکەی لای ماڵە خەزوورانی بوو، خۆشی لای کەس

وکاری بە تەنها پاش مەینەتی وغەم وپەژارەی ئەو ماوە زۆرە بەزەییان پێیدا هاتەوەو ڕێگایاندا بە خۆی و منالەکەیەوە کۆچ بکات بۆ مەدینە، بە تاقی تەنها ڕێی مەدینەی گرتەبەر کە (٤٠٠) کیلۆمەتر بوو، لە ڕێگادا کە عوسمانی کوڕی تەڵحە ئەم ئافرەتەی بینی و زانی بە تەنها کۆچ ئەکات، غیرەتی قبوڵی نەکردو بە حوشترەکەی خۆی بووە دەلیلی تا گەیاندیە نزیك مەدینە.

ئوم سەلەمە زۆر باسی پیاوەتی ومەردایەتی وجوامێری عوسمان دەکات، کە ئەو چاکە گەورەیەی لەگەڵ کرد، پاش ماوەیەك عوسمانیش موسوڵمان بوو لە فەتحی مەککەدا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاسی ئەو هەڵوێستە مەردانەیەی کردوو کلیلی کەعبەی دایە دەست... صەحابەکان دەفەرموون: بەخوا هیچ کارێك نابینین بۆ هیدایەتی عوسمان ، تەنها ئەو پیاوەتی وچاکەیە نەبێت کە لەگەڵ ئوم سەلەمە کردی و خوای گەورەش پاداشتی دایەوە لەسەری.

بەڵێ ئیمانداران: خوای گەورە ( الشكور ) ە واتە: ئاگای لە کارو کردەوەکانەو لەسەر کارو کردەوەی چاکیش سوپاست دەکات، هەمیشە لەگەڵ ئەم سیفەتەیدا لە قورئاندا ، سیفەتی ( عليم ) یش هاتووە ، وەکو دەفەرموێت: ﴿وكَانَ اللهُ شاكِراً عَلِيماً﴾ تا بڕوادار دڵنیابێت هەر کارێك بکات خوا ئاگاداریەتی وبەزایە ناچێت.

٥) بانگخوازی بەناوبانگ ( مامۆستا عمرو خالد ) دەفەرموێت: من پابەند نەبووم بە ئیسلامەوە، تا ڕۆژێك چووم بۆ ( بور سعيد ) لە شەقامێکدا پیاوێکی کەم ئەندامم بینی، کە لەسەر کورسی کەم

ئەندامەکان بوو، خۆی بۆ نەگیرابوویەوەو کورسییەکەی دابووی بە قەراغ شۆستەکەداو کەوتبووە خوارەوەو کەس نە دەچوو بەلایدا، من زۆر بەزەیم پێیدا هاتەوەو چووم باوەشم پێدا کردو هەڵم ساندەوەو خستمەوە سەر کورسییەکەی و دڵم دایەوە.. من ئەمەم بۆ خوای گەورە کرد، دیارە خواش ( شاکر علیم ) ە ، خوا ئاگادارە پاش یەك هەفتە بەیانییەك لەخەو هەستام دەست نوێژم شت و نوێژی بەیانیم کرد، وە هیچ هۆکارێکیش نابینم بۆ ئەو هیدایەتە ، تەنها ئەوە نەبێت کە بەرامبەر ئەو کەم ئەندامە کردم.!

بەڵێ (عمرو خالد ) خوا هیدایەتی داو کەوتە بانگەوازکردن بۆ ئیسلام و کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر خەڵکی، دیارە دەسەڵاتداران ئەمەیان پێ خۆش نەبوو، بۆیە هەڕەشەیان لێکردو داوایان لێکرد بەپەلە میصر جێ بهێڵێت. عەمرو خالد دەفەرموێت: کە لە میصر زۆریان بۆ هێنام ودەریان کردم، تەنها دەمتوانی بچم بۆ وڵاتی سعوودیە بۆ عەمرە، لەکاتی عومرە کردندا، لە تەوافی یەکەمی کەعبەیماڵی خوادا زۆر پاڕامەوەو ووتم: خوایا گیان دڵشکاوم، فریام بکەوەو دڵشکاوییەکەم بۆ چارەسەر بکە، خوای گەورە بە هاوارمەوە هات و لە تەوافی دووەمدا، پیاوێك لە تەنیشتمەوە پێی ووتم: ئەوە تۆ لە کوێیت؟ من ژێر زەویت بە دوادا ئەگەڕێم، تۆ لەسەر زەویت! ووتم : بۆچی؟ ووتی: حەزرەتی ( رَسُول الله ) ﷺ هاتووەتە خەوم کە پێت ڕابگەیەنم کە لە دوو سێ ڕۆژدا کێشەکەت بۆ چارەسەر دەکەن، پاش ئەوەش کە چوومە دەرەوەی

حەرەم، پیاوێکی ترم بینی ووتی: ها ئەوەتا فیزەی لوبنانمان بۆ وەر گرتووی ئەتوانیت بچیت بۆ ئەویٚ....

عەمرو خالد دەفەرموێت: کە لە میصر دەریان کردم ئەوەندەیان پەلە لیٚ کردم ، بواریان نەدام تەلەفۆنێك بکەم بۆ باوکم،..لە لوبنانیش لەگەڵ برادەرێکدا لە ژوورێکدا دەژیاین، زۆر شەو بەیەکەوە لە تاو بیٚ وەزعیمان دەگریاین، زۆر دوعامان کرد تا خوای گەورە دەرگای خێری بە ڕووماندا کردەوە.

بەڵیٚ بەڕاستی هەر وایە هەر کەسێك بۆ خوا بێت، خواش بۆ ئەوە، دەرگا بۆ عەمرو خالد کرایەوەو بەهۆی بەرنامەکانی کەناڵە فەزاییەکانەوە بووە کەسایەتییەکی جیهانی نەك هەر لاوە موسوڵمانەکان، بەڵکو لاوە مەسیحییەکانیش بوون بە شوێنکەوتەیی و گوێگری ووتە بە نرخەکانی.

بەڵیٚ ئاوا چاکەیەك لەگەڵ کەم ئەندامێکی هەژاری بیٚ کەس لەبەر خوا، بووە مایەی هیدایەتی و بەرز بوونەوەی ناوو ناوبانگی و بەدی هاتنی ئامانج و مەبەستەکانی لە دنیاداو پاداشتی ڕۆژی دوایشی ( ان شاء الله ).

بەڵیٚ ئیمانداران: چاکە کردن مایەی ڕزگار بوونە لە بەڵاو ناخۆشییەکانی ژیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ الحج ٧٧.

سەرنج بدەن، ڕکوع وسوژدە، واتە نوێژ کردن، لەگەڵ بەندایەتی تەواوی ژیان بۆ خوای گەورە، لە ڕۆژوو حەج و هەموو کردارێکی بە نیەتی خوا پەرستی، لەگەڵ ﴿وَافعَلُوا الخَيرَ﴾ چاکە کردندا بەیەکەوە هاتوون، کە سەرەنجامیان دەبێت بە هۆی سەرفراز بوون.

هەزاران هەزار ڕەحمەت لە دایکی بەڕێزمان، دایکی سەرجەم ئیمانداران ( خاتوو خەدیجە ) ی هاوسەری دڵسۆزو تێگەیشتووی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە فیترەتی پاکی زۆر باش لەم حەقیقەتە گەیشتبوو، ئەوە بوو کاتێك کە خۆشەویست ﷺ لە ئەشکەوتی ( حراء ) گەڕایەوەو زۆر ترسا بوو، چونکە یەکەمجار بوو جوبریلی بینینی بوو، فەرمووی ئەی خەدیجە ( لَقَد خَشيتُ عَلَى نَفسي ) بەڕاستی لە خۆم ئەترسم کە بەڵایەکم بەسەر بێ و توشی ڕووداوێکی ناخۆش ببم، خەدیجە لێی نەپرسی: بۆچی چیت دیوە؟ کێ هەڕەشەی لێ کردووی؟ چی ڕووی داوە؟ یان نەیفەرموو: خۆ تۆ لەسەر ئاینی باپیرەت ئیبراهیم، خواناسی ئەکەی و بۆ خواناسی و بیرکردنەوە لە دەسەڵاتی خوای گەورە ئەچیتە ئەو ئەشکەوتە، بۆیە توشی خراپە نابیت. نەخێر ئەمانەی نەووت و نەپرسی، بەڵکو فەرمووی: ( كَلاَّ وَاللهِ ما يَخزيكَ أبَداً ) نەخێر، سوێند بە خوا کە ( الله ) یە ، هەرگیز خوای گەورە تۆ توشی داماوی و خراپی وکزۆڵی وکلۆڵی ناکات، بەهۆی چییەوە خوا ئاوا ئەیپارێزێت؟ خەدیجە فەرمووی چونکە (إنَّكَ

لَتَصِلُ الرَّحِمَ وتَصدُقُ الْحَدِيثَ وتَحْمِلُ الْكَلَّ وتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ وتُقْرِى الضَّيْفَ وتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ) رواهُ البُخاري

واتە: بەڕاستی ئەی محمد تۆ کەسێکیت کە: سیلەی ڕەحم بەجێ دێنی و سەردان و چاکە لەگەڵ خزمەکانتدا دەکەی راستگۆیت و بەدەم داماوەوە دێی و یارمەتی دەست کورت وهەژار ئەدەی، ڕێز لە میوان ئەگریت، لە تەنگانەدا دەستباری بار کەوتوو دەکەی.

بەڵێ ئەم ژیانە پڕیەتی لە نموونە: هەموو ئەو ( عِلم اليَقين )ەی کە دەیزانین و دەیڵێین، لەسەر ئەوەی کە چاکە کردن لە بەڵاو ناڕەحەتی ئەتپارێزێ و ڕزگارت ئەکات، بۆمان ئەکات بە ( عِلمَ اليَقين ) و بەچاوی سەر دەیبینین.

ڕۆژانە دەبینین کە چاکە مایەی ڕزگار بوونی مرۆڤە لە غەم، لە مەراق وخەفەت، لە نەخۆشی، لە ناخۆشی، لە کەوتن، نازانی خوای گەورە بەچی لێت ڕازی دەبێ و سەرفرازت دەکات، جاری وا هەیە بە پەرداخە ئاوێک کە دەیدەیتە هەژارێك، دەیان نەخۆشیت لەسەر لادەچێت.

جارێکیان پیاوێک هاتە خزمەت ( عبدالله ی کوڕی موبارەك ) عەرزی کرد قوربان: برینێك لە ئەژنۆم پەیدا بووە، حەوت ساڵە دکتۆر نەماوە نەگەڕێم، چارەسەری نییە، چی بکەم باشە؟ زاناو خواناسی گەورە ( عبدالله ی کوڕی موبارەك ) لەبەر ڕووناکی نوری ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت: (صَنَائِعُ

المَعْرُوف تَقِي مَصَارِعَ السُّوءِ وَالصَّدَقَةُ خَفِيّاً تُطْفِيءُ غَضَبَ الرَّبِّ ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ زِيَادَةَ فِي العُمُرِ) رواهُ الطَبَراني.

واتـە: کـردەوەی جـوان وچـاکە کـردن لەگـەڵ خـەڵکی، لـە دیمـەن وپێشهاتی دڵتەزێن دەتپارێزێت، خێرو بەخشین بە نهێنـی، تووڕەیی خوا دەکوژێنێتەوە، بەجێ هێنانی سیلەی ڕەحم تەمەن زیاد ئەکات، بەبەرەکـەتی دەکـات وبەخۆشـی دەژی و دوور دەبیـت لـە نەخۆشـی و ناخۆشی، وە لە ژێر بەرەکەت ونووری فەرموودەی پێغەمبـەرەوە ﷺ کـە فەرموویـەتی: (دَاوُوا مَرْضَـــاكُمْ بالـــصَّدَقَةِ) حَسَّنَهُ الألبـاني في صَحيح الجامع(٣٣٥٨).

واتە: دەرمانی نەخۆشییەکانتان بکەن بە خێرو خێرات وبەخشین لە ڕێی خوادا.

لـەم ڕووەوە، بـەم تێگەیشتنەوە، ( عبـدالله ی کـوڕی موبـارەك ) بـە کابرای فەرموو: کـاکی خـۆم بـڕۆ چاو بگێڕەو وورد ببـەوەو شـوێنێك بدۆزەرەوە کە ئاوەدانییـەك بـێ و خـەڵك لێـی نیـشتەجێ بـن، بـەڵام بـێ ئاو بن و کەم ئاوی ژیانی لێ تاڵ کردبن، بڕۆ لەو جێگایە ناوی خوای لـێ بێنـەو بـە دڵێکـی پاکـەوە دەسـت بکـە بـە بـیر لێـدان و وەسـتاو کرێکـاری بـیر هەڵکـەنی بخـەرە سـەر تـا بـە ڕەحمـی خـوای باڵادەسـت دەگاتـە ئـاوێکی جـوان و زۆر، ئـیتر لـە پێنـاوی خـوادا بیبەخـشە بـەو خەڵکـەو خـۆتی لـێ مەکـە بـە خـاوەن، ئومێـدم وایـە بـە ڕەحمـی خـوا هەرکـە ئـاو لـەو بـیرە خورایـەوە، خـوای گـەورە شـیفای ئـەو برینـەی ئـەژنۆت بـدات. ( فَفَعَلَ الرَّجُلُ فَبَرِء) کـابرا ئامۆژگارییەکـەی ( عبـدالله

ی کوڕی موبارەك ) جێ بەجێ کردوو بیرەکەی هەڵکەندوو خوای گەورە بەرەکەتی خستە ناو ئاوەکەوەو خەڵکی ئەو ناوە پێی حەسانەوەو گەلێك دوعای خێریان بۆ کردوو خوای گەورە شیفای داو برینەکەی ئەژنۆی چاك بویەوەو کۆتایی پێ هات.!

لەم سەردەمەی خۆشماندا ڕووداوو بەسەرهاتی زۆر هەن لەو بارەیەوە، بۆ نموونە: لە کتێبی ( مِـن عَجائِـب القَـدَر ) دا کە لە نوسینی ( محمد عوسمان عوسمان ) ە لە ژێر ناونیشانی( الغریقان ) دا ، بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە وڵاتی سووریا ڕووی داوە، بەسەرهاتەکە بەم جۆرەیە:

پیاوێکی دەوڵەمەندی سەرمایەدار کە ماڵی لەناو شاری دیمەشق دەبێت، بەڵام باخ وبێستانێکی لە دەرەوەی شار دەبێ و لەناو باخەکەدا خانووێکی جوان دروست دەکات، بۆ ئەوەی ئەو کاتانەی کە بۆ گەشت و سەیران وئیسراحەت، چوونە دەرەوەی شارو ناو باخەکە، لەو خانوەدا ئیسراحەت بکەن و پشوو بدەن، ئەم خانووە کە هەموو کەل وپەلێکی پێویستی ماڵی تێدا بوو، لە تەنیشت خانووی باخەوانەکەیەوە دروستی کردبوو، کلیلی لای خۆی بوو، ڕۆژێکیان کە لە شوێنێکی ترەوە دەگەڕێتەوە، پێش ئەوەی بگاتە دیمەشق لا دەداتە ناو باخەکەیەوە بە مەبەستی تەماشا کردنی و هەواڵ پرسی باخەوانەکەو زانینی چۆنیەتی باخەکەی ودرەختەکانی، بەڵێ لائەدات و دوای گفتوگۆ لەگەڵ باخەوانداو گەڕانێك بەناو باخەکەدا، دەیەوێت سەیرێکی ناو ماڵەکە بکات، کاتێك دەچێتە ژوورەوەو تەماشا دەکات،

وا جامێـك كـە نیوەیـە لـەئاو دانـراوە كـە جـاری پێـشوو خێـزان ومناڵەكانی جێیان هێشتووە، مشكێك كەوتووەتە ئاوەكەوەو هەموو هەوڵێك ئەدات بۆ ڕزگار بوون، بەڵام هەوڵەكانی بێ سوودن بە هۆی بەرزی لێواری قاپەكەو لوسی دەفرەكەوە، وە كە ئەم پیاوە دەبینێت زیـاتر هـەوڵ ئـەدات بـەڵام بێـسوود دەبێـت، دیـارە ئـەم مـشكە لـە زینـدەوەرە پـیس و زیانبەخشەكانەو كوشتنی دروسـت و پێویـستە، بەڵام ئەم پیاوە كە بەم زەلیلییە دەیبینێت، بەزەیی پێیدا دێتەوەو بڕیار ئەدات نەیكوژێت، بۆیە بە قاپەكەوە دەیهێنێتە دەرەوەو بەرەڵای دەكات، ئەم كارەی كردو ئەم بەزەییە لە دڵیا جووڵا، دەرگای داخست وبـەرەو ماڵـەوە ڕۆیـشتەوە، كـە نزیـك مـاڵی خۆیـان بویـەوە تەماشـا دەكات قەرەباڵغیەكی زۆر لە دەوری ماڵەكەیانە، دڵی دادەخورپێ و بە پەلـە لـە ئوتومبێلەكـەی دادەبـەزێ و لـە خەڵكەكـە دەپرسـێت: ئـەوە چییە؟ چی ڕووی داوە لـە مـاڵی ئێمـە؟ ئەوانیش دەڵێن: سـوپاس بۆ خـوا شـتێكی دڵ ناڕەحەتكـەر ڕووی نـەداوە، شـوكری خـوا بكـە، كوڕەكەت كەوتە ناو بیری حەوشەكەتانەوە، كە بیر پاككەرەوە هاتبوو خاوێنی بكاتـەوە، نیـوەڕۆ كـە دەسـت هەڵدەگرێت، لـە بیری ئەچێت سەری بیرەكە دابپۆشێتەوە، لەو كاتـەدا كوڕە پێنج شەش ساڵەكەت دەچێتە سـەر بیرەكـەو دەیـەوێت تەماشـای نـاو بیرەكـە بكـات، بـەڵام وەختێك ئەزانێت بەسەردا دەكەوێتە نـاو ئەو بیرە قوڵەوە كە ئاوێكی زۆری تێدایە، كەسیش ئاگای لێ نییە، تـا نیـوەڕۆ كابرا نوێژ دەكات ونـان وچـا دەخـوات و دەچـێتەوە نـاو بیرەكـە، تەماشـا دەكـات وا

منداڵەکە لەناو بیرەکەدایەو بەڵام ( سُبحانَ الله ) سەری بە دەرەوەیەو لەو هەموو ئاوەدا سەری نقوم نەبووەو بە ئاگایە،! هەر خێرا دێتە دەرەوەو حەبلی پێویست دەباتە خوارەوەو منداڵەکە دێنێتە دەرەوەو ئیتر دایك و خوشك و دەرو دراوسێ کۆ دەبنەوەو منالەکە دەگەیەننە نەخۆشخانە، بەڵام سوپاس بۆ خوا زۆر باشەو هیچ زیانی پێ نەگەیشتووە.!

کابرای دەوڵەمەند بیردەکاتەوە، لەو کاتەدا کە ئەم ئەو مشکەی نەکوشت و زەلیلی نەکردو ڕزگاری کرد، لەوکاتەدا بووە کە کوڕەکەی کەوتووەتە بیرەکەوەو خوای میهرەبان ڕەحمی پێ کردووەو کوڕەکەی پێ بەخشیوەتەوە لە کاتێکدا کە بە هەموو پێوانەیەکی مرۆیی دەبوایە بخنکایە، یان سەری بە گونجی بیرەکەدا بدرایە، یان لە ئاوەکەدا نقوم ببوایە تا دەخنکا، بەڵام سەلامەت دەرچوو.

بەڵێ هیچ چاکەو بەزەیی هاتنەوەیەك بە زایە ناچێت لای خوای گەورە ، با ئەو بەزەییە بە جانەوەرێکی پیسی زیانبەخشیشدا بێت، ئەی ئەو کەسەی کە مرۆڤێك ڕزگار دەکات لە بارێکی گرانی سەرشان، وەکو هەژاری، قەرزاری ، نەخۆشی، کە خەریکە دەیخنکێنێت، تۆ هاوکاری دەکەی و ڕزگاری دەکەی، دەبێ چۆن خوای گەورە دەرگای خێرت لێ بکاتەوە.

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر ئەتەوێت بەختەوەر بیت لە ژیانتدا، چاکە بکە.

( دکتور محمد راتب النابلسی ) له ( مَوسوعة أسماء اللهِ الحُسنی ) دا دەفـەرموێت: بـرادەرێکم بـۆی گێڕامـەوەو ووتـی: دراوسـێیەکی تازەمان هاتە لاوە، زۆر هەژارو دەست کورت بوو، کەسی نەدەناسی، شەوێکیان لە دەرگای ماڵی ئێمەی داو بە شەرمەوە داوای لێکردم کە ئەگەر بگونجێت هاوکاری بکەم و منداڵەکەی بە ئوتومبێلەکەم بۆ بگەیەنمە نەخۆشخانە، چونکە شەو درەنگەو پارەی تەکسی پێ نییە، پیاوە باشەکە دەڵێت: منیش زۆر بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیم لێ کردوو، پێم گووت: سەیارە هی خۆتەو پارە لە خزمەتدایە، منداڵەکەمان بردە لای دکتۆرو پارەی دەرمانەکانم بۆداو، هێنامنەوە بۆ ماڵەوەو ئەویش زۆر دوعای خێری بۆ کردم. سوێند بە خوای گەورە تا ماوەی دوو سێ هەفتە لە خۆشی و فەرەحییەکی دەروونی وادا بووم، ئەوەندە سینەم شادو دڵم خۆش بوو، کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو.

ئیمانداران: چۆن لە ژیانی دونیاماندا کێ بڕکێ وموونافەسەی یەکتری دەکەین لەسەر زیاتر دەوڵەمەند بوون و خۆش گوزەران بوون، جێگای خۆیەتی و زۆریش پێویستترە، لەسەر کارو کردەوەی چاکە کێ بڕکێ و موونافەسەی یەکتری بکەین، چۆن لە معامەلەو بازرگانیدا ئەگەر شتێك شك بەری خێر بکاو دەست کەوتێکی باشت دەست دەکەوێت لێیەوە، هەوڵ ئەدەی پێش هەموو کەس بگەیتە سەری و هەر بەشەو خۆتی دەگەیەنیێ و نایخەیتە ڕۆژ، دەی بۆ توێشووی قیامەتیش ئاوابە.

قاعیدەیەکی فیقی زێڕین هەیە کە دەڵێت: ( لا إِثارَ في القُــرآن ) بۆ نموونە: ئەگەر بۆشاییەك هەبوو لە ریزی نوێژ خوێنانـدا، لـه ریـزی بەردەمتا، ئەبێت تۆ پڕی بکەیتەوە تا خێری زیاترت دەست بکـەوێت. واتە: هەر شوێنێکت لە پێشەوە پێ پڕ دەکرێتـەوە، بیکـەو چاوەڕێی کەس مەبەو مەیدە بەسەر شانی کەس داو ئەو خێـرو پاداشـتەو نزیـك بونەوەیە لە خوایە، لە کیس خۆت مەدە.

بـەڵام بـە داخـەوە بـەهۆی کـەم حـاڵی بـوون لـە دینـەوە زۆرجـار بینیومانـە لـە ریـزی یەکـەمی نوێژخوێنانـدا کـەلێنێك هەیـە، کەچـی هـەمووی سـەیری یـەك دەکـات و چاوەڕێیە کەسـێکی تـر بـچێتە ئـەو شوێنە، بەڵام خۆی ناچێت تا ئەو خێرە گەورەیە بۆ ئەو بێت.

یــان جــاری وا هەیــە خێــر هەیــەو خێرتــر هەیــە، ئــەبێت تــۆی موسوڵمان هەوڵ بدەی خێرترەکە بکەی، لە قورئانی پیرۆزدا بـەردەوام ( أحسن ) ئەبینیت لە جیاتی ( حسن ) .

هــاوەڵی بــەڕێز ( أبــو هــورەیرە ) لــە مزگــەوتی پێغەمبــەردا ﷺ ئیعتیکافی دەکرد، مابوویەوە لە مزگەوتدا بە مەبەستی خواپەرستی، مزگەوتی پێغەمبـەر ﷺ ئـەو مزگەوتـە پیرۆزەیە کە: یـەك نوێـژ تێیـدا بەرامبەر بە هەزار نوێژە لە مزگەوتەکانی تردا، جگە لە کەعبە، چونکە لە ( مَسجِدُ الحَرام ) دا یەك نوێژ بەرامبەر بە سەد هەزار نوێژە.

مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ باخێکە لە باخەکانی بەهەشت:( ما بَــينَ بَيتي وَ مِنبَري رَوضَـــةٌ مِـــن رِيــاض الجَنَّـــةِ ) لـە نێوان ماڵەکـەم ومینبەرەکەمدا باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت.

ئالەو شوێنە پیرۆزەدا أبو هورەیرە نیەتی ئیعتیکافی هێناوەو دانیشتووە بۆ خواپەرستی، وەختێك سەری هەڵبڕی تەماشای کرد وا کەسێك لە گۆشەیەکی مزگەوتەکەدا بە غەمبارییەوە دانیشتووە، ئەویش چوو بۆ لایی و پرسیاری غەمبارییەکەی لیٚ کرد، کابراش حاڵ و وەزعی خۆی بۆ باس کرد، أبو هورەیرە لە هۆکاری غەمبارییەکەی تێگەیشت و ووتی: کاکە گیان هەستە بابڕۆین بە پشتیوانی خوای گەورە من کارەکەت بۆ جێبەجیٚ دەکەم و گرفتەکەت نامێنێت، پیاوەکە ووتی: ئەی ئیعتیکاف و خواپەرستییەکەی ناو مزگەوتی پێغەمبەر واز لیٚ دێنیت و دێیت بەدەم منەوە؟! أبو هورەیرە سەیرێکی لای مینبەرەکەی پێغەمبەری خوای کردوو فەرمووی: بە خوا ئالەو شوێنە پیرۆزەدا گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە فەرمووی: ( وَاللهِ لَأَن أَمشيَ مَعَ أَخي في حاجَتِهِ خَيرٌ لي مِن صِيامِ شَهرٍ وَ إِعتِكافِهِ في مَسجِدِي هذا ) سوێند بە خوای گەورە ئەگەر لەگەڵ براکەم دا بڕۆم بۆ ئەوەی ئیش و پێویستییەکی بۆ جێبەجیٚ بکەم، ئەوە بۆ من زۆر چاکترە لەوەی کە مانگێك بە ڕۆژوو بم وە مانگێك ئیعتیکاف بکەم لەم مزگەوتەی خۆم دا.!

ئەمجا أبو هورەیرە لەگەڵ کابرادا ڕۆیشت.

بەڵیٚ أبو هورەیرە لە عیبادەتێکی گەورەدا بوو لە شوێنێکی گەورەو پیرۆزدا، بەڵام کە خێرێکی گەورەتر هاتە پێشەوە، بەدەم خێرە گەورەترەکەوە ڕۆیشت.

بەڵێ خزمەت کردنی خەڵك و کار بۆ ئاسان کردنیان و لابردنی غەم لەسەر دڵەکانیان، لە ئیسلامدا لە عیبادەتە گەورەکان حیساب کراوە. ( خَيرُ النَّاسِ أنفَعُهُم لِلنَّاس ) .

بەڕێزان: دەبێت ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە ڕاست بکەینەوە کە کەسانێك لە موسوڵمانان واتێگەیشتوون کە خواناسی و ئیسلامەتی تەنها نوێژە، یان دوژمنایەتی خواو دینی ئیسلام هەر تەنهاو تەنها نوێژ نەکردنە، بۆیە قورئانی پیرۆز ئەم هەڵەیەمان بۆ ڕاست ئەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ۝٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ۝٣ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ۝٦ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ۝٧﴾ الماعون ١-٧

واتە: ئایا تۆ ئەو کەسەت بینیوە کە باوەڕی بە ئاینی خودا نییەو بە درۆی دەزانێ؟! ئەو کەسە لە لای خودا کەسێکە کە بە خراپە لەگەڵ هەتیودا دەجوڵێتەوەو بەتوندی پاڵی پێوە دەنێ و دووری دەخاتەوە، وە هانی کەس نادات بۆ خواردن بەخشین بە هەژاران ونەداران، ( ئەم فەرمایشتە پیرۆزە وا ئەگەیەنێت کە ئادەمیزاد سەرەڕای ئەوەی کە پێویستە لەسەر خۆی یارمەتی هەژارو کەم دەستان بدات، دەبێت هانی خەڵکیش بدات بۆ ئەو یارمەتیدانە پڕ خێرو پاداشتە) .

لە ڕۆژی دوایدا وەیل وفەوتان وقوڕ بەسەری بۆ ئەو دوو ڕووانەیە کە لە نوێـژ کردنـی ڕاسـتەقینە غافـڵ وبێئاگـان، ئەوانـەی کـە نوێـژ دەکەن، بەڵام مەبەستیان نوێژکردنی ڕاست وپەسەند کراوی خوای گـەورە نییـە، بـەڵکو مەبەسـتیان ئەوەیـە کـە دوو ڕوویـی خۆیـان بشارنەوەو خۆیـان بـە نوێـژخوێن بخەنـە پـێش چاوی ئیمانداران و بیانخەڵەتێنن، هەروەها وەیل و ماڵوێرانی بۆ ئەو کەسانەیە کە خێرو چاکەیان لیٚ ناوەشێتەوەو دەست نوقاوو بیٚ خێرن و دەست بەسەر هەموو شتێکی خۆیاندا دەگرن، تەنانەت ئەگەر داوای ( کتێبێك، یان مەنجەڵێك یان چەکوشێك ) یان لیٚ بکرێت، با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، هەر نایدەن. ( تەفسیری گوڵشەن ) .

بەڵیٚ ئەگەر بە ووردی لە ئایەتەکانی ئەم سوڕەتی ( الماعون ) ە ووردبینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن ئاوڕدانەوە لە هەتیوی بیٚ سەرپەرشـتیار لەگـەڵ برسـییەتی خـەڵکی و نـەبوونی بیمـەی کۆمەڵایـەتی و لـە پـێش سـستی نوانـدن لـە نوێـژدا هـاتووەو لـە دوایشەوە ڕیابازی و مەنع کردنی پێویستی لە هاوڕیٚ و دراوسیٚ و خەڵکی، بە هەموویان بریتین لە بەدرۆ زانینی ئاینی خوا، ئەمە لەسەر ئاستی تاك وخێزان، خۆ لەسەر ئاستی حکومەت گەورە ترە.

کەواتە: حکومەتی بیٚ دین کە خوا لێی نارازییە، ئەو حکومەتەیە کە: دانیشتوانەکانی، هەتیوەکانی بیٚ نازبن، زۆربەی میللەت ڕەش وڕووت وبرسی بن، بە هۆی خراپی داهاتی تاك و بەفیڕۆچوونی

سامانی نیشتمانی و کۆبونەوەی سامان لە دەستی بەرپرسانی وڵات دا و تەخش وپەخش کردنی بە ئارەزووی خۆیان.

وە زۆربەی کارەکانی حکومەت بۆ ڕیابازی بێ و تەنها ڕاگەیاندن وقسە بێت و بۆ خەڵەتاندنی میللەت بێت، وە هاوڵاتیان لە سادەترین مافەکانی ژیان بێبەش بکات، وەکو ئاو و کارەباو سووتەمەنی و پێداویستی نەخۆشخانەو خوێندنگاو ڕێگاوبان. جا حکومەتی ئاوا ئەگەر لە ئاڵاکەشی نوسرابێت ( لآ إِلَهَ إلاّ الله ) ئەوە دینی خوای بە درۆ زانیوەو خوای گەورە لێی توڕەو عاجزە.

بەڕاستی زۆر گرنگە لە مانای چاکە کردن تێبگەین، گەورەترین چاکەی کاربەدەست دوای بەجێهێنانی فەرزەکان، بریتییە لە خزمەتی میللەت، لە بوژانەوەی ئابووری ، لە پێش خستنی ڕۆشنبیری، لە پاراستنی ناسنامەی نەتەوەی و میللی، دروست کردنی قوتابخانەو نەخۆشخانەو چاککردنی ڕێگاوبان و بەگەڕ خستنی کارخانەو دەزگای بەرهەم هێنان و ئاسان کردنی کشتوکاڵ و بازرگانی ودۆزینەوەی کار بۆ کەسی بێکارو ئەنجامدانی دادپەروەری و پاراستنی سنووری وڵات بە ڕووی دەرەوەداو ڕێگرتن لە هێنانە ناوەوەی هەرشتێك کە زەرەر لە دین وژین و ڕەوشتی ئەو میللەتە ئەدات... لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە: ڕۆژێکی سەرکردەیەکی دادپەروەر باشترە لە عیبادەتی شەست ساڵ .

وە جەماوەرو میللەتیش دەبێت ئەوە بە عیبادەت و ئەنجامدانی کاری چاکە بزانن، کە کاتێك حکومەت کەم وکوڕی نواند لە واجبی

سەر شانی دا، ئەوە دەبێت میللەت ڕەخنەی لێ بگرێت، ئاگاداری بکاتەوە، بە نوسین، بە خۆ پیشاندانی هێمنانە، بەکۆڕوسیمینار، هەر هیچ نەبێت دەبێت هاوڵاتی لە دڵدا بڕیاری لابردنی خراپە بدات و سوور بێت لەسەر چاکەکاری و حەز کردن بە چاکە، هەرچەندە ئەمەیان لانیکەمی ئیمانە.

بەڵێ ئیمانداران: ژیان بەسەر دەبەین و شەوو ڕۆژ بە دوای یەکدا دێین و لە تەمەنمان کەم دەبێتەوە، تاکە شتێك کە سوودمان پێ دەگەیەنێ و لێی پەشیمان نین، ئیمان وکارو کردەوەی چاکە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ۝٣﴾ العصر.

بەڵێ لە دنیادا چاکە بکە ، چاکە دێتەوە ڕێت: لەسەرە مەرگا، لەناو قەبرا، لە دوای زیندوو بونەوەت لە مەیدانی مەحشەرو سەر تەرازووی کردەوەکانتا، ئەو چاکەیە دێتەوە ڕێت، جا کەوایە گەر ئەتەوێت سەرفرازی دنیاو قیامەت بیت چاکەکار بە.

هەزار ڕەحمەت لە شاعیر کە دەفەرموێت:

{ گەر ئەتەوێ کاتێ مردی، بەرەو گۆڕی تاریان بردی، فرمێسکی گریانی یاران، بۆت ببارێ وەکو باران، گەر ئەتەوێ سیماو یادگارەکانت، ڕەفتارو گوفتارەکانت، لە دڵان بیر نەچێتەوە،

خۆشەویستیت نەقشی بەرد بێ و نەسڕێتەوە، وا گوێ بیستی ئەم پەندە بە:

— تەنها لە بۆ خوا بەندە بە، میهرەبان وڕووخۆش ودەم بە خەندە بە، تا دەتوانی ئاسانکاربە، شەیدای کار بە، چالاکانە پەلامار بە، بۆ یارانت خەم خۆرو خزمەت گوزار بە، بۆ بار کەوتووان دەسبار بە، بۆ مەردێتی سەربازێکی شاراوە بە، بۆ ئازاری کاروانییان حەکیمێکی ئەو ئاوە بە، بە جوان پۆشی و بە بۆن خۆشی، وەکو خونچەی کراوە بە، بۆ کاروبار دڵگەرم بە، لە بۆ یاران دڵنەرم بە، کاڵای حەیا لەبەر بکەو جوان ناسێکی پڕ شەرم بە...

خانەدان بە، نادان مەبە، چەوری خۆری دیوان مەبە، هەر کارێکیان پێ سپاردی نۆشی گیان بە سندان مەبە، لە مەیدانا خۆ بنوێنە، ( بسم الله ) کەو ڕامەمێنە، کە وترا سەر مەخورێنە، هانای هێنا مەیتۆرێنە، مەیشکێنە، مەیڕوخێنە، هەوری بەهارە ساڵ مەبە، زبرو مۆن و ڕووتاڵ مەبە...

ئاممان خوشکە، ئاممان برا، هەرچی وتراو هەرچی کرا، هەرمافێکت زەوت کرا، گەر لەبەر خوا لەبیر کرا، دوکەڵ ناکەی وەکو چرا، نایکەی بە گۆڵمەزو هەرا...

لە کردو کۆ دەغەڵ مەبە، وێنەی پیاوی تەمبەڵ مەبە، خاوەن بیانوو گێچەڵ مەبە، سینەساف بە، مەتەڵ مەبە، هەرچیت کردوو هەرچیت کۆشا، هەرچی تاڵی وسوێریت نۆشا، هەرچی بەرگی غەمت پۆشا، ئیتر دوایی مەیلێرەوە، لاف لێمەدە بەو خێرەوە، کە تۆزێ دڵت

گەرم بوو، وەکو برین مەکولێرەوە، گەر ڕووتاڵی کرا بە خوو، ئەگەر تانە درا لە ڕوو، ئەوا یاران دڵگیر دەبن، لە خوو خەندەت زویر دەبن...

خۆ گەر درکێ چەقی لە پێت، ئەگەر کۆسپێك هێنرایە ڕێت، خۆڕاگر بەو چۆك دامەدە، بۆ کاری تر مل بامەدە، گەر بەخشینی سەریشت بێ، بۆ خوا سازو ئامادە بە، هەر بەخششێ، هەر بەهرەیە، کە خەڵاتی خوای گەورەیە، بیخە خزمەت بۆ دەورو بەر، تا وەکو دار لە هەردوولا بۆت بێتە بەر، ئەگینا خوا ئەیباتەوە، وەك گەزۆی دار ئەیشواتەوە، ئەوسا بگری وبناڵێنی، لای سۆزت لێ ناکاتەوە...

هاکا لاشەت وا هاتە پێش، خەزان ومەرگ هاتنە پێش، فریشتە گیانیان لێ سەندی، یا بەڕووی خۆش یا کێشە کێش، دە ڕامێنە لەو هەگبەیەت کە لە مەحشەر لەگەڵتایە، بزانە چەندە دەست مایە، چەندی دان وچەندی کایە، چونکە ڕێگای هات ونەهات لە ڕێتایە ...}

لە کۆتایی ئەم ووتارەشدا، بە بیری خۆم وئێوەی بەڕێزیش دێنمەوە، کە با ئاگامان لە ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە بێت، هاوەڵی بە ڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ( ابي قَتادة ) دەفەرموێت: ( سُئِلَ رَسُولَ الله ﷺ عَن صَومِ يَومِ عَرَفَةَ، قالَ: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الماضيَةَ وَ الباقيَةَ ) رَواهُ مُسلِم.

واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە، کە خێرو پاداشتی چۆنە؟ خۆشەویستمان، نووری

چاومان، لە هەموو کەس دڵسۆز ترمان، فەرمووی: خوای گەورە دەیکات بە کەفارەت ولابەری گوونـاهی سـاڵی ڕابـردوو، وە گوناهی ساڵی داهاتوو، ئای چ خەڵاتێکی گەورەیە کە خوای پەروەردگار بەم ئوممەتی ئیسلامەی بەخشیوە، دەبا لە دەست خۆمانی نەدەین، خوای گەورە ڕەحممان پێ بکات و بۆ کاری چاکە یارمەتیمان بدات..

# سەرچاوەکان:ـ


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری گوڵشەن — نظام الدين عبد الحَميد

٣. مِن وَصايا الرَسول ﷺ — طه عبدالله العَفيفي

٤. بەرەو ئیسلام ... ئارامی — ئەندازیار عوسمان

٥. السلسِلة الذَهَبية — محمود المِصري

٦. مِن عَجائِبِ القَدَر — محمد عثمان عثمان

٧. مَوسوعَة أسماءُ اللهِ الحُسنى — د. محمد راتب النابلُسي

٨. بەرەو ئیسلام ... ئاشتی — ئەندازیار عوسمان

٩. گۆڤاری بانگی حەق — ژمارە ٢٣

١٠. التَرغيب وَالتَرهيب — للحافظ المُنذري

١١. تریفەی مانگ... پەخشانە شیعر — م. مەلا غریب پێنجوێنی

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ أجمَعينَ:

ئیمانـداران: بۆ ڕوونکردنـەوەی بابەتـەکان و چاکتر تێگەیـشتن لـە شتە گرنگەکانی ژیان، خوای گەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا گـەلێك شتی شـوبهاندووە بـە شـتی تـر، بـۆ نموونـە: کـافرو بـێ بڕوایـان کاتێـك گوێبیـستی قورئـان دەبـن و گـوێ ی بـۆ نـاگرن، بـە ( کـەرە کێـوی ) چـوواندوون، کاتێـك چـاوی بـە شـێر دەکـەوێت وەکـو دەفـەرموێت: ﴿كَأَنَّهُم حُمُرٌ مُستَنفِرَة. فَرَّت مِن قَسوَرَة﴾.

یـان زانایـەك کـە کـار بـە زانـستەکەی نـەکات، شـوبهاندووبەتی بـە گوێدرێژێك کە باری کتێبی لەسەر دانرابێت: ﴿كَمَثَلِ الحِمارِ يَحمِـلُ أسفاراً﴾ .

بە پشتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەشدا، نموونەیـەك دێنینـەوەو لێکچوونێك لە قورئانی پیرۆز هەڵدێنجین ئەویش لە نێوان ئاوو ئیمان:

خوای گەورە باسـی ئـاو دەکـات و دەفـەرموێت: ﴿وَجَعَلنا مِنَ الماءِ كُلَّ شَيءٍ حَيٍّ﴾.

وە باسـی وەڵامدانـەوەی خـوای گـەورە دەکـات ، کاتێـك بـانگی بەندەکانی دەکات و فەرمانێکیان بەسەردا ئەدات، کە ئەمەش ئەصڵی ئیمانـە. دەفـەرموێت: ﴿يأَيُهَا الَّذينَ آمَنوا استَجِبُوا لِلَّهِ وَ لِلَّرَسُـولِ إذ دَعاكُم لِما يُحيكُم﴾ . لێرەدا ووشەی لێکچوو ژیانە. ( حَي ) ( يُحيِكُم ) لێکچووەکانیش ( وَاللهُ اعلَم ) لەم ڕووانەوەیە:

١. هیچ زیندەوەرێك بێ ئاو ناژی، ژیانیش بەبێ هەموو شتێك دەبێت بەڵام بێ ئیمان نابێت، ئەوەتا دەیان میللەت وگەل هەبوون، بێ پارەو سامان، بێ عیلم ومەعریفەت، بێ قوتابخانە، بەڵام یەك گەل نییە لەسەر ڕووی زەوی بێ دین بێت، تەنانەت ئەوانەی ( ئیلحادین ) دینەکەیان ئەو مەنهەجە ئیلحادییەیە کە پەیڕەوی دەکەن.

جا ئەگەر مرۆڤ دینی حەقی دەست کەوت، ئەوا ڕێگای ڕاستی دۆزیوەتەوە، بەڵام کە دینی حەقی نەدۆزییەوە، ئەوا دینێکی بەتاڵ بۆ خۆی دروست دەکات، هەروەکو چۆن ئەگەر ئاوی پاکی دەست نەکەوێت بۆ لابردنی تینوێتی کە ناخی داوای دەکات، ئەوا ئاوی میکرۆباوی دەخواتەوە.

٢. چۆن ئاوی پاك لاشەت لە نەخۆشی دەپارێزێ و ژیانت تەندرووست دەکات و هەموو خواردن و خواردنەوەیەکی باش وبە سوود بێ ئاو تام و سوودی لێنابینرێت و ناخورێت، بە پێچەوانەشەوە ئاوی پیس ومیکرۆباوی، تەندروستی مرۆڤ تێك دەدات و ئاوی بۆگەن بکرێتە هەر خواردنێکی پاکەوە بۆگەنی دەکات و لەکاری دەخات.

ئیمان وباوەڕیش وایە، بەبێ ئیمان وعەقیدەی پوخت وڕاست، هیچ شتێك لە ژیاندا مرۆڤ بەختەوەر ناکات، وە ئیمان وبیرو باوەڕی شێواویش ژیان لە مرۆڤ تێك ئەدات.

٣. ئاو سەرچاوەکەی لە ئاسمانەوە دەبارێ و تەنها ئاوی بارانە، ( پێش ئەوەی تێکەڵ بە پیسیەکانی ژینگە ببێت، کە بەرز بوونەوە بۆ

ئاسمان ) لە هەموو ئاوێك پاكترەو هەرچی پیسی و خوێ بێ تێیدا نییە، كە لە قورئانی پیرۆزدا بە ﴿ ماءً فُراتا ﴾ وەصف كراوە.

وە ئەو ئاوی بارانە كە لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە، هەموو شوێنێك دەگرێتەوە، ئیمانیش سەرچاوەكەی وەحییەو لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە، وە هەموو جێگایەك دەگرێتەوە.

٤. ئاو بە دڵۆپ دڵۆپ هیچ داد نادات، مەگەر بۆ پشكنین و ناسین، بەڵام كە زۆر بوو، ئەمجا دەبێت بە دەریاچەو مرۆڤ و گیانداروو رووەكەكان لێی سوودمەند دەبن، ئیمانیش وایە، بە تاك تاكی ئیمانداران بەرهەمی ئیمان دەرناكەوێت، مەگەر لە ڕوانگەی ئەو ئیماندارەوە ئیسلام بناسرێت، وەكو دڵۆپە ئاوەكە لە تاقیگەدا، بەڵام ئەگەر هەموو ئیمانداران چوونە پاڵ یەك، ئەوا هەموو سەرزەوی لە مرۆڤ و زیندەوەران لێی سوودمەند دەبن. بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا ﴿ يأيُها الَّذينَ آمَنُــوا﴾ هاتووە، وە تۆی ئیماندار ئەگەر بە تەنهاش نوێژ بكەی، هەر دەبێت بڵێی: ﴿إيَّاكَ نَعبُدُ وَإيَّــاكَ نَــستَعين﴾ نابێت وەكو تاك قسە بكەی.

بەڵێ كە ئیمانداران چوونە پاڵ یەك، ئەو كاتە هێزوو توانایان دەردەكەوێ و حوكم دەدەن و لە سایەی حوكمی ئەواندا تەواوی سەر زەوی سوودمەند دەبن.

٥. ئاو مردوو ناگرێتە خۆی، ئەوەتا ئاو كە زۆر بوو، بوبە ڕووبارو دەریا، ماسی مردوو فڕێ ئەداتە دەرەوەو دەكەوێتە سەر ئاوەكەو سەرەنجام كەنار ئاوەكە دەكەوێت، ئیمانیش بە هەمان شێوە كەسی

زیندوو بە ئاگا دەگرێتە خۆی، بەڵام کەسی بێ ئاگاو بێ خەبەر لە ئیسلام ، ئەگەر هەر ئیمان هێنانەکەی چاو لێکەری بوو، ئەوە دوور نییە ڕۆژێك لە ئیسلام بچێتە دەرەوەو توشی کافر بونەوە ببێ و ئیسلام لە خۆی نەگرێ و فڕێی بداتە کەنارەوە.

٦. ئاو کە یەکی گرت و بو بە دەریا، دەبێتە رووحی ئەو شتانەی دەچنە ناوی، ئەوەتا کەشتی وبەلەم لە ووشکانیدا ناجوڵێن، بەڵام کە چوونە دەریاوە دەست دەکەن بە جوڵە، مرۆڤیش بە ئیمان ڕەفتارە جوانەکانی دەکەونە جوڵە. مرۆڤ بە ( فیترەت ) ئەگەر فیترەتی نەشێوێنرێ و پیس نەکرێت، حەزی لە خێرە، ئیسلام زەکات و بەخشینی صەدەقەو قوربانی کردنی بۆ داناوە، بۆ ئەوەی ئەو خێرەی لە ناخیدایە بکەوێتە جووڵە، مرۆڤ بە فیترەت حەزی لە پاك وخاوێنییە، ئیسلام دەست نوێژو خۆشتنی فەڕزو سوننەتی بۆ داناوە.

٧. زیندەوەرانی ناو ئاو ناخەون و بەردەوام لە جم وجوڵدان، ئیمانداریش لە دەریای ئیماندا بەردەوام لە جوڵەی خێردایە، بە فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَإِذا فَرَغْتَ فَانْصَبْ وَ إِلى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾

٨. دەریا کە ئاوێکی زۆرە، پیسی دەشواتەوەو خوێ هەرگیز پیس نابێت، بە هەمان شێوە مرۆڤی کافر بە ئیمان هێنان و چوونە ناو دەریای ئیمانەوە لە گوناه پاك دەبێتەوە.

٩. دەریا بەخشندەیە، باران لە ڕێگەی بە هەڵم بونەوە دەنێرێت بۆ شوێنە دوورەکان، ئەگەر بارانیشیان بۆ نەنێرێت، لانی کەم ئاوو هەواکەی کاری گەری دەبێت بۆ هەموو ئەو شوێنانەی کە لێیەوە نزیکن یان دوورن، بە هەمان شێوە ئیمانداریش خێری دەگاتە هەموو کەسێك، هەر هیچ نەبێت بەدڵ دوعای خێریان بۆ دەکات و بێگومان دوعای ئیمانداریش بۆ براو خوشکانی ئیمانداری، کاریگەری خۆی دەبێت.

١٠. ماسی لەناو دەریادا لەزەتی ناو ئاو نابینێت، کاتێك کە لەئاو دێتە دەرەوەو دەکەوێتە تۆڕی ڕاوچییەوەو دەهێنرێتە ووشکانی، ئەمجا قەدرو قیمەتی ئاوو ژیانی ناو ئاوی بۆ دەردەکەوێ و هەر دڵۆپە ئاوێك بۆی، هەموو سەروەتی دنیا دێنێ و سەرەنجام بەبێ ئاوی سەردەنێتەوە. بە هەمان شێوەش مەگەر ئەو کەسەش لەزەتی ئیمان بزانێ، کەوا لە وڵاتی بێ دینیدا دەژی، یان لە ئیمان وئیسلامەتی دوور کەوتووەتەوەو وا لە سەرەمەرگدایە، ئەمجا دەزانێت ئیمان چەند گرنگە، چ تام و لەزەت و نرخێکی هەبووەو ئەم ئێستا هەستی پێ دەکات.

بەڵێ ئیمانداران: ئەمە ( ١٠ ) خاڵی لێکچووی نێوان ئاو وئیمان بوون، جا ئەم ئیمانە گەورەیی و عەزەمەتەکەی لە هەڵگرانیدا دەردەکەوێ ، گەورەیی مرۆڤیش بە گەورەیی ئیمانی ناو دڵیەتی.

صەحابی بەڕێز ( ئەبو زەڕی غیفاری ) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕاینەوەو فەرمووی: شەوێکیان لە خەومدا دوو

فریشتە هاتن بۆلام، یەکێکیان لەسەر زەوی و ئەوی تریان لە نێوان زەوی وئاسماندا بوو، منیش لە (بە طحا) ی مەککە بووم، یەکێك لەو دوو فریشتەیە بە هاوەڵەکەی ووت، ئەوە خۆیەتی؟ مەبەستی من بوو، فریشتەکەی تر ووتی: بەڵێ، فریشتەی یەکەم بە فریشتەی دووەمی ووت: ( فَزِنهُ بِرَجُلٍ ) فەرمووی: بیکێشە بە پیاوێك، ئەویش منی بەرامبەر بە پیاوێك دانا، بەڵام من لەو قورستر بووم، پاشان فریشتەی یەکەم ووتی: ئەمجارە بەرامبەر بە ( دە ) پیاو بیکێشە، کە کێشامی لەو دە کەسەش قورستر بووم، پاشان فریشتەکە بە فریشتەی دووەمی فەرموو: ئەمجارە بەرامبەر ( سەد ) پیاو بیکێشە، کە بەرامبەریان کردین لەو سەد پیاوەش قورستر بووم، ئەمجا فەرمووی بەرامبەر بە ( هەزار ) پیاو بیکێشە، کە کێشامی هێشتا من قورستر بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی گێڕانەوەی ئەم باسەدا بۆ صەحابەکان فەرمووی: (كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَنْتَثِرُونَ عَلَيَّ مِنْ خِفَّةِ الْمِيزَانِ ) بەڕاستی دەڵێی هەر ئێستا وا چاوم لێیە کە چۆن ئەو هەزار کەسە دەچوون بە ئاسماندا، چونکە تای تەرازووەکەیان سوك بوو.

( فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ لَوْ وَزَنْتَهُ بِأُمَّتِهِ لَرَجَحَهَا ) فریشتەکە بە هاوەڵەکەی فەرموو: بەخوا ئەگەر بە هەموو ئوممەتی بکێشی، لە هەموو ئوممەتەکەی قورسترە.

ئەم فەرموودەیە:أَخرَجهُ الدّارمي(١٤) في المُقَدِّمَةِ وَقَالَ الألباني في الصَحيحَةِ(٢٥٢٩) .

ئیمانداران: لەم فەرموودەیەدا، کە گەورەیی و ڕێزی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان دەردەخات، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، (وَاللهُ أعلَم ) کە مەبەست لە قورسی، قورسایی لاشە نییە، بەڵکو قورسایی ئەو ئیمانەیە کە لەناو دڵی مرۆڤدایە، کە بەبێ هیچ گومانێك ئەبێت ئیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیمانی هەموو ئوممەتەکەی قورستر بێت، ئەمجا دەتوانێت باری گرانی پێغەمبەری هەڵبگرێت.

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم کە ئاماژە بکەم بۆ ئەوەی کە ڕەنگە خەڵکانێکی دوور لە دین و خۆ بە فەریکە خوێندەوارزان و عەلمانی دوور لە عیلم، بڵێن: باشە عەقڵ قبوڵی ئەکات کە مرۆڤێك بەرامبەر هەزار کەس بخرێتە تەرازووەوە، کەچی هەر ئەو قورستر بێت، لە کاتێکدا وا لەبەرچاوە کە مرۆڤ هەر مرۆڤەو وا گریمان ( ٢٠ تا ٣٠ ) کیلۆ لە کەسێکی تر قورستر بێت؟! لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ ئەمە زۆر چاك عەقڵ دەیگرێ و بە نموونەیەکی بەرچاو نیشانتان دەدەین:

ئەمڕۆ سیدی کۆمپیوتەری هەیە، دوو سیدی کە لە ڕواڵەت و قەبارەدا وەکو یەکن لەبەرچاو، بەڵام لە ناوەوە یەکەمیان بە سەدان کتێبی لەسەر تۆمار کراوە کە ئەگەر بکێشرێ بە هەزاران کیلۆ قورسە، بەڵام سیدی دووەمیان تەنها چەند لاپەڕەیەکی نامیلکەی لەسەر تۆمار کراوە کە بارستاییەکەی لە ( ١٠٠ ) کیلۆ بایت تێپەڕ ناکات، ئایا دەکرێت بڵێین: ئەم دوو سیدییە کە لە ڕواڵەتدا وەکو یەك وان، لە ناوەڕۆك وناخیشدا وەکو یەکن؟ نەخێر، دەی ئیمانیش بە

هەمان شێوەیەو لە ناوەوە تۆمار کراوەو قورسی مرۆڤ بە ئیمانەوەیە نەك لاشەکەی.

ئیمانداران: ئێمە ئێستا لە جەژنی قورباندایین، ئەم قوربانی کردنە یادی سێ پاڵەوانە { إبراهیم ، إسماعیل ، هاجەرە خاتوون } ( خێزانێك هەموو ئەندامەکانی ملکەچ و گوێڕایەڵی بێ قەیدو شەرتی پەروەردگاریانن، باوك، دایك، ڕۆڵە ) هەر ئەمەیە کە وای کردووە ( إبراهیم ) بە ( أبو الأنبیاء ) ناو دەبرێت، واتە باوکی هەموو پێغەمبەران، بەڵام حەزرەتی ( نوح ، لوط ، عیسا ، موسا ) تەنها باسی خۆیان هەیە. یان خێزانەکەیان وەکو لوط موسوڵمان نەبووە، یان کوڕو خێزانەکەی موسوڵمان نەبووە، وەکو نوح، یان وەکو عیسا کە هەر ژن ومناڵی نەبووە،یان وەکو موسا کە ژن ومناڵی دیار نییە چ ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە.

کەواتە: لەناو هەموو پێغەمبەراندا، ( إبراهیم ) باوکی پێغەمبەرانە، وە حەزرەتی محمد ﷺ سەرداری پێغەمبەرانە، حەزرەتی محمد ﷺ خۆیی و هەموو خێزانەکانی هەر لە خەدیجەوە تا عائیشە وە مناڵەکانی هەموویان ، وە زاواو خەزورانی، هەمووی فیدای ئیسلام بوون.

حەزرەتی ( إبراهیم ) یش بە خەونێك، کە خەوی پێغەمبەران وەحییەو گومان لە ڕاستی و دروستیدا نییە، ئامادەیە بێ دوودڵی و بیر کردنەوە، تاقە کوڕەکەی سەر ببڕێت، کە لە تەمەنی ( ٨٠ )

ساڵیدایەو لە دوو ژن تەنها ئەو کوڕەی هەیەو ئومێدی منداڵ بوونی تری نەماوە.

پاشان دەوری فیداکارانەی ( إسماعیل ) دێتە پێشەوە، کە هەر لەگەڵ ئەوەدا باوکی فەرمانی خوای گەورەی پێ ڕاگەیاند کە دەبێت سەربڕێت، بێ هیچ دوو دڵی و بیرلێکردنەوەیەك فەرمووی: ﴿يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾ نەك فەرمووی سەرم بڕە، بەڵکو فەرمووی: چیت ئەمر پێکراوە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ئەوە جێبەجێ بکە. ﴿سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾ پشتیوان بە خوای گەورە لە خۆڕاگران دەبم، چونکە ئیسماعیل چاك لەو حەقیقەتە تێگەیشتبوو کە ئەگەر خوا ئارامیت پێ نەبەخشێت، بە ئازایەتی خۆت نییە، ئیماندار بۆیە بەهێزە، چونکە هێزو قووەتی خۆی لە خواوە دەزانێت، لە هەموو شتێکدا پشتی بە خوا بەستووە.

ئیماندارانی بەڕێز: با هەوڵ بدەین هیچ بریارێك ، هیچ پەیمانێك، هیچ هەڵوێستێك دەرنەبڕین تاکو نەڵێین: ( ان شاء الله ) خوای گەورە بە پێغەمبەری سەروەرو سالارمان دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ .

ئاممان هەرگیز مەڵێن حەتمەن وا دەکەم و وادەبێت، چونکە هەر کەسێك بڵێت: ( ان شاء الله ) ی ناوێت، ئەوا خوای گەورە دەرسێکی وای دائەدات، کە هەرگیز لە بیری نەچێتەوە.

بەڵێ ئیسماعیل فەرمووی: ﴿سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾ .

پاشان ڕۆڵی هاجەرە خاتوون دەست پێ دەکات، کاتێك شەیتان دەچێت بۆ لایی و پێی دەڵێت: إبراهیم دەیەوێت کوڕە تاقانەکەت سەرببڕێت، بەڵام هاجەرە بەبێ شڵەژان فەرمووی: ئەگەر خوا ئەمری پێ کردبێ، ڕووحی خۆشمی بە قوربان دەکەم!! ئایا خوای گەورە چۆن پاداشتی دانەوە ﴿وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴾ لە جیاتی ئیسماعیل خوای گەورە بەرانێکی گەورەی بۆ ئیبراهیم نارد کە سەری ببڕێ و بیکات بە قوربانی. وە هەتا قیامەتیش بە ملیۆنەها موسوڵمان قوربانی دەکەن و یادی { إبراهیم و إسماعیل و هاجەرە } دەکەنەوە.

بەڕاستی ئەم مرۆڤانە ژیانیان جوان کردووە، هەموو ڕەفتارێکیان خێرو بەرەکەتە بۆ مرۆڤایەتی، ئەمڕۆ ئیسلام پێویستی بە باوکێکی وەکو ئیبراهیمە، تۆش کوڕەکەت وەکو ئیبراهیم پەروەردە بکە، بیهێنە بۆ مزگەوت، ئیسلام پێویستی بە کوڕێکی وەکو ئیسماعیلە کە فەرمووی: ﴿ يَا أَبَتِ﴾ ئەی باوکی زێدە بەڕێزو خۆشەویست وئازیزم، نەیفەرموو ﴿ يا ابي ﴾ ئەی باوکە، چونکە پێشتریش لە کاتی خۆیدا ئیبراهیمیش کاتێك قسەی لەگەڵ باوکیدا دەکرد، هەرچەندە باوکی کافر بوو، هەر دەیفەرموو: ﴿يَا أَبَتِ﴾ چوار جار ﴿يَا أَبَتِ﴾ هاتووە لە باسی گفتوگۆی نێوان ئیبراهیم وباوکیدا، خوای گەورەش کوڕەکەی ئاوا بۆ موئەدەب و بەڕێز کرد( وَالجَزاءُ مِن جِنسِ العَمَل) .

گەنجانی بەڕێز چاو لە ئیسماعیل بکەن، ئاوا گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە بکەن، ئاوا ڕێز لە باوکتان بگرن، خوای گەورەش وەکو ئیسماعیل ناوتان ڕێزدار دەکات.

ئیسلام پێویستی بە دایکی وەکو هاجەرەیە، کە کاتێ حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ کوڕە مەلۆتکە تاقانەکەی لەو بیابانە ووشك و بێ ئاوو ئاوەدانییەدا بەجێی هێشت، هاجەرە هەر ئەوەندەی لە حەزرەتی ئیبراهیم پرسی: ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی کە لێرە بەجێمان بێڵی؟ فەرمووی: بەڵێ، هاجەرە خاتوون فەرمووی: ( إذاً لا يُضَيِّعنا اللهُ ) دەی ئیتر بێخەمم تۆ بڕۆ خوات لەگەڵ بێ، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە زایەمان ناکات و ئاگادارمان دەبێت.

بەڵام بە داخەوە باوکان ودایکانی ئەمڕۆ، بەزۆری هەر خەمی ئەوەیانە کە کوڕەکەیان یان کچەکەیان شەهادەیەکی هەبێت، موچەیەکی هەبێت، دەوڵەمەند بێت، بەڵام بیری لای ئەوە نییە کە گەورەترین شەهادەی لە دەست بچێت، کە ﴿لاَ إِلـَهَ إلاَّ الله مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله﴾ یە، بۆیە کاتێك ئەولادەکەشی، کوڕو کچەکەشی، بیروباوەڕەکەی لە دەست چوو، ئیتر کەسایەتی خۆشی بزر دەکات، کوڕەو هەر خەریکی ئەوەیە وەکو کچی لێ بێت، کچەو بە هەموو شێوەیەك دەیەوێت ڕەفتاری، جل وبەرگی، قسەکردنی کوڕانە بێت، لەم ناوەدا (ضائِع، مائِع) دەمێنێتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: ئێمە لە سەرەتای ووتارەکەوە باسی لێکچوونی نێوان ئاوو ئیمانمان کرد، جا چۆن ئاو سەرچاوەی ژیانی هەموو زیندەوەرێکە، ( سایتۆ پلازم ) کە بەشی هەرە گەورەی ناو خانەیە نزیکەی ( ٩٠٪ ) ی ئاوە، ئیمانیش لە ژیانی مرۆڤدا گەورەترین دەور دەبینێت، ئیمان مرۆڤی مەردو خۆڕاگرو پاڵەوان دروست دەکات. کە

مێژوو شانازی بە بونی ناوی ئەو لە لاپەڕەکانی دا دەکات، چونکە هەموو ژیانی پڕ خێرو بەرەکەت بووە، بۆ خۆی و دەوروبەری و خەڵکانی دوای خۆشی.

ئیمان ( أبوبکر )ی پاڵەوان دروست دەکات، کە ئەوەی سەلماند ئیمانداری ڕاستەقینە تەنها خوا دەپەرستێ و دوورە لە پەرستنی مرۆڤ و خۆشەویستی جیاوازە لە پەرستن، با ئەو کەسە خۆشەویستتر بێت لە گلێنەی چاوی خۆت، کە حەزرەتی محمدە ﷺ . بۆیە ( أبوبکر )ی پاڵەوان لەکاتی وەفاتی پێغەمبەردا، کە هەموو صەحابەکان خەریك بوو سەریان لێ بشێوێ و نەیاندەزانی چۆن بەرەو ڕووی ئەو موصیبەتە گەورەیە ببنەوە، چۆن لەو ڕۆژە ڕەشەدا بەرپێی خۆیان ببینن، کە مەدینە رووناکی تیا نەمابوو لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ئا لەم وەختە دژوارەدا، ( أبوبکر )ی دڵ پڕ لە ئیمان، ئەو ئەبو بەکرەی کە ئیمانەکەی پێشی خست بەسەر هەموو صەحابەکاندا، هەروەکو ( أبو بكر بن عياش ) فەرموویەتی: ( ما سَبَقَهُم أبوبكر بِكَثرَةِ صَلاةٍ، وَلا صيامٍ، وَلَكِن بِشَيءٍ وَقَر فـي قَلبِـهِ )(فضائِل الصَّحابَة لِلإمـام أَحمَـد(١٧٣/١)) واتـە: حـەزرەتی أبـو بكـر بـەهۆی نوێـژی سـوننەتی زۆری و ڕۆژوی سـوننەتی زۆرییـەوە پـێش صـەحابەکان نەکەوت، بەڵکو بەهۆی شتێکەوە پێشیان کەوت کە لەناو دڵیدا جێگیر بوو بوو، کە ئەویش ئیمانەکەیەتی. هەر بۆیە ووتراوە: ( لَـو وزن إيمانُ أَبي بَكر بِإيمان أهلِ الأرضِ لَرَجَحَ ) ئەگەر ئیمانی ئەبو بەکر

بخرێتە تای تەرازوویەکەوەو ئیمانی هەموو سەر زەویش بخرێتە تای تەرازووەکەی ترەوە، ئەوا ئیمانی ئەبو بەکر قورسترە.

ئائەم ئیمانە بوو کە وورەی ئەبو بەکری بەرز رکردەوەو فەرمووی: ﴿مَن كانَ يَعبُدُ مُحَمَّداً فَإنَّ مُحَمَّداً قَد مات، وَمَن كانَ يَعبُدُ الله فَإنَّ الله حَيٌّ لا يَموُت﴾. ئەی خەڵکینە هەرکەسێك محمد پێغەمبەری خوای دەپەرست، ئەوە محمد وەفاتی کردو ڕۆیش لەناومان، وە هەر کەسێك خوای پەرستووە، ئەوە بەڕاستی خوا هەر زیندووەو هەر زیندو دەمێنێتەوە.

ئیمان شێرە پیاوی وەکو ( عومەری کوڕی ختاب ) پێ دەگەیەنێت، کە ئەوەندە ئیمان بەهێزی کرد بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموو: ﴿يا إبنَ الخَطاب، وَالَّذي نَفسي بيَدِهِ ما لَقيَكَ الشَيطانُ سالِكاً فَجّاً قَطُ إلاَّ سَلَكَ فَجّاً غَيرَ فَجِّكَ﴾.

واتە: ئەی کوڕی خەتاب، سوێند بەو کەسەی کە نەفسی منی بە دەستە، کە ( الله ) یە، هەرکاتێك شەیتان لە ڕێگەیەکی گەورەو فراوانیشدا توشت بوبێ، ئەوا نەیتوانیوە بەو ڕێگایەدا بڕوات و بەڕێگایەکی تردا ڕۆیشتووە.

بەڵێ شەیتان بەرامبەر ئیماندار زۆر بچووکە، بۆیە لە حەجدا بە حەوت بەردی بچووکی وەکو دەنکە نۆك ڕەجم دەکرێت، وە ئیماندار دەبێت زۆر هیممەت بەرز بێت، نەك بە داخەوە هەندێ کەس ئیماندارو ئەهلی مزگەوت ئەبینن لە هەموو شتێك ئەترسێت، لە جنۆکە، لە نوشتە، لە ساحیرو سیحر، لە چاوی پیس، هەرچەند پێی دەوترێت

ئەمانە بە پەنا گرتن بە خواو خوێندنی سورەتە تایبەتەکانی ( الفَلَق، النـاس ، الإخـلاص ) و هەنـدێك زیکـری بـەیانیان و ئێـواران کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆی دیـاری کـردووین، ئەمانـە کاریگـەرییان لەسەر تۆی ئیماندار نابێت، کەچی هەر لە ترس و دڵەڕاوکێ ڕزگاری نابێت و زۆرجار بڕوای بە کۆمەڵێك خەرافیات هەیە کە لە شەرعدا نەهی کراوە لە بڕوا بوون بەو شتە خرافیات و ناڕاستانە.

بـەڵێ بـەڕێزان: ئـەوەی هێـز دەدات بـە مرۆڤـی ئیمانـدار، ئـەوەی کێشی زیاد دەکات، ئیمانەکەیەتی.. نەك بازووی بەهێزو جەستەی پتەوو قەڵەوی لاشە، پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( إِنَّهُ لَيَـأْتي الرَّجُلُ العَظيمُ السَّمينُ يَومَ القيامَةِ، لا يَزِنُ عِندَاللهِ جَنَـاحَ بَعُوضَـةٍ، وقَـالَ: إقـرَأوا:﴿ فَلَـا نُقِـيمُ لَهُـمْ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ وَزْنًـا﴾). متفق عليه(بُخاري:٤٧٢٩) (مُسلم: ٢٧٨٥)

واتە: بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا، کەسێکی لاشە گەورەی قەڵەو دەهێنرێت، بەڵام لای خوای گەورە کێشی باڵە مێشوولەیەکی نییە، چونکە ئیمانی نییە، ئـەمجا پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ئـەم ئایەتە بخوێننەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ( لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ نرخ و کێشێکیان بۆ دانانێین )، قورسی و گرانی ئیمانە کە وا دەکات، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بە قاچە زۆر باریکەکانی ( عبدالله ی کوڕی مسعوود ) بفەرموێت: ئەی صەحابەکان ئەو قاچە باریکانەی عبدالله کە ئێوە لەبەر باریکیان و لاوازییان، پێکەنینتان هاتە سەر لێو کاتێك چاوتان پێیان کەوت، بزانن ئا ئەو قاچە باریکانەی عبدالله لە

ڕۆژی قیامەتدا، لە کاتی کێشانەی کردەوەکاندا ( أَثْقَلُ فِي المِيـزانِ مِـنْ أُحُـدٍ ) رَواهُ أحمَد فِي المُسنَد (٩٢٢) وَ إسنادُهُ صَحيح.واتە: قاچەکانی لە کێوی ئوحود قورسترن.

وە کاتێك(خالیدی کوڕی وەلید) لە جەنگی فارسەکاندا داوای یارمەتی لە خەلیفە أبوبکر کرد، خەلیفە (قەعقاعی) بۆ ناردو فەرمووی: دەنگی قەعقاع لە سوپادا چاکترە لە هەزار جەنگاوەر.

وە کاتێك ( عەمری کوڕی عاص ) لە میصر داوای یارمەتی لە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب کرد، بۆ فەتحی قەڵای ( بابیلۆن )، حەزرەتی عومەر چوار کەسی بۆ ناردوو فەرمووی: ئەم چوار کەسە لە جیاتی چوار هەزار جەنگاوەرن.!

یەکێك لەو چوار کەسە ( زوبەیری کوڕی عەوام ) بوو، حەزرەتی عومەر فەرمووی: زوبەیری کوڕی عەوام بەرامبەر هەزار کەسە.! وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( لَصَوتُ طَلحَةَ فِي الجَيشِ خَيـرٌ مِن أَلفِ فارِسٍ) واتە: دەنگ و هاواری( طەڵحە ) لە جەنگدا لەناو هەر سوپایەکدا بێت، چاکترە لە هەزار سوارچاك.!

ئەمانە ئیسلام پێی گەیاندن، ئیمانی ناو دڵیان گەورەی کردن، ئەگەر ئیسلام نەبوایە هەرگیز ناویان ئاوا بەبەرزی و بڵندی نەدەمایەوە، کە هەتا قیامەت بە شانازییەوە باس دەکرێن.

بەڵێ ئیمانداری وا هەیە، بە دوعا بە کوڵەکانی فریای ئەم ئوممەتە دەکەوێت، بۆ نموونە: لە کاتێکدا ( قوتەیبەی کوڕی موسلیم ) ی باهیلی ئابڵوقەی کابولی دابوو، فەرمووی: بگەڕێن بە شوێن (محمدی

کوڕی واسع) دا، کاتێك گەڕان بینییان وا پەنجەی شایەتومانی بەرز کردووەتەوەو دوعا دەکات و دەفەرموێت: ( یا حَيُّ یا قَیُّوم أُنصُرنا ) ئەم هەواڵەیان دا بە قوتەیبە، فەرمووی: زۆر دڵخۆشم چونکە پەنجەی محمەدی کوڕی واسع کە بەرزی دەکاتەوە بۆ لای خواو داوای سەرکەوتن بۆ موسوڵمانان دەکات، لەلام گرنگترە لە سەد لاوی بەغیرەتی شمشێر بەدەست.

بەڵێ ئەوە بوو بە بەرەکەتی دوعاکانی محمەدی کوڕی واسع و دڵسۆزی موجاهیدانی ڕێگای خوا، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

بەڕێزان: بە درێژایی مێژووی ئیسلام، سوپاس بۆ خوای گەورە بەردەوام کەسانێکی ئیمان بەهێزو هیممەت بەرز، پەیدا بوون و دەبن کە بەهەڵوێستی دلێرانەیان بەرامبەر خەڵکی زاڵم و کافر، ئوممەتی ئیسلامیان بەرز کردووەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( أَفضَلُ الجِهادِ كَلِمَةُ حَقٍّ عِندَ سُلطانٍ جائِرٍ ) بەرزترین جیهادو تێکۆشان وتنی ووشەیەکی حەق وڕاستە لە لای کاربەدەست و فەرمانڕەوایەکی ستەمکار. کە ئەدرێ بە گوێیدا کە چۆن بەهۆی زوڵمی ئەوەوە میللەت ژیانی تاڵ بووەو ژیانی بووە بەژان، مێژووی ئێمەی موسوڵمانان بە فەخرەوە ناوی ( پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و عیززی کوڕی عبدالسلام ) تۆمار دەکات، سوپاس بۆ خوای گەورە میللەتی کوردی ئێمەش سەربەرزە بە زانای حەق بێژوو سەرکردەی بوێری موسوڵمانی خۆیەوە، وەکو ( شیخ الأسلام: إبنُ

تَیمیة و سەعیدی نەوڕەسی و شێخ سەعیدی پیران و قازی محمد ) لە گەڵ دەیان هەڵکەوتووی تر کە ناتوانین ناوی هەموویان بنوسین.

بەڵێ لەناو میللەتی کوردی موسوڵماندا، لە بەرەکەتی ئیسلام وقورئاندا، لە نووری مزگەوت و میحراب وحوجرەی فەقێدا، لە سایەی ئیماندا، مەردوو دلێری زۆرمان تێدا هەڵکەوتوون، کە دەبێت ڕۆڵەکانی ئەم گەلە شارەزای مێژووی ژیانیان ببن، کە بە داخەوە زۆریان وا خەریکە بزر دەبن، کە لە زۆربەی گەنجی ئەم گەلی کوردە بپرسی، فڵان کەس کێیە؟ نازانێ ونایناسێ، کە جێگای داخەو حەقی خەم لێخواردنی هەیە، کە لە ڕێگەی وەزارەتی پەروەردەوە لەناو وانەکانی خوێندندا، مێژووی ژیانی ئەو مەردو هەڵکەوتووانە بەڕۆڵەی ئەم میللەتە بناسرێتەوە.

یەکێك لەو زاتە پایە بەرزە دڵ پڕ لە ئیمان وخواناسییە، ( مەلا عەلی مەڵکەندی )یە ، کە لە ساڵی ( ١٨٥٨ ) ی زاینی لە سلێمانی لە گەڕەکی مەڵکەندی لە دایك بووە، خوێندنی لە حوجرەو مزگەوتەکانی ناو شاری سلێمانی لە لای مامۆستا دڵسۆزەکانی ئەو سەردەمەی حوجرەکان دەست پێ کردووەو سەرەنجام تا شاری سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بەشوێن فێر بوونی علومی شەرعیدا ڕۆیشتووەو بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرتووە. دوای کۆچی دوایی باوکی هەرچەندە خێزانێکی زۆری بەسەردا دەکەوێت، بەڵام بە هیممەتەوە دەست ئەداتە کاری کشتوکاڵی و بازرگانی و بژێوی ژیانی خۆی و خێزانەکەی پێ دابین دەکات، کاتێك چاوی بە

نەخوێندەواری ڕۆڵەکانی شارەکەی دەکەوێت، قۆڵی مەردانەی لێ هەڵدەکات و لە مزگەوتی مەڵکەندی بەبێ موچەو بەبێ بەرامبەر وانە بە گەنج ومنداڵان دەڵێتەوەو لە پاڵیا ئامۆژگاری بە تەمەنەکانی نوێژ خوێنی مزگەوت دەکات و پێش نوێژیان بۆ دەکات، بەبێ ئەوەی داوای هیچ موچەو ساڵانەیەکیان لێ بکات و داوای پاداشت تەنها لە خوای گەورە دەکات.

لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، لەناو سەربازانی سوپادا، ئامۆژگاری کردووەو سەربازەکانی شارەزای ئاینی پیرۆزی ئیسلام کردووە، پاشان ماوەیەك قازی شەرعی بووە، کاتێك دەور گۆڕاو ( ئینگلیزەکان ) هاتنە وڵاتەوە، ئەم زانا خواناسە لە ڕوانگەی شەرعەوە موچەی بەریتانیەکانی دوژمن بە دین و خاکی کوردانی لە لا حەرام بووە، بۆیە وازی لە موچە خۆری هێناوە، جا بۆ بژێوی ژیان و دوور کەوتنەوە لەم خراپە کارانە، دووکانێکی لەبەردەرکی سەرا داناوە، کە لە دووکانەکەیدا خۆی خەریك کردووە بە کارێکی زۆر جوان وشیاو ئەویش ( مۆر هەڵکەنی ) بووە، لە گەڵیشیدا ( عەریزە نوسی ) کردووە، ئەم مەلا گەورەیە بەدەر لە زمانی دایك، هەرسێ زمانی ( عەرەبی و تورکی و فارسی ) زانیوە.

( مێجەرسۆن ) سیخوڕی بەریتانی، پاش شۆڕشی شێخ محموودی حەفید، بوو بە ( محافظ ) ی سلێمانی، مێجەرسۆن ووتویەتی: لە سلێمانیدا بە دوو کەس زۆر سەرسام بووم، ئەوانیش ( تایەر بەگی جاف و مەلا عەلی مەڵکەندی ) بوون، مێجەرسۆنی ئینگلیز ئەم دوو

زاتـەی زۆر لـەلا بـەڕێز بـوون و بـە زیـرەك و ڕاگـیراوو نـەگۆڕ نـاوی بردوون، ئەوەی لەم باسەدا جێگای بایەخی ئێمەیە، زیاتر ئەوەیە کە: ئیمان وعەقیدەی ئیسلامەتی چۆن مرۆڤ گەورەو بەرزو بەڕێز دەکات.

مێجەرسـۆن کـە حـاکمی سیاسـی بـوو، زۆر کەسـێکی دڵـڕەق و زۆردار بوو، کاتێك بەناو بازارو شەقامەکاندا گوزەری دەکرد، ئەبوایە دانیشتوان لەبەری هەستانایەو ڕێبوارانیش ڕابوەستانایەو مل کەچ سڵاویان بۆ بکردایە، ئەمە فەرمانێك بوو دەری کردبوو، ئەم حاکمە دژ بـە ئیـسلام ومیللـەتی کـوردە، ڕۆژێـك بەبـەر دوکانـەکانی بـەردەرکی سەرادا دێتە خوارێ، هـەموو دوکانـدارەکان لەبەری هەڵدەسـتن و لارە مل و بێ ئیرادە سڵاوی بۆ دەکەن، کاتێك دەگاتە ئاستی دوکانەکەی مامۆستا مەلا عەلی مەڵکەندی، هەر هیچ حیسابی بۆ ناکات و لەبەری هەڵناستێ و مێجەرسۆنیش کە هەڵوێستی ئاوای لە کەس نەبینیوە، دێتـە بـەردەمی مـەلا عـەلی و دەڵێـت: ئـەوە بۆچـی ئـەم خەڵکـە لەبـەرم هەڵساون، بەڵام تۆ لەبەرم هەڵناسی؟! ئەم پرسیارە زۆر بە توڕەییـەوە لـە مامۆسـتا مـەلا علـی دەکـات، مامۆسـتاش بـەبێ ئـەوەی لـە شـوێنی خۆی هەستێت، زۆر بەبێ ئەهمیـەت سەیرێکی مێجەرسۆن دەکات و دەفـەرموێت: تـۆ پیـاوێکی نـامۆو غـەیرە دینـی بـە ئـاین و بیروبـاوەڕی مـن، لەبـەر ئـەوەش کـە خـۆت بـە دەسـەڵاتدار دەزانـی و هێـزت هەیـە، بەلامەوە دروست وڕەوا نییە منی موسوڵمانی قورئان خوێن لەبەر تـۆ هەڵسم و ملت بۆ لار کەم.! چونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا

الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾.

مێجەرسۆن تا ئەم کاتەش نەگەیشتبوو بە کەسێك کە بتوانێت بەرامبەری ڕابوەستێ و قسەی حەق وبوێرانە بکات بەرامبەری، ئەمە یەکەمجارە توشی کەسێکی ئاوا جوامێرو بوێر دەبێت... زۆری پێناخۆش دەبێت، بەڵام هیچ قسە ناکات وئەڕوات، ئەو ڕۆژە مێجەرسۆن مەراقی دەبێت و بە سیاسەتە تیژو گڵاوەکەی خۆی بیرێکی تازە بروسکە ئاسا بەمێشکیا دێت، بۆ ڕۆژی دوایی تورەکەیەك پڕ لە پارە دەکات و بە سەربازێکدا بۆی ئەنێرێت، مەلا عەلی کیسە پارەکە بەدەستی سەربازەکەوە دەبینێت و سەرنجی ئەدات، بەڵام زۆر باش لە پیلان و فێڵی ئینگلیز تێگەیشتووە، بۆیە پارەکە وەر ناگرێ و بە توڕەییەوە دەڵێت: لە کوێوە هێناوتە بیبەرەوە بۆ ئەوێ، پارەی غەیرە دین بە کەڵکی من نایەت و پێویستم بە پارە نییەو دڵم دەوڵەمەندەو قەناعەتم بەوە زۆرە کە خوای گەورە پێی بەخشیوم، ئەوەش بۆ من گەورەترین دەوڵەمەندیە.!

سەربازەکە بە ناچاری دەگەڕێتەوەو ئاکامی سەردانەکەی و پارەکە بۆ مێجەرسۆنی سەرکردەی دەگێڕێتەوەو دوای ماوەیەك چەند ئینگلیزێکی تر دێنە لای ( مێجەرسۆن )، ئەویش باسی مامۆستا مەلا عەلییان بۆ دەکات و دەڵێت: بەڕاستی مەلایەکی هۆشیارو وریاو زیرەکە.

پاشان ئەنێرن بە شوێن مامۆستاداو پێی دەڵێن: ئێوە بۆچی بە فەرمانڕەوایی و حوکمی ئێمە ڕازی نین؟ ئێمە ڕێی پاکوخاوێنیمان نیشان دان و ڕێگاو بان و شەقاممان بۆ زۆر کردن.

مەلا عەلی لە وەڵامدا دەڵێت: پاك وخاوێنی لە دروشمی موسوڵمانانەو موسوڵمانان بە فەرمانی ئیسلام هەمیشە جل وبەرگ و لەشی خاوێنەو لە شەو وڕۆژێکدا پێنج جار دەست نوێژ دەشوات، خۆشتنی واجبی لەسەرەو چەندین خۆشتنی سوننەتیشی هەیە، ئەگەر جل وبەرگی خاوێن نەبێت، نوێژی قبولْ نابێت، پاکوخاوێنی لای ئێمە بەشێکە لە دینداری و عیبادەتمان.پاشان ڕێگاوبان دروست کردن وپاککردنەوەی کردەوەی موسوڵمانانەو پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: لابردنی ئازارێك لەسەر ڕێگاوبان بە خێرو صەدەقە کردن حیسابەو ئاینی ئیسلام فەرمانی داوە بەوەی کە هەرکەسێك بەردێك لەسەر ڕێگایەك ببینێت، پێویستە لای ببات، نەوەکو کەسێك توشی ئازار بکات.. هەروەها یارمەتی هەژاران و ئازووقە زۆر کردن ئەوە پیشەی ئێمەیە، ئێوە وازمان لیْ بێنن و سواری سەرمان مەبن، وڵاتی کوردستان ئەوەندە بە بەرەکەتە بەشی زۆری جیهان بەخێوو دەکات، ئینگلیزەکان ئەم وەڵامەیان لەلا زۆر جوان دەبێت و ئافەرینی دەکەن، پاشان مێجەرسۆن دەڵێت: مامۆستا مەلا عەلی ئەگەر ئەو پارەیەت وەرئەگرت، خۆم ئەمزانی چ بەڵایەکم بەسەر ئەهێنای، پاشان هەموویان لەبەری هەڵدەستن و زۆر بە ڕێزو حورمەتەوە خوا حافیزی لێدەکەن..! ئەم زانا گەورەو دڵپڕ لە ئیمانە لە تەمەنی ( ٩٠ ) ساڵیداو

لـە ١٩ی تـشرینی یەکـەمی سـاڵی ( ١٩٤٨ ) دا وەفـات ئـەکات و بـە خاکی ئەسپێرن. خوای گەورە لێی خۆش بێت و لـە نوورو ڕەحمـەتی خۆی بێبەشی نەکات.

بەڵێ هەرکەسێك شانازی بە دین و ئیمان و بیروباوەڕی خۆیـەوە بکات، دوژمن لە ئاستیا سەردائەخات، وە هەرکەسیش لە دینی خۆی لا بدات، دوژمن هیچ حیسابی بۆ ناکات.

وە ئێمـەی میللـەتی کـوردیش بـەم پیـاوە بـەرزو زانایانـەوە کـە پەروەردە کراوی مزگەوت و دەرچووی حوجرەکانی کوردستانن، کە هەر حوجرەیەك زانکۆیەك بوو بۆ بڵاو کردنەوەی زانست و فێر بوونی ڕەوشتی جوان و پەسەند.

ئێمە شانازی بەم کەسایەتییانەوە دەکەین نەك بە پیـاو کـوژو دیـن فـرۆش و عـەرەق خـۆرو چڵکاو خـۆری دەسـتی دوژمنـانی ئیـسلام و نەتەوەکەمان.

لـە کۆتایـدا دەڵـێم: بـا هـەوڵ بـدەین ڕۆژ بـە ڕۆژ ئیمانەکـەمان زیـاد بکـەین، چـونکە سـەر بـەرزی و سـەرفرازی دنیـاو قیامـەتمان بـە ئیمانەکەمانـەوە بەنـدە، وە ڕۆژانـە لـە چاکەو خێـردا بـەرەو پێـشەوە هەنگاو بنێین.

دەگێڕنەوە: شێخی گەورەی سەمەرقەند مزگەوتەکەی زۆر قەرەباڵغ بووە، ڕۆژێکیان کە مامۆستای سەمەرقەندی هەڵدەستێت بۆ ئەوەی کە ووتاری ئەو ڕۆژە بۆ ئامادەبوان بخوێنێتەوە، لەو کاتەشدا کەسێك دەیـەوێت بێتـە ژوورەوە، بـەڵام سـەیر دەکـات جێگـا نـەماوە، بۆیـە بـە

دەنگی بەرز دەڵێت: ڕەحمەتی خواتان لێ بێت هەرکەسەو هەنگاوێك لە ئاستی خۆیەوە بچێتە پێشەوە. شێخ فەرمووی: خەڵکینە مەوعیزەی ئەمڕۆ بەسە! با ئەم قسەیە جێبەجێ بکەین و هەرکەسەو لە ئاستی خۆیەوە هەوڵ بدات ڕۆژانە هەنگاوێك بەرەو چاکە بنێت.

بەڵێ مرۆڤ کە هاتە ناو دائیرەی ئیمانەوە، ئەگەر ئەمڕۆ و دوێنێی وەکو یەك بێت، ئەوا بەڕاستی زەرەرمەند بووە. بەڵکو دەبێت ئیماندار ڕۆژ بە ڕۆژ بڕواتە پێشەوە لە بواری عیبادەتدا، هەڵساوی لە تاریکی شەودا دوو ڕکات شەو نوێژت کردووە، چوویتە پێشەوە، ئەمڕۆ هیچ نوێژێکت بە جەماعەت نەفەوتاوەو هەمووت لە مزگەوت بە کۆمەڵ کردووە، چویتە پێشەوە، لە ووتاری جومعەدا وانەیەکی تازە لە ئیسلامەکەت فێر بووی، کە لە مزگەوت هاتیتە دەرەوە لە هەوڵی جێبەجێ کردنیدای لە ژیانی ڕۆژانەتدا، ئەوە چویتە پێشەوە لە بواری عیبادەتدا، لە بواری خوێندن و زانستدا، ئەمڕۆ زیاتر لە دوێنێ هەوڵت داوە، ئەمڕۆ کتێبی بە سوودت پەیدا کردو خوێندتەوە، نمرەی ئەم مانگەت لە نمرەی مانگی پێشووت بەرزتر بوو، ئەوەچویتە پێشەوە، لە بواری کاروکەسابەتی حەڵاڵدا هەوڵت داوەو پاشەکەوتت هەبێ و لە دەستمایە نەخۆی، ئەوە چویتە پێشەوە، لە بواری ژیری وسیاسەتدا، ئەمساڵ بەرچاوت ڕۆشنترەو دۆست وناحەز لەیەك دەکەیتەوەو دەست ناخەیتەوە ئەو کونەی کە پار هەر لەوێدا مار گەستتی، دلشاد بە کە حاڵت باشەو ژیانت گەشەو ڕێگات ڕۆشنەو ئاوا هەتا سەر بەردەوام بە، ئیتر هەنگاو هەنگاو

ئەڕۆیتە پێشەوە، هەتا کە مردی ڕوحەکەشت هەر لە بەرەو پێش چووندایەو بەرز دەبێتەوە هەتا دەگاتە ( اعلی علیین ) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ كِتابَ الأبرارِ لَفِي عِلِّيين﴾.

بەڵام ئەگەر پەنا بەخوا ڕۆژ بە ڕۆژ هەنگاوێك بەرەو دواوە بێیت، دوێنێ هەر پێنج فەرزەی نوێژت کردووە، ئەمڕۆ چواریت کردو یەکیانت فەوتاند، پێشتر نوێژت بە جەماعەت نەدەفەوتا، ئێستا تەنها جومعەو جومعە دێیتە مزگەوت، لە ووتاری جومعەشدا خەیاڵت لە شوێنی ترە، ئەوە لە عیبادەتا پاشە کشەتە.

لە بواری خوێندن وزانستدا، نمرەی ئەم مانگەت نزمترە لە مانگی ڕابردوو، ئەمساڵ لە چاو پاردا هەست دەکەی لە دواوەی، بە شوێن هیچ کتێبێکی بەنرخدا نەگەڕاوی و هیچت نەخوێندووەتەوە، ئەوەی دەشتزانی زۆرت بیر چووەتەوە، ئەوە بەرەو دواوە دەچی.

لە بواری فیکری وژیری دا، وێڵی و بەپەلەی دەست بکەیتەوە بە هەمان شوێندا کە پار لێی مارەنگاز بووی، ئەو کەسەی خەڵەتاندتی هێشتا چەپڵەی بۆ لێ ئەدەی و بژی و بڕوخێی بۆ دەکەی، سپی بەڕەش و ڕەش بە سپی وێنا دەکەی، گەرمی وساردی ئەم دونیایە هەروەکو یەك هەست پێ ئەکەی، ئەوە هەنگاوەکانت بەرەو دواوە دەنێی و کوێرانە پاشەو پاش هەنگاو دەنێی.

لە بواری دارایدا، تەممەڵ دانیشتووی و خەریکی خواردنی سەرمایەکەتی و ئەمڕۆ بە سبەینێ دەکەی، ئەوە نزیکی ئەوە بویتەوە

دەست لە ئەژنۆ دانیشی و وەختێ بە ئاگا بێیتەوە، دەستت لە هیچ کارێکی شیاوو حەڵاڵ گیرنەبێت.

بەم شێوەیە ئەگەر هەر وا بەرەو دواوە هەنگاو بنێی ئەوە سەرەنجام دەگەیتە مردن و لەوێش ڕووحەکەت هەر بەرەو خوار دەچێت، تا دەچێتە ( أسفَلَ السافلِين ) وە دەچێتە ( سجین ) کە شوێنی بەدبەختان و چارە ڕەشان و ماڵ وێرانەکانە، کە پەشیمانن و پەشیمانی دادیان نادات.

جا توخوا حەیف نییە تۆی موسوڵمان کە قورئانت لەبەر دەستایەو ڕۆشنایی ڕێگایە، فەرموودەکانی (رسول الله) بۆت چاوساغ و مامۆستایە، حەیف نییە بەردەوام لەبەرەو پێش چووندا نەبیت، ئێمە باسی پەیوەندی نێوان ئاوو ئیمانمان کرد، دەی سەرنج بدە، ئاو ئەگەر نەجوڵێ و نەڕواو هەر لە گۆمێکدا وەکو خۆی بمێنێتەوە، سەرەنجام بۆگەن دەبێ و قەوزە هەڵدێنێ و بەکار نایەت، ئیمانیش هەروایە دەبێت بەردەوام لە زیاد بوندا بێ و لە جوڵەدا بێت ئەگینا دەپوکێتەوە.

موسوڵمانان هەتاوەکو ڕۆژانە بەرەو پێش دەچوون، سەرکردایەتی گەلانیان دەکرد، کەچی کاتێك کەوتنە هەنگاونان بەرەو دواوە، ئێستا دەبێت دەست بگرنەوەو خێریان پێ بکرێ و لەم پێناوەشدا غیرەتی ئیمانداران کەم دەبێتەوە.

مامۆستا هەژار موکوریانی: لە وەرگێڕانی ( یەك لە پەنای خاڵ و سیفری بێ بڕانەوە) دا، کە دکتۆر ( عەلی شەریعەتی ) بە فارسی نوسیویەتی دەڵێت:

ڕۆژێك کە ئیسلام باوی بوو، لەناو گەلاندا ناوی بوو، زێڕی هەبوو، زۆری هەبوو، چی بیگوتا، هەر ئەوە بوو، مامۆستاکانی ڕۆژئاوا، لە فێرگە، لە زانستگایان، لەناو کۆڕی کەیخودایان، کاریان لاسای موسوڵمان بوو، دابی ئەوانیان پێ جوان بوو، کەوای شۆڕیان لەبەر دەکرد، عەمامەیان لەسەر دەکرد، ئەدای ڕازی ئەبو عەلی و دینەوەریان و غەزالی و کێو کێی دیکەیان دەردێنا، چۆن ئێستا مامۆستاکانمان، کە نەدارین، لاسای ئەوان دەکەنەوە، قەرزی کۆنە دەدەنەوە، لە جەژنەدا کڵاوی لەنگەری لەسەر، جبەی قۆڵ فش وفۆڵ لەبەر، ئەدای ڕۆژئاوا دەردێنن، ئورووپاییانە دەنوێنن....

دەست ڕەنگینانی خاچ پەرست، کە دەستکردێکیان ڕێك دەخست، فێڵیان دەکرد، مۆری ( الله ) یان لێ دەدا، ڕەنگی ئیسلامیان پێ دەدا، تا وابزانن ئەو کارانە، هی وڵاتی موسوڵمانە، کاری شام و بوخارایە، کرگاری بەڵخ وبەغدایە، ئەستەنبووڵە، تووسە، ڕەیە، کاری وەستای غرناتەیە، تەنانەت خاچی گەردن بەند، ( الله ) یەکیان لێ هەڵدەکەند...

لەدەستکاریان دەدەن (madein) ئەوا ئێستاش لە ڕۆژهەڵاتی بار کەوتوو، لەناو گوێچکەی گادا خەوتوو

لاسای ڕۆژئاواییان دەکەن...

هەتا دەگاتە ئەوەی کە دەفەرموێت: { کارەکانمان، شارەکانمان، نوسەرانمان، خۆنەرانمان، پیاوی پیتۆڵ و چازانمان، حاڵمان، باڵمان، ژیانی ناو ماڵ ومناڵمان، ژنمان، پیاومان، گشت وخاومان، تەنانەت لەقەم وناومان، دەمەلاسکەیەك لەوان بێ، تا کلیلمان هەر بەوان بێ... بەڵێ داگیر کەرەکانمان، ڕزق وڕۆزی دەرەکانمان، نایانەوێ خۆ بناسین، تا وا کاسین، بۆ وان خاسین، ئەوان ئەترسن تێبگەین، لە داو بەربین و پێ بگەین }...

کۆتایی ئەم ووتارەش بەو ووتە گەوهەریە کوردییە جوانەی ماموستا هەژار دێنین کە دەفەرموێت:

{ با لاوەکانمان ووشیار بن، دوژمن بناسن، بەکار بن، با هاوکار بن، لە لاسایی خۆ ڕزگار کەن، لە داگیرکەر خۆ قوتار کەن، با ئازاد بن، با ئازا بن، پیاوی خۆ بن، پیاوی خوا بن، لە حەق خوازی ڕانەوەستن، تەنها پشت بە خوا ببەستن، هەر یەکە شیاوی پەرستن، هۆی بون ومان، ئەو یەکەیە، ئیتر هەرچییەکی تر هەیە، خاڵە لە پەنا ئەو یەکە}...

# سەرچاوەکان:.

١. قورئانی پیرۆز.

٢. ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم ئاوات أبوبکر

٣. خُطَب الشَیخ محمد حسَین یَعقوب

٤. بەهاری دڵان ئەندازیار عوسمان

٥. چوار نامیلکەی دکتۆر علی شەریعەتی و. مامۆستا هەژار

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ أجمَعينَ:

ئیمانداران: مرۆڤ بە گشتی بە پێغەمبەرانیشەوە، کە لە هەموو کەس زیاتر لە خوای گەورە نزیکتر بوون، لە پێنج شت بێئاگان و ئەم پێنج شتە خوای گەورە تەنهاو تەنها لای خۆی زانینەکەی هێشتووەتەوەو کەسی لێ ئاگادار نەکردووە، ئەوانیش:

١. هاتنی ڕۆژی قیامەت: کە چ ساڵێك و چ سەردەمێك دنیا کۆتایی پێ دێت و قیامەت دێت، تەنها خوای گەورە دەیزانێ و ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی لە نیشانە بچووك و گەورەکانی پێش هاتنی قیامەت، کە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندووە، تەنها نیشانەکانن و بۆ بەرچاو ڕوونی و بە هەڵوێست بوونی مرۆڤی ئیماندارن کە گەیشتە ئەو سەردەم وزەمانە چۆن هەنگاو بنێ و هەڵوێست بنوێنێت. ئیتر ئەو ساڵ وساتەی کە دنیای تێدا کۆتایی پێ دێت و قیامەت بەرپا دەبێت، تەنهاو تەنها خوا خۆی دەیزانێت.

٢. باران بارین: خوای گەورە خۆی دەیبارێنێت و هۆکارەکانی درووست بوونی هەورو باران لە بوونی دەریاو زەریاو بە هەڵم بوون و چڕ بوونەوەو خەست بوونەوەو بوونە هەورو باران بارین، هەر خوا خۆی بە قودرەت و دەسەڵاتی خۆی ڕێکی خستووە. وە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەو بارانەش بۆ سەر زەوی، کە لە چ چرکەو سەعاتێکدا دێتە سەر زەوی و لە کوێ ی زەوی دەبارێت و تەنها لە زانستی

خـوای گەورەدایـەو ئـەوەی دەوتـرێ لـە کەشناسـیدا تـەنها پێشنینی کردنە، بە گوێرەی ڕادەی شێ و پلەی گەرمی و هەندێ دیاردەی تـر کە بـوونی بـاران نیـشان ئـەدەن، ئەگینا هـیچ کـەس نییـە بتـوانێ بـێ زیادو کەم و بە دڵنیاییەوە بڵێ کە لە چ سات و کات و زەمـان و لـە چ زەمینێکدا باران دەبارێت.

٣. وە ئـەوەی لـە ڕەحـەمی ئافرەتدایـە: کاتێـك تـۆوی پیـاو و هێلکۆکەی ئافرەت لە ڕەحەمدا دەپیتێن و منالّی لێ دروست دەبێت و لە عەلەقەوە دەست پێ دەکات، تەنها هـەر خـوای گـەورە خۆی زانایـە بەوەی کە ئەو منالّە کوڕە یان کچە، ئیتر ئەوەی کە دواتر دکتۆری سۆنەرو تیشك دەڵێت منالّەکە کوڕە یان کچ، ئەوە دوای دروست بوونی تەواوی ئەندامانی لاشەی منالّەکەیە.

٤. وە هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەر دێت و چی دەست دەکەوێت، لەبەر ئەوە مرۆڤ نابێت هەرگیز ووشەی ( حەتمەن ) بەکار بهێنێت، کە بڵێت حەتمەن بەیانی ئەوە دەکەم، بەڵکو دەبێت بڵێت ( إن شاءَ الله ) ئەگەر خوای گەورە مەیلی لێ بێت، بە نیازم بەیانی ئەو کارە بکەم، چونکە تەنها لە زانستی خوادایە کە بەیانی چیت بەسەر دێت.

٥. وە هیچ کەسیش نازانێت لەسەر چ زەوییەك دەمرێت و کۆتایی بە ژیانی دێت: تەنهاو تەنها خوای گەورە دەزانێت تۆ لە کوێ دەمریت و لە چ خاکێکدا دەنێژرێیت.

**جا خوای گەورەو کاربەجێ، خوای زاناو ئاگادار لە قورئانی پیرۆزدا ئەم پێنج ڕاستییەی لە ئایەتێکی پیرۆزدا بەیان کردووە بۆمان و دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ﴾ **لقمان ٣٤.**

**بەڵێ بەڕێزان: مردن لە هەموو شتێك زیاتر لێمان نزیکە، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت:** ( الجَنَةُ أَقرَبُ إِلى أَحَدِكُم مِن شِراكِ نَعلِه، وَالنَّارُ مِثلُ ذالِك ) **رَواهُ البُخاري .**

**واتە: بەهەشت لە هەریەك لە ئێوە نزیکترە لە قەیتانی پێڵاوەکانی، جەهەننەمیش بە هەمان شێوە.**

**کە بێگومان بەهەشت و دۆزەخی هەموو کەسیش لە مردنەکەیەوە دەست پێ دەکات، چونکە قەبر یان باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، یان شیوێکە لە شیوەکانی دۆزەخ.**

**کەواتە: مردن هەروا بە قاچمانەوەیەو هەموو ساتێك مرۆڤ ئەبێت چاوەڕێ ی ئەوەی هەبێت کە مردن قاچەکانی تێك بئاڵێنێ و بیدات بە زەویداو کۆتایی بە ژیانی ئەم دونیایەی بێت و بەرەو قیامەت بەڕێ بکەوێت.**

**بەچاوی خۆمان بینیومانەو هەر لەم کوردستانەی خۆماندا، لە پارێزگای سلێمانی لە ماوەی یەك ساڵدا دوو بوك و زاوا، هەردوکیان**

لە شەوی یەکەمی بەیەك گەیشتنی بوك و زاوایەتییاندا، کە ئەوەی بیریان لێ نەکردووەتەوە ئەوەیە: ئەو بەرگی سپی بوکێنییە ڕاستەوخۆ کە دانرا، کفنی بەسەردا لەبەر بکرێت. کەچی هەر ئەو شەوە مردن و بەیانی کە دەرگاکەیان لەسەر شکاندن کە شەو دایان خستبوو، سەیر دەکەن مردوون.! یەکیان بە غازی سۆپاو بوك وزاواکەی تریش بە شۆرتی کارەبا ژووری کابینەکەیان لە دوکان سووتاو بوك وزاواکەش لە دوکەڵدا خنکان.!

ئەی چەند کەسمان بینی لە کاتی پێکەنین و شادیدا، هەبووە لەناو شایدا بەلادا هاتووەو مردووە، هەبووە چەپڵەی لێداوە کە دەستی کردووەتەوە فریای ئەوە نەکەوتووە دەستی بەیەکدا بداتەوە مردن ساردی کردووەتەوە... کەواتە: مردن نە بەساغییەو نە بە نەخۆشی، نە بە پیرییەو نە بەگەنجی، نە بە دڵخۆشییەو نە بە غەمباری، بەڵکو کە کاتی دیاری کراوی خۆی هات، کە مرۆڤ بە ڕەحمی خوا لێی بێئاگایە، پاش وپێش ناکات و لاپەڕەی دنیات دەپێچێتەوە.

جا بەڕێزان: بەم پێشەکییە دەچمە ناو ووتارەکەوەو دەڵێم: کاتێك مرۆڤ ئاوا بەردەوام مردن وەکو سێبەر بە شوێنیەوە بێ و هەموو کات موعەڕەز بێت بۆ مردن، مرۆڤیش خاوەنی مافە لەسەر خەڵکی و منالی و خێزانی، وە مافی خەڵك و منال و خێزانی خۆیشی لەسەرە. هەندێ جار ئەم کۆمەڵە مافە غەیری خۆی کەس ئاگای لێ نییە، بۆیە کاتێ مردوو ئەم مافانەی خەڵکی بەسەرەوە بوون، بۆی دەبێتە هۆی

عەزابی قەبرو قیامەت و، وە کێشەو دوبەرەکی و ماف فەوتان و ماف خوران بۆ کەسانی دوای خۆی، جا هەر لەبەر ئەمەیە کە لە ئیسلامدا، لە شەرعدا باسێکی گەورەو فراوان هەیە بە ناوی ( وەصیەت و میرات) ەوە.

بەڵێ ئیمانداران: مادام مردن لە ڕێی هەموو کەسدایەو کاتەکەشی نەزانراوەو هەموو کات دەگونجێت کاتی مردن بێت، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئاگاداری کردوینەتەوەو فەرموویەتی: (مَا حق امْرِئ مُسلم لَهُ شَيْء يُوصي فِيهِ يبيت لَيْلَتَيْنِ إِلَّا ووصيته عِنْده مَكْتُوبَة ) رَواهُ البُخاري وَ مُسلِم.

واتە: باش نییەو بە قازانجی نییە هیچ کەسێکی موسوڵمان کە شتێکی هەیەو دوو شەوی بەسەردا بێت و وەصیەت نامەیەك بە نوسراوی و بە پێی شەرع لە پشت سەریدا دانەنرابێت.

واتە: هەر کەسێك کە لە ژیاندایەو بە تایبەت کاروبارێکی بە دەستەوەیە، کڕین و فرۆشتنێکی هەیە، مەعامەلەی لەگەڵ خەڵکا هەیەو قەرزی لای خەڵکییەو قەرزی کەسانی تری لایە، ماڵ وموڵکی هەیەو نەوەو ڕۆڵەو خێزانی هەیە، بەڕاستی پێویستە لە نزیکترین کاتدا وەصیەت بنوسێت بەپێی شەرع، وە لە ماڵەوە لە شوێنی پاراستنی ناسنامەو بەڵگەکانیدا، دایبنێ، چونکە کە مردن یەخەی مرۆڤی گرت، ئیتر مۆڵەتی پێ نادات کە دابنیشێ و وەصیەت بنوسێت.

﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾ يس ٥٠ .

بەڕێزان: لە نیشانەکانی عاقیبەت خێری ئەوەیە کە مرۆڤ کاتێ مرد، وەصیەتی نوسیبێت، چونکە: ( مَنْ مَاتَ عَلَى وَصِيَّةٍ مَاتَ عَلَى سَبِيلٍ وَسُنَّةٍ ، وَمَاتَ عَلَى تُقًى وَشَهَادَةٍ ، وَمَاتَ مَغْفُوراً لَهُ ).

وە بزانن وەصیەت کردن بە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و ئیجماعی زانایانی ئیسلام کارێکی پێویستە لەسەر موسوڵمان... وە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾ البقره ١٨٠.

واتە: پێویست کراوە لەسەرتان کاتێك یەکێکتان مەرگی نزیك بویەوەو سامان ومالْ ودارایيەکی بەجێ دەهێشت، با وەصیەت بکات کە هەندێك بدرێت بە دایك و باوکی و خزمانی بە شێوەیەکی جوان و لەبار، ئەمە پێویست و ئەرکە لەسەر خواناس و پارێزکاران.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت: ( كُنا عِندَ رَسُولُ الله ﷺ ) ئێمە کۆمەڵی صەحابەکان لە خزمەتی پێغەمبەردا بوین ﷺ ( فَجَاءَ رَجُلٌ ، فَقَالَ : يَا رَسُول اللهِ ، مَاتَ فُلانٌ ، قَالَ : أَلَيْسَ كَانَ مَعَنَا آنِفًا ؟ قَالُوا : بَلَى ، قَالَ : سُبْحَانَ اللهِ ، كَأَنَّهَا إِخْذَةٌ عَلَى غَضَبٍ ، الْمَحْرُومُ مَنْ حُرِمَ وَصِيَّتَهُ ) رَواهُ أبو يَعلي بِأسنادٍ حَسَنٍ .

واتە: پیاوێك بە هەڵە داوان هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد: قوربان فڵان کەس مرد. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئێستا لامان نەبوو؟ خۆ کەمێك لەمەوبەر بەیەکەوە بوین، ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەو پیاوەی کەمێك لەمەوبەر لەگەڵ ئێمە بوو، کە لە ئێمە جیا بویەوە، مرد! پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو ئەوەی دەرسێکی گەورە لەم کاتەدا کە گونجاوە بۆ ئەم مەبەستە بە ئوممەتەکەی بڵێ: وە نموونەی بەم پیاوە هێنایەوە، فەرمووی: پاکو بێگەردی بۆ خوا، ئەڵێی ئەم پیاوە لەسەر تورە بوونی خوا لێی مردووە، چونکە وەصیەتی نەکردبوو، کە مرد. بێبەش ئەو کەسەیە کە لە وەصیەت نوسینی شەرعیانە پێش مردنی بێ بەشە.

بەڵام ئیماندارانی بەڕێز: ئەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە هەموو وەصیەتێك شەرعی نییە، بەڵکو بەپێی کەسەکان و بارودۆخەکان حوکمی وەصیەتەکەش دەگۆڕێت، وەصیەتیش وەکو هەموو شتەکانی تر لە شەرعدا، واجب و سوننەت و حەرام و نا پەسەندو حەڵاڵی بەسەردا دەچەسپێت.

لەو حاڵەتانەی کە وەصیەت کردنی تێدا واجبە ئەوەیە: کاتێك کەسێك حەقێکی شەرعی لەسەرە، ئەگەر تاخۆی لە ژیاندایە، وەصیەت نەکات و باسی نەکات ونەینوسێت، هیچ دوور نیە لە دوای مردنی ئەو مافانە بفەوتێن، جا ئەو حەق ومافانە جاری وا هەیە پەیوەندی بە مرۆڤەکانەوە هەیە، وەکو ئەوەی ئەمانەتێکی لا دانراوەو تەنها خۆیی و خاوەنی ئەو ئەمانەتە دەزانن کە ئەمە لای ئەم دانراوە،

یـان قـەرزی کەسـێك یـان کەسـانێکی لەسـەرەو تـەنها خـۆی دەزانـێ قـەرزی کێـی لەسـەرەو کـەس بەمـە نـازانێ، جگـە لـە خـۆی. وە ئەگـەر بمرێ، خاوەن ئەمانەتەکەو خاوەن قەرزەکە ناتوانێ داوای مافی خۆی لە کەس وکاری مردووەکە بکاتەوە، چونکە بەڵگەی پێ نیە.

یـان ئـەو مـاف وحەقـە پەیوەنـدی بـە خـوای گـەورەوە هـەبووە ( سُبْحانَهُ وَتَعالى ) وەکو ئـەوەی ماڵ وسـامانی هـەبووەو گەیشتووەتە حـەددی زەکـات، بەڵام زەکـاتی لـێ دەرنـەکردووەو تـەنها هـەر خۆشـی بەمـە دەزانـێ، وە هـەموو مەرجـەکانی واجـب بـوونی حـەجی لەسـەر هاتووەتـە جـێ، بـەڵام حـەجی نـەکردووە، ئەمـە لەسـەری واجبـە کـە وەصیەتنامەیەك بنووسێ و ئەم حـەق ومافانـەی کـە لەسـەرنی، چ هـی خـواو، چ هـی بەنـدەکانی خـوا، بە جـوانی وبـە ڕوونـی باسـی بکـات و داوا لە میرات گرەکانی بکات، کە پێش ئـەوەی ماڵەکە دابـەش بکـەن بەسەر خۆیانـدا، ئـەم مـاف وحەقانـەی لـێ لابـدەن و ئـەوەی لـەوە زیـاد بوو، دەبێتە بەشی میراتگرەکانی.

وە لـە شـەرعدا دەفـەرموێت: ( وَيَتَأَكَدُ الوَصيَّةُ إِذا كانَ الإنسانُ في حالَةِ خطرة، مِثْل: إِشتِداد مَرَضٍ، أَو دخُول حَربٍ، أَو كـــانَ عَلـــى سَـــفَرٍ ) واتـە: ئـەم وەصـیەتە واجبـە زیـاتر دەبێـت هـەوڵی نوسـینی بدرێت، لە کاتێکدا کە مرۆڤ لـە بارودۆخێکی پڕ مەترسیدایە، وەکو: نەخۆشـی سـەخت وکوشـندە، یـان چـوون بـۆ جـەنگ و کوشـتار، یـان ڕۆیشتن بۆ سەفەر، کە لەم کاتانەدا بە ڕواڵـەت مـردن لـە مـرۆڤ نـزیکترە لە چاو کاتەکانی تردا.

وە لەو حاڵەتانەدا کە وەصیەت بۆی سوننەتە، ئەوەیە: کە مرۆڤی موسوڵمان وەصیەت بکات و بڵێ: کە لە دوای مردنم لەو ماڵ وسامانەی کە جێم هێشتووە، بەڕەنج وشەونخوونی پەیدام کردووە، ئێوەی میراتگرانم، خێرو خێراتم بۆ بکەن، بە تایبەت ئەو خێرانەی کە نەبڕاوەن، وەکو چاپ کردنی کتێبی شەرعی، یان هەڵکەندنی بیرە ئاوێك، یان دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانەو نەخۆشخانە، وە یارمەتی دانی هەژاران و قەرزارو نەخۆشی موسوڵمانان. کە ئەمەش نابێ لە سنووری ( سێیەکی ) ماڵەکەی دەربچێ، واتە: دروست نییە بڵێ نیوەی ئەو ماڵ وسامانەی لە دوام جێ دەمێنێ، بۆم بکەن بە مزگەوت، یان هەموو ماڵەکەم بۆ بکەن بە خێرو صەدەقە، بەڵکو تەنها لە سنووری ( سێیەکی ماڵی بەجێماودا ) درووستە.

وە وەصیەت کردنی حەرامیش ئەوەیە: کاتێك کە وەصیەتکار بەو وەصیەتەی زەرەر بە میراتگرەکانی بگەیەنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( الإضرارُ في الوَصـيَّةِ مِنَ الكَبائرِ ) واتە: زەرەر گەیاندن بە میراتگران بە هۆی وەصیەت کردنەوە لە گوناهە گەورەکانە.

بەڵێ زۆر کەس هەیە وەصیەت دەکات تەنها بە مەبەستی ئەوەی کە یەکێ لە میراتگرەکانی زیاتری بەر بکەوێ و یەکیان کەمتری بەر بکەوێت، یان کچەکانی مەحرووم بکات لە میرات، ئەو کەسانە با گوێ لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری پێشەوا بگرن ﷺ کە فەرموویەتی:

( إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ أَوِ الْمَرْأَةَ بِطَاعَةِ اللَّهِ سِتِّينَ سَنَةً ثُمَّ يَحْضُرُهُمَا الْمَوْتُ فَيُضَارَّانِ فِي الْوَصِيَّةِ فَتَجِبُ لَهُمَا النَّارُ ). رواه الترمذي

واتە: بە ڕاستی پیاوی وا هەیە، یان ئافرەتی وا هەیە، کە ماوەی شەست ساڵ بە عەبدایەتی خواو تاعەتی خوا ژیان دەباتەسەر، بەڵام پێش مردنی وەصیەت دەنوسێ و بەو وەصیەت کردنەی زەرەرێکی گەورە لە میراتگرەکانی دەدات، هەندێکیان زۆر دەوڵەمەند دەکات وهەندێکیان بێبەش دەکات، بەهۆی ئەم زوڵمەوە کە ئەو وەصیەتە حەرامە نا شەرعییە، ئاگری جەهەننەمی بۆ واجب دەبێ و دەچێتە جەهەننەمەوە.!

حەزرەتی ئەبو هورەیرە کە ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموودەکەی گێڕایەوە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزیشی خوێندەوە کە دەفەرموێت:﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿١٢﴾ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ النساء ١٢ ـ ١٣ .

واتە: ئەمانە هەمووی دوای وەصیەتێك کە دەکرێت، دانەوەی قەرز، لە کاتێکدا ئەو وەصیەتە زیانبەخش نەبێت بە میراتگران، هەتا گەیشتە ئەوەی کە فەرمووی: بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی گەورەو دەسکەوتی بێ سنوور.

ئەم فەرموودەیە: حَديثٌ صَحيح رَواهُ الترمذي وَ غيرُهُ، صَحيح الجامع(٧٥٧٠).

بەڵێ ئیمانداران: وەصیەت پەیوەندی هەیە بە عاقیبەت خێری و عاقیبەت شەڕی مرۆڤەوە. هەروەکو پێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ ئاگاداری کردوینەتەوە و فەرموویەتی: ( إنّ الرَّجُل لَيَعْمَل بعَمَلِ أهْلِ الخَيْرِ سَبْعِينَ سَنَةً فإذا أوْصَى حافَ في وَصيَّتِهِ فَيُخْتَمُ لَهُ بِشَرٍّ عَمَلِه فَيَدْخُلُ النَّارَ وإنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بعَمَلِ أهْلِ الشَّرِّ سَبْعِينَ سَنَةً فَيَعْدِلُ في وَصيَّتِهِ فَيُخْتَمُ لَهُ بِخَيْرِ عَمَلِه فَيَدْخُلُ الجَنَّةَ ) رواهُ احمَد في المُسنَد ج٢ ص٢٧٨ بِرَقَم:٢٧٠٤ وَ إبن ماجَه في الوصايا (٩٠٢/٢) بِرَقَم: ٢٧٠٤.

واتە: بەڕاستی کەسی وا هەیە کە کارو کردەوەی ئەهلی چاکەو خێر دەکات بۆ ماوەی حەفتا ساڵ، جا کاتێ کە نزیک بویەوە لە مردن، وەصیەت دەکات و ستەم دەکات لە وەصیەتەکەی داو زەرەر بە هەندێك لە میراتگرانی دەگەیەنێت، ئیتر کۆتایی بە کردەوەی بەدو خراپ دێت و دەچێتە دۆزەخەوە... وە کەسی واش هەیە کارو کردەوە دەکات، بە کارو کردەوەی خەڵکی خراپ بۆ ماوەی حەفتا ساڵ، بەڵام کاتێك مردنی نزیك دەبێتەوە، وەصیەت دەکات زۆر بە دادگەری و شەرعی خوا، چۆنی دەوێت ئاوا لە شەرع لانادات، خوای گەورە بە هۆی ئەم هەڵوێستە جوانەیەوە ئەیخاتە بەهەشتەوە بەوەی کە بەعاقیبەت خێری دەمرێت.

جا بەڕاستی ( حُسنُ الخاتِمة ) عاقیبەت خێری گەورەترین سەرمایەو سەرکەوتنە بۆ مرۆڤ، وە عاقیبەت شەڕی ( سُوءُ الخاتِمة ) خراپترین دۆڕان ولەدەست دان و تیا چوونە، جا توخوا حەیف نیە دین ودونیای خۆت، قیامەتی نەبڕاوەی خۆت، بەهەشتی خوا، بە قوربانی میراتگرێکت بکەی ، کە دوای چەند هەفتەو مانگ و ساڵێك هەر لە بیریشی نامێنیت.

ئیمانداران: شتێکی ئاشکرایەو لە قورئان وفەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ تێی گەیشتووین، کە خێرکردن بە کەس وکاری خۆت، پاداشتی لە خێرو چاکە کردن لەگەڵ کەسێك کە بێگانەیەو خزمت نیە، زیاترە، دەی بە هەمان شێوەش دزی کردن وغەش کردن لە کەس وکاری خۆت، وەکو لە وەصیەت ودابەش کردنی میرات دا، گوناهەکەی لە ماڵ خواردنی بێگانە زیاترە.

ﮮ سەرنجی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بدەن، کە ئیمامی مالیك لە کتێبە بە نرخ و بەها دارەکەیدا (المُوَطَأ) ئەم فەرموودەیەی تۆمار کردووەو دەفەرموێت: زەیدی کوڕی جەهەنی فەرموویەتی: لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا پیاوێك کە لەو غەزایەدا لەگەڵمان بوو، مرد. خەڵکەکە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان ڕاگەیاند: کە فڵان کەس، کە کەسێکی دڵسۆزو ئازا بوو مردووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( صَلُّوا عَلَى صاحِبِكُم ) ئێوە خۆتان نوێژی مردوو لەسەر برادەرەکەتان بکەن و من ناچم نوێژی لەسەر بکەم، خەڵکەکە هەموویان سەریان سوڕماو دەم وچاویان تێك چوو لە

بیستنی ئەم هەواڵە، کە دیارە ئەم پیاوە کارێکی ئەوەندە نابەجیٚ ی کردووە کە شایەنی ئەوە نەماوە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەنازەی لەسەر بکات و ئەو هەموو فەزڵ وگەورەییەی لە دەست چوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆیە نوێژی لەسەر ناکەم چونکە ( إِنَّ صاحِبَكُم قَد غَلَّ فـي سَـبيلِ اللهِ ) هاوەڵەکەتان دزی کردووە لەو ماڵەی کە لە غەزاکەدا دەستکەوتی موسوڵمانان بووەو پاشقولی داوە.

زەیدی کوڕی خالید دەفەرموێت: ( فَفَتَحنا مَتَاعَهُ فَوَجَدنا خرزات مِن خرز يَهُود ما تَـساوي دِرهَمَـينِ ) ئیمەش کەل وپەلەکەیمان کردەوە، هەندێك ورردە شتی جولەکەکانمان دۆزییەوە کە بە هەر هەمووی بایی دوو درهەم نەدەبوو.

ئەم فەرموودەیە: رَواهُ مالِـك فـي المُوَطَّـأ ج٢ ص٤٥٨ بِرَقَم:٩٧٨، وَ أحمَد في المُسنَد بِرَقم:٢١٧١٩.

جا بەراورد بکە لەگەڵ ئەو کەسەی کە بایی چەند دەفتەر دۆلار، چەند ملیۆن دینار زەرەر لە میراتگرێکی خۆی ئەدات، بە وەصیەت نوسێکی نا شەرعی پڕ لە زوڵم وستەم، ئەی دەبێت ئەو کەسە چۆن عاقیبەت شەڕێك بێ و چۆن نابێت نوێژی مردووی لەسەر بکرێت، لە کاتێکدا ئەو کەسە کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری غەزای خەیبەری کردوو، جەنگا بوو، ژیانی کەوتبووە مەترسییەوە،

تەنها لەسەر ئەوەی کە بایی دوو درهەمی لە ماڵی گشتی موسوڵمانان پاشقول دا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر نەکرد.

ئیمانداری بەڕێز: پێویست ناکات وەصیەت بکەی بۆ دابەش کردنی ماڵ وسامانەکەت بەسەر میراتگرەکانتدا دوای خۆت، کە بە داخەوە بەهۆی نەشارەزایمان لە ئیسلام، لای زۆرێك لە موسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە بە ژن و بە پیاوەوە، وای لێهاتووە هەر کە ناوی میرات هات، یەکسەر بیرو هۆش بۆ لای ئەوە دەچێت کە فڵان کەس چەندی بۆ دانراوەو فڵان کەس چۆن لە میرات بێبەش کراوە، وە بە داخەوە ئەوەی کە وەصیەت دەکات، تەنها بۆ دابەشکردنی ماڵەکەی دوای خۆی وەصیەت دەکات، کە لە ڕاستیدا ئەمە وەصیەتی ناوێ، نەخێر، تۆی موسوڵمان وئەهلی مزگەوت دەبێت وەصیەتەکەت شەرعی بێت.

وەصیەت بنووسەو بڵێ: دوای مردنم لە ڕووی شەرعەوە، ئەو خێرەو ئەو صەدەقە جارییەم بۆ بکەن، ئەو قەرزەم بۆ بدەنەوە، ماڵم لای فڵان کەسە بە جوانی لێی وەر بگرنەوە، پاشان شەرعی خوا چۆنی داناوە ئاوا ماڵەکەم دابەش بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ )حَديث صَحيح، رَواهُ الترمذي – صَحيح الجامع لِلألباني برقم: ٧٥٧٠ .

واتە: خوای گەورە بەشی هەموو خاوەن حەقێکی دیاری کردووە، لەبەر ئەوە پێویست ناکات وەصیەت بۆ میراتگر بکرێ و بەشی بۆ دابنرێ.

وە تۆی موسوڵمان بە هیچ شێوەیەك درووست نییە لە وەصیەتی ناشەرعیدا کە ئاوا هەندێ میراتگری تیا زاڵ دەکرێت بەسەر هەندێك میراتگری تردا، بەشدار بیت، هەروەکو لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت، کە ( نەعمانی کوڕی بەشیر ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: باوکم بەشێك لەماڵی خۆی بۆ من دانا لە کاتێکدا کە خۆی لە ژیاندا بوو، بەڵام دایکم فەرمووی: بەخوا تاکو نەچیتە خزمەت پێغەمبەری خواو ﷺ پرسی پێ نەکەیت و نەیکەیت بە شاهید نابێت شتی وا بکەی، { بەڕاستی ئەمەیە نموونەی دایکی دڵسۆزو ئیماندار } بەڵێ نەعمان دەفەرموێت: کاتێك باوکم چووە خزمەتی پێغەمبەری خواو ﷺ بۆی باس کرد، خۆشەویست ﷺ فەرمووی: ﴿أَكُلَّ أولادِكَ نحلته مِثلُ ذلكَ؟ ) ئایا هەموو منداڵەکانت ئاوا وەکو ئەم کوڕەت بە هەمان شێوە بەشت بۆ دیاری کردوون؟ باوکم ووتی: نەخێر، تەنها بۆ نەعمانم دیاری کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( أَشهِد عَلى هذا غَيري ) بڕۆ کەسێکی تر جگە لە من بکە بە شاهید، لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی:( فَــإنِّي لاَ أَشهَدُ عَلى جَورٍ) بەڕاستی من شایەتی لەسەر کاری نابەجێ و ستەم نادەم.

ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر ویستت یەکێك لە میراتگرەکانت دوای مردنت شتێك زیاتر لە حەقی خۆی پێ ببەخشی کە شەرع بۆی دیاری کردووە، لەبەر ئەوەی کە کەسێکی زۆر هەژارە، کەمئەندامە، توانای کەسابەتی نیە، نەخۆشە، ئەوانی تر وەزعیان باشەو لاشەیان

ساغە، ئەوا لەو کاتەدا دەبێت هەموو ئەو کەسانەی کە لە دوای خۆت دەبنە میراتگرت، { ئەگەر تۆ لە پێش ئەواندا بمری، کە ئەمەش تەنها خوا دەیزانێت کێ پێش کێ دەمرێت} دەبێت هەموویان کۆ بکەیتەوەو مەبەستەکەی خۆت و هۆکارەکەیان بۆ باس بکەیت و پرسیان پێ بکەی، جا ئەگەر ڕەزامەندییان لەسەردا، بەڵام بە ڕەزامەندی دڵ، ئەوا دروستە هەندێ زیاتر بۆ یەکێك لە میراتگرەکان دابنرێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّ الله قَد أعطَى كُلَّ ذي حَقٍّ حَقَّهُ، ألا لا وَصيَّةَ لِوارِثِ إلاَّ بِرِضا الوَرَثَةِ ) رَواهُ الدَّار قُطني في سُنَنِه.

بەڵام پێویستە ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە نابێت ئەم پرس پێ کردنە پرسە گورگانە بێت، وەکو ئەوەی باوکێك کچەکانی بانگ بکات و پێیان دەڵێت: کچەکانم، تا خۆم لە ژیاندا ماوم، وا بەشی خۆتانم بۆ داناون، جا یان لێم وەر بگرن، یان گەردنی براکانتان ئازاد بکەن، ئەمە هەمووی غەش وچاو بەستەکییە، جاری خۆ هیچی نەداونەتێ و هیچ بەشێك و ماڵ وپارەو سامانێك دیار نییە، ئەمجا پێشی دەکەوێت بۆ گەردن ئازادی، وە ئەگەر وەریشی بگرێ نەفرەتی لێ دەکات و دەڵێ: کچەکەم مێرد پەرستە، لەبەر ئەوە بە هیچ جۆرێك ئەو گەردن ئازادی و ڕەزامەندی دەربڕینە، وەر ناگیرێ و ئیعتیباری نییە.

جا ئیمانداری بەڕێز: زۆر باش ئەو ڕاستییە بزانە، کە هەر کەسێك وەصیەت بکات بۆ میرات دابەش کردن، بۆ ئەوەی یەکێك لە میراتگرانی زیاتری بەر بکەوێ و یەکێ کەمتر، یان کچ و خوشك

مەحرووم بکات لە میرات، ئەوا توشی ئەم بەڵا گەورانە دەبێت:.....
پەنا دەگرین بە خوا.

١. بە عاقیبەت شەڕی دەمرێ.

٢. بە هۆی ئەو کارە نا شەرعییە پڕ لە زوڵم و ستەمەوە، دەچێتە دۆزەخەوە، کە پەنا بەخوا هەرکەس چووە دۆزەخەوە، هاوار دەکات و دەڵێت: تەنها خۆم دەربکەن لەم ناو ئاگرە، ئیتر ژنم، کوڕم، کچم، خزمم هەموو خەڵکی سەر زەوی بخەنە ئەم دۆزەخەوە، تەنها خۆم ڕزگارم ببێت.﴿ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنْجِيهِ﴾ بەڵام داواکارییەکەشی لێ قبوڵ ناکرێت. ﴿كَلَّا إِنَّهَا لَظَى، نَزَّاعَةً لِلشَّوَى﴾ جا توخوا حەیف نییە لەبەر خاتری هیچ کەسێك، کە چەندیش خۆشت بوێ خۆت بخەیتە دۆزەخەوە.

٣. چونکە تۆ بەگوێ ی خوات نەکردووە، ئا ئەو میراتگرەی کە تۆ خۆتت ئاوا بۆ گوناهبار کردووە، بە خوا دوای مردنت هەرزوو لە یادت دەکات و هیچ خێرو خێراتێکت بۆ ناکات و خۆ ئەگەر بۆشت بکات، سوودت پێ ناگەیەنێ و خوا ماڵی حەرام وەرناگرێ: ( إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ لا يَقبَلُ إلاَّ طَيِّبَاً ).

٤. هەر میراتگرێك ئاوا خۆتی بۆ گوناهبار دەکەی و ئەو ماڵە حەرامەی بە میرات بۆ جێدەهێڵی، دڵنیابە گاڵتە بە عەقڵت دەکات، چەند کەسمان بینیوە زۆر دەوڵەمەند بوون، هەموو کچ وخوشکەکانی لە میرات بێبەش کردوون، کەچی کوڕەکەی کە هەموو سامانی باوکی کەوتووەتە دەست، لەناو خەڵکا لەبەر چاوی دۆست و هاوڕێیانی

گاڵتەی بە باوکی کۆچکردووی کردووەو باسی ئەوەی بۆ گێڕاونەتەوە کە باوکی چۆن ڕەزیل و پیسکە بووەو دڵی نەهاتووە پارەکانی بخوات و وتویەتی: بەڵام من ئاوا بۆی دەخۆم.

وە ئەو خانووەش کە بە ستەم دراوە بە میراتگرێك و بەشی میراتگرانی تری پێوەیەو لێی بێبەش کراون، ئەوە هەر نوێژێك لەو ماڵەدا بکرێت، قبولٚ نیەو هەر ڕۆژوویەك لە نانی ئەو ماڵە پارشێوو بەربانگی بۆ بکرێت، قبولٚ نیە، وە حەجی لەسەر بکات خوای گەورە لێی قبولٚ ناکات، ئای چ ماڵوێرانییەکە ﴿خَسِرَ الدُّنیا وَالآخِرَةَ﴾ کەواتە: تۆی باوك کە بەو شێوەیە ئەو ماڵەت بە ناڕەوا لەسەر حیسابی بەشی میراتگرانی ترت، بە وەصیەت پێش مردنت بەخشیوتە بەو کوڕەت، یان ئەو کچەت، ئەوە دڵنیابە چاکەت لەگەڵ نەکرد، بەڵکو ماڵ وێرانت کرد.

٥. بەم ماڵ دابەش کردنە ناعادیلانەیە، کە دەڵێ: با ئەو خانووەم کە بایی ئەوەندە دەفتەر دۆلارە، بۆ فڵان کوڕم بێ و ئەو زەوییەشم کە لە فڵان شوێنە بۆ ئەوی تریان بێت، شوێنەکەی باشەو بازرگانییە، فڵان زەویشم کە هیچ ناکات با بۆ ئەو کوڕەم بێ و ئەو فەرشە کۆنەش بۆ ئەو کچەم بێ و ئەو ئوتومبێلە گرانبەهایەم بۆ ئەوی تریان بێ پێویستی بە ئوتومبێل هەیە، بەڵام ئەویان با هەر بۆخۆی بە پێ بگەڕێ، گەڕان بە پێ بۆ تەندروستی باشە!

ئائەم دابەش کردنە مامۆستا ( قانع ) ی شاعیرمان بیر دەخاتەوە کە لە شیعری( ماڵ دابەش کردن لەگەڵ براکەم) دەفەرموێت:

براو باوکمان ڕۆیی بە ڕەحمەت

چاك نەجاتی بوو لە دەردو زەحمەت

باوك بۆ هیچ کەس نامێنێ تا سەر

کوڕ ئەو کوڕەیە لە کلْ بێتە دەر

مەسەلە مەشهور، برامان برایی

بەڵام بەو شەرتە کیسەمان جیایی

ماڵەکە بەش کەین، بێ مەلاو قازی

یەك لە یەکتری چاك ببین ڕازی

ئەو هێسترە شێتەی جووتە وەشێنە

دایبنێ بۆ من هیچ دامەمێنە

ئەو پشیلە جوانەی پڕ خەت و خاڵە

چش با بۆ تۆ بێ ڕەونەقی ماڵە

ئەو جووتە مانگای زل و زۆر خۆرە

کە یەکێ شینەو یەکێکیان بۆرە

بۆ من دوو مریشك لاری و هێلکەکەر

دابنێ بۆ خۆت بەبێ دەردی سەر

ئەو ماینە پیرەی زین هەڵپچڕاوە

مەرحوومی باوکم بۆ منی داناوە

بەشی تۆ لەسەر ئەم ماینە نییە

باوکم فەرموویە خەتای من چییە

مس ومەسینەی لە ژەنگا پوواو

دایبنیٚ بۆ من لە ساغ و شکاو

کیتەڵەو گۆزە، دیزەو دەرخۆنە

هەمووی بۆ تۆبیٚ لە تازەو کۆنە

قەت پارە نادەی بۆسپی کردن

مسگەر ناناسی تا ڕۆژی مردن

زڕنگەی مەنجەڵ و زەحمەتی سینی

لە خوام گەرەکە تۆ قەت نەیبینی

ئەو ئاوە ساردە لە ئەو جەوەنە

دایبنیٚ بۆ خۆت، هەر پیٚی پیٚکەنە

ئەو هیزە ڕۆنەی کوڵك و موو دارە

دابنیٚ بۆ من چارم ناچارە

لە دەرگای حەوشە تاوەکو سەربان

دابنیٚ بۆ من سەرپاك هۆدەکان

ئەمما لە سەربان هەتاکو ئاسمان

هەمووی بۆ تۆ بیٚ بیٚ کەسری و نوقسان

هەردووکیان بۆ من گا سورو گا ڕەش

دوو سەگمان هەیە بۆ تۆ لە جیٚی بەش

نە کای بۆ بێنە، نە جێی بماڵە

هیچ ئەرکیان نیە ئەو دوو گەماڵە

شەو تا بەیانی بە جووت ئەوەڕن

حەلەلیان لێ کەی سك پیاو ئەدڕن

برا واماڵمان تەواوی بەش کرد

هەموو بەزیادۆ بەشی خۆتت برد

ئەلحەمدو لیلا بەبێ دڵ یەشان

جیابوینۆ لەیەك بە سەهل و ئاسان

هەرچەند مەغدوور بووم بەشی تۆ زۆرە

لەبەر تانەی عام ڕازیم بەم جۆرە

با خەلقی نەڵێن بڕوانە حاڵی

تەماعی کردە برای منالی.....

بەلێ ئیمانداران: ئەم جۆرە ماڵ دابەشکردنانە، منالەکانت، نەوەکانت، بوکەکانت، کوڕو کچەکانت، پورەکانت، خوشك و خوشکەزاکانت، دەکات بە دوژمنی یەکتری، هەتا مردن چاویان بە یەکتر هەڵنایە، هەموشی سەبەبەکەی ئەم میراتە ناعەدالەت دابەشکراوەیە، وە گوناهی ئەو ڕق لەیەك بوون و هاتوچۆی یەکتر نەکردنە، هەمووی بە ئەستۆی تۆیە، ئەی باوکی ناحاڵی و داماو، کە قیامەتی خۆت بە قوربانی دنیای کەسانی تر دەکەی.!

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب لە ئەحنەفی کوڕی قەیسی پرسی: کێ زۆر زۆر داماوو ماڵوێرانە؟ ئەحنەف فەرمووی: ( مَن باعَ آخِرَتَهُ بِدُنياهُ ) کەسێ دواڕۆژی بە دونیا بفرۆشێت(وأخسر منه مـن باع آخرته بدنيا غيره) وە لەو داماوتر کەسێکە قیامەتی خۆی بە قوربانی دنیای کەسێکی تر بکات... کەسی وا هەیە هەتا مردن لەسەر ماڵەکەی بەخۆشی نەژیاوەو تێری نەخواردووە، بەو دابەشکردنەشی کە موخالیفی شەرعی خوایە، قیامەتی خۆی بە قوربانی دونیای نەوەکانی دوای خۆی دەکات.

بەڕێزان: ئایا ئاژاوەی ناو ماڵێ حەزرەتی ( یەعقوب ) هەر هۆکارەکەی ئەوە نەبوو کە حەزرەتی یەعقوب یوسفی لە براکانی تری زیاتر خۆش دەویست؟ تەنها ئەوە بوو زیاتر یوسفی دەلاواندەوە، خۆ هیچ ماڵیشی نەدابویێ، کەچی ئەمە بیری براکانی بۆگەن کرد.

﴿إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ﴾ یوسف ٨.

ئەمە تەنها لەسەر زیادە خۆش ویستن و زیاتر مەیل پێ دانێك، ئەی ئەگەر ماڵ وساماني ئەو باوکە بدرێ بە هەندێکیان و هەندێکیانی لێ بێبەش بکرێت، دەبێ چ ئاژاوەو دوژمنایەتییەکی درێژخایەن بکەوێتە نێوانیانەوە.

پەنا بەخوا، ئەگەر نەگەڕێینەوە بۆ ئیسلام، زۆر کەس ماڵوێرانی دنیاو قیامەتە، لە دنیادا چونکە پرسی بە شەرع نەکردووە، ماڵ

ومناڵی لێك هەڵدەوەشیٚ، لە قیامەتیشدا خوای گەورە پرسیاری لیٚ دەكات كە ئەو ماڵەی بە دەستیەوە بوو:( مِن أَينَ اكتَسَبَهُ، وَفيمَ أَنفَقَهُ ) لێی ئەپرسێت: چۆنت بەدەست هێنا؟ وە لە چیدا خەرجت كرد؟ جا وەرە بە حەرام پەیدات كردبیٚ و بە ناعەدالەتیش دابەشت كردبێت.!

٦. بەڵای شەشەمی ئەم وەصیەتە ناشەرعییە ئەوەیە: هەر كە ئەولادەكانت زانییان ماڵ وسامانت خستە بەر دەستیان و بە دەست خۆتەوە نەما، ئەوا ئەو ڕێزو حورمەتەیان بۆت نامێنیٚ.

بەڕاستی ئیمانداران: مەسەلەی میرات زۆر گرنگە، خوای پەروەردگار بە ڕەحمەت و بەزەی و كاربەجێی خۆی، بۆخۆی میراتی دابەش كردووەو لە قورئانی پیرۆزدا بەشی هەموو میراتگرانی داناوە، وە ئەم دابەشكردنەی نەسپاردووە بە هیچ پێغەمبەرێك، یان پاشایەك، بەڵكو بۆخۆی لە قورئانی پیرۆزدا دیاری كردووە، خوای گەورەش ( العدل ) ە وە بەسۆزو دڵسۆزترە بە بەندەكانی خۆی، لە دایكێكی بەڕەحم بۆ جگەر گۆشەكانی خۆی، هەر لەبەر ئەمەشە: هەركەسێك یەكێك لە میراتگرانی لە میراتەكەی بێبەش بكات، ئەوا سزایەكی بەئێش و تۆڵەیەكی بە زەبری لیٚ دەكرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ۝١٩﴾ الفجر ١٩.

هەندیٚ كەسیش بەهانەیان ئەوەیە كە دەڵێن: بۆیە پارەی زۆرترو خانووی جوانترو موڵكی بەپیت ترمان داوە بە فڵان ئەولادمان و

نەمانداوە بەوی تریان، چونکە ئەوەیان ماڵ وسامانی خۆشتر دەوێ و باشتر دەیپارێزێت، واتە لە ئەنجامی لە ڕادەبەدەر خۆش ویستنی ماڵ وسامانەوەیە، کەئەمەش زەم کراوە لە قورئاندا: ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾ الفجر ٢٠. کە ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ﴾ باشەو ڕێگە پێدراوەو ئاساییە، بەڵام﴿حُبًّا جَمًّا﴾ خراپەو نەهی لێ کراوە.

بەڕێزان: دابەشکردنی میرات، پەیوەندی هەیە بە ڕوو سوری و ڕوو ڕەشی قیامەتەوە، کە ئەگەر بە گوێرەی شەرع بێ، سەربەرزی پێوەیەو ئەگەر بە پێچەوانەی شەرعیشەوە بێ، ئەوە بەدبەختی و چارە ڕەشی بە دواوەیە، ئەوەتا خوای گەورە لە دوای ئەوەی باسی ئایەتەکانی میرات دەکات، دەفەرموێت:

﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَـٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ النساء ١٣ ـ ١٤.

واتە: ئەوانەی کە باسکران، دەربارەی هەتیوان و چۆنیەتی دابەشکردنی میرات، ئەو سنورانەن کە خوا دیاری کردوون، جا ئەو کەسەی کە فەرمان بەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بکات، لەم بوارەداو لە هەموو بوارەکانی تردا، ئەوە خوا دەیخاتە ناو باخەکانی

بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە تیایدا، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی گەورەو دەستکەوتی بێ سنوور، بەڵام ئەوەی یاخی بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و دەرچێت لە سنوورەکانی، ئەوە خوا دەیخاتە ناو ئاگرێکەوە کە بۆ هەمیشە تێیدا دەمێنێتەوەو سزایەکی سەر شۆڕکەرو ڕیسواکەری بۆ هەیە.

لێرەدا بەپێی ئایەتی ﴿خالِداً فِيها﴾ ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە هەرکەسێك بڕوای بە یاسای میراتی شەرع نەبێ و بیەوێ دەستکاری بکات، ئەوە کافر دەبێت، چونکە هەر کافرە کە بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە.

جا ئەی ئەو کەسەی مافت لە میراتدا خوراوە، غەمبار مەبەو حەقی خۆت بدە بەخودا، لە قیامەتدا تۆڵەت بۆ لە تاوانبار دەکاتەوە.

ئیمانداران: هەر لە وەصیەتی حەرامە، کەسێك وەصیەت بکات و بڵێت: لە دوای مردنم لە سێیەکی ماڵەکەم زیاترم بۆ بکەن بە خێرو حێرات، چونکە تەنها لە سێیەکی ماڵەکەت ڕێگای خێرکردنت پێ ئەدرێ و نابێ زەرەر لە میراتگرانت بدەی.

وە جۆرێکی تر لە وەصیەت کردن دەچێتە ڕیزی مەکروهو ناپەسەندییەوە، ئەمەش لەو کاتەدا کە وەصیەت نووسەکە ماڵ وسامانی کەم بێ و هەندێك میراتگر یان یەك میراتگری زۆر موحتاجی هەبێت، کە زۆر پێویستیان بەو ماڵ وسامانە هەبێ کە لەو وەصیەت

نوســـەوە پێیـان دەگات،هـەروەکو لـەم فەرموودەیــەدا بۆمـان ڕوون دەبێتەوە.

سـەعدی کوڕی ئـەبی وەقاص دەفـەرموێت: سـاڵی فـەتحی مەککـە نەخۆشـییەکی زۆر تونـدو سـەختم گـرت، نەخۆشـییەکە وا کـاری لـێ کردبووم، چاوەڕێی مردن بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەردانم و هەواڵ پرسینم، جا کاتێ تەشریفی لە لام دانیشت، عەرزم کرد: ( يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي مَالاً كَثِيرًا وَلَيْسَتْ تَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَــةٌ لِـــي فَأُوصِـــي بِمَـــالِي كُلِّـــهِ؟) ووتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ مـن مـاڵ وسامانێکی زۆرم هەیە، وە هیچ میراتگرم لە دوا بەجێ نـامێنێ، تـەنها ئەو کچەم نەبێت، ئایا هەموو ماڵەکەم بکەم بە وەصیەت کە لـە دوای مـردنم بۆم بکـەن بـە خێـرو خێرات؟ پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: نەخێر، سەعد دەفـەرمووێ ووتم: ( فَثُلُثَي مالي) دەی دوو لەسـەر سـێ ی ماڵەکــەم دەکــەم بــە خێــرو خێــرات و یــەك بەشــی بــۆ کــچەکەم دەهێڵمــەوە، پێغەمبــەری خــوا ﷺ فــەرمووی ئەمەشــیان کــارێکی شـەرعی نییـە، سـەعد دەفـەرموێ ووتم: ﷺ دەی سـێیەکی ماڵەکـەم دەکەم بە وەصـیەت کـە لـە دوای مـردنم بۆم بکـەن بـە خێـرو صـەدەقە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كثير) باشە وەصیەت بکە سێیەکی ماڵ وسامانەکەت لە دوای خۆت بۆ بکـەن بـە خێـرو خێـرات، هەرچەندە سێیەکیشی هەر زۆرە، چونکە:( إِنَّــكَ أَنْ تَــدَعَ وَرَثَتَــكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ)متفق عَلَيه .

واتە: ئەگەر تۆ میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی، باشترە لەوەی کە بە هەژاری جێیان بهێڵی و پاشان چاو لە دەستی خەڵکی بن.

بۆیە هەندێ لە زانایانی شەرع، بەلایانەوە وا باشە کە وەصیەت کردن بۆ خێرو خێرات، لە سێیەك کەمتر بێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ سێیەکیشی پێ زۆر بوو، وە فەرمووی: ( الثُّلُثُ كثير) .

هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێنج یەکی ماڵەکەیان دیاری دەکرد، کە لە دوای خۆیان بۆیان بکرێ بە خێرو خێرات، ئەمەش بەپێی ئایەتی:

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ الأنفال ٤١ .

بەڕێزان لێرەدا چەند سەرنجێك هەیە:.

١. ئیمانداری تێگەیشتوو پێگەیشتوو، وەکو سەعد، بۆ خێرو خێراتیش سەربەخۆو بە ئارەزووی خۆی بڕیار نادات، بەڵکو پرس بە شەرعی خوا دەکات، چونکە ئێستا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوماندا نەماوە، کە ئێمەش وەکو سەعد بچینە خزمەتی، بەڵام

قورئان وحەدیس لەبەر دەستماندان و دەبێ بچینە خزمەتیان و بۆ هەر کارو بڕیارێك پرسیان پێ بکەین.

٢. بەخشندەیی صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەتا سەعد ئامادە بوو هەموو ماڵ وسامانی خۆی ببەخشێ لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا.

٣. جوانی ئەم ئیسلامە. کە بەردەوام هاوسەنگی ڕادەگرێ و ناهێڵێ لە کاتێکدا مرۆڤ دڵی گەرم بووەو وا چاوی لەبەهەشتە، لەو کاتەدا هەموو ماڵ وسامانەکەی بکات بەخێرو پاشان ماڵ ومناڵەکەی موحتاجی دەستی خەڵکی بن.

کەواتە: ئاینی ئیسلام هەر دینی عەطف وسۆز نیە، بەڵکو دینی عەقڵ ومەنتیقیشە مافی هەموو کەس دەپارێزێت.

ئیمانداران: ئەم بابەتە شیکردنەوەی زیاتر هەڵدەگرێت ( إن شاءَ الله ) لە ووتاری داهاتوودا تیشکی زیاتری دەخەینە سەرو تا ئەو کاتە بە خوای گەورەتان ئەسپێرم.

# سەرچاوەکان:.


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان — بورهان محمد ئەمین

٣. صَحیحْ وَصایا الرَسول ﷺ — سعد یوسف أبو عزیز

٤. فَتاوَی وَأحکام بَرید الأسلام — د. أحمد علی طریان

٥. گوڵچینی دیوانی قانع

٦. لا تَحْزَنْ — محمد عبدالعاطی بَحِري

٧. نَظرَة النَعِیم ج.٨

٨. صَوت المِنبَر — محمد صالح الونیات

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ أَجمَعينَ:

**ئیمانـداران: لـە ووتـاری ڕابـردوودا لـە بابـەتێکی گـرنگ وگـەورە دواین، کە بریتی بوو لـە وەصـیەت کـردن، جـا وەصـیەت کـردن ئـەگـەر بـەپێی شـەرع بـێ، زۆر پـیرۆزەو پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئوممەتەکـەی ئاگادار کردووەتەوە، کە ئەوەندە گرنگی بە وەصـیەت بـدەن، کە هـیچ شەوێك نەچنە سەر جێگـای خـەوتن، هەتاوەکو وەصیەتەکە لە پشت سەریان یـان لـەناو نوسـراوو کـەل وپەلەکانیانـدا نـەبێت، بەڵام ئەگـەر وەصیەت کردن شەرعی نەبێت، ئەوە بەڕاستی بەڵایـەکی گەورەیە بۆ دیـن و قیامـەتی ئـەو کەسـەو مایـەی فیتنـەو ئاشـووب و پـچڕانی برایەتییـە لـە نێـوان میراتگرەکانـدا، جـا هـەرکات وەصیەتێك نوسـراو ئەوەی وەصیەتەکەی کردووە بۆی ڕوون بویەوە کە ناشـەرعییە، ئـەوە دەبـێ دەسـت بـەجێ لێـی پەشـیمان بێتـەوەو ئـەو وەصـیەتە بـەتاڵ بکاتـەوە، وە وەصـیەت کـردن لـە ڕووی شـەرعەوە حوکمەکـەی ئەوەیـە کـە:(** عَقدٌ غَيرُ لازِمٍ مادامَ المُوصـــي حَيَّـــاً **) لەبەر ئـەوە وەصـیەت جێبەجێ ناکرێـت تـاکو وەصـیەت نوسـەکە لـە ژیانـدا بێـت، هەربۆیـە زانایانی شـەرع فەرموویانـە: (** تبطل الوَصيَّةُ بِرُجُوعِ المُوصي فيهـــا قَبلَ المَوتِ ).

**حەزرەتی عومەر فەرموویەتی: وەصیەتکار بۆی هەیـە دەسـتکاری وەصیەتەکەی بکات بە ئارەزووی خۆی.**

کەواتە: ئەگەر وەصیەتەکە ناشەرعییە لێی پەشیمان ببنەوەو بەو پەشیمان بونەوەیە بەتاڵ دەبێتەوە.

وە بزانن: وەصیەت کردن سوننەتە شاهیدی لەسەر بێت، دوو شاهید ئاگاداری نوسینی وەصیەتەکە بن، جیاوازی نییە کە وەصیەتکار بە دەستی خۆی وەصیەتەکەی نوسیبێت یان خوێندەواری نەبوبێت و کەسێکی تر بۆی نوسیبێت لەسەر قسەکانی ئەو، وە هەروەها سوننەتە وەصیەتکار، کەسێك دیاری بکات کە لە دوای خۆی سەرپەرشتی جێبەجێ کردنی وەصیەتەکەی بۆ بکات، ئەم کەسەش دەبێت ئەم ئیشانە بکات:

١. بە دادگەری و بەپێی شەرع ماڵەکە دابەش بکات بەسەر میرات گرەکاندا.

٢. ئەگەر وەصیەتکار زەکاتی لەو ماڵ وسامانە نەدابوو، دەبێت زەکاتی لێ دەربکات، ئینجا دابەشی بکات، وە ئەگەر حەجی نەکردبوو، دەبێت حەجی بۆبکات لەو پارەیە، کەسێك حەجی بۆبکات پاشان ئەوەی مایەوە دابەشی بکات.

٣. هەر وەصیەتێکی کردبێت ئەم سەرپەرشتیارە جێبەجێی بکات، بۆ نموونە: ووتویەتی: لە دوای مردنم مزگەوتێکم بۆ دروست بکەن، خوێندنگایەك، نەخۆشخانەیەك لەو پارەو سامانەی بەجێی دێڵم دروست بکەن، یان هەر خێرو صەدەقە جارییەیەکی تری بڕیار درابوو، دەبێت سەرپەرشتیار جێبەجێی بکات، بە مەرجێك لە سێیەکی ماڵ وسامانەکە زیاتر نەبێت و زەرەر لە میراتگرەکان نەدات.

مەرجەکانی سەرپەرشتیار: ئەو کەسەی کە دەکرێ بە سەرپەرشتیاری جێبەجێ کاری وەصیەتێك، دەبێ لە تەرازووی شەرعدا هەڵبسەنگێندرێ و ئەم مەرجانەی لێ بێنەجێ:.

١. موسوڵمان بێت.....٢. باڵغ وپێگەیشتوو بێ و منداڵ نەبێت.....٣. عاقڵ وژیرو کەسێکی کاڵ فام و بێ هۆش وگۆش نەبێت.....٤. دادپەروەربێ و لە حەق لانەدات.....٥. کەسێکی خاوەن رێزو جێگای متمانە بێ و گوێی بۆ بگیرێ و پێگەی کۆمەڵایەتی بەهێز بێ و توانای ئەوەی هەبێت میراتگرەکان ملکەچ بکات، کە کەس لە حەقی خۆی زیاتر داوا نەکات.

جا ئەو کەسە کە سەرپەرشتیارە دەگونجێ لە ئەولادو نەوەی وەصیەتکارەکە بێ، یان خزمێکی نزیکی بێ، یان کەسێکی بێگانە بێ، یان دۆست وخۆشەویستی بێ و جێگای متمانەی بێت.

وە ئەو کەسەی کە کرا بە سەرپەرشتیاری جێبەجێ کردنی وەصیەتنامەکە، ئەگەر زانی ئەم کارەی پێ ناکرێ، دەبێ هەر لە سەرەتاوە قبوڵی نەکات و نەچێتە ژێر بارییەوە.

ئیمانداران: دەبێت ئەو کەسەی وەصیەت دەکات ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١. عەقیدەو بیروباوەڕی موسوڵمانانە بێت.

٢. زۆری لێ نەکرابێ و لەژێر گوشاردا پێی نەنوسرابێ، بەڵکو دەبێت زۆر بە ئازادانەو سەربەستانە نوسیبێتی، نەك لە ترسی ئەوەی

بوکەکەی دەری نەکات وەصیەت بنوسێ و بڵێ: با ئەم خانووە بۆ ئێوە بێت.

پاشان دوای ئەوەی کە وەصیەتکار مرد، دەبێت سەرپەرشتیار هەموو میراتگرەکان کۆ بکاتەوەو بچنە خزمەت زانایەکی بەڕێزی شەرعزان بۆ دابەشکردنی میراتەکە، چونکە زانستی وەصیەت و میرات هەموو کەس نایزانێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ وَتَعَلَّمُوا الْفَرَائِضَ وَعَلِّمُوهَا النَّاسَ وَتَعَلَّمُوا الْعِلْمَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ فَإِنِّى امْرُؤٌ مَقْبُوضٌ وَإِنَّ الْعِلْمَ سَيُقْبَضُ وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ حَتَّى يَخْتَلِفَ الاثْنَانِ فِى الْفَرِيضَةِ لاَ يَجِدَانِ مَنْ يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا ) رَواهُ النسائي في سُنَنِه الكُبرى برقم(٦٣٠٦) وَرَواهُ الدَّارَقُطني في سُنَنِه بِرَقَم(٤٥).

واتە: قورئانی پیرۆز فێر بىن وبیخوێنن، وە فێری خەڵکیشی بکەن، وە زانستی فەرائیز( وەصیەت ومیرات دابەش کردن ) فێر بىن، وە فێری خەڵکیشی بکەن، وە هەموو زانستێکی بە سوود فێر بىن، وەکو (جوگرافیا، مێژوو، کیمیا، فیزیا، زیندەوەرزانی... هتد ) وە فێری خەڵکیشی بکەن، چونکە منیش وەکو هەموو مرۆڤێك ڕۆژێك کۆتایی بە ژیانم دێ و جێتان دەهێڵم، ئیتر ئەوکات فیتنە ئاشکرا دەبێ و زانستی شەرعی کەم دەبێتەوە، تا وای لێ دێت، دوو کەس کێشەیان لەسەر مەسەلەیەکی میرات دەبێ و کەسێکیان دەست

ناکەوێت کە نێوانیان بکات و بەشی هەریەکەیان بە پێی شەرع دیاری بکات.

بەڕاستی ئەمڕۆ زانایانی شارەزاو پسپۆڕ لە بواری میرات دابەشکردندا کەم بونەتەوە، خوای گەورە زانایان و مەلا مێزەر سپییەکانی کوردستانمان تەمەن درێژو لەش ساغ بکات و یارمەتی دەریان بێت بۆ ئەوەی فەقێ لە حوجرەیان نەبڕێت، ( إن شاءَ الله ) .

بەڕێزان:ئەمانە هەمووی شەریعەتی ئسلام باسی کردوون و پێویستە ئێمەی موسوڵمان لێیان شارەزابین.

وە بزانن: دروستە سەرپەرشتیار دەستکاری وەصیەت بکات ئەگەر زانی ناشەرعی تێدایەو صوڵح لە نێوان میراتگرەکاندا بکات، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ البقره ١٨٢.

واتە: جا هەرکەس دەترسا لە وەصیەتکارەکە هەڵە یان گوناهێك یان ماف خۆرییەك ئەنجام بدات، گیروگرفت بۆ وەرەسە دروست بکات، ئینجا ڕێکی خست، ئەوە هیچ گوناهی لەسەر نییە، بەڵکو بە خێرخواز لەقەڵەم دەدرێت. بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبوو میهرەبانە.

ئیمانداران: دوای مردنی وەصیەتکارەکە، یەکەم شت کە لەو ماڵ وسامانەی جێی هێشتووە، خەرج دەکرێت ئەمانەیە: هەرشتێك لەسەر مردووەکە پێویست و واجب بێت، دەبێ جێبەجێ بکرێت، جا

وەصیەتی کردبێت یان وەصیەتی نەکردبێت، وەکو فەرزی حەج، ئەگەر حەجی نەکردبێ ومەرجەکانی چوونە حەجی تێدا هاتبێتە جێ، دەبێت پارەی حەجێکی تەواو لابدرێت، وە هەروەها ئەگەر کەفارەتی سوێندی لەسەر بوو، وە نەیدابوو، دەبێت بایی خواردنی ( ١٠ ) هەژار پارە جیا بکرێتەوەو بدرێت بە ( ١٠ ) کەسی هەژار، یاخوود ئەگەر کەفارەتی (ظهار ) ی لەسەر بوو کە خواردنی ( ٦٠ ) هەژارە، بڕی پارەکە جیا بکرێتەوە، یان زەکاتی نەدابوو لەو ماڵ وسامانە، دەبێ زەکاتەکەی لێ جیا بکرێتەوە، یان نەزرێکی لەسەر خۆی بڕیار دابوو، بەڵام فریا نەکەوت جێبەجێی بکات ومرد، ئەوا دەبێت ئەو نەزرەی بۆ جێبەجێ بکرێت، یان قەرزی کەسێکی لەسەر بوو، یان قەرزی بانقی حکومی لەسەر بوو، ئەبێت ئەو بڕە پارەیە کە ئەو قەرزەی پێ لادەچێت، جیا بکرێتەوەو قەرزەکە بدرێتەوە، پاشان ئەوەی لەمانە زیاد مایەوە دابەش دەکرێت بەسەر وەرەسەدا.

بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ زۆرێك لە موسوڵمانان بە هۆی بێئاگاییان لە شەرعی خوا، هیچکام لەمانەی باسمانکردن جێبەجێ ناکەن و یەکسەر ماڵ وسامانەکە دابەش دەکەن بەسەر خۆیانداو ئەوەی لە بیریان نامێنێ، مردووەکەو ئەو هەموو ماف وحەقەی کە لەسەریەتی و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەری.

بەڕێزان: پرسیارێکی گرنگ هەیە کە لای زۆربەی موسوڵمانان ڕوون نییە، ئەویش ئەوەیە:ئایا ئەولادی خراپ لە میرات بێبەش دەکرێت؟ جا چ کوڕ بێت یان کچ، بۆ نموونە کچێك بەبێ ڕەزامەندی

باوكی شوو بە كوڕێك بكات و ژیانی هاوسەری لەگەڵ پێك بهێنێت، ئایا لە میرات بێبەش دەكرێت؟

لە وەڵام دا دەڵێین: ( والله أعلم ) هیچ شتێك میراتگر لەبەشە میراتی بێبەش ناكات، تەنها كوشتن نەبێت، كاتێك میراتگر میرات لێگیراو بكوژێت، ئەو كاتە بكوژ لە میرات بێبەش دەكرێت.

كەواتە: ئەگەر كوڕێك باوكی خۆی كوشت، ئەوا هیچ لە میراتی باوكی ناگرێت، هەرچەندە ئەو باوكە پێش مردنی لە وەصیەتەكەیدا، بەشی تایبەتیشی بۆ ئەو كوڕەی دانابێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( لَيسَ لِلقاتِلِ شَيءٌ ) رَواهُ ابُو داود وَ النِّسائي.

واتە: بكوژی میراتگر هیچ لە میرات لێگیراوەكەی خۆی كە كوشتویەتی ناگرێت... یاسای شەرع زانانیش لەمبارەیەوە ئەوەیە ( مَن استَعجَلَ الشَيءِ قَبلَ أَوانِهِ عُوقِبَ بحِرمانِهِ ) هەركەسێك پەلە بكات بۆ گەیشتن بە شتێك، پێش هاتنی كاتی خۆی، ئەوە سزا دەرێت بەوەی كە لەو شتە بێبەش دەكرێت.

( سُبحانَ الله ) ئەم ئیسلامە چەند جوانە، ئەم یاسایەی داناوە لەبەر ئەوەی كە نەوەكا ئەولاد لەبەر خاتری ئەوەی زوو میراتی باوكی پێ بگات، باوكی خۆی بكوژێت، وەكو ئەوەی كە لەیەكێك لە شارەكانی كوردستانی خۆماندا كوڕێك لەگەڵ دوو برادەری خۆی دا، باوكی بە فێڵ وپیلان دەباتە دەرەوەی شارو بەناوی ئەوەی كە ئوتومبێلەكەی لە كەسێكی داوەو كوشتویەتی، پاشان كە باوكەكەی

دەباتە دەرەوەی شار، دەیکوژێت ولاشەکەی فڕێ ئەدات، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو پلاتینەی کە کاتی خۆی خراوەتە ناو قاچی باوکییەوە، ماددەیەکی بەنرخە، دەری بهێنن وبیفرۆشن، بەڵام کاتێك قاچی باوکی هەڵدەدڕێت، سەیر دەکات پلاتینەکەی تێدا نەماوە..!

دواتر لەلایەن پۆلیسەوە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە دەکرێ و کوڕە باوك کوژەکەو هاوڕێکانی دەستگیر دەکرێن و دان بە تاوانەکەیاندا دەنێن.... جا لە نموونەی ئەم کارەساتانە ئەم کوڕە لە میراتی باوکی بێبەش دەکرێت.

ئیمانداری بەڕێز: ئاوا ماڵ وسامانت دەڕوات بۆ میراتگرانت، دەی تا لە ژیاندا ماوی بە بەشێکی کەمی ئەو ماڵەی ژێر دەستت، قیامەتی خۆت ئاوەدان بکەرەوە.خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللَّهَ وَاعْلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ البقره ٢٢٣.

دە کەواتە تا لە ژیاندای ماڵەکەت بۆ خاتری خوای گەورە ببەخشە.

هاوەڵی بەڕێز ( ئەبو هورەیرە ) دەفەرموێت: پیاوێك عەرزی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ ( یا رَسُولَ الله أَيّ الصَّدَقَة أعظَمُ أجراً؟ ) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام خێرو صەدەقەیە زۆرترین پاداشتی هەیە لای خوا؟ فەرمووی: ( أَنَّ تَصَدَقَ وَأَنتَ صَحيحٌ شَحيحٌ تَخشَى

الفَقرَ وَتَأمُلُ الغنى، وَلا تُمهِل حَتَّى إذا بَلَغَتِ الحُلقُومَ قُلـتَ: لِفُـلانٍ كَذا، وَقَد كانَ لِفُلانٍ ) رَواهُ البُخاري في صَحيحِه.

**واتە: باشترین خێرو صەدەقە کە زۆرترین و گەورەترین پاداشتی هەیە لای خوا، ئەوەیە کە تۆ خێرو بەخشین ئەنجام بدەیت، لە کاتێکدا کە تۆ لاشەت ساغەو دڵت بە دنیا خۆشەو لە هەژار کەوتن دەترسی و حەزت لە دەوڵەمەند بوونە. ئیتر لێ مەگەرێ هەتا ئەو کاتەی کە ڕووح دەگاتە گەرووت، ئا لەو کاتەدا بڵێ: بۆ فڵان کەس ئەوەو بۆ فڵانیش ئەوە دابنێن، چونکە لە ڕاستیدا تازە هەر بۆ فڵانە.**

**دەی کەواتە ئەگەر لە حاڵی حەیاتدا ماڵ وسامانەکەت چووەتە ناو دڵتەوەو لە گیرفانتدا نییەو لە گیرفانی دڵتدایە، ئەوا لانی کەم وەصیەت بکە کە مردی خێرێکت بۆ لێ بکەن، بڵێ: توخوا گەلێك بەو ماڵ وسامانەوە ماندوو بووم، صەدەقەیەکی جاریم بۆ بکەن، مزگەوت، مەکتەب، نەخۆشخانەیەکم بۆ دروست بکەن، بیرە ئاوێك بەو پارەیەی جێی دێڵم و خۆم دەستم تێی نەچوو، لێ بدەن، فڵان خانووم بۆ بەکرێ دراوە، مانگانە کرێکەی بە هەژاران ببەخشن، یان با کەسی هەژار بەبێ کرێ تێیدا بژی، بڵێ: قورئانێکم بۆ هەدیە بکەن، کتێبێکی شەرعی لەسەر پارەکەم چاپ بکەن و بڵاوی بکەنەوە.**

**ئای هاوار بەحاڵی ئەو کەسەی کە نە لە ژیانی خۆیدا خێرو صەدەقە دەکات، نە وەصیەتیش دەکات کە دوای مردنی خێرێکی نەبڕاوەی بۆ بکەن.**

خۆشەویستان: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەگەر کەسێك مردوو وەصیەتی نەکردبوو کە خێرو صەدەقەی بۆ بکەن، ئایا دروستە کە خێری بۆ بکرێ و سوودی پێ دەگەیەنێت؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا: دەچینە خزمەت ئەم فەرموودەیە: هاوەڵی بەڕێز ( ئەبو هورەیرە ) دەفەرموێت: ( أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ الله ﷺ قالَ: إنَّ أبي ماتَ وتَرَكَ مالاً، ولَم يُوصِ، فَهَل يُكَفِّرُ عَنهُ أن أتصَدَّق عَنهُ؟ قالَ: نَعَم ) رَواهُ مُسلِم.

واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو ووتی: من باوکم مردووەو ماڵ وسامانێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە، بەڵام وەصیەتی نەکردووە کە لە دوای مردنی خێرو خێراتی بۆ بکەین، جا ئایا ئەگەر من خێرو صەدەقەی بۆ بکەم، دەبێتە هۆی لابردنی گوناه وتاوان لەسەری؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ .

لە فەرموودەیەکی تردا کە دایکی ئیمانداران ( خاتوو عائیشە ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی: ( إنَّ أُمِّي افتُلِتَت نَفسَها، ولَم تُوصِ وَ إنِّي أظُنُّها لَو تَكَلَّمَت لَتَصدَّقَت، فَلَها أجرٌ إن تَصدَّقتُ عَنها؟ ولِّيَ أجرٌ؟ فَقالَ: نَعَم) متفق عَليهِ .

واتە: من دایکم لە ساغیدا بەبێ هیچ نەخۆشییەك کتوپڕ بە لادا هات و مرد، وە فریا نەکەوت وەصیەت بکات کە خێرو خێراتێکی بۆ بکەین، وە من وا دەزانم کە ئەگەر قسەی بۆ بکرایەو فریا بکەوتایە،

خێروخێراتێکی دیاری دەکرد کە لە دوای مردنی بۆی بکرێت، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر من کە کوڕی ئەوم خێرو صەدەقەیەك بکەن، خێرو پاداشتەکەی بە دایکم دەگات و منیش هیچ ئەجرو پاداشتم دەست دەکەوێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ هەم تۆ ئەجرو پاداشتت دەست دەکەوێ و هەم دایکیشت لەو ئەجرو پاداشتە بەهرەمەند دەبێت... هەزاران سوپاس وستایش بۆ ڕەحمی خوای گەورە.

بەڕێزان: کاتێك کە ئێمە باسی وەصیەت و میرات دەکەین، بە پێویستی دەزانم لەم دەرفەتە شیاوەدا، وەڵامی ناحەزانی ئیسلام بدەمەوە کە زۆرجار لێرەو لەوێ، لە کۆن ونوێ بڵاوی دەکەنەوەو دەڵێن: باشە بۆچی لە ئیسلامدا کوڕ دوو ئەوەندەی کچی بەر دەکەوێت لە میراتدا؟ کە مەبەستیان ئایەتی پیرۆزی﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ یە، ئایا ئەمە ستەم نیە لە ئافرەت؟ کە دوو ئافرەت لە بەرامبەر یەك پیاودا دابنرێن.

لە وەڵامی ئەو ڕەخنەیەی ناحەزانی ئیسلامدا دەڵێین:

١. لە پێش هاتنی ئاینی ئیسلامدا ئافرەت بە میرات دەگیرا، نەك میرات وەر بگرێت، هەر بە تەواوی بێبەش کرابوو لە میرات، بەڵام کە ئیسلام و نوورو ڕەحمەتەکەی هات، ناوی ئافرەتی هێنایە ناو لیستی میراتگرەکانەوە.

٢. ئەبێ زۆر جوان هەموومان گوێ بۆ ئەو ڕاستییە بگرین کە: ئیسلام میراتی لەسەر ئەساسی پیاو سالاری دابەش نەکردووە، بەڵکو لەسەر گەلێك بنەمای زانستی میراتی دابەش کردووە، وە ( ٣٤ ) قاعیدەی بۆ میرات داناوە:

لە ( ١٠ ) شوێن دا ئافرەت بە ئەندازەی پیاو میرات دەبات.

لە ( ١٠ ) شوێن دا ئافرەت لە پیاو زیاتر میرات دەبات.

لە ( ١٠ ) شوێن دا ئافرەت پیاو بێبەش دەکات لە میرات.

لە ( ٤ ) شوێن دا پیاو دووقاتی ئافرەت میرات دەگرێت، ئەویش ئەو کاتەیە کە پیاوێك مردووەو هەم کوڕ هەم کچی لە دوا بەجێ ماوە، ئا لەم کاتەدا میرات لەسەر بنەمای ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان دابەش دەکرێت.

ئایا پیاو ئەرکی کۆمەڵایەتی زیاتر لەسەر شانە یان ئافرەت؟ بێگومان پیاو، چونکە لە ئیسلامدا هەموو ئەرکەماڵییەکان خراونەتە سەر شانی پیاو.

کوڕ ژن ئەهێنێت، دەبێت مارەیی بدات، خەرجی بووك گواستنەوەو ماڵ دروست کردن بدات، پاشان نەفەقەی ژنەکەیی و مناڵەکانی بدات.

لە بەرامبەردا: کچیش شوو دەکات، مارەیی وەردەگرێت، نەفەقەشی دەکێشرێت، ماڵ وحاڵ و هەموو پێداویستییەکیشی بۆ ئامادە دەکرێت، وە هیچ لە پارەکانی خۆی خەرج ناکات.

کەواتە: لە هەموو حاڵێکدا ئافرەت ژیانی مسۆگەر کراوە، تا کچە پێویستە باوکی یان وەلی ئەمرەکەی هەموو پێداویستییەکانی ژیانی بۆ دابین بکات، بەپێی تواناو هەبوون، کە شوشی کردو چووە لای هاوسەرەکەی، دەبێت مێردەکەی تەواوی پێداویستی ژیانی بۆ دابین بکات، وە کاتێکیش چووە تەمەنەوەو بوو بە دایك، واجبە مناڵەکانی بەخێوی بکەن و لە خزمەتیا بوەستن و هەموو پێداویستییەکانی بخەنە بەر دەست.

کەواتە: ئەو پارەیەی ئافرەت لە میراتدا وەری ئەگرێت، دەست مایەیەو بۆ خەرج کردن وەری ناگرێت، بەڵام کوڕ ئەو پارەیەی کە لە میراتدا وەری دەگرێت، بەشی ژن هێنانیشی ناکات.

کەواتە: ئەگەر خوشك وبرا وەکو یەك میرات لە باوکیان یان لە دایکیان وەر بگرن، ئەوە مساوات ویەکسانییە، بەڵام مساوات ویەکسانییەکی سەقەتە، چونکە عەدالەتی تێدا نییە، ئەمە هەروەکو ئەوە وایە کە کەسانێك داوای ئەوە بکەن، کە موچەی پیرە ژنێکی تەنهای خاوەن ماڵ وحاڵ وخانوو، وەکو موچەی کابرایەکی خاوەن ژن و دە منالی بێ خانووی کرێچی بێت، وەکو یەك موچە وەربگرن بێ زیادو کەم، ئەمە لە ڕواڵەتدا یەکسانییە، بەڵام هەتا بڵێی ستەمە، چونکە دژی عەدالەتە.

ئیمانداران: قاعیدەو بناغەیەکی تر بۆ دابەش کردنی میرات کە لە ئیسلامدا ڕەچاو کراوە ئەوەیە: فەرع زیاتر دەگرێت لە ئەصڵ، بە ڕوونتر نەوەی نوێ زیاتر وەردەگرێ لە باوك و باپیرانی، هەندێ جار

نەوەی تازە، ئەصڵەکەی خۆی کە چووەتە تەمەنەوە بێبەش دەکات لە میرات، کە پێی دەوترێت ( حەجب ).

بۆ نموونە: دایك نەنك حەجب دەکات، باوك باپیرە حەجب دەکات، بۆچی؟

چونکە کوڕو کچ ئەو جیلەیە کە پێ دەگات بەرەو پێگەیشتن دەڕوات، بەڵام نەنك وباپیر بەرەو لێبوونەوە دەڕۆن، کەواتە: ئەمەی کە تازە پێدەگات موستەحەقە بەوەی کە موراعاتی لایەنی مادی بکرێت، چونکە ئەرکی بەخێوکردن ئەکەوێتە سەر ئەم، کەواتە ئەم ئەفزەڵیەتی هەیە بەسەر ئەوەی کە خوا حافیزی لە ژیان دەکات..

لە کۆتایی ئەم ووتارەش دا دەڵێم: گەلێ جار دەبیستین کە فڵان دەسەڵاتدار لە ئەورووپا کە مرد، هیچی وای لە ماڵ وسامان لە دوا بەجێ نەما کە شایەنی باس کردن بێت، ئێمەی موسوڵمان یەکسەر پێی موعجیب دەبین، بەڵام بێ ئاگاین لە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان ﷺ کە کاتێ وەفاتی کرد، میراتی لێ نەگیرا، چونکە خۆی فەرموویەتی: ( نَحنُ مَعاشِرِ الأنبياء لا نُورَثُ، ما تَرَكناهُ صَدَقَة ) بۆیە کاتێك فاتیمە داوای ئەو پارچە زەوییە بچکۆلەیەی کرد، کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ سوودی لێ دەبینی، حەزرەتی أبوبکر نەیدایەوە بە فاتیمەی کچی پێغەمبەری خواو خێزانی عەلی کوڕی أبو تالیب بەڵام بە داخەوە، لە کۆنەوە تائێستا، نەك هەر ماڵ وسامان وکۆشك وتەلارو بازاڕو ئوتومبێلی بێشوومار لە دەسەڵاتدارانەوە بۆ نەوەکانیان ببێ بە میراتی، بەڵکو

کورسی و دەسەڵاتیش دەکرێت بەمیرات وکوڕ هەرچەند قابیلیەتی نییە لە شوێنی باوکی دابنرێت، ئێستا چەند کەس هەیە خاوەنی عیلم وتوانایەو کەچی هیچ پۆستێکی نیە، چەند کەسیش بەهۆی باوکییەوە، باشترین پۆستی بە میرات بۆ ماوەتەوە، کە ئەمە لە ئیسلامدا ڕەفز کراوە.

زانای گەورە ( شیخ ابوبکر الجَصاص ) لە ( أحكام القُرآن ) دا، لە تەفسیری ئایەتی ﴿وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ بَعَثَ لَكُمۡ طَالُوتَ مَلِكٗاۚ قَالُوٓاْ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلۡمُلۡكُ عَلَيۡنَا﴾ البقره ٢٤٧ دەفەرموێت: ( يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الإمامَةَ لَيسَت وِراثَةً ) ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە فەرمانڕەوایەتی بە میراتی لە باوکەوە ناگوازرێتەوە بۆ نەوەکانی.

دە با شانازی بە ئیسلامەکەمانەوە بکەین، کە هەموو هۆکارێکی بەختەوەری بۆ باس کردوین و هەموو پێشکەوتنێك لە ئیسلامەکەی خۆماندایە.

وە لە کۆتایدا: جارێکی تر بە بیری هەموو لایەکی دەهێنمەوە، کە با وەصیەت بنووسین، بەڵام بەپێی شەرع بینوسین، وە هیچ کەس میرات بۆ وەرەسەکانی دیاری نەکات، چونکە هەر خوا دەزانێ کێ مەرگی پێش کێ دەکەوێ ...

بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم ڕاستییە، سەرنجی ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیە بدەن، کە زانای گەورە ( دکتۆر سعید عبدالعظیم ) بۆمان

دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: { ئافرەتێکی دەوڵەمەند توشی نەخۆشییەك دەبێت و سەرەنجام دکتۆری پسپۆڕ پێی دەڵێت: کە هیچیتر عیلاج بەکار مەهێنەو سەردانی دکتۆر مەکە، وەکو ئەوەی بە ناڕاستەوخۆ پێی بڵێن: مردنت نزیك بووەتەوە، ئەم ئافرەتەش هەڵدەستێت هەرچی ماڵ وسامانی هەیە دەیکات بە ناوی یەکێك لە خوشکەکانیەوە، کە لە کاتی نەخۆشییەکەداو پێشتریش زۆر بە دەوریەوە بووە، بۆ ئەوەی هەموو خوشك و براکانی تری بێبەش بکات لە میرات، چونکە هاوسەری نەماوەو منداڵیشی نیە، ئەمەی وەکو تۆڵە لێکردنەوە کرد لە خوشك وبرا بێڕەحمەکانی.. بەڵێ هەموو سەروەت و سامان و خانوو ماڵەکەی بەخشی بە خوشکە خۆشەویستەکەی و لەسەری تاپۆ کرد، بەڵام ( سُبحانَ الله ) پاش ماوەیەکی زۆر کەم، ئەم خوشکەی کە ساغ وگەنج بوو، هێشتا شووی نەکردبوو، وە هەموو ماڵ وسامانی خوشکە نەخۆشەکەی کرابوو بەناوی ئەوەوە، لە کتوپڕدا بەلادا هات ومرد، ئەم ماڵ وسامان و خانوو بەرەیەی لە ڕێگەی دادگاوە دابەشکرا بەسەر خوشك وبراکانیدا، کە بە حیساب بێ بەش کرابوون، وە ئەم خوشکە نەخۆشە کە لە ڕاستیدا خاوەنی هەموو ماڵ وسامانەکەیەو بەهۆی پرس نەکردن بە شەرعی خوا لە دەستی داوە، وەکو یەکێك لە میراتگران بەشی بەرکەوت و ساڵانێکی زۆر دوای ئەوە ژیاو ژیانێکی هەژارانەی بەسەر برد.!

خوای گەورە بە ڕەحمی خۆت لە دینەکەت شارەزا ترمان بکەی، وە هیدایەتمان بدەی کە هەموو کارو کردەوەمان بە گوێرەی شەریعەتە پاك و بێگەردەکەت بێت و دنیاو قیامەتمان بەختەوەری بێت. ..اللهُمَ آمیــن ...

## سەرچاوەکان:.


١. تەفسیری ئاسان بورهان محمد ئەمین
٢. صَوتُ المِنبَر صالح محمد الونیان
٣. كَبائِر الذنُوب یوسف الحاج أحمد
٤. فَتاوی وَأحكام د. أحمد علی طه ریان
٥. فَتاوی مَعاصِرة د. یوسف القرضاوی
٦. خُلَفاء الرَسول خالد محمد خالد
٧. القَلائد مِن فَرائِد الفَوائِد د. مصطفی السباعي
٨. خُطَب الشَیخ د. سعید عبد العظیم

## الخطبة الأولى

الحَمدُلله الذي اكْمَلَ لنَا الدِّينَ، فَليسَ لأحدٍ ان يَزيدَ فيهِ ما ليسَ منْهُ، احمَدُهُ تعالى واشكُرُهُ واتُوبُ إليهِ واستَغْفِرُهُ.

واشْهَدُ انْ لا إلَه إلاّ اللهُ وَحدهُ لا شريكَ لهُ، شَرَعَ ويَسَّر، وحَكَمَ ودبَّرَ، ونَهى وامرَ، وانعمَ عَلينا بِنعمٍ لا تُحصى ولا تُحصر.

واشهد انَّ محمداً عبدُهُ ورسولُهُ وهوبشرٌ كالبَشرِ، بَعثهُ اللهُ رَحمةً للعالمينَ، ارسلهُ لِيُطاعَ ويُتَّبعَ، لا ليُخالَفَ سنتَهُ ويُزادَ فيها ويُبْتدَع.فَلا يَستقيمُ إيمانُ عبدٍ بهِ حتى يُطيعَهُ فيما امَر، ويُصدِّقَهُ فيما اخْبرَ، ويَجتنِبَ ما عنْهُ نَهى وزجَرَ مِنَ المَعاصي والبِدعِ الجالِبةِ للخَطَر، صلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه الذين إلتزموا سُنَتَهُ ووقَفوا عنْدَ هديهِ، ما إتصلَتْ عينٌ بنظرٍ، وأُذُنٌ بِخَبرٍ، وسلَّمَ تسليماً كثيراً.

أُوصيكم عبادالله: بتقوى الله وطاعته، فاتقوا الله تعالى واشكروه على ما منَّ به عليكم إذ بعث فيكم رسولاً من انفسكم يتلوا عليكم آياته ، ويزكيكم ويعلمكم الكتاب والحكمة، فحققوا هذه النعمة بإتباع سنة رسولكم صلى الله عليه وسلم والوقوف عند هديه وشريعته، والبعد عمَّا احدثه اهل الأهواء من البدع التي ما انزل الله بها من سلطان. قال الله تعالى: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ۝٧ ﴾ الحشر: ٧.

نبهني الله وإياكم من نومة الغافلين وحشرني وإيّاكم تحت لواء سيد المرسلين.

## الخطبة الثانية

الحمدلله ناصر المؤمنين المجاهدين وقامع الكفرة والظالمين، والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

أوصيكم عبادالله ونفسي قبلكم بتقوى الله، فاتقوا الله عبادالله، واطيعوه، واحذروا أعداءكم فقد قال الله تعالى فيهم ﴿كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلاًّ وَلَا ذِمَّةً يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨﴾﴾.

أيها المسلمون: إعلموا أنَّ مأساة المسلمين اليوم في أنَّهم لم يعرفوا عن أنفسهم ما يعرفه الأعداء عنهم، ولا شك أنَّ الأعداء يدركون حقيقة ما تنطوي عليه جوانب القوة وجوانب الضعف في بلاد المسلمين، فهم يخططون ليلاً ونهاراً من أجل تدمير المباديء الإسلامية الغالية.

فإحذروهم واعرفوا مكرهم وخديعتهم، وقابلوهم بما هو أشد، فإنَّهم يمكرون ويمكر الله والله خير الماكرين.

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾

الا فصلوا وسلموا على المصطفى كما أمركم ربكم في كتابه حيث يقول ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾﴾

اللّهم إغفر للمؤمنين والمؤمنات والمسلمين والمسلمات، الأحياء منهم والأموات من أهل السنة والجمعة والجماعات.

اللهم إجعلنا ممن يعرفون أعدائهم ويحذرونهم.

اللهم أعز الإسلام والمسلمين واخذل أعدائك أعداء الدين، اللهم إكسر شوكتهم فلا تقم لهم قائمة بعدها أبداً.

اللهم إنّا نعوذ بك من عذاب القبر ، اللهم إنّا نسألك أن تعصمنا من فتنة القبر.

اللهم إجعل القبور بعد فراق هذه الدنيا خير منازلنا، وإفسح فيها ضيق ملاحدنا، اللهم إعنّا على الموت وسكرته والقبر وظلمته، والموقف وكربته، والصراط وزلته، يا حي يا قيوم.

اللهم إقسم لنا من خشيتك ما تحول به بيننا وبين معاصيك، ومن طاعتك ما تبلغنا به جنّتك، ومن اليقين ما تهون به علينا مصائب الدنيا.

اللهم متعنا بأسماعنا وابصارنا وقواتنا ما أحييتنا واجعله الوارث منّا ، واجعل ثأرنا على من ظلمنا وانصرنا على من عادانا ولا تجعل الدنيا أكبر همّنا ولا مبلغ علمنا ولا تسلط علينا من لا يرحمنا.

اللهم إنا نسألك من الخير كله عاجله وآجله ما علمنا منه وما لم نعلم، ونعوذ بك من الشر كله ما علمنا منه وما لم نعلم.

ونسألك الجنّة وما قرّبَ إليها من قول اوعمل، ونعوذ بك من النار وما قرّبً إليها من قول او عمل.

اللهم إنا نعوذ بك من علم لا ينفع ومن قلب لا يخشع، ومن نفس لا تشبع، ومن دعوة لا يستجاب لها.

اللـهم آت نفوسـنا تقواها وزكها انت خير من زكاها انت وليها ومولاها.

اللهم إشف مرضانا وسلم أحيائنا وإغفر لأمواتنا برحمتك يا ارحم الراحمين. آمين.

٣٤ غەزەتی طارق کوری زیاد (اندلس

٣٠٢ طریق المستقیم (ریبازی راستە

٦٢٢ گەورەیی و قەدری دا(...)ی پێغەمبەر

٥.. ئایا دوو رۆژت وەک یەک بێ

+ النصح شێخ سەمەرقەندی

٦.. موقف ملا علی سلیمانی

# پێڕست


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| ووتاری یەکەم بۆ مانگی شەعبان گەورەیی مزگەوت ١ | ٩ |
| ووتاری دووەم بۆ مانگی شەعبان ڕۆڵ و گەورەیی مزگەوت ٢ | ٣٥ |
| ووتاری سێهەم بۆ مانگی شەعبان: هاوڕێیەتی | ٥٧ |
| ووتاری چوارەم بۆ مانگی شەعبان نوێژی بەیانی | ٨٥ |
| ووتاری یەکەم بۆمانگی ڕەمەزان گەورەیی و بەرەکەتی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان | ١١٣ |
| ووتاری دووەم بۆ مانگی ڕەمەزان ڕەحمەتی خوا | ١٣٧ |
| ووتاری سێهەم بۆ مانگی ڕەمەزان زەکات | ١٥٩ |
| ووتاری چوارەم بۆ مانگی ڕەمەزان بەختەوەری | ١٩٥ |
| ووتاری پێنجەم بۆ مانگی ڕەمەزان :لَيْلَةُ القَدْر | ٢٢٣ |
| ووتاری جەژنی ڕەمەزان | ٢٥٧ |
| ووتاری عەرەبی بۆ جەژنی ڕەمەزان: بەشی یەکەم | ٢٧١ |
| ووتاری عەرەبی بۆ جەژنی ڕەمەزان: بەشی دووەم | ٢٧٥ |
| ووتاری یەکەم بۆ مانگی شەوال ماڵئاوایی لە مانگی ڕەمەزان | ٢٧٩ |
| ووتاری دووەم بۆ مانگی شەوال بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی | ٣٠٥ |
| ووتاری سێهەم بۆ مانگی شەوال غەیبەت بەشی یەکەم | ٣٣٣ |
| ووتاری چوارەم بۆمانگی شەوال غەیبەت بەشی دووەم | ٣٦٣ |

| | |
|---|---|
| ووتاری پێنجەم بۆ مانگی شەوال قورئانی پیرۆز بەشی یەکەم | ٣٨٩ |
| ووتاری یەکەم بۆ مانگی ذي القعده قورئان بەشی دووەم | ٤١٣ |
| ووتاری دووەم بۆ مانگی ذي القعده:حەزرەتی یونس ﷺ بەشی یەکەم | ٤٤٩ |
| ووتاری سێهەم بۆ مانگی ذي القعْده پەندو ئامۆژگاری لە ژیانی ﷺحەزرەتی یونس بەشی دووەم | ٤٧٧ |
| ووتاری چوارەم بۆ مانگی ذي القعده سەرنجدان و بیرکردنەوە لە گیانداران بەشی یەکەم | ٤٩٩ |
| ووتاری پێنجەم بۆ مانگی ذي القعدة سەرنجدان و بیرکردنەوە لە گیانداران بەشی دووەم | ٥٢٩ |
| ووتـــاری جـەژنی قـوربـــان | ٥٦١ |
| ووتاری عەرەبی بۆ جەژنی قوربان | ٥٩١ |
| ووتاری یەکەم بۆ مانگی ذي الحِجَة نۆمینەی حاجییان | ٥٩٥ |
| ووتاری دووەم بۆ مانگی ذي الحِجَة ئـــــاو و ئیمـــــان | ٦٢٧ |
| ووتاری سێهەم بۆ مانگی ذي الحِجَة وەصیەت کردن بەشی یەکەم | ٦٥٧ |
| ووتاری چوارەم بۆ مانگی ذي الحِجَة وەصیەت و میرات بەشی دووەم | ٦٨٩ |